# دائیرەتولمەعاریف

## فەرهەنگی زانیاری وهونەر



ئەندازیار خوسرەو جاف

بەشی یەکەم

2007




238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

📚 PDF کتێبی 📚 پەڕەی فەرمی
Public Figure

لێرە
باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان
بە خۆرایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان
drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_













دائیرەتولمەعاریف
فەرهەنگی زانیاری و هونەر
بەرگی یەکەم
نەخشەسازی: بەرزان، شاروخ ئەرژەنگی
بەرگ:شاروخ ئەرەنگی
چاپی دووەم: سلێمانی ٢٠٠٧
تیراژ:٣٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ( ٢٩٣ )ی سالّی٢٠٠٧ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە
چاپ: چاپخانەو ئۆفسێتی شڤان
لەسەر ئەرکی چاپخانەی شڤان چاپکراوە

## ووتەیەك

زۆر لە برادەران و دەستگا چاپەمەنیەکان داواکاری لە چاپدانەوەی دانیرەتولەعارفیان کرد و رازی نەدەبووم و نەدەچوومە ژێر لە چاپدانەوەی لەبەر یەك هۆی سادە، بە نەشیاوم دەزانی دوای تێپەڕبونی بیست ساڵ بەسەر لەچاپدانی لەو دەمە باشتر لەچاپ نەدرێتەوە، ئیدی تونێلی زەمان رەحم بە هیچ گیانلەبەرێك ناکاو لەیەکم دایەوە تا بۆ خۆم ماوم دووبارە لە چاپدرێتەوە، سودی بۆ میللەتەکەم زۆرترە تا مەرج و هەواو هەناسەی خۆم، زۆر پرۆژەو بەرنامە لە ژیاندا بەو شێوەی هەڵناکەوی وا مرۆڤ تەماحگیریەتی ئەوەی راسی بێت بەرگی دووەمی ئەو کارەم زەمانێکە تەواو کردوە دەتوانم لە دوو مانگدا ئامادەی کەم ئەگەر دەست لە بڕێك کاری ترم هەڵگرم

بەهەر حاڵ چاپخانەی شڤان توانی رەزامەنیم بەدەست بهێنێت و دوبارە بەرگی یەکەمی دانیرەوتولەعارف بە چاپ بگەیەنێت ئومێدەوارم وەکو میوانێکی ئێسك سوك سەر بە هەموو ماڵێکی کوردا بکا، یاخوا ماڵە کورد ئاوا بێت یاخوا ولاتەکەمان لە درۆو بی بارانی و ئافەت و دوژمنەکانی دەورویەرمان بپارێزێت، دە تخوا بڵێن ئامین

خوسرەو جاف

٢٠٠٦/١١/٢٨

***********************************


زۆر لە برادەران و دەستگا چاپەمەنیەکان داواکاری لە چاپدانەوەی دانیرەتولەعارفیان کرد و رازی نەدەبووم و نەدەچوومە ژێر لە چاپدانەوەی لەبەر یەك هۆی سادە، بە نەشیاوم دەزانی دوای تێپەڕبونی بیست ساڵ بەسەر لەچاپدانی لەو دەمە باشتر لەچاپ نەدرێتەوە، ئیدی تونێلی زەمان رەحم بە هیچ گیانلەبەرێك ناکاو لەیەکم دایەوە تا بۆ خۆم ماوم دووبارە لە چاپدرێتەوە سودی بۆ میللەتەکەم زۆرترە تا مەرج و هەواو هەناسەی خۆم، زۆر پرۆژەو بەرنامە لە ژیاندا بەو شێوەی هەڵناکەوی وا مرۆڤ تەماحگیریەتی. ئەوەی راسی بێت بەرگی دووەمی ئەو کارەم زەمانێکە تەواو کردوە دەتوانم لە دوو مانگدا ئامادەی کەم ئەگەر دەست لە بڕێك کاری ترم هەڵگرم
بەهەر حاڵ چاپخانەی شڤان توانی رەزامەنیم بەدەست بهێنێت و دوبارە بەرگی یەکەمی دانیرەتولەعارف بە چاپ بگەیەنێت ئومێدەوارم وەکو میوانێکی ئێسك سوك سەر بە هەموو ماڵێکی کوردا بکا، یاخوا ماڵە کورد ئاوا بێت یاخوا ولاتەکەمان لە درۆو بی بارانی و ئافەت و دوژمنەکانی دەورو بەرمان بپارێزێت دە تخوا بڵێن ئامین.
خوسرەو جاف
2006-11-28

# ناوەرۆك

## قسەیەك

زانیاری مرۆڤی ئەمرۆ گەیشتوەتە ئەندازە و پلەیەکی یەجگار بەرز و بوڵەند، ئاکامی ئەندێشەکانی رۆژ بە رۆژ، فراوانتر و بەربڵاوتربوون، هەر یەکێك لەو زانیارانە بەتەنیا بۆ خۆی بووە بە دەریایەکی قووڵ و بێ پەی، بە چەشنێکی وا ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بڕواتە ناخێوە و پسفۆریی تیادا بەدەس بهێنێت، ساڵەهای ساڵ درێژە دەکێشێت، و تازە نەگەیشتۆتە دەروازەی بەر بڵاوی ئەو زانیاریە.. جا بۆیە، سەدەی بیست، و ئەم سەردەمەیان ناو ناوە سەردەمی پسفۆری..

لەلایەکی ترەوە ژیان و پێویستیەکانی رۆژانەی ژیان، و حەز و مەیلی خەڵکەکە بۆ زانین، و زانیاری، و ناسینی دونیای ئەوەی لە دونیادا هەیە و ڕووی داوە، هەروەها ناسینی کەڵە پیاوەکانی مێژوو، سیاسەت، و ئابووری، و فەلسەفە، زانیاری، تێکڕا مەرجێکی گرنگە بۆ مرۆڤێکی خوێنەواری ئەمرۆیی..!!

لە سەردەمێکی زووەوە بیرم ئەکردەوە، ئەبێت لە خاڵێکەوە، لە جێگەیەکەوە، یەکێك پەیدا بێت و دەستی پێدەکات، و گرنگی "دائره المعارف" بخاتە بەر چاوی خوێنەواران، و کەسێکیش بازووی لێ هەڵکات و خۆی بکاتە پێش قەرەوڵ، و لەم ڕووەوە هەنگاوی یەکەم دابنێت.. بەڵام داخەکەم درێژەی کێشا و، ئەو ئاواتەم نەهاتە دی.. جا بە هەر چەرمەسەرییەك بوو، و بە هەر گرفتاری، و دەسنە ڕۆیشتنێك بوو، وورده وورده دەستم پێکرد و، ئەو بەرهەمە هەژارەم خستە بەردەستی خوێنەواران، لەگەڵ ئەو کەم و کورتیانەدا کە تیایدایە، هەر ئەبێت هەنگاوێکە و سبەینێ چاو ساغان ڕێچکەی هەنگاوی هەژارانەی بەندە، بە توانا و دەسەڵاتێکی زۆرترەوە هەڵئەگرن، نەك وەکو من تا چاوگەیەکم بەدەس هێنا، قیر سپی بووەوە شەمەش لەمانگ بڕاوە..

جا لەیرەدا بە گرنگی ئەزانم، ئەختێك دەربارەی چۆنیەتی مێژووی ئەدەبیاتی ئەوروپا بدوێین، چونکە لەگەڵ تەقەلاکەماندا بێ بەلگەنییە..!!

دوای تێپەڕبوونی سەردەمی دواکەوتن، وتاریکیی سەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی "رنسانس" [۱] کە سەرەتا، لە وڵاتی ئیتاڵیاوە دەستی پێکرد و، و وڵاتی فرانسەوە، وڵاتانی کەی ئەوروپادا گیرسایەوە.. "رنسانس" رۆحێکی تازەی کردە لەشی ماندوو پرووکاوی هەر هەموو ڕشتە زانیاریەکاندا. جووڵانەوەیەکی ئەدەبی بە تونـد و قیژەیەکی سەرسام ئاوەر دەستی پێکرد، بە جۆرێکی وا ژیانی خەڵکێکی زۆری گۆڕی و ژێر و ژوورکرد..

"ژول"ی دووهەم، "لئون"ی دەهەم، کەسانێك بوون لە وڵاتی ئیتالیادا، لە سەرەتاوە لایەنگیر و هاندەری سەردەمی "رنسانس" بوون، و ئەم پشتیوانە بوو بە هۆی پێگەیشتنی زۆر بلیمەت و کەڵە زانیارانی مرۆڤ وەکو: میکافیل [۲] ، بمبو [۳] ، لوکادولا [۴] ، ئاریوست [۵] ، برامانت [۱] ، لیونارد دافنشی [۷] ، روفائیل [۸] ، میکائیل انجلو [۹] ، تاس [۱۰] ، فرانشرلیکو [۱۱] ، و سەدان هونەرمەنیکە..

بێگومان ئەدەبیاتیش شان بەشانی ئەو شتانە لە جووڵانەوەدا بوو، بەتایبەتی لە وڵاتی فرانسەدا، چونکە پاشاکانی ئەو وڵاتەش لە دڵەوە، یان بۆ چاولێکەری لە پاشاکانی ئیتالیا لایەن گیرییەکی زۆریان وەدەرئەخست.

فرانسوای یەکەم پێکهاتنی زانکۆی ئەدەبیاتی دەرهێناو "رابولە" [۱] شارەکانی "هەجونامە"ی بڵاوکردەوە، "رونساد دوپلای [۲] کە زمانەوان بوو زمانی فرانسەویی پتەوکرد. داستانەکانی "لافونتین" [۳] ئەندێشەکانی "لاروشفوکو" [۴] کۆمیدیاکانی " مۆلێر" [۵] تراژیدییەکانی "راسین" [۱] هەڵبەستەکانی "بوالو" [۷] ڕەواج و ڕەونەقێکی شایانیان گەیاندە ئەدەبیاتی وڵاتی فرانسە ..

لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمین دا، کە ڕاپەرینی زانیاری و دروستکردن دەستی پێکرد، ئەو بەرهەمانەش بێگومان ئاکامی تەقەلای سەدەکانی ناوەڕاست بوون، کە هاتبوونە دی بەتایبەتی لە ولاتی فەرانسەدا تەقەلاکە زۆرتر دەردەکەوت و خۆی دەنواند، نووسەرانی وەکو "فۆلتێر" [1] ، "ژان ژاك رۆسۆ" [2] ، "دیدرۆ" [3] ، "مونتسکیۆ" [4] ، هەریەکە بە شێوەیەك، زۆر و زوڵمی دەوڵەت و زۆردارانیان ئاوەڕووت دەکرد و ڕۆشنیان دەکردنەوە، بێگومان دەوڵەتی ئەو سەردەمەش کەمتەرخەم نەوەستابوو، هیچ نەکاو و گوێگر بێت. ئەوە بوو "فۆلتێر" دوورخرایەوە، و ولاتی ئینگلیز "دیدرۆ" خرایە بەندیخانەوە، "ژان ژاك رۆسۆ" خۆی شاردەوە .. بەسەر ئەمانەشا زانا و چاو ساقان بێکار نەوەستان، بەڵکو دەستیان کرد بە وەرگێرانی "دائرة المعارف"ی ولاتی ئینگلیز بە زمانی فەرانساوی و گونجاندنی بیروڕاکانی خۆیان لە هەمان وەرگێڕاودا.

"ژان ژاك رۆسۆ" لە هەمان "دائرة المعارف"دا پێشەکیەکی دوور و درێژی دەربارەی ئازادی نووسی، "فۆلتێر" بەشێك لە نامە فەلسەفیەکانی خۆی دەربارەی ئاین و سیاسەتی تیادا بڵاوکردەوە "دیدرۆ" لەبەر ئەوەی کوڕی کرێکارێکی چەقۆساز بوو دەربارەی کرێکار و دەردەسەریەکانی چینی کرێکار وتارێکی بڵاوکردەوە، هێندەی نەخایاند زۆری دەوڵەت دیسان بەرایی گرد و کەوتنەوە ئازاردانی زانایانی "دالامبر" توانای ئەو زۆر و زوڵمەی لە خۆدا شك ئەبرد کەناری گرد و "دیدرۆ" جێگەی گردەوە و بەتوانایەکی پۆلاینەوە باروکار و گرفتاری وەدی هێنانی "دائرة المعارف"ی گردە ئەستۆ. شەو و ڕۆژی بۆ نەبوو بۆ ساتێك هەنووزی نەنەکرد، زانایان و چاوساقانی لە دەور گلێر بووەوە، وە دووبارەی "دیدرۆ" خرایەوە بەندیخانە.. دوای ئازاد بوون لە ساڵی ١٧٥١م بە یارمەتی چەند کەسێك وەك مادام "دویمپادور"، ریشیلووبرنی شوازول، مالرب، تورگو، یەکەمین بەرگی "دائرة المعارف"یان وەردەرهێنا.

"دیدرۆ" تەقەلاکانی چەند بەرابەرکرد ئەوە بوو توانی تا ساڵی ١٧٧٧م "دائرة المعارف" بگەیەنێتە سەر (٢٨) بەرگ بەم شێوەیە "دائرة المعارف" شێوەیەکی دامەزراوی بەخۆی گرد و زۆر میللەتان و ولاتانیش لاسکایان لێ کردووەتەوە، ئەمڕۆ هەر میللەتێکی خاوەن شارستانیەت "دائرة المعارف"ی جۆراوجۆری پێك هێناوە لە زۆر ڕشتە و زانیاریدا، خوا ئێمەش وەك ئەوان لێ بکات.. بەڵکی ..!!

*١) Renalssance ٢)Machfavel ٣)BemBo ٤) IvcA-dellA*
*٥) ARiAste ٦) Bramant ٧) LeOnArdde-vin ٨) RaphAeel*
*٩) Miehel Anqe ١٠) tAss ١١) FeRA Angelico*

*١) RAbelais ٢) ovBellAy RonsARd ٣) LA fontAine*
*٤) LARochefoucAvld ٥) MoLieRe ٦) RAcine ٧) BoiLeAu*

*١) VoltAire ٢)Rousses ٣)DideRo ٤) Montesqieu*

**ئەندازیار**
**خوسرەو جاف**

# قوتابخانەکانی فەلسەفە

**١- ئازاد بیران *Libre penseur***

فەیلەسووفەکانی سەدەی هەژدە هێندە پەیوەندییان چۆنیەتی لەگەڵ مەسەلەکانی (حیکمەت)دا نەبوو تەواوی بیر و باوەڕیان بەلای کاروباری رامیاری "سیاسی" و چۆنیەتی رەوشتەوە بوو زۆریش خۆیان لە چوارچێوەی بیروڕا فەلسەفییەکانی کۆن دا گیرنەدەکرد، هێندەش باوەڕیان نە بە چۆنیەتی بیر کردنەوەیان هەبوو نە ئەوەندەش گوێیان بە ئایین دەدا، ئەمانەش وەکو:




أ – فۆنتینەل *Fontenell*

ب – مۆنتسکیۆ Montesquieu

ج – ڤۆلتێر *Voltair*

د – دیدرۆ *Dideroe*

کۆندیاك *Condillac*

**٢- ئیلتقاطی – گوڵەوەچنی *Electique***

بڕێك لە فەیلەسووفەکانی بێ ئەوەی گوێ بدەنە نەژادی فەیلەسووفە بەناوبانگەکانی کۆن لە هەر بالێك گوڵێك و لە هەر کەسێك شتێکیان وەردەگرت و تێکەڵیان دەکرد و چوارچێوەیەکی تایبەتییان بۆ ئەو بیروڕایە دروست دەکرد، ئەم برە بە دەستەی (ئیلتقاطی) بەناوبانگ بوون.

**٣- ئالئاتەکان**

ئەم زانایانە تەواوی باوەڕیان لەسەر بناخەی بیر و بەڵگە بووە بەتەنیا، جگە لە بیرو لە بەڵگە باوەڕیان بە شتی تر نەبووە، لەمانەش:

أ – بودوکسینوس

ب – برماندیسن

ج – زینوون

**٤- رەواقییەکان**

ئەم دەستە فەیلەسووفانە بیر و ڕایەکەیان بەناوی ئەو جێگەوە ناسران کە تیایدا کۆ دەبوونەوە، ئەوەش رەواقێك واتا "بێلاییبەك" بوو لەشاری ئەثینای کۆن "سەردەستەی ئەم کۆمەڵەش زینوون بوو، بیروڕایان ئەوەبوو کە "بیری مرۆڤ وەکو پەڕەیێکی ساف و بێگەردە، هەرچی زانیارییش هەیە هەر تەواوی لە دەرەوە بەدەس دێت و تێگەیشتنی مرۆڤیش بریتییە لەچوار بەش ١- واهیمە ٢- گومان ٣- پێزانین "ئیدراك" ٤- زانیاری "علم".

٥ – سۆفستایەکان *Sophistiens*

ئەم کۆمەڵە زۆر بەتەنگ راستەقینەوە نەبوون بەڵکو پەیرەوانی خۆیان هان دەدا بۆ ئەوەی لە قسە و باس و دەمەتەقێدا ببن بە مامۆستا و بەسەر بەرامبەرەکانیان دا زاڵ بن، سەردەستەی ئەم کۆمەڵەش ئەمانە بوون:-

ا – ئەفریدیکۆس *Afry piodicos*

ب – گرکیاس *Gorgias*

ج – پرتاگۆرس *Protagoras*

- گوماندااران ( شکاکان ) *Sceptiqve*

ئەم کۆمەڵە زانایە لە باوەڕێك دا بوون کە بۆ بەدەست هێنانی زانیاری هیچ چاوگەیێك پاك و خاوێن نییە. هەست هەڵە دەبێت، بیر توانای ڕاست کردنەوەی ئەو هەڵەیەی نییە چونکە مرۆڤ وا لەژێر باری هەستی جۆراوجۆری لەش و بەدەندا. دانەری ئەم بیروڕایە پیرهۆن **Pyrrhon** ی فەیلەسووف بوو.

٦- عیرفانی فلۆتین

فلۆتین یەکێك لەو فەیلەسووفە کۆنانەیە کە بوو بە هاودەمی (ئامونیۆس ساکاس) و بوو بە پەیرەوانی قوتابخانەی حیکمەت و عیرفان. ئیدی بەرەو رۆژهەڵات کەوتە ڕێ کەشکۆڵ و دارعەسای لێ هەڵ گرت و بە تەواوی وازی لە دنیا هێنا و بوو بە پەیرەوانی یەکتاسی (وحدانییەت) و تەنیا خوای بە سەرچاوەی سەرەتا و دوایی دانا و هەرچیش لەم دنیایەدا دەبینرێت هەر لە سەرچاوەی یەکیەتیی هەڵ قوڵیوە.

٧- کارتزینەکان *Carteziens*

فەیلەسووفەکانی سەدەی حەڤدە و پەیرەوانی (دیکارت) بەم ناوە ناسراون و ناسراوترینیان پاسکاڵ **Pascal** و مالبرانشە **MaLbranche** .

٨- کەلبییەکان ( سەگوندەکان )

یەکێك لە قوتابییەکانی سوقرات بەناوی ئەنتیس تینەس **Antisthene** شێوەی ژیانی سوقراتی کردە پیشە و بە شێوەیێکی لە ڕادە بەدەر گوێی بە نیازەکانی لەش و دەروون نەدەدا. لەبەر ئەوەش ئەم فەیلەسووفە لە شارێك دا دەژیا بەناوی (سەگەسپی) بیروڕاکەی بەناوی سەگوندەکان ناسراوە.

بەناوبانگترین پەیرەوانی ئەم قوتابخانەیە دیوجینسە Diogens .

٩- ماددییەکان *Mathematiceins*

پەیرەوانی ئەم قوتابخانە (مادە و جسم) بە بنچینەی هەموو شتێك دەزانن، بەناوبانگترین پەیرەوانی ئەم قوتابخانەیە (هیرەقلیدوس)ە کە لە باوەڕێك دایە کە گۆڕین و جووڵانەوە چاوگە و بنچینەیە.

## قوتابخانە سیاسی و فەلسەفییەکان

١- ئەپولوژیسم *ApoLogisme*

ئەو دەستانەن کە تەنیا باوەڕیان بە بەڵگە هەیە.

٢- ئەگنۆتیسیسم *Agnosticisme*

بیروڕای ئەم دەستە ناسراوە بە (نازانم) کە وەڵامی فەلسەفە ناسراوەکانی کۆن بە (نازانم) دەدەنەوە.

٣- ئەمپیریسم *Empirisme*

باوەڕیان وایە هەر باوەڕێك دەبێت بە پێی تاقیکردنەوە بێت.

٤- ئانارشیسم *Anartchisme*

شێوەیێك کە دەوڵەت بە پێویست نازانن.

٥- ئابسۆلوتیسم *AbsoLutisme*

فەرمانڕەوایی بێ لیدوان کە هەموو توانایێکی بە دەستەوە بێت.

٦- ئاپۆرتۆنیسم *Opportunisme*

واتە خەڵکێك کە بەپێی رۆژ رەوشت بگۆڕێت واتە "نان بەنرخی رۆژ خواردن".

٧ - ئاپیس کۆپالیس *Episcopalisme*

خەلکێك کە پەیرەوی (کالون)ی فەیلەسووفی سەدەی شانزدە بوون کە بیروڕای لەسەر ئەوە بوو ئاخووند و قەشەکان دەبێت زۆربەی کار و دەزگاکانی دەوڵەت بەپێی بیروڕای ئەوان هەڵ بسووڕێت.

٨ - ئوتۆکراسی *Autocratia*

باوەڕ بە توانای کەسێك کە لەلایەن میللەتەوە هەڵ نەبژێردراوبێت.

٩ - ئەپیکوریانیسم *Epicurianisme*

پەیرەوانی بیروڕای (ئەپیکۆر)لایەنگری (مادیات) و خۆش بینی بەرامبەر مرۆڤ و مرۆڤ خوازی و باوەڕ نەبوون بە پەروەردەگار و پاراستنی سوودی تاکەکەسی و نەسەلماندنی دادگەری و بەدەس هێنانی حەز و نیاز و لەززەت.

١٠ - ئارستیانیسم *Erastianisme*

بیروڕایەك کە دەسەڵاتی کاربەدەستانی ئاین و دەوڵەت بخاتە چوارچێوەیێکی دیاری کراو و ناسراوەوە.

١١ - ئەگوئیسم *Egoisme*

بیروڕای خۆپەرستی واتا "پادار بگرە و بێ پا ماڵی یۆمانە".

١٢ - ئەنترناسیونالیسم *InternationaLisme*

باوەڕکردن بە هاوکاری میللەتەکان لەگەڵ یەك دا لە پێناوی بەختیاری تێکڕای مرۆڤ دا.

١٣ - ئۆتارکی *Autarkie*

باوەڕ لەسەر ئەوە کە هەر وڵاتێك پێویستی و نیازەکانی خۆی وەدەست بهێنێت و نیازی بە دەرەوەی سنوور نەبێت.

١٤ - ئایدیالیسم *IdeaLisme*

واتە خەیاڵ پەرستی.. ئەم قوتابخانەیە بیروڕای وایە کە سیاسەت دەبێت لە پێناوی مرۆڤایەتیدا بێت نەك سیاسەت بۆ سیاسەت.

١٥ - بەربەریسم *Barbarisme*

بیروڕای میللەتە دواکەوتووە دڕەکان کە تەنیا باوەڕیان بە خوێن ڕژان هەیە.

١٦ - ثیوکراسی *Theocratie*

دەوڵەتێك کە فەرمان ڕەواکان و کاربەدەستەکانی پیاوی ئاین بن.

١٧ - تیرۆریسم *Terrorisme*

باوەڕ بە کوشتن و بڕین و زەبروزەنگ.

١٨ - دیپارتمانتالیسم *Departemantalisme*

سیستەمی دەوڵەتێك کە خۆڕێبەری "خودی موختاری" بەپێی پێویست بە ناوچەکانی خۆی بدات.

١٩ - دایلەکتیك *Dialectique*

شی کردنەوەی باسێك بە ڕەوشتێکی فەلسەفانە بەپێی پرسیار و وەڵام و دەمەتەقێ.

٢٠ - ریالیسم *Realisme*

ڕاستەقینە پەرستی واتە ڕاستەقینەی دنیا و دەوروبەری و پرسیار و وەڵام و دەمەتەقێ.

٢١ - فاشیسم *Fascisme*

فەرمان ڕەوایی تێکرایی دەستەیێکی دڕ و خوێن ڕێژ.

٢٢ - کاپیتالیسم *Capitalisme*

سیستەمی سەرمایەداری کە بەرهەم بەدەست سەرمایەدارانەوە بێت.

٢٣ - لیبرالیسم *Libralisme*

باوەڕکردن بە ئازادی مرۆڤ.

٢٤ - ماتریالیسم *Materialisme*

باوەڕ بە (مادە) و هیچی تر، واتە باوەڕ نەبوون بە خوا و ئاین و هێزە نادیار و شاراوەکان.

٢٥ - مۆبۆکرسی *Mobocratie*

فەرمان ڕەوایی لەلایەن خەڵك و کۆمەڵێکی گەوجەوە.

## فەیلەسووفەکانی دنیای ئیسلام

**١- ئیبن سینا :**



ئەبو عەلی کوڕی حسینی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەلی کوڕی سینا ساڵی ٣٧٠ی کۆچی لەدایك بووە و لە ٤٢٨دا مردووە.

زۆرتر لە سەد بەرگ کتێبی نووسیوە و بەناوبانگترینیان ئەمانەن:-

أ – شفا

ب – قانون

ج – إشارات

**٢- ئیبن مسکوێە (لە ٤٣١ کۆچی مردووە)**

بەناوبانگترین کتێبی بە عەرەبی بەناوی "الطهارة" دەربارەی زانیاریی ڕەوشت و پەروەردەکردنی خووڕەوشتە.

**٣- حەسەن کوڕی سوار (لە ٣٣١ کۆچی لەدایك بووە)**

بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەمانەن:-

أ – تفسير المادة

ب – الكليات الخمسة

ج – آثار الجوّ

**٤- شەهابەددینی سەهرەوەردی (٥٤٩ – ٥٨٧ ك)**

باناوبانگترین کتێبی بە عەرەبی بەناوی (حكمة الاشراق)ە.

**٥- ئەبولحەسەن کوڕی محەمەد ئەلعامری (لە ٣٢١ ك مردووە)**

بەناوبانگترین کتێبی بە عەرەبی ئەمانەن:

أ - الأبصار

ب – المبصر

ج – النسك العقلي

٦- ئیمام محەمەدی غەزالی (٤٥٠ – ٥٠٥ ك)

لە سەد و سی کتێبی زیاتر نووسیوە بەناوبانگترینی ئەمانەن:


ئیمام محەمەدی غەزالی

أ – كيمياء السعادة

ب – نصيحة الملوك

ج – تهافت الفلاسفة

د – المنقذ من الضلال

ه – إحياء علوم الدين

٧- ئەبو نەصری فارابی (٢٦٠ – ٣٣٩ ك)

لە سەد کتێبی زیاتر نووسیوە بەناوبانگترینیان ئەمانەن:-

أ – فصوص الحكم

ب – إحصاء العلوم

ج – عيون المسائل

د – رسالة في مبادىء آراء أهل المدينة الفاضلة

ه – رسالة في إثبات المفارقات . كتاب النجوم .

ع – الأغراض مابعد الطبيعة


ئیبن خەلدوون

٨- فەخرەددینی ڕازی (٥٤٣ – ٦٠٠ ك)

بەناوبانگترین کتێبەکانی:

أ – المباحث المشرقية

ب – شرح عيون الحكمة

ج – كتاب شرح الإشارات

د – كتاب المطاليب العالية

٩- عەبدولڕەحمان ئیبن خەلدوون (٧١١ – ٧٨٥ ك)

مێژوو نووس و کۆمەڵ ناسی بەناوبانگە و دیارترین کتێبی (مقدمة ابن خلدون)ە.


ئیبن ڕوشد

١٠ – ئیبن ڕوشد (٥٢٥ – ٥٩٥ ك)

دەوروبەری پەنجا کتێبی نووسیوە بەناوبانگترینیان:

أ – فلسفة ابن الرشد

ب – فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعة من إتصال

ج – تهافت التهافت

١١- ئەبولعەلای مەعەڕڕی (٣٦٣ – ٤٤٩ ك)

شاعیر و نابیناش بووە، بەناوبانگترین کتێبەکانی ئەمانەن:

أ – ديوان سقط الزند
ب – اللزوميات الغفران
ج – رسالة الغفران
د – الفصول والغايات

## فەیلەسووفانی ناموسلمان

١ – ئەبیلار *Abelard* (١٠٧٩ – ١١٤٢ ز)

خەڵکە فەرەنسایە، زۆرتر لەبەر ئەوە ژیانی پڕ لە کوێرەوەری و بەدبەختی بووە بۆیە بەناوبانگ بووە.

٢ – ئەرخەلاووس *AicheLaos*

فەیلەسووفێکی یۆنانییە لەسەدە پێنجەمی پێش زایین دا ژیاوە و سوقرات ئەوی بە پێشەوای خۆی داناوە.

٣ – ئەرستیدس *Alistide* (سەدەی دووەمی زایین)

پەیڕەوی ئایینی مەسیحیەت بووە و کتێبێکی نووسیوە بەناوی (ستایشتێ) لە ئایینی مەسیحیەت.

٤ – ئەنکساغۆرس (٥٠٠ – ٤٢٨ پ. ز)

پەیڕەوی قوتابخانەی ئەیۆنی بوو.. و بوو بە دۆست و برادەری پریکلس، باوەڕی بەوە بوو کە "هەموو شتێك لە هەموو شتەوە دروست بووە و دنیا تەنیا لەیەك شت پێك نەهاتووە" هەروەها بۆ یەکەم جار بلاوی کردەوە کە خۆر و مانگ و ئەستێرە هەروەکو زەوی وەهان، خۆریش چاوگەیێکی ئاگرینە، خواکانیش نین تا شایانی پەرستن بن.

٥ – ئەنتیستەنس *Antisthene* (٣٦٥ – ٤٤٤ پ. ز)

یۆنانییە، یەکێکە لە قوتابییەکانی سوقرات و لە ئەثینا لەدایك بووە بیروڕای ئەومیە دەڵێت: وجوودی مرۆڤێکی زیندوو لە مایەداری (فضیلة) دەبینرێت و مایەدارییش بە لەخۆ حەرام کردنی لەزەت و خۆشیی لەش و گیان بەدەست دێت. پەیڕەوانە ئەم فەیلەسووفە ژیانی دەروێشییان کردە بەر و دنیای شارستانییان بەجێهێڵا و چڵکن و مووی سەر هاتوو و پێپەتی و ڕووت لەناو خەڵك دا دەخولانەوە و هەرچییان بەدەم دا دەهات دەیان گوت.

٦ – ئەنسەلم *AnseLm* (١٠٢٣ – ١١٠٩ ز)

لەسەدەی یازدەدا ژیاوە و کاثولیکەکان زۆر باوەڕیان پێ هەبووە و ناوی (پاك)یان لیناوە و بیروڕای وەهایە کە: پێش هەموو شتێك دەبێت مرۆڤ باوەڕی بە ئاین هانی بێت دوای ئەوەی شیی بکاتەوە و بڕواتە قولاییەکەیەوە.

ئەنسەلم زۆر لە (ئەگوستین) و بیروڕای نزیکە بۆیە ناونراوە ئەگوستینی دووەم، ئەوەی لێ بەجێماوە کۆمەڵە خالێکە دەربارەی بوونی خوا.

٧ – ئەپرقلس *PiocLus* (٤١٠ – ٤٨٥ ز)

لەدەوری سەدەی پێنجەم دا ژیاوە و یەکێکە لە پەیرەوانی ئەفلاتون، کتێبێکی دەربارەی کتێبەکەی "تیماووس" نووسیوە.

٨ – ئەپیکتیتوس *Epictete*

لەسەدەی یەکەم و دووەمی زایین دا ژیاوە، بە رەچەڵەك یۆنانییە بەڵام لە رۆما ژینی بەسەر بردووە، لەپێش دا کوێلە بووە و ئازاد کراوە، پەیرەوی دەستە و دایەری رەواقییەکان بووە و بیروڕای وا بووە کە دەڵێت: کاروباری ئەم دنیایە لەسەر دوو بناغەیە یەکێکیان بەدەستی خۆمانە و ئەوی تریان نا، یەکەم بیر و ئیرادەیە ئەگەر توانیمان حەز و ئاواتەکانمان لغاو بکەین دەتوانین بێ دەردەسەری بژین و چێژی ئازادی بکەین، ئەوانیش لەبەست هێنان دوورن نابێت خۆمانی بۆ بچرووسێنینەوە، هێندە ئاخ و داخیان بۆ بخۆین؛ کەواتە ئەوەی هەتە پێی دڵخوش بە و قەدری بزانە.

٩ – ئەپیکوور *Epicuie* (٢٤٢ – ٢٧٠ پ. ز)



یەکێکە لە فەلەسووفە ناودارەکانی یۆنان کە لە دوورگەی (سامۆس) لەدایك بووە کە دەکەوێتە ناو دەریای ئیژەوە. دوای دەورانی قوتابییەتی کەوتە ئەو باوەڕە کە بیروڕای خۆی بخاتە چوارچێوەیێکی فەلسەفییەوە و لەئاکام دا بەدی هاتنی. ئێستاش بیروڕاکەی ناسراوە بە (ئەپیکووریسم) واتە پەرستنی حەز و لەزەت.

ئەپیکوور لەساڵی ٣٠٦ی پێش زایین دا لە قەراغی شاری ئەثینادا خانوو باغێکی کردە بنکەی خۆی و لەوێوە دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی.

ئەپیکوور فەیلەسووفێکی ئازادی خواز و سەربەست بوو، بۆ یەکەم جار هێڵای کە ژنان لە کۆڕ و کۆبوونەوە فەلسەفییەکانیدا بەشداری بکەن.. ئەپیکوور لە دەرسەکانی ئەفلاتون دا بەشداری کردووە.

١٠ – ئەراسم *Eirasme* (١٤٦٩ – ١٥٣٦ ز)



لەشاری رۆتردام لەدایك بووە و بەناوبانگترین نووسینەکانی (مناظرات)ە کە بە زمانی لاتینی نووسیویەتی و یەکێکە لە پێشڕەوانی سەردەمی رێنیسانس هەمیشە دەکۆشا کاروباری کۆمەڵایەتی و ئایینی بەشێوەیەکە ئارام و لەسەرخۆ شی بکاتەوە لێی بدوێت.

١١ – ئەرستۆتالیس



پزیشکی بەناوبانگی یۆنان، باوکی پزیشکی تایبەتی پاشای مەکەدۆنیا بووە و ناوی (نیکوماخس) بوو، ئەرستۆ بە منداڵی باوکی مردووە و بەهەتیوی گەورە بووە و لە شاری ئەثینا لەنگەری خستووە و بووە بە یەکێك لە قوتابییەکانی ئەفلاتون. ئەویش زۆر رێزی گرتووە و زانیویەتی کە بلیمەتێکی لێ دەردەچێت، دوای مردنی مامۆستاکەی چەند شارە و شارێکی کرد، لەدواییدا لە ماکەدۆنیادا لەنگەری خست و بوو بە مامۆستای ئەسکەندەری ماکەدۆنی و لەگەڵ ئەسکەندەردا مایەوە تا مردنی ئەسکەندەر، پاش مردنی شاری ئەثینای بەجێهێشت و چوو بۆ خالکیس کە لەوێدا مرد.

١٢ – ئادەم سمیث *Smith. A* (١٧٢٣ – ١٧٩٠)

فەیلەسووفێکە ئەسکەتلەندییە و لە زانکۆی گلاسکۆ و ئوکسفۆرد دەرسی خوێندووە، لەساری (ئەدیمبورگ)دا ژیاوە لە ساڵی ١٧٥١ ز بووە بە مامۆستای فەلسەفەی زانکۆی گلاسکۆ، سمیث یەکەمین دانەری کتێبی "سیاسەتی ئابووری"یە کە ناوی (سامانی نەتەوەکان)ە. پێش ئەوەی بمرێت وەسیەتی کرد هەرچە نووسیوە بیسووتێنن.

١٣ – ئەفلاتون *Platon* (٤٢٨ – ٣٤٧ پ. ز)



لەشارە ئەپینادا لەدایك بووە لە خێزانێکی دەسەڵاتدار و دەست ڕۆیشتوو، کە هەمیشە بەوە دەنازی کە کوڕی خێزانێکی وایە. تەمەنی بیست ساڵ بوو کە بوو بە قوتابیی سوقرات، تا کوژرانی سوقرات هەشت ساڵ هەر شاگردی بوو.

لەتەمەنی چل سالیدا دەستیدا دەس گوتنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ئکادیمییەکی کردەوە. ئەو لە باوەڕی سوقرات نەبوو کە لە شەقام و گۆڕەپانەکان دا ڕاوەستێ و دەرس بڵێتەوە. جا پارچە زەوییەکی بەدەست هێنا کە موڵکی پاڵەوانێك بوو ناوی (ئاکادموس) بوو بۆیە بنکەکەی ناونرا ئەکادیمی.

١٤ – برکلی *Berekely* (١٦٨٥ – ١٧٥٣ ز)



فەیلەسووفێکی ئینگلیزە، بەناوبانگترین کتێبەکانی ئەمانەن:

أ – چۆنیەتی دیتن "کیفیة الإبصار"

ب – سەرەتاکانی زانیاریی مرۆڤ

ج – وتووێژی هیلاس و فیلونوس

د – سیفرون

١٥ – رینە دیکارت *Descares* (١٥٦٤ – ١٦٥٠)



فەیلەسووفێکی فەرەنساییە لەپێش دا لە ڕشتەی سەربازگەریدا بوو دوایی بوو بە مامۆستای زانکۆ. لەشاری پاریس، ماوەی بیست ساڵ لە هۆڵەندەدا ژیا دوور لە هەرا و دوور لە خەڵك هەر خەریکی خوێندنەوە بوو. ساڵی ١٦٤٩ شاژنی سوێد دەعوەتی کرد بۆ وڵاتەکەی بەڵام چونکە نەیتوانی لە ئاو و هەوای ئەم وڵاتە هەڵبکات پاش چەند مانگێك مرد و تەرمەکەیان هێنایەوە شاری پاریس لە کڵێسای (سن تتن) نێژرا. بەناوبانگترین کتێبەکانی ئەمانەن:

أ – ڕێبازێك بۆ ڕاپەڕایەتیی بیر.

ب – لیکۆڵینەوە دەربارەی ڕەوشت

ج – بیرکردنەوەی لە ئەولای سروشت

بیری دیکارت ئەوەیە کە دەڵێ: بۆ ئەوەی بگەیتە ڕاستەقینە دەبێ بۆ جارێکیش بێت هەرچی بیروڕایەکت هەیە تاکو ئێستا تووڕی دەیت و سەرلەنوێ دەست پێ بکەیتەوە.



١٦ – دیۆجینس *Diogene* (٤١٢ – ٣٢٣ پ. ز)

ئەم زانایە بەرامبەر رەوشتی هەڵسان و دانیشتن بێ خەم بووە ژینێکی سادە و بێ ئارایش ژیاوە، هەمیشە لە خەڵك دوور کەوتووەتەوە، بۆ ئەوەیش خەڵکی لێ دوور بێ زۆر جنێو فرۆش و دەم پیس بووە.

١٧ – راسل، برتراند ئەرتور ولیام *Russell* (١٨٧٢ – ١٩٧٠ ز)

پاش تەواوکردنی زانکۆی کەمبریج بوو بە ئەندامی باڵیۆزخانەی ئینگلیز لە پاریس، چەند مانگێکیش لە بەرلین ژیا و گەڕایەوە بەریتانیا لە شاری (ویسلر) لەنگەری خست، بەناوبانگترین نووسینەکانی راسل ئەمانەن:



أ – مێژووی فەلسەفەی رۆژاوا

ب – ئارەزووە تازەکان بۆ دنیای نەگۆڕین

ج – رەخنە لە فەلسەفەی لیبنیتز

د – پاساکانی بیرکاری (ریاضیات)

لەساڵی ١٩١٨دا وتارێکی نووسی دژی شەڕی تریبونال شەش مانگ خرایە بەندیخانەوە، لە بەندیخانەکەدا توانی کتێبێکی بەناوبانگ بنووسێ بەناوی "پێشەکییەك بۆ فەلسەفەی بیرکاری".

راسل بیروڕای لەسەر ئەوە بوو کەوا، لە هەمووشت گرنگتر مەنتیقە و پێی وابوو بە شیکردنەوەی مەنتیق دەتوانین بگەینە مەرزی وردەکاری و "موو لە ماست دەرهێنان".



١٨ – راما کریشنا *Ramakrishna* (١٨٣٤ – ١٨٨٦ ز)

سۆفی و فەیلەسووفێکی هیندستانییە لە بەنگال لەدایك بووە و لە شاری کەلکەتا مردووە. کریشنا لە باوەڕێك دا بوو کە: مرۆڤ نابێت خۆی و ئارەزووەکانی خۆی لەبیر بکات. لە باوەڕێکیش دا بوو کە تەواوی ئاینەکان یەك مەبەستیان هەیە ئەویش گەیشتن بە ڕاستەقینە و حەقە. ئەم زاتە هەتاوەکو لە وڵاتە رۆژئاواییەکانیش دا زۆر کەس پەیرەوی لیکردووە.



١٩ – رەنان *Renan* (١٨٢٣ – ١٨٩٢ ز)

لەسەرەتاوە لە ڕشتەی دین و ئاین دا خۆی خەریك دەکرد بەڵام لەم دواییەدا لێی دوور کەوتەوە و پەنای بردە بەر فەلسەفە و ڕێبازەکانی فەلسەفە. بیروباوەڕی تا ئەندازەیەکی زۆر لە بیروڕای هیگڵەوە نزیك بوو.

ئەرنست رەنان بۆ ئەوە دەچوو کە: ڕەسانەیەتی تێفکرینە، خواش هەر ئەو تێفکرینە رەسەنەیە و ڕاستەقینە لەهەموو شتێك دا هەیە و شاراوەیە بەڵام هەستی پێ دەکرێت. بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەمانەی خوارەوەن.

أ – یادگارەکانی سەردەمی منداڵی و لاوی

ب - دوارۆژی زانیاری



٢٠ – ژان ژاك رۆسۆ *Rousseas . J. J.* (١٧١٢-١٧٧٨ ز)

لەشاری جنیڤا لەدایك بووە، بە منداڵی دایکی مرد و بێ دایك گەورە بوو، یەکێکە لە نووسەرە هەرە گەورەکانی فرانسە، پیاوێکی بە هەست و خاوەن زەوق و سەلیقە دەژمێردرا، بیروڕا و وتەکانی لەگەڵ بیروڕای سەردەمی خۆی دا نەدەگونجا و

تا مەرزی چل ساڵی شتێکی وای نەبوو بۆ وتن. تاوەکو یەکێك لە ئەنجومەنە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمەی فرانسە بیروڕایەکی خستە ناو زاناکانەوە بۆ ئەوەی شتێك بنووسن دەربارەی ئەوەی کە "داخۆ تازەکردنەوەی سەردەمی زانیاری و ئەدەب و هونەر یارمەتی خەڵك گەیاندووە ؟"

رۆسۆ لەم تاقیکردنەوە تێکرایەدا بەشداربوو، یەکەم دەرچوو، گرەوی بردەوە ناوبانگیشی لە تەواوی فرانسەوە و وڵاتەکانی تردا بڵاوبووەوە. رۆسۆ لە باوەڕێك دا بوو کە، زانیاری و ئەدەب بە شێوەیەکە رووکەشانە خەڵك دەرازێننەوە بەڵام دەروونیان پێشێل دەکەن، رەوشتی مرۆڤ بە هەڵەدا دەبەن بەڵام زەوق و سەلیقەیان پێ دەبەخشن. بەکورتی رۆسۆ لە باوەڕێك دا بوو "مرۆڤ دەبێت بە هونەرمەند بەڵام نابێت بە مرۆڤ". بەناوبانگترین نووسراوەکان رۆسۆ ئەمانەن:

أ – دان پێدانان

ب – ئەمیل

ج – پەیمانی کۆمەڵایەتی

٢١- زەنوون دیل *Zenondelec* (٤٧٥ پ. ز)



یەکێکە لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن ئەو بیروڕا و تاقی کردنەوەی زۆری هەجووڵانەوە، لەم ڕووەوە دەڵێت: ئەگەر تیرێك بهاوێژیت تۆ بەچاو دەیبینی و ئاسمان دەدایە بەڵام لە ڕاستیدا ئەو تیرە جێگایەکی گۆتومتەوە و خودی جێگاکردنەوە، واتە وەستاوە و ناجوڵێتەوە.

٢٢- ژان پۆل سارتەر *Sartre .J. P* (١٩٠٥ – ١٩ ز)



زانایێکە فرانسەوییە لە پاریس لەدایك بووە و لە یەکێك لە زانکۆکان دا رشتەی فەلسەفەی تەواو کردووە و بوەتە مامۆستا لە هەمان رشتەدا.

لەساڵی ١٩٣٦ دا چەند وتارێکی نووسی بیروڕای خۆی تێدا دەرخست، لەم دواییەدا ئەو وتارانە کرانە کتێبێك بەناوی "تصور" و لە ساڵی ١٩٤٣ ز دا شانۆییەکی نووسی بەناوی "مێش" بیروڕای نازیسمی هەتك و پێشێل کرد، بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەمانەن:

أ – هەبوون و نەبوون

ب – داوێن پیسی بەڕێز

ج – دیوار

د – بێ ئاگایی

سارتر زۆرتر لایەنگیری بیروڕای فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمان (هایدگر) بوو بەم جیاوازییە کە سارتر واقیعێتی زەمانی بەلاوە گرنگ بووە، هێندەش پابەندی ترس نەبووە کە بنەڕەتی فەلسەفەی (هایدگر)ە.

٢٣- سوقرات *Socrates* (٤٦٩ – ٣٩٩ پ. ز)



فەیلەسووفە بەناوبانگی یۆنان و مامۆستای ئەفلاتونە. باوکی ناوی سوفرونیسکس بووە کار و پیشەی سەنگ تراشە بووە و دایکیشی مامانیی کردووە. سوقرات ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ فەلسەفە و بیروڕاکانی فەلسەفە. شەیدای ڕاستەقینە و مایەداری بوو، هەمیشە لەگەڵ دەستە و کۆمەڵی سوفستائییەکان دا لە گیرە و کێشەدا بوو لەبابەت ڕێبازەکانی ژیان و فەلسەفەی ژیانەوە.. لاوان هەروەکو پەپوولەی دەوری چرا هەمیشە

لە دەوری دەگەڕان و بە سزای ئەوەی کە ڕێزی ئاین ئەو سەردەمەی لانییە دەرمانی خواردیان کرد و کوشتیان.

ڕەوشتی سوقرات بۆ فێرکردن جۆرێك بوو کە مامۆستا پرسیاری بە شێوەییێك لە قوتابیانی دەکرد قوتابی لە وەڵام دا تووشی دەردەسەرییێکی وا نەدەبوو.

سوقرات لە باوەڕێك دابوو کە: مایەداری (فضیلة) واتە زانین، زانینیش بە باس و لێ دوان بەدەست دێت، بۆیە لە فەلسەفەی سوقرات دا دۆزینەوەی باس و لێکدانەوەی ڕاست گرنگییەکی زۆری پێ دراوە.

دەڵێن سوقرات یەکێك لە شێوەکانی ئەوە بوو گاڵتە و گەپی لە دەمەتەقێ (جەدەل)دا بەکاردەهێنا، لەهەمان کات دا ئەو گاڵتە پێکردنە شێوە و ڕەوشتێك بووە بۆ دەرخستنی بیروڕای هەڵە.

سوقرات هەمیشە دەیگوت: من وەکو دایکم وام، ئەو یاریدەی ساوا و کۆرپەی دەدا بۆ ئەوەی بێنە دنیاوە منیش دەروونی مرۆڤ تا بە چاکی بژین لە دنیادا لەگەڵ زانیاریدا.

زۆرتر سوقرات هەر لە ڕەوشت (اخلاق) دەدوا، لەم ڕووەوە دەیگوت: مرۆڤ هەمیشە بە دوای خۆشبەختیدا وێڵ و سەرگەردانە، جا ئەگەر مرۆڤ حەز و هەوەسەکانی خۆی بتوانێت بخاتە چوارچێوەیەکەوە و لغاوی بکات بێگومان خۆشبەختی ئاسانتر بەدەست دێ.. هەروەها لە باوەڕێك دا بوو کە کردەوەی مرۆڤ بەدەست خۆی نییە ئەگەرهاتوو پەیڕەوی لە بیر و لە ژیری (عقل) کرد بێ دەردەسەر چاکی و باشی بەدەست دەهێنێت.

سوقرات دەربارەی خوا دەڵێت: چۆن لە مرۆڤ دا بیر و ژیری هەیە لە دنیادا دیسان ئاوا هێزێك بە تایبەتی کە دەبینین ئەم دنیایە لەسەر یاسایێ سازاوە هەروا لە خۆیەوە دروست نەبووە.



## ٢٤- سپەنسر *Spencer* (١٨١٩ – ١٩٠٣ ز)

وازی لە ئەندازیاری هێنا و دەستی کردە ڕۆژنامەنووسی، لە ئەنجام دا ڕووی کردە دنیای فەلسەفە و لە هەمان کات دا بیروڕای (داروین) بڵاوبووەوە تەواوی کات و توانای خۆی تەرخان کرد بۆ ئەوەی قوتابخانەیێکی فەلسەفی وا بهێنێتە کایەوە کە هەوێنەکەی بیروڕاکەی داروین بێت.

سپەنسەر لە باوەڕێك دا بوو کە هەموو گیانلەبەرێك لە سەرەتاوە ناڕێك و لاسەنگ و خاو بووە کەم کەم لەیەك جیابوونەتەوە، ئاژەڵ پەیدا بووە، مرۆڤە سەرەتاییەکان ئینجا تیرە و کۆمەڵ و نەتەوەکان. بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەمانەن:

أ – چۆنیەتی ژیان ناسین

ب – ڕەوانکاری (علم النفس)

## ٢٥ – سەنیکا *Senepue* (٤ پ. ز – ٦٥ ز)

ئەم فەیلەسووفە مامۆستای نیرۆنی ئیمپراتۆری بەناوبانگی ڕۆما بوو، خەڵکی لە باوڕێك دان کە سەرەتاوە ڕەوشتی جوانی نیرۆن هۆی ڕێنیشان دان و بیروباوەڕی ئەم مامۆستایە بووە، لەپاشان لەسەر فەرمان و داوای نیرۆن ڕەگی دەستی خۆی بڕی و خۆی کوشت.

## ٢٦ – سیسرۆن *Ciceron*

یەکێك لە گەورە پیاوانی ڕۆما و پەیڕەوی زانیاری ئەکادیمی بوو بەڵام لە ڕەوشت دا پەیڕەوی ڕەواقییەکان بووە، زۆرتر لە سەدەی یەکەمی پێش زایین دا ژیاوە.

٢٧ – **شۆپنهاوەر** *Schopenhaur . A* ( ١٦٨٨ – ١٨٦٠ ز )



لەشاری دانتزیك لەدایك بووە باوكی بازرگان و دایكی نووسەر بووە بەڵام دایكی خۆشی نەدەویست و لەدواییدا بەجێیهێشت، ئەو خۆش نەویستنە لە بیروڕایدا بە جوانی دەردەكەوت، لەتەمەنی سی ساڵیدا كتێبە بەناوبانگەكەی نووسی بە ناوی (دنیای خۆپیشان دان و توانا) بەڵام لەسەرەتاوە ئەو كتێبە سەرنجی خەڵكی ڕانەكێشا، هەمیشە گۆشەگیر و تەنیا بوو، باوەڕی بە خەڵك زۆر كەم بوو تا مرد ژنی نەهێنا، لەدوا دوایی ژیانی دا بەناوبانگ بوو، دوای مردنی هێندەی تر ناوبانگی دەركرد.

شۆپنهاوەر دەڵێت: هەست و بیر زانیاری پێك دەهێنن بەڵام راستەقینەی هەموو شتێك نین بەڵكو بەشێكن نەك هەموو، چڵێكن لە درەخت، ئەوەی بنەڕەت و هەموو شتە توانا و ویستە (ئیرادە). توانا و ویستیش نەكو تەنیا راستەقینەی مرۆڤە بەتەنیا بەڵكو راستەقینەی تەواوی گێتییە.

٢٨ – **فلوتین** *Plotin* ( ٢٠٥ – ٢٧٠ پ. ز )

لە بنەڕەت دا خەڵكە رۆما بووە، بیروڕای خۆی لە پەنجا و چوار وتاردا نووسیوەتەوە.

٢٩ – **فیختە** *Fichte* ( ١٧٦٢ – ١٨١٤ ز )



لەیەكێك لە گوندەكانی ئەڵمانیا لەدایك بووە، بە منداڵی قازەوان بوو، لە هەژدە ساڵیدا چووە زانكۆ دوای تەواوكردنی زانكۆ بوو بە مامۆستای تایبەتی ماڵان. بۆ سویسەرە گەشتی كرد، لەگەڵ كچی خوشكەزای (كلوپستك)ی شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانی ئاشنا بوو پاشان مارەی كرد، ئەم ژن هێنانە بوو بەهۆی ئەوەی بكەوێتە تەلاقەوە كە لە رەشتەیەك دا بەناوبانگ بێت. گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا و پەیوەندییەكی فراوانی لەگەڵ بیروڕا فەلسەفییەكانی كانت دا پەیدا كرد و بوو بە دۆست و برادەری ئەو دانایە. هەر بە پەیڕەوی بیروڕای كانت دەستی كردە نووسینی مەسائلی فەلسەفی (كانت)یش لە ڕووەوە زۆر یاریدەی دا. لەئاكام دا كرا بە مامۆستای زانكۆ لە شاری (ینا) لە ئەڵمانیادا.

ساڵی ١٨١٤ تووشی نەخۆشییەك بوو كە لە نەخۆشەكانی شەڕەوە تووشی هاتبوو، هەر بەو نەخۆشییە لە پەنجا و دوو ساڵیدا مرد. بەناوبانگترین نووسینەكانی ئەمانەن:

أ – مافە خۆرسكەكان

ب – سەرنویشتی مرۆڤ

ج – لێدوان لە زانیاری

٣٠ – **كۆنفۆشیوس** *Confucius* ( ٥٥١ – ٤٧٩ پ. ز )



یەكێكە لە بەناوبانگترین فەیلەسووف و داناكانی چین، لە چل و حەوت ساڵیدا هاتە مەیدانی نەدەبەوە و بە ئاسانی توانی بیروباوەڕی خۆی بە میللەتی چین بسەلمێنێت، زانیارییەكانی كۆنفۆشیوس لەسەر پێنج پایە وەستان:

أ – پەیوەندی ژن و پیاو.

ب – پەیوەندی باوك و كوڕ.

ج – پەیوەندی دۆست و گەورەتر.

د – پەیوەندی دۆست و بچووکتر.

پەیوەندی برای بچووکتر و برای گەورەتر.

ه – پەیوەندی کرێکار و خاوەن کار.

بەپێی بیروڕای کۆنفۆشیوس لە دنیادا دوو گیان هەیە گیانی سوود بەخش و گیانی زیان دار، سوود بەخش بەناوی (شن) و زیان دار بەناوی (کویی).

تاکو ئێستاش پەیڕەوانی ئەم دانایە لە چوار سەد ملیۆن زۆرترە.



**٣١ – مارکس** *Marx . K . H .* (١٨١٨ – ١٨٨٣ ز)

یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی ئەڵمانیا لە مەیدانی ئابووری و فەلسەفە و سیاسەت دا بەناوبانگترین کتێبە بەناوی (سەرمایە) بووەوە بەلایەنگیری سەرسەختی کرێکاران دەژمێردرێت.



**٣٢ – مالبرانش** *Malebranche* (١٦٢٨ – ١٧١٥ ز)

لەپاریس لەدایک بووە. لەپێش دا بووە بە قەشە، یەکێک بووە لە پەیرەوانی دیکارت. نووسەرێکی زەبر بەدەست بووە، یەکەمین کتێب کە نووسیویەتی ناوی (بەدوای راستەقینەدا) بووە، ئەم دوو کتێبەش لە کتێبە بەناوبانگەکانی ئەون:

أ – ئەندێشەکانی مەسیحیەت

ب – لێدوان دەربارەی ئەولای سروشت

مالبرانش بیروڕای خۆی زۆرتر لە دیکارتەوە ئیلهامی وەرگرتووە، بەڵام زۆریش عاشقی بیروباوەڕی ئەفلاتۆن بووە، هەتاوەکو بە ئەفلاتۆنی مەسیحی ناونراوە. مالبرانش دەڵێ: هۆی هەرە گەورە گوناح و بەهەڵەدا چوون ئەوەدیە کە مرۆڤ گیان (روح) و ژیری (عقل)ی گرفتاری پێویستی و نیازەکانی لەشن و لێرەدا لەش و ئارەزووەکانی لەش بیر و گیان بەهەڵەدا دەبەن.

**٣٣ – مەترلینك** (١٨٦٢ – ١٩٤٩ ز)

نووسەرێکی بەلجیکییە، سەرباری نووسەری بە شانۆیی نووس بەناوبانگە و لایەنگر و سەرامەدی ڕێبازی (سامبولیسم)ە (رەمزییەت) لە ئەدەب دا.

**٣٤ – مۆنسکیۆ** *Montesquieu* (١٦٨٩ – ١٧٥٥ ز)

یەکێکە لە زاناکانی فرانسە و لە بنەماڵەیەکی ناسراو لە شاری (بوردو) لەدایك بووە، لەتەمەنی چل ساڵیدا وازی لە کاربەدەستیی دەوڵەت هێنا و دەستی کردە دنیا گەڕان و نووسین و لێکۆڵینەوە. نووسینە بەناوبەنگەکانی ئەمانەن:

أ – نامەکانی ئێران

ب – فەلسەفەی مێژوو

ج – هۆی بەرزی و بڵندیی رۆمەکان

بەڵام کتێبی (گیانی یاساکانی)ی مۆنتسکیۆ دوای لێدوانەکانی ئەفلاتۆن و ئەرستۆ بەناوبانگترین کتێبە لەبارەی یاسا و مەرجەکانی یاساوە.

مۆنتسکیۆ لە باوەڕێك دا بوو؛ لەبەر ئەوەی مرۆڤ چارەی نییە دەبێت لەگەڵ دا بژین و پێکەوە تێکرا لەگەڵ یەك دا بن جا دەبێت پەیوەندییان لەگەڵ یەك دا بەپێی مەرجەکانی یاسا بێت، ئەو یاسانە نووسراو بێت یان مەرج و رەوشتێکی نەتەوایەتی بێت.

٢٥ – نیتچە *Nietzche . F.*



فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، لەبنەماڵەیەکی پرۆتستانت لەدایك بووە، لەپێشا باوکی ویستی بیکات بە قەشە بەڵام وازی لە ئاین و دەرسەکانی ئاین هێنا و دەستی کرد بە فێربوونی زمانی یۆنانی و زانیاریی ئەدەبی، دوای ماوەیەك بوو بە مامۆستای زانکۆی شاری (بال).

بەناوبانگترین نووسراوەکانی ئەمانەی خوارەوەن:

أ – زەردەشت وای دەگوت

ب – داخوازیی توانا

شێوەی روون کردنەوەی نیتچە نەختێك سەخت و گرانە، چونکە بە رەوانبێژییەکی شاعیرانە و پارچە پارچە نووسیویەتی. نیتچە لە باوەڕێك دا بوو کە: خۆپەرستی هەقێکی ڕەوایە و بەزەیی بەبێ توانایی کرێت و ناشیرین هاتووتە بەرچاو. نیتچە لە لاویدا هەمیشە ناساغ بوو، لە دوادوای ژیانیشیدا بۆ ماوە پانزدە ساڵ شێت بوو. زۆر حەزی لە شیعری حافزی شیرازی دەکرد و لە زۆر نووسینەکانی خۆیدا باسی ئەو شاعیرە مەزنەی کردووە.



٣٦ – ڤۆلتێر *Voltaire* ( ١٦٩٤ – ١٧٧٨ ز)

ژان فرانسوا ماری ئاروونە ناوی راستیی ڤۆلتێرە بەڵام ئەو ناوی ڤۆلتێری لەخۆی نا و بەو ناوەوە ناوبانگی دەرکرد. ناوباوی ڤۆلتێر لە سەدەی هەژدەدا لە هەموو کەس لە دنیادا زۆرتر بوو؛ ڤۆلتێری شاعیر، شانۆیی نووس، مێژووزان، داستان نووس و فەیلەسووف. زۆرتر ناوباوەکەی بەبۆنەی چۆنیەتیی وتووێژەوە بوو لەگەڵ بەرامبەرەکەی بە شێوەیێکی تێکەڵ لە گاڵتەپێکردن. دوژمنی هەرە گەورەی کڵێسا و ئاینی مەسیحیەتی بوو. هەر لەیەك کات دا خۆشەویسترین و ناحەزترین نووسەری ئەم سەردەمە بوو. ڤۆلتێر لە باوەڕێك دابوو کە: ئەگەر بە شێوەیێکی وردەکاری سایکۆلۆجییەت بەکاربهێنرێت هەموو شتێك لە مرۆڤ و سروشت دا شیاوی روون کردنەوەیە و تەواوی شاراوەکانی دوور لە ڕاستی و نهێنییەکانی تاریکی و دواکەوتن و دوایی پێ دەهێنرێت.



٣٧ – هیگڵ *Heggel* ( ١٧٧٠ – ١٨٣١ ز)

هاوزەمانی فیختە بوو، لەسی و حەوت ساڵیدا یەکەمین بیروڕای فەلسەفیانەی خۆی بڵاوکردەوە، لە زۆر شاری ئەڵمانیا دەرسی وتەوە، لە چل و هەشت ساڵیدا بوو بە مامۆستای زانکۆی بەرلین لە جێگای فیختە.

بەناوبانگترین نووسراوەکانی ئەمانەن:

أ - زانینی نیشانەکانی گیان.

ب – زانستی مەنتیق.

ج – فەلسەفەی حقوق.

بیروڕای هیگڵ وابوو کە رەسەنیی ژیری هەموو شتە.

١ - ئۆروپا *Europe*

کچە شازادەی وڵاتی فینیقییەکان بوو زەیۆس خۆی بردە شێوەی گایەکەوە و لەگەڵیدا دروس بوو، لەبەری ئەو دروس بوونە "مینیۆس" هاتە دنیاوە.

٢ - ئەپۆلۆن *Apollo*

یەکێکە لە خواکانی ئۆلۆمپ کوڕی زەیۆسە، خوای دەرمان و یارمەتی و تۆڵەسەندن و مۆسیقا و هەڵبەست بوە، لە یۆنان دا کە پەیکەری ئەم خوایەیان دەتاشی پەیکەرەکانی لە ئەندازە بەدەر جوان تاشاو و لەش و لارێکی ڕێك و جوانێکی تا بڵێی جوان و ئێسك سووك و ڕەزا شیرین دراوەتە قەڵەم، هەرگیزیش لە دەموچاوی دا موو دەرنەدەچوو، هەتا بڵێی بە هێز و توانا بووە، هەمووەدەم تیروکەوان و کوتەکی گاوانی و ئامرازی مۆزیقا (کە چەنگە) پێی بووە، دەشڵێن خۆی ئەم ئامرازە مۆزیقایەی دروست کردووە.

٣ - ئەتریۆس *Atree*

پاشای میسنا بوو کوڕی پلوپس بوو بە کینە و ڕق لە دڵییەکی زۆر بەناوبانگە، شێوەی تۆڵەسەندنەوەکەشی لە براکەی لە ئەفسانەکانی یۆنان دا بەناوبانگە؛ کەوا چۆن دوو کوڕی براکەی خۆی کوشت و گۆشتەکەی ئەوانیشی لە میوانداریییەك دا دەرخواردی باوکیانی دا. بەڵام ئەکیستوسی کوڕی بچووکی تیتس تۆڵەی براکانی کردەوە و ئەتریۆسی کوشت.

٤ - ئاتنا *Athena*

خواوەندگاری دانایی (حیکمەت) بوو، هەروەها پاسەوانی شاری (ئەتینا)، هەمیشە کڵاوزرێکی لەسەردا بوو، قەڵغانێکی بەدەستەوە بوو لەگەڵ کەللەسەری میدوسادا. ئاتنا کچی خوای خواکان بوو.

٥- ئەدمتۆس *Admetus*

لە میتۆلۆژیای یۆنان دا خوای شاری (تسالی) بوو. سەردەمێك ئەپۆلۆن خزمەتکاری ئەدمتۆس بووە، ژنەکەی ئەمیان ژیانی خۆی بەخشی تا مێردەکەی بۆ هەتا هەتایی نەمر بێت. هەرکول "هرقل" توانی ئەو ژنە لە خوای دنیای تاریکی کە "هایەس"ە ڕەزگار بکات.

٦ - ئاراکنە *Arachne*

کچێك بوو بە جادووی (ئاتنە) بوو بە جاڵجاڵۆکە.

٧ – ئارتاسوسا *Arethusa*

یەکێکە لەو پەرییانەی کەوا "ئەلفیوسن" عاشقیان بوو، بەلام ئارتمیس ئەو پەرییەی گۆڕی و کردی بە کانی و ئەلفیوس کە خوای رووبار بوو خۆی گەیاندێ.

٨ – ئارس

لە میتالۆژیای یۆنان دا بە خوای شەڕ بەناوبانگە، کوڕی هیرا و زەیۆس بوو، هەروەها مێردی ئەفرۆدێت بوو، لە شەڕە بەناوبانگەکەی تەروادەدا لایەنگیری خەڵکی تەروادە بوو.



٩ – ئەرتمیس *Artmis*

یەکێکە لە کەڵە خواکانی ئەفسانەکانی یۆنان، کچە زەیۆس و خوشکی ئەپۆلۆنە، بەخوایراووشکار بەناوبانگ بوو. خۆی و کەنیزەکەکانی هەموو کچ بوون، واتە شوویان نەدەکرد.



١٠ – ئاریان *Arian*

کچی مینۆس وپاسیفە و خوشکی فیدەر Fhedre ، دێوێک دیل ودەست بەسەری کردبوون لەناو ئەشکەوتێك دا، بەیارمەتی (تزە) توانی لەو ئەشکەوتە رزگاری بێت وتزە لە دوورگەی " تاکسۆس" بەرەڵلای کرد.

١١ – ئاریستیۆس *Aristee*

کوڕی ئەپۆلۆن و سیرن، خوای کشتوکاڵ بوو، خەڵکی فێری ڕواندنی دارمێو کرد لەگەڵ بەخێوکردنی مێش هەنگ دا.



١٢ – ئەشیل *Achille*

نموونە دلێری و ئازایی و کوڕی تەتیس و پلە بوو، یەکێکە لە قارەمانانی بەناوبانگی ئەفسانەکانی یۆنان؛ ئەم قارەمانە (روبین تەن) واتا کەس نەکوشتوو بوو تەنیا لە باژنەی پێیەوە نەبێت نەدەمرد. ئەوەبوو تیرێکە ژەهراوی پاژنەی پێی ئەنگاوت و کوژرا.



١٣ – ئاژاکس *Ajix*

ئازایەکی بەناوبانگی شاری تەروادە بوو رۆژێکی تەواو لەگەڵ هیکتۆردا بە یەك دا هاتن و شەڕیان کرد.

دوای کوشتنی ئەشیل، لەسەر شیرەکەی ئەشیل لەگەڵ "ئۆلیس" بەشەرهاتن، بەلام دەرەقەتی ئۆلیس نەهات و سەرنەکەوت، ئەوجا لە داخا خۆی کوشت.



**١٤ – ئارژی**

یەکێك بوو لە دێوەکان، هەرچی ئاو هەبوو هەڵیلووشی و بەسەر لوتکەی چیایەکەوە دانیشتن.. ئەندرا پەلاماری دا و بەشەڕهاتن، لەئاکام دا بەدەستی ئەندرا کوژرا، هەرچی ئاویش لە زگیدا هەبوو دەریهێنایە دەرەوە.

**١٥ – ئاکەلۆوس *Achelous***

خوایەك بوو لە خوایەکانی ڕووباران.

**١٦ – ئاگامەمنوون *Agamemnon***

کوڕی ئەترە *Attree* و برای مەنیلاوس *Menelas* بوو کلتینەستری *ClytenNestie* خوشکی (هیلین)ی مارەکرد لەبەر ئەوەیش کە کوڕێکی خۆی (ئیفی ژن) ناوی کردە قوربانیی خوای با لەلایەن ژنەکەیەوە کوژرا.

**١٧ – ئەمفیتریون *Amphtryon***

کوڕی ئالسە بوو پاشای تیرنت مێردی ئالکمن. زەیۆس توانی ئالکمن هەڵ خەڵەتێنێت و لەگەڵی دروس ببێ، لەئەنجام دا "هراکلس" هاتە دنیاوە.



**١٨ – ئاسترە *Astree***

کچی زەیۆس و تمیس بوو، لەسەردەمی زێرین دا لەناو پیاوان دا دەژیا، دوایی بەرەو ئاسمان چوو، لەناو ئەستێران دا بوو بە گوڵەگەنمێك لەوێ مایەوە.

**١٩ – ئالستیس *Alceste***

ژنی ئادمت و کچی بلیاس بوو، بۆ ڕزگارکردنی مێردەکەی خۆی کردە قوربانیی هراکلس و چووە دۆزەخ تا ڕزگاری بکات.

**٢٠ – ئامۆن *Amon***

خوای میسرییەکان بوو، دوای مارەکردنی خوای هەتاو ناوی "ئامۆن ڕاع" ی لەخۆی ناو لەناو شاری (کارناك)دا پەرستگاییێکی هەرە گەوردیان بۆ دروست کردبوو.



**٢١ – ئانتیگۆن *Antigone***

لە ئەفسانەی یۆنان دا کچەکەی ئۆدیب کە چاوساغی باوکە کوێربووەکەی بوو، لەبەر ئەوەیش پێی فەرمانی "کرێون" لەشی براکەی ئەنێژا زیندە بە چاڵیان کرد.



**٢٢ – ئامەزۆن *Amazones***

لە ئەفسانەكانی یۆنان دا باسی ئەو كۆمەڵە ژنە دەكرێت كە دانیشتووی قەراغی دەریای رەش بوون و لەپێناوی خاك و وڵاتی خۆیان دا ساڵانی دوورودرێژ لەگەڵ یۆنانییەكان دا شەڕیان كردووە.



**٢٣ – ئاندرۆماك *Andromache***

دایكی ئاستیاناكس و ژنی هیلكتۆر بوو، لە ئیلیازددا بە نموونەی عیشق و ژن و مێردایەتی ناودەبرێت.

**٢٤ – ئانو بیس *Anubeas***

لە ئەفسانەی كۆنی میسریدا خوای گۆڕستان و كوری ئوزیریس بووە، شێوەی روخساری لە چەقەڵ دەچوو.

**٢٥ – ئەیۆس *Eos***

دایكی باو ئەستێران بوو، بە بەرەبەیان ناودەبرا ژنی تیتۆنۆس و خوشكی هلیۆس بوو، هەموو رۆژێك بەردو دەریاكان بەرێدەكەوت و لە ئاسمانەوە سەری دەردەهێنا.

**٢٦ – ئایوفرۆسین *Euphrosyne***

یەكێك بوو لە سێ خواكانی بەزەیی.

**٢٧ – ئایومەنیدس *Eumendies***

یەكێكە لە خواكانی تۆڵەسەندنەوە لە ئەفسانەكانی یۆنان دا، خواكانی تۆڵە لە شێوەی سێ كچی باڵداردا بوون و پرچ و كەزییان لەباتی موو مار بووە.

**٢٨ – ئەبولهەول *Abo-Lhawl***

لە ئەفسانەكانی میسریدا ئەبولهەول درندەیەك بووە سەری مرۆڤ و لەشی شێری هەبوو، میسرییە كۆنەكان بۆ رێزلینانی ئەم فریشتەیە لە (جیزە) پەیكەرێكی زەلامیان لە بەرد تاشیوە كە درێژایی ٢٩ مەتر و بەرزییەكەی ١٧ مەترە.



### ٢٩ – ئادۆنیس *Adonis*

یەکێك بوو لە خواکانی فینیقی، بەرازێك بریندار کرد. ئەم خوایە گەلێك جوان خاس بوو، ئافرۆدیت گۆڕیی و کردی بە گوڵاڵەیەك.

### ٣٠ – ئۆدیب *Oedipe*



کوڕی پاشای تیس بوو کە ناوی لایۆس بووە، دوای لەدایك بوونی ئۆدیب باوکی بردی و خستییە سەر چیای ستیرون، پاشان شوانان ئەم منداڵەیان دۆزییەوە و بردیانە لای پاشای (کرنت)، پاشاش منداڵەکەی گەورە کرد، کە گەورە بوو لە وڵاتی کرنت دەرچوو، لەڕێدا تووشی باوکی خۆی بوو بێ ئەوەی بزانێ کە باوکییەتی کوشتی. پاشان ڕێی دەکەوێتە شارەکەی باوکی و لەبەر ئەوەی پەیمان درابوو هەر کەسێك "ئەسفەتکس"ی کوشتوو بێت دەکرێت بە پاشا. ئەسفەتکسیش لەلایەن ئۆدیبەوە کوژراوە و بۆیە کرا بە شا و شاژنیشی مارەکرد کە دایکی خۆی بوو. دوای ئەوەی لە ڕاستیی گەیشت و مەسەلەکە روون بووەوە، دایکەکە خۆی هەڵواسی و خۆی کوشت و ئۆیبیش هەر دووچاوی خۆی هەڵ کۆڵی و وڵاتەکەشی بەجێهێشت.

### ٣١ – ئاردیبهیشت


ئاردیبهیشت

فریشتەیەکی ئەفسانەکانی ئێرانە، فریشتەی خاوێنی و پەرستن و پاسای خوای ئاهورەمزدا بوو. لەسەر زەویش ئاگرپارێز بوو.

### ٣٢ – ئافیۆس *Apphe*



کوڕی ئاگر پاشای تراکیەیە، داستانێکی تر دەڵێ کە گوایا کوڕی ئەپۆلۆن و کلیو بووە. یەکێك بووە لە هەرە مۆزیقازانە بەناوبانگەکان. ئاهەنگەکانی بە ئەندازەیێك دڵگیر و شیرین بوون هەتاوەکو دڕندەش مات و جادوو لیکراو دەبوون.

لە رۆژی ژن هێنانیدا مارێك "ئوربدیس"ی ژنی گەزت و کوشتی. ئەویش بۆ ئەوەی ژنەکەی لە دۆزەخ ڕزگار بکات بەرەو دۆزەخ کەوتەڕێ، بە جادووی ئاواز و ئاهەنگی خۆش خۆشی توانی کاربەدەستانی دۆزەخ رازی بکات و ژنەکەی بدەنەوە بە مەرجێك تا لە دۆزەخ دەردەچێت لانەکاتەوە بنوارێتە ژنەکەی، خەریك بوو لە دۆزەخ دەردەچوو بۆ ئەوەی بزانێت ژنەکەی بە دوایەوەتی یان نا ئاوڕێکی دایەوە، ئەمە بوو بە هۆی بەدی نەهاتنی مەرجەکە و ئەویش سەری تێدا چوو.

### ٣٣ – ئارۆس *Eros* یا "کیوپیو"


ئارۆس

خوای عیشقی یۆنانییەکانە بەشێوەی لاوێکی باڵدار نیشان دەدا، لە ئەفسانەکانی رۆمان دا بە شێوەی منداڵێکی تیر و کەوان بەدەست.



**٢٤ – ئۆزیریس *Osiris***

یەکێکە لە خواکانی میسریکۆن پارێزەری مردووانە و مێردی ئیزیس و باوکی هوروس بووە.

**٢٥ – ئەژدیها *Dragon***

جانەوەرێکی ئەفسانەیی زۆر زل و زەلامە تەنانەت توانیویەتی هەڵ فڕێت و لە زۆر شت تێکەڵ بووە دەست و چڕنووکی شێر، کلکی مار، ئاگر لە دەمییەوە دەهاتە دەرێ، ئەم جانەوەرە ئەفسانەییە لە زۆر ئەفسانەکانی میللەتانی کۆن دا هەبووە، هەتاوەکو لای بابلییەکانیش. ئەم جانەوەرە "ئارمی" واتا دروشمی ئیمپراتۆری چین بووە و دەشیان پەرست. هەروەها دروشمی ولاتی وێلزیشە لە دورگەکانی بریتانیا. کوشتنی ئەژدیها لە ئەفسانەکانی دا تەنیا بەدەستی پاڵەوانە بەناوبانگەکان دەکرا و هەموو کەس توانای ئەژدیها کوشتنی نەبوو.

**٢٦ – ئیژە *Egee***

کوڕی پاندیون پاشای ئەثینا بوو، لەبەر ئەوەی وای دەزانی کوڕەکەی (تزە) لەلایەن ئەرە گەورێکەوە قووت دراوە لەداخا لە دەریایەك دا خۆی خنکاند و ئەو دەریایەش تاکو ئێستا هەر بەناوی ئەوەوە ناونراوە دەریای ئیجە.



**٢٧ – ئاژیست *Egisthe***

یەکێك بوو لە خواکانی یۆنان بە داوێن پیسی و هەوەس بازی و مرۆڤ کوژی بەناوبانگ بوو، کوڕی تیستەس و دایکی ناوی پلوپیا بوو.

**٢٨ – ئەسیندارمز**

فریشتەی نێوان دروست بووەکان و دروست کراوەکانە، نوێنەری ئاهورامزد و نموونەی سەیر و سازگارییە.



ئەسیندارمز

**٢٩- ئەسفندیار**

یەکێکە لە پاڵەوانە ئەفسانەییکانی ئێران، کوڕی گشتاسپی پاشای کیانییە، بەدەستی زەردەشت روبین تەن کرا کە کەس ناتوانێت بیکوژێت. بەڵام خاڵی لاوازی بەدەنی هەر دوو چاوەکانی بوو. ئەوەبوو رۆستەم تیرێکی دووفلیقانەی هاوێشتە هەر دووچاوی و کوشتی.

٤٠ – ئەسكلیپیۆس

کوڕی ئەپۆلۆن و خوای پزیشکیی یۆنانییەکان بووە، هەتاوەکو مردووشی زیندوو دەکردەوە، لەبەر ئەوەی مردوویێکی زۆری زیندووکردەوە "هادس"ی خوای دۆزەخ لای زەیۆسی خوای خوایان سکاڵای لەدەست کرد. زەیۆس گەلێك لە کرداری ئەسکلیپیۆس تووڕە بوو، بۆیە بە هەورە تریشقە کوشتی.



٤١ – ئشتاد

فریشتەییێکی مێگینە بووە لە دینی زەردەشت دا.

٤٢ – ئەتلەس *Atlas*

کوڕی کلیمن و ژاپە بوو، سێ کوڕی هەبووە بەناوی هیادس، پلیادس و هسپرید. قارەمانێکی ئێجگار بە توانا و زەلام بوو لەگەڵ زەیۆس دا بەشەڕهات و زۆری لیکرا کە دنیا بە کۆڵەوە بگرێت.

٤٣ – ئەکۆ *Echo*

پەرییەك بوو هیرای ژنی زەیۆسی سەرگەرم دەکرد تا لە عیشقبازییەکانی زەیۆس بێ ئاگای بکات.

٤٤ – ئایریس *Iris*

خواوەندی هەسوونە زەرینە (پەلکە زێڕینە) و پەیك و نامەبەری خواکان و چارەکەری گیانی دۆزەخییان بوو.




٤٥ – ئایندرا *Indra*

خوای ئاسمان و تۆفان و لێمشت.

٤٦ – بەعل *Baal*

خوای میللەت سامییەکان بوو بەتایبەتی لە وڵاتی سووریا و فەلەستین دا بە (بعل فغو) یان (بعل زیوب) بەناوبانگ بوود. بۆ ستایشی ئەم خوایە هەمیشە مرۆڤیان بۆ کردۆتە قوربانی.

٤٧ – بلەروفۆن *Pellerophon*

کوڕی یوزیدوونە، یەکێکە لە قارەمانانی ئەفسانکانی یۆنان، بە ناچاری براکەی خۆی کوشت و پەنای بردە بەر شازادەییێك.. ژنی ئەم شازادەیە بوختانی بۆ هەڵبەست ئەویش وڵاتی بەجێهێشت.

٤٨ – باکانت *Bacchantes*

لە ئەفسانەکانی یۆنان دا بەو ژنانە دەڵێن وا خەریکی پەرستنی باکووس بوون، شێوەی پەرستنەکەشیان هەمیشە تێکەڵ بە رابواردن و مۆزیقا بووە.




٤٩ – باکووس *Bacchus*
خوای خواردنەوە و شەراب و ئاووس بوون.

٥٠ – بەس *Bes*
یەکێکە لە خواکانی میسری کۆن، پارێزەری سەما و مۆزیقا و رابواردن بوو، کوڵە باڵا و پان و پۆڕ بووە.

٥١ – پرسەیووس *Perseus*
کوڕی (زەیوس)ە، پاشای ئەرگوس لەوە دەترسا کە پرسەیووس گەورەبێت بیکوژێت، چونکە فاڵ گیرەوەکان وایان پێ گوتبوو، بۆیە پرسەیووسی خستە ناو سندووقێکەوە و بە دەریای دادا، پاشای دورگەی سریفۆس رزگاری کرد و بەخێوی کرد، دوای ماوەیێك داوایان لە پرسەیووس کرد دەبێت میدۆسا بکوژێت و سەر بهێنێتەوە، ئەویش توانی میدۆسا بکوژێت و سەری ببڕێت.

٥٢ – پروزوپین *Proserpine*
شاژنی خوای دۆزەخ بووە لە ئەفسانەکەی یۆنان دا.



٥٣ – پرۆمیثوس *Promethees*
یەکێکە لە قارەمانەکانی یۆنانی کۆن، لەبەرئەوەی دەسکێ گڕمناگری لە مەڵبەندی خواکان دا دزی و دایە مرۆڤان و چۆنییەتی کەڵك لێ وەرگرتنی فێرکردن، زەیۆسی خوای خوایان لە تاوانی ئەم کارەدا لە کەژێکی بەرزی وڵاتی قەفقازیادا بە زنجیر بەستییەوە و فەرمانی دا هەموو رۆژێك هەڵۆیەك جەگری دەربهێنێت و بیخوات، بەشەو دووبارە جەرگی دەهاتە جێی خۆی. ئەم ئێش و ئازارە هەروا بەردەوام بوو تا لەدواییدا پرومیتوس رزگاری بوو.
لە ئەدەبیاتی دنیادا پرومیتوس بە دۆست و لایەنگیری مرۆڤ ناسراوە و بەرهەمێکی زۆر بەناوی ئەوەوە ناونراوە، ناودارانی وەکو ئاشیل، گوتە، بایرون، شیللی، ریلیپف و پیتهۆڤن بەرهەمیان بەناوی ئەوە ناوناوە.




٥٤ – پلوتۆن *Pluton*
لای رۆمانەکان خوای دۆزەخ بووە، بەلای یۆنانەکانیشەوە (هادس)ی ناوبووە.

٥٥ – پۆزەئیدۆن *Poseidon*
کوڕی کرونوس و رئا بوو خوای دەریا و ئۆقیانووسان.

٥٦ – دان *Dan*
ناوی پاشا ئەفسانەییکانی دانیمارك و بە باپیرە گەورەی تەواوی میللەتی دانیمارك دەژمێردرێت.

٥٧ – دانائوس *Danaus*

له ئەفسانەکانی یۆنان دا دانائوس لە پێشا پاشای میسر بووە، دوایی بووە بە پاشای ئەرگوس. ئەم زاتە پەنجا کچی هەبووە، براکەشی پەنجا کوڕی هەبووە هەر پەنجا کچەکەی دا بە برازاکانی بەڵام کچەکانی هان دا مێردەکانی خۆیان بکوژن. هەموویان بە گوێی باوکیان کرد تەنیا کچێکیان نەبێت بەناوی "هوپرمنستر" کە کێردەکەی خۆی نەکوشت و لە ئەنجام دا هەر ئەو تەنیا زاوا توانی تۆڵەی چلونۆ براکەی لە خەزووری بکاتەوە و بیکوژێت.



٥٨ – دیانا *Diana*

خواییێکە لە خواکانی میتولۆژیای رۆمەکان، کچی ژۆپیتێرە دایکی ناوی (لاتون)ە، خوای مانگ و دار و درەخت و ئاژەڵ بووە، رۆمانەکان بە نیشانەی کچێکی شوونەکردووەوە ناسیویانە، بۆ ئەم مەبەستەش لەشاری رۆما پەرستگایان بۆ کردووە.

٥٩ – دیۆمیدس *Diomedes*



پاشای تراکیە بووە، بەدڵ رەق و خوێن ڕێژ بەناوبانگ بووە، ئەسپەکانی خۆی فێری خواردنی گۆشتی مرۆڤ کردبوو هەر بە گۆشتی مرۆڤ بەخێویانی دەکرد. دیۆمیدس بە دەستی هەرکول "هرقل" کوژرا.

٦٠ – رۆستەم



گەورەترین پاڵەوانی ئەفسانەی ئێران کوڕی زاڵ و رودابە بووە، دەورانی ژیانی لە سەردەمی مەنوچهردوە دەست پێ دەکات تا دەورانی بەهمەن، دێوسپیی کوشت و کەیکاوسی رزگار کرد.. ئەفسانەکانی (شانامە) دەربارەی ئەم پاڵەوانە دەڵێت: دە دایەن شیری دەدایە کە ساوا بوو. کە گەورەش بوو کاتێك بەڕێوە دەڕۆیشت هەر دوو پێی بە زەوی دا چەقی، بە ئەندازەی دە کەس نانی دەخوارد، ئەسپەکەی (رەخش)ی ناوبوو ئەسفەندیار و سوهرابی کوڕی بە دەستی خۆی کوژران. لەلایەن براکەیەوە (شغاد) بە فێڵ کەوتە ناو چاڵێکی پڕ لە نیزەی دا چێنراوی ناوچاڵەکە.

٦١ – زەیۆس *Zeus*

لە ئاینی یۆنانی کۆن دا خوای خواکانە و کوڕی کرونوس و (رئا)یە مێردی هیرای خوشکی خۆی بووە. بروسکە و هەورە تریشقە و بارانی لەژێر فەرمان دا بووە، زەیۆس نزیکەی حەوت سەد ناوی هەبووە و ئەفرودێت، ئارتمیس، هیرمس کچ و کوڕی ئەون.




٦٢ – زالی کوفە

ئەو پیرەژنەیە کە دەڵێن تۆفانی نووح سەرەتا لەناو تەنوورەکەی ئەوەوە دەستی پێ کردووە.

٦٣ – ژۆپیتر *Jupiter*

کوڕی ساتورن و (رئا) بووە لە میتۆلۆژیای رۆمانەکان دا لە ئەفسانەکانی یۆنانیش دا یەکێك بووە وەك زەیۆس.

٦٤ – ژونوو *Junon*

خوای رووناکی و ئاسمان و ژن و مێردایەتی بووە لە ئەفسانەکانی رۆمانـەکان دا، ژنی ژۆپیتر لە هەمان کاتیشدا خوشکی بووە، بێ گومان لە ئەفسانەکانی رۆمان دا ژونوو وەکو هیرای یۆنان وا بووە.

٦٥ – ساتی *Sati*

فریشتەیەکە هیندییەکان باوەڕیان پێی هەبووە و مێردی (شیوا) بووە. لەبەر ئەوەی باوکی شیوا بە کەم ڕێزی و چاوی سووك لە ساتی دەنواڕی خۆی سووتاند.

٦٦ – ساتیر *Satyre*

خواێکی یۆنانە، بە دڵ ڕەق بەناوبانگ بووە، هەمیشە خەریکی نەی لێدان بووە.

٦٧ – ساردا ناپال *Sardanapale*

بەپێی ئەفسانەکانی یۆنان پاشای ئاشوور بووە و زۆر حەزی لە ڕابواردن کردووە، مادەکان دەوری شارەکە دەگرن و لەئاکام دا کۆشك و تالارەکەی خۆی دەسووتێنێت.

٦٨ – سامسۆن *Samson*

پاڵەوانێکی مێژووی کۆن بووە، زۆر بە هێز و توانا بووە تەواوی هێـز و توانـای لـە پـرچ و قژیـدا بووە. ژنێك بەناوی دەلیلە لەخەودا پرچی هەڵپاچی، ئنجا لایەن دوژمنانییەوە بەردەست کرا.

٦٩ – سراپیس *Sarapis*

یەکێکە لە خواکانی میسری کۆن، پەرستگایێکی گەلێك مەزنی بۆ دروست کراوە.

٧٠ – شیڤا *Civa*

خوایەکە لە خواکانی هیندستان، نیشانەی رووخانـدن و هـەر لـەو دەمیش دا وەچـەنانەوە و زاتـە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هیندییەکان لە باوەڕێك دا بوون کە دروست کردن و تێك دان شان بە شانی یەك هاتوون و دەچن، گونـاحی لـەدایك بـوون دەبـێ بـە مـردن وەلام بدرێتـەوە، لەهـەمان کـات دا لـە دایـك بـوونێکی تر ناکامییەکە بۆ مردن، ئیتر هەر بەم جۆرە وەکو تەرازوویەکی دەق بەدەق وەهایە. شیڤا پەرستن لە هیندستان دا ئاینێکی گەلێك کۆنە و تا ئێستاش پەیڕەوانێکی زۆریشی هەن.

٧١ – زوحاك "ئاژی دهاك"

پاشایەکی ئەفسانەییە دوای جەمشید لە ئێران دا فـەرمانڕەوایی کـرد کـوڕی (مـرداس) بـوو، ئەهریمەن خۆی گـۆڕی و لـە ڕواڵـەتی گـەنجێك دا بـوو بـە چێـشت کـەری زوحـاك، وردە وردە فێـری گۆشـتی هـەموو چوارپێیەکی کرد، کەم کەم خووری دڕندەیی و خوێن ڕێژی لە بیر و دەروونیدا بەهێزکرد. ڕۆژێك ئەهریمەن هەردوو شانی زوحاك ماچ کرد و گوم کرد دەست بە جێ دوو مـار لەسـەر هـەردوو شـانی زوحـاك پەیدابوون. هەرچی پزیـشك هـەبوو نـەیانتوانی دەردەکـەی دەرمـان بکـەن تـا دیـسان شـەیتان خـۆی خـستەوە بەرگی

پزیشکێکەوە و هاتەوە بۆ لای و ڕایگەیاند تەنیا چارەی ئەو ئەوەیە هەموو ڕۆژێك دەبێت مێشکی دوو لاو بدرێتە ئەو مارانە.. ئەم جۆرە تیمارکردنە بوو بە هۆی زوڵم و زۆرێکی زۆر لەناو گەڵ دا، لە دواییدا زوحاك کوژرا و گەل ڕزگار بوو.

٧٢ – عوززا

یەکێك لە دوو پتە بەناوبانگەکەی هۆزی قورەیش بووە.

٧٣- لات

یەکێك لە دوو پتە بەناوبانگەکەی هۆزی قورەیش بووە.

٧٤ – مێرکور *Marcure*

کوڕی ژۆپیتەر و خوای گەڕان و بازرگانی و ڕەوانبێژی و قسەپاراوی و ئارامی گیانی مردووان بووە، لەلایەن زەیۆسەوە بەناونیشانی پەیك هەڵبژێردراوە، لایەنگیر و پارێزەری وەرزش کاران بووە و لە دەرگای شوێن وەرزش دا "ئۆلیپیاد" بۆ ڕێزی ئەو پەیکەرێکی گەورە و زەلامیان بۆ دروست کردبوو، شێوە و ڕوخسارێکی جوانکیلە لەگەڵ بەدەنێکی ڕێك و پێك و هاوسەنگی هەبوو، دوو پێڵاوی باڵداریشی لەپێدا بووە و تێلایەکی باڵداریشی بە دەستەوە بووە کە دوو ماری پێدا ئاڵاوە.



٧٥ – ڤینۆس "ئەفرۆدیت" *Venus*

خوای دڵداری و جوانی و نموونەی ڕێکی و هاوسەنگیی لەش و لار و بەدەنی ژنانە، پەیکەرێکی ئەم خوایە دۆزرایەوە کە چەند سەدە پێش زایین لە بەرد دروست کرابوو ئێستاش ئەو پەیکەرە لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە فەرانسە.



٧٦ – ڤولگان *Vulcan*

خوای ئاگر و مێردی ئەفرۆدیت بووە، لەهەمان کاتیش دا کوڕی زەیۆس و هیرا بووە.. خوایەکی ناشرین و شەل بووە. کاتێکی هاتە دنیاوە دایکی زۆری لاناخۆش بوو کە ئەوەندە ناشرینە بۆیە فڕێیدایە ناو دەریا تا بخنکێت بەڵام پەرییەکانی دەریا ڕزگاریان کرد. هەر لەو کاتیش دا ڤولگان خوای ئاسن و مس و برونز بوو هەمیشە خەریکی ئاگر و ئاسنگەری بوو، لەم ڕووەوە هونەرمەنێکی شایان بوو.



### ٧٧ – هێرا *Hera*

شاژنی ئاسمان خوای ژنانی گێتی و ژن هێنان و ژن و مێردی بووه، هەروەها پارێزەری بێوەژنان بووە.. هەمیشە کراسێکی شۆڕی لەبەردەکرد و تاجێکی گەوهەرداری لەنەخشی تونێلی دادەنا و داردەستێکی مرواری ڕێزی بەدەستەوە بووە گۆپکەکەی چۆلەکەیێکی بەسەرەوە بوو کە لە جەواهیر دروست کرابوو.



### ٧٨ – هەرکول *Heracles*

ئەم پاڵەوانە بەناوبانگە لە هەر دوو میتۆلۆژیای یۆنان و ڕۆمان دا هەیە. لای یۆنانەکان ناوی "هیراکلیس"ە ولای ڕۆمانەکان "هەرکولە"، ئەم قارەمانە لەهەر دوو ئەفسانەدا گەلێك بەناوبانگە و قارەمانێتییە بەو دوانزدە کردەوە ناسراوە:

- سەربڕینی شێری نیمە *Neeme*
- سەربڕینی ماری حەوت سەر *Cerynie*
- کوشتنی بەرازی ئاریمانت *Erymanthe*
- کوشت و بڕینی باڵدارەکانی ستیمفال *Stymphale*
- پاك کردنەوەی گەوڕ (پشتیر)ەکانی ئووگیاس *Augias*
- گرتنی ئاسکی سرینی *Cerynie*
- گرتنی گا و وەحشی مینۆس *Minos*
- سەربڕینی ئەسپی دیۆمە *Diomede*
- بەدەس هێنانی پشتێنی ئامازۆن هیپۆلیت *Amazone-Hyppilyte*
- سەربڕینی کریۆن *Ceryon*
- سێوکردنەوە لە باغی هسپرید *Hesperides*
- سەفەر بۆ دۆزەخ



### ٧٩ – هیلین *Helen*

ژنی منیلاوسی پاشای شاری ئەسپارتە بووە، بووە هۆی هەڵگیرساندنی ئاگری کوشتاری درێژخایەنی تروادە، زۆر کەس حەزی لێ دەکرد بەڵام ئەو مێردەکەی خۆی خۆش دەویست کوڕی پاشای ترواده ڕێی کەوتە دەربارەی تەلاری پاشای ئەسپارتە و هیلین دڵدار و عاشقی بوو ڕەدووی کەوت و هەڕای کرد، چوونەوە شاری ترواده منیلاوس داوای یاریدەی لە پاڵەوانەکانی یۆنان و نیوە خواکان کرد. ئەوجا بە پشتگیری ئەوان پەلاماری شاری ترواده‌ی دا و بە درێژایی دە ساڵ شەڕ بەردەوام بوو، تا دوای دە ساڵ بە فێڵ توانییان لە دەرکەی ترواده بچنە ژووری و دەرگاکانی شار بکەنەوە و شار بگرن و بەسەر یەك دا بیڕووخێنن، پاشان (هیلین)یان لەگەڵ خۆ بردەوە.

## ئابووری چییە؟

ئابووری ڕشتەیێکی زانیاریی کۆمەڵایەتییە، بەپێی یاسا و پێوەندییەکی ئابووری خەڵکی لەگەڵ یەک دا سەودا دەکەن بە پێی کات و شوێن لە پێناوی بەختیاریی تاکەکەس و کۆمەڵ دا.

## قوتابخانە ئابوورییەکان

**١ـ ڕێبازی سەربەستیی ئابووری:**

بیروڕا لەسەر ئەوەیە کە دەوڵەت و دەزگاکانی دەوڵەت بەهیچ جۆر دەست لە کاروباری ئابووری وەرنەدەن، چونکە ئەم قوتابخانەیە لە باوەڕێك دایە کە سوودی تاکەکەسی خۆی و داهێنانی چاکترین هاندەرە بۆ پێش کەوتنی ئابووریی وڵات. دانا ناسراوەکانی ئەم ڕێبازەش ئەمانەن: مارشال، سینیرو، پولیت، ماك کولیچ. لەم ڕووەوە ئادەم سمیث لە هەموویان بەناوبانگترە کە دەڵێ: بەرژەوەند و سوودی ئەو کەسە هاندەری جووڵانەوەی ئابوورییە، سەربەستیی ئابووریش لە هەموو یاسا و بڕیارێك چاکترە چونکە ئەو سەربەستییە سوودی کۆمەڵیش جێبەجێ دەکات.

**٢ـ ئابووریی نگاران:**

(مۆر) زانای ئابووری زانی ئەو قوتابخانەیە، ئەم قوتابخانەیە لەباوەڕێك دایە ئابووری دەبێت بەپێی لێکدانەوەیێکی بیرکاری (ریاضیات) لێك بدرێتەوە.

**٣ـ ئابووریی نەتوایەتی:**

لەم قوتابخانەدا ئابووری لە ڕوانگەیەکی نەتەوایەتییەوە لێك دەدرێتەوە بۆ پێگەیشتنی پیشەسازی. دانەری ئەم بیروڕایە "لیست"ی زانای ئەڵمانییە کە کتێبێکی لەم ڕووەوە نووسیوە، ناوی "ڕێبازی ئابووریی نەتەوایەتی"یە.

**٤ـ دابەش کردنەکان**

ئادەم سمیث لە باوەڕێك دایە کاروبار ئەگەر جوان دابەش بکرێت بەسەر ئیش کەران دا (واتا نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب) بێگومان بەرهەم گەلێك زۆرتر دەبێت. سمیث بۆ نموونە دەبێژێ: دە کرێکار دەتوانن لە کارگەیێکی دروست کردنی دەرزی دلیوان دا بەرهەم لە دوو سەد دانەوە بگەیننە ٤٨٠٠ دانە، ئەو لە باوەڕێك دابوو زانین و چالاکی و کات بەفیڕۆ نەدات بڕبڕاگەی بەرهەم دانە.

**٥ـ سەوداگەری**

لەم قوتابخانەیە بیروڕا لەسەر ئەوەیە سەرمایەی ڕاستەقینە واتە گلێر و گردکردنەوەی زێڕو زیوو شتی گران بایی، لە دوادوایی سەدەی پانزدەدا وڵاتانی وەکو ئیسپانیا و فڕانسە و ئینگلتەرە ئەیان هێشت زێڕ و زیو و شتی بایبدار لە وڵاتەکەی خۆیان بچێتە دەرەوە و لە ڕێگای پیشەسازی و دەریاوانی و بازرگانییەوە کەوتنە گردکردنەوەی زێڕ و زیو.

### ٦ـ سوسیالیسم:

لەم قوتابخانەیەدا جیاوازیی جینایەتی پەسند ناکرێت و ئابووری دەبێت بەپێی دادپەروەرییەکی کۆمەڵایەتی بێت، کەسایەتیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسایەتیی کەس دا جیاوازە و سوودی تێکڕایی لە سوودی تاکە کەس گرنگترە. ئەم قوتابخانەیەش سێ بەشە:

ا – سۆسیالیسمی دەوڵەت

ب – سۆسیالیسمی زەوی و زار

ج – سۆسیالیسمی زانستی

ا – سۆسیالیسمی دەوڵەت:

ئەم قوتابخانەیە بیروڕای لەسەر ئەوەیە کە ئابووری بەشێوەیێکی تێکڕایی دەبێت لەژێر سەرپەرستی دەوڵەت دا بێت. فردیناند لاسال و رۆبەرت توس دوو زانای بەناوبانگی ئەم قوتابخانەیەن.

ب – سۆسیالیسمی زەوی و زار:

جان ستیوارت میل بیروڕای لەسەر ئەوەبوو کە دەست بەسەر بەرهەمەکانی زەوی و زار بکێشرێت لە پێناوی کۆمەڵ و تێکڕای خەڵك دا. زۆر لە چاوساغی ئەم قوتابخانەیە ڕایان لەسەر دابەش کردنی زەوی و زارە.

ج – سۆسیالیسمی زانستی (مارکسیزم):

دانەر و داهێنەری ئەم قوتابخانەیە کارل مارکس خاوەن کتێبی بەناوبانگ "سەرمایە"یە. مارکس لە باوەڕێك دا بوو: ڕژێمی سەرمایەداری دەبێتە هۆی لەناوچوونی چینی ناوەڕاست و چینی کریکار لەکاتێك دا ئەگەر سەرمایە بەدەست چەند کەسێکەوە بسوورێتەوە و بچەرخێت، بێ گومان ڕەوشتێکی ئابووریی وەها دەبێتە هۆی شێرازە تێك چوون و بەرەڵلای ئابووری و لە ئاکام دا شۆڕشی کرێکاران دێتە کایەوە.

### ٧ـ فیزیۆکرات:

دانەری ئەم قوتابخانەیە دکتۆر کنە بوو، لەم ڕووەوە کتێبێکی بەناوی "دێراوی ئابووری" نووسیوە، فیزیۆکراتەکان لەباوەڕێك دان کە زەوی چاوگەی بنەڕەتی سەرمایەیە و جوتیاریش سەرمایەسازە. دەبێ ئەوەش بزانین کە پیادەکردنی بیروڕای ئەم قوتابخانەیان خستۆتە چوارچێوەیێکی ئایینییەوە.

### ٨ـ کۆمەڵەی کلاسیك:

دانەر و داهێنەری ئەم قوتابخانەیە ئادەم سمیثە لەم ڕووەوە کتێبێکی بەناوی (سامانی نەتەوان) نووسیوە کە تێیدا دەبێژێت:

کاروباری ئابووری نابێت بچووکترین پێوەندی بە ئاینەوە هەبێت چونکە زۆر لە یەکەوە دوورن. هەروەها لە باوەڕێك دایە کە یاساکانی ئابووری وەکو یاسا نەگۆڕاوەکان سروشت ناگۆڕێن و گشتین.

**٩- پاریدە خوازان**

دانــەری ئــەم قوتابخانەیــە (ســیمۆندی) ناوێــك بــوو کتێبێکــی لــەم ڕووەوە نووســیوە بــەناوی (بنچینەکانی زانستی ئابووری) کە تێـیدا دەڵێ: بۆ پاراسـتنی مـان و حەسانەوەی کرێکـاران پێویـستە دەوڵەت چاودێری چینی کرێکار بکات و ئاگای لییان بێت.

**١٠- قوتابخانەی مێژوو:**

دانەری ئەم بیروڕایە زانایێکی ئەڵمانیاییە بە ناوی (روش) کە دەڵێ: پێویستە ئـابووری زانـان بـۆ دۆزینەوەی یاسا پەسندەکان ئابووری لە رابردوو ڕووداوەکانی مێژوو کەڵك وەربگرن.

**١١- قوتابخانەی بیرکاریانەی ئابووری:**

(کورنوی) ئابووری زانی بەناوبانگ فەرانسەیی لە باوەڕێك دایە کە زانیاریی ئابووری واتا زانیـاریی ئاڵوگۆر و گۆڕینەوە لەم ڕووەوە بـەپێی سوود وەرگرتن لە باسەکانی بیرکاری (ریاضیات) چۆنیەتیی ئاڵوگۆڕ و گۆڕینەوەی روون کردۆتەوە.

## بازاره بنەڕەتییەکانی جیهان

١ ـ بازاڕی ئاوریشم:

| شار | ولات |
|---|---|
| شانگهای | چین |
| کانتون | چین |
| لیۆن | فرانسە |
| جینوا | ئیتالیا |

٢ ـ بازاڕی خوری:

| شار | ولات |
|---|---|
| سدنی | ئوسترالیا |
| ملبۆرن | ئوسترالیا |
| ئاوکلاند | زیلاندی نوێ |
| ولنکتۆن | زیلاندی نوێ |

٣ـ بازاڕی لۆکە:

| شار | ولات |
|---|---|
| نورلیانی نوێ | ئەمریکا |
| بۆمبای | هیندستان |
| ئەسکەندەرییە | میسر |

٤ـ بازاڕی تووتن:

| شار | ولات |
|---|---|
| ئەمەریکا | لویزوفیل |
| سویل | ئیسپانیا |
| تولۆز | فرانسە |
| ئەزمیر | تورکیا |
| سامسۆن | تورکیا |
| ئەسکەندەرییە | میسر |

٥ـ بازاڕی چای:

| شار | ولات |
|---|---|
| کلکتا | هیندستان |
| کولبۆ | سیلان |
| هنگ کۆنگ | هنگ کۆنگ |
| کانتون | چین |
| شانگهای | چین |

٦- بازاڕی دار و تەختە

| شار | وڵات |
| --- | --- |
| ئوتاوا | کەنەدا |
| بیرگن | نەرویج |
| ریگا | لیتوانیا |
| ئەرخانگل | یەکیەتیی سۆڤیەت |
| رانگۆن | بورما |
| پێرث | ئوسترالیا |

٧- بازاڕی خەڵە

| شار | وڵات |
| --- | --- |
| فینی پك | کەنەدا |
| شیکاگۆ | ئەمریکا |
| بوخالو | ئەمریکا |
| نیویۆرك | ئەمریکا |
| مونرال | کەنەدا |
| فیلادلفیا | ئەمریکا |
| پۆستون | ئەمریکا |
| پالتیمور | ئەمریکا |
| ئادسا | یەکیەتیی سۆڤیەت |
| ملبۆن | ئوسترالیا |
| کراچی | پاکستان |

٨- بازاڕی شەکر:

| شار | وڵات |
| --- | --- |
| هامبورگ | ئەڵمانیا |
| ئانور | بەلچیکا |
| جۆرج تاون | گویانا |
| باتاویا | جاوە |
| ئەسکەندەرییە | میسر |

٩- بازاڕی قاوە

| شار | وڵات |
| --- | --- |
| ریدوجانیرۆ | برازیل |
| مدەرەسی | هیندستان |
| باتاوە | جاوە |
| صەنعا | یەمەن |

١٠ـ بازاڕی گۆشت

| شار | وڵات |
|---|---|
| سدنی | ئوستراليا |
| ملبۆرن | ئوستراليا |
| نیویۆك | ئەمریکا |

١١ـ بازاڕی ماسی

تەواوی بەندەرگاكانی دەریای (باكوور) و قەراغەكانی وڵاتی ئەمریكا.

١٢ـ بازاڕی ئەوت:

| شار | وڵات |
|---|---|
| نیویۆرك | ئەمریكا |
| فیلادلفیا | ئەمریكا |
| بوستۆن | ئەمریكا |
| پالتیمور | ئەمریكا |
| باكو | ئەذەربێجان |
| دانكون | بورما |
| بەندەرگاكانی | مەكسیك |

١٣ـ بازاڕی ئەڵماسە ئەتاشراو: كیمپرلی

بازاڕی ئەڵماسی تاشراو: ئەمستردام

# ئابووری زانانی بەناوبانگ

**١ـ ئارهارد *Erhard***



لەساڵی ١٨٩٧ لەشاری فۆرت نزیکی نۆرمبۆرگی ئەڵمانیا لەدایك بووە، کوڕی پیاوێکی جوتیار بووە، لەسەرەتاوە دەستی دایە بازرگانیی قوماش وتێیدا سەرکەوت، لە بیست ساڵیدا لە شەڕی یەکەمی جیهان دا بریندار کرا و گەڕایەوە و چووە زانکۆی فرانکفۆرتەوە، لەبەشی ئابووریدا باوڕنامەی دکتۆریی وەرگرت.

دوای دەست پێکردنی شەڕی دووەمی جیهان نازییەکان زۆر هەوڵیان لەگەڵ دا بۆ ئەوەی بەلای خۆیانەوە بیچەرخێنن بەڵام بێسوود بوو.. دوای دەرکردنی ئەڵمان لەشاری ستالینگراد ئارهاد بۆی دەرکەوت تەمەنی دام و دەزگای هیتلەر هێندە ناخەیەنێت و کورتە.. جا کەوتە نووسین و تێکۆشان بۆ چارەسەرکردنی ئابووریی ئەڵمانیای دوای شەڕ و لە تەقەلاکەیدا سەرکەوت و بوو بە دانەری دامەزراندنی پایە و بنەڕەتی ئابووریی ئێستای ئەڵمانیا.

**٢ـ ئیستیوارت میل ( ١٨٠٦ – ١٨٧٣ز) *Stuart Mill***

لەباوەڕێك دابوو کە بۆ ئاسایش و بەختیاریی مرۆڤ دەبێت بەرهەم بە شێوەییکی پڕ لە داد بەش بکرێن.

**٣ـ ئۆین ( ١٧٧١ – ١٨٥٨ ز) *Owen***



کوڕە جوتیارێکی خەڵکی وڵاتی ئینگلتەرە بووە، زۆرترین بەشی ژیانی نیشی بۆ سەرمایەدارەکان کردووە توانی تا ئەندازەیێکی زۆر چۆنییەتی ئابووریی وڵاتەکەی بگۆڕێت بە پێی ئەو بیروڕایانەی کە دەری دەخست.

**٤ـ باستیا (فردیك) ( ١٨٠١ – ١٨٥٠) *Bistia***

یەکێکە لەزاناکانی وڵاتی فرەنسا، نووسراوە بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

ا – بەندوباوی ئابووری شێوەکان

ب – هاو ئاهەنگیی ئابووری

باستیا دەڵێ: ئابووری دەبێت بەتەواوی سەربەخۆ بێت و هیچ جۆرە چوارچێوەیێکی بۆ دروست نەکرێت.

**٥ـ بلان ( ١٨١١ – ١٨٨٢ ز) *Blan***

لەباوەڕێك دابوو کە: هەر کەسێك دەبێت بە پێی توانا و هۆش و چالاکی و بە ئەندازەی نیاز پێی بدرێت.



**٦ـ بودن (جان) *Bodin***

زانایێکی فرەنساییە (١٥٣٠ – ١٥٩٦ ز)

٧- پارتۆ (١٨٤٨ -١٩٢٣ ز) *Pareto*

زانایێکی ئیتالییە لەو باوەڕەدا بوو کە: یاسای ئابووریی سەربەست و یاسای ئابووریی سۆسیالیسم هەردووکیان لەگەڵ سروشتی مرۆڤ دا ناگونجێن.

٨- پرودۆن (١٨٠٩ - ١٨٦٥ ز) *Proudhon*

دەڵێ: مرۆڤ کە پارەی داهێناوە کارێکی بەجێی کردووە و داهێنانێکی بەسوود بووە بۆ مرۆڤ هەر لەو کاتەش دا نیشانەی بەدبەختی هەژارییە. لەم ڕووەوە کتێبێکی بەناوی "فەلسەفەی هەژاری" نووسیوە.

٩- دورکیم (ئامیل) (١٨٥٨ - ١٩١٧ ز)

ئابووری زانێکی فەرانساییە دەڵێ: نرخ و بایی مرۆڤ بە ڕەوشتیا ئەندازەگیری دەکرێت. کتێبێکی نووسیوە بەناوی "دابەش کردنی ئیشی کۆمەڵایەتی".

١٠- راکفلەر (١٨٣٩ - ١٩٣٧ز) *Rachefeller*

پیشەسازێکی بەناوبانگی ئەمریکایی و خاوەن کۆمپانیای "ستاندارد ئۆیل" و زۆر دامودەزگای تری ئابوورییە.

١١- گید (١٨٤٧ - ١٩٣٢ ز) *Gide*

خەڵکی وڵاتی فەرانسایە، زانایێکی ناوداری کاروباری ئابووری و لایەنگیری ڕێبازی "کۆمپانیای هەرەوەزی" بوو.




١٢- سای "ژان پاتیست" (١٧٤٧ - ١٨٣٢ ز) *Say. J. B*

خەڵکی شاری لیۆنی فەرانسایە. دەڵێ:"پایەی ڕێبازی پیشەسازی دەبێت لە هەرچی ڕێبازێکی دیکە هەیە بەرز و باڵاتربێت.



١٣- فۆرد "هێنری" (١٨٦٣ - ١٩٤٧ ز) *Fourd. H*

باوکی فۆرد پینە دۆزێکی خەڵکی ئیرلەندە بوو، کۆچی کردبوو بۆ ئەمریکا. هێنری بەشی "میکانیک"ی لە یەکێك لە زانکۆکان دا تەواو کرد و لەئاکام دا توانی مەکینەیێك دروست بکات کە بە ئاو سارد بێتەوە.

١٤- کلارك "جان مۆریس" (١٨٨٤ - ١٩٥٨ ز) *Clark. J. M*

یەکێکە لە زانا ئابوورییەکانی ئەمریکا و مامۆستای زانکۆی کۆلۆمبیا.

١٥- کینس "جان مانیاد" (١٨٨٣ - ١٩٤٦ ز) *Keynes . J. M*

خەڵكی ئینگلتەرە بوو لە ژێر چاودێریی زانای ناسراوی ئابووری "مارشال"دا بیروڕاكانی لە زانكۆی كەمبریدج پەروەردە بووە، یەكەمین كتێبێك كە دای ناوە بەناوی "ئابووریە هیندستان" بووە، لە دواییش دا بووە بە مامۆستای زانكۆی كەمبریدج.



**١٦- لوپلە "فردریك" ( ١٨٠٦ – ١٨٨٢ ز) *Leplay . F***

ئەندازیارێكی كان ناس بووە لە باوەڕێك دا بوو: كە دەبێت ڕەوشت لەگەڵ گەشە كردنی ژیانی ئابووری دا شان بە شانی یەك پێكەوە لەگەشە دابن.



**١٧- لیست "فردریك" ( ١٧٨٩ – ١٨٤٦ ز)**

ئابووری زانێكی ئەڵمانی بووە و خاوەن كتێبێكە بەناوی "ڕێبازی ئابووریی نەتەوایەتی". پوختەی ئەوەیە كە گەلان دەبێ ئەم قۆناغانە ببڕن بۆ ئەوەی بگەنە پلەی گەشەی ئابووریی نەتەوایەتی:

أ – بەرەڵلایی ب – شوانی ج – كشتوكاڵ د – پیشەسازی

**١٨- ژرمن مارتن "لویی" ( ١٨٧٢ – ١٩٤٨ ز) *Cermain Martin. L***

زانای وڵاتی فڕانسا و مامۆستای زانكۆی دیژون و پاریس بووە.



ژرمن

**١٩- مارشال "ئەلفرید" ( ١٨٤٢ – ١٩٢٤ ز) *Marchall - A***

چەند كتێبێكی نووسیوە بەو ناوانە:

أ – بنچینەكانی ئابووری زانی.

ب – كامەرانیی مرۆڤایەتی

بیروڕاكانی دەربارەی (نرخ) زۆر سەرنج ڕاكێشن.

**٢٠ – مالتوس "تۆماس ڕۆبەرت" ( ١٧٦٦ – ١٨٣٤ ز) *Malthus. T***

یەكێكە لە زانا كلاسیكییەكانی دنیای ئابووری. لە باوەڕێك دا بوو كە: خواردن لە ئایندەدا بەشی خەڵكی سەر زەوی ناكات چونكە مرۆڤ زۆر دەبن.

**٢١- وایت "دوین" *White***

لە باوەڕێك دا بوو كە: ئەگەرچی مرۆڤ بوونەوەرێكی شایان ڕێز گرتنە بەڵام، بۆ بەختیاری ئاسایشی مرۆڤە كە دەبێ دەوڵەت ئاگاداری ئەم بەختیاری و ئاسایشە بێت.

**٢٢- ویلن ( ١٨٨٧ – ١٩٤٣ ز) *Veblen***

ئابووری ناسێكی خەڵكی ئەمریكایە، دەڵێ: كەسێك ئابووری ناس بێت نابێ بیروڕای كەسیی خۆی تێكەڵ كاروباری ئابووری بكات.

## ناوی پارەی ولاتان

| ولات | | ناوی دراو |
|---|---|---|
| ئەرجەنتین | | بیزو |
| ئەلبانیا | | لەك |
| ئەڵمانیا | | مارکی ئەڵمانی |
| ئەمریکا | | دۆلار |
| ئەندونیسیا | | روپیە |
| ئەردون | | دیناری ئەردونی |
| ئەسکوتلەند | | لیرە |
| ئەفریقیای خواروو | | راند |
| ئەفریقیای ناوەندی | | ئەفغانی |
| ئەفغانستانی | | ئەفغانی |
| ئەکوادۆر | | سوکر |
| ئینگلتەرە | | پاوەند |
| ئۆرگوای | | پزو |
| ئۆغەندە | | شیلنگ |
| ئێران | | ریاڵ |
| ئیرلەندا | | پاوەند |
| ئیتالیا | | لیرە |
| ئیسلەند | | کرۆنا |
| برازیل | | کروزیرو |
| بورما | | کیات |
| بەلجیکا | | فرانك |
| بلغاریا | | لو |
| بولیڤیا | | پزو |
| پاراچوای | | گورانی |
| پاکستان | | روپیە |
| پاناما | | بالبوا |
| پورتەغال | | ئەسکودو |
| پیرو | | سول |
| تەنجانیقا | | شیلنگ |
| تانزانیا | | شیلنگ |
| تایلەند | | باهت نات |
| تورکیا | | لیرەی تورك |
| چیکۆسلۆڤاکیا | کورونا | |
| توگو | | فرانك |
| چینی میللی | | یوئان |
| چینی فەرموزا | | دۆلاری تایوان |
| دانیمارك | | کورن |
| دۆمنیکان | | پیزو |
| رۆدیسیا | | لیرە |
| رۆمانیا | | لی |
| زامبیا | | لیرە |
| زیلاندی نوێ | لیرە | |
| زنجبار | | شیلنگ |
| ژاپۆن (یابان) | یەن | |

| | |
|---|---|
| سلڤادۆر | کولون |
| سوید | کورونا |
| سووریا | لیره |
| سویسرا | فرانك |
| سیلان | روپیه |
| شیلی | ئەسکودو |
| عیراق | دینار |
| سعودیه | ریال |
| فرانسا | فرانك |
| فنلاند | مارکا |
| فلیپین | پیزو |
| قیبروس | پاوند |
| کۆریای ژووروو | هوان |
| کەنەدا | دۆلاری کەنەدا |
| کۆریای خوارووی | هوان |
| کۆستاریکا | کولون |
| کۆلۆمبیا | پیزو |
| کووبا | پیزو |
| کوومیت | دینار |
| گابۆن | فرانك |
| گرین لاند | کورون |
| گواتیمالا | کەتزال |
| لوبنان | لیره |
| لوکزامبورگ | فرانك |
| مالیزیا | دۆلار |
| مەجەر | فورنیت |
| مەڕاکیش | درهەم |
| میسر | قرش "جونێه" |
| مەکسیك | پیزو |
| مۆناکۆ | فرانك |
| نیپال | روپیه |
| نەرویج | کۆرن |
| نیجریا | پاوەند |
| نیکاراگوا | کوردونا |
| فاتیکان | لیره |
| ڤۆڵتای سەرەوە | فرانك |
| ڤەنزویلا | بولیوار |
| ڤێتنام | دونك |
| هائیتی | گورد |
| هۆڵەندە | کیلدەر |
| هیندستان | روپیه |
| هەندۆراس | لیبرا |
| یەمەن | ریاڵ |
| یۆگۆسلاڤیا | دینار |
| یۆنان | دراخما |
| یەکیەتی سۆڤیەت | رۆبڵ |

## ناوی بەستەکانی جیهان

| ناو | وڵات | بەرزی بەپێ | ئەندازەی ئاوگرتنی بە پێ سێجا | ساڵی سوود لێ وەرگرتن |
|---|---|---|---|---|
| ئادامنیانی | ئوسترالیا | ٢٩٠ | ٢٥٠٠,٠٠٠ | ١٩٥٩ |
| ئەسوان | میسر | ٤٥ م | ٧٠٠ ملیۆن م٣ | – |
| ئالبەگر | ئیتالیا | ١٧٨م | – | ١٩٤٤ |
| ئالدر | ئەمریکا | ٣٣٠ | ٣٣٢٠٠٠ | ١٩٥٢ |
| ئان سیبا | ئیتالیا | ٢٤٨ | ٢٤٣٦٠٠ | ١٩١٥ |
| ئەرووروۆك | ئەمریکا | ٣٥٠ | ٢٨٦٠٠٠ | ١٩٢٦ |
| ئێکس چەکر | ئەمریکا | ٣٢٦ | ٢٨١٣٠٠ | ١٩٤٨ |
| ئال پالمیتو | مەکسیک | ٣٠٢ | ٣٢٦٢٧٠٠ | ١٩١٦ |
| ئەلفنت بوت | مەکسیک | ٣٠١ | ٢١٨٥٤٠٠ | ١٩٦١ |
| ئەمیر کبیر | ئێران | ١٨٣م | ٢٥٠٠٠٠٠٠٠م٣ | ١٩٥٠ |
| ئەندرسون ریخ | ئەمریکا | ٤٥٦ | ٤٩٢٢٠٠ | ١٩٥٣ |
| ئاویرار | سویسرا | ٣٤٠ | – | ١٩٣٦ |
| ئاوشانسی | ئەمریکا | ٤٣٠ | ٢٦٠٣٦٠ | ١٩٦٠ |
| ئینگوری | یەکیەتی سۆڤییێت | ٣٠١ | – | ١٩٥٧ |
| براتسك | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ١٤٩٠٠٠٠٠م٣ | ١٩٥٩ |
| برون لی | ئەمریکا | ٣٩٥ | ١٤٧٠٠٠٠ | ١٩٦٠ |
| بما کر | هیندستان | ٧٤٠ | ٧٤٠٠٠٠٠ | ١٩١٠ |
| پولدەر | ئەمریکا | ٢٢٠م | ٤٥٠٠ ملیۆن م٣ | – |
| بها کرا | هیندستان | ٢٢٦م | – | ١٩٦٢ |
| بیکر | ئەمریکا | ٣٠١ | ٢٩٨٠٠٠ | ١٩٥٩ |
| بەینەل عوێدین | مەڕاکش | ٤٤٠ | ١٢٠٠٠٠٠ | ١٩٥٤ |
| پارکر | ئەمریکا | ٣٢٠ | ٧١٦٠٠٠ | ١٩٢٨ |
| پاین فیلت | ئەمریکا | ٤٣٠ | ١٠٠٠٠٠٠ | ١٩٥٤ |
| پردی | ئەمریکا | ٢٥٨ | ٢٢٢٠٠٠ | ١٩٢٩ |
| پورت | فەڕانسا | ١٣٠م | ٤٠٠ ملیۆن م٣ | – |
| تاکی یین | تایوان | ٧٨٠ | – | ١٩٦١ |
| تریزێ | ئەمریکا | ٥٣٧ | ٢٥٠٠٠٠٠ | ١٩٦٠ |
| تیملیانسك | یەکیەتی سوفییێت | – | ٢٣٩٠٠٠٠٠م٣ | ١٩٥٢ |
| تینی | فەڕانسا | ١٨١م | – | ١٩٥٢ |
| چری وولی | ئەمریکا | ٣٣٠ | ٦٦٨٢٠٠ | ١٩٥٢ |
| دارێۆش | ئێران | ٥٨٥ م | – | – |
| دوکان | عیراق | ٣٠٨ | ٥,٥٠٩,٦٥٠ | ١٩٦٢ |
| دیابلو | ئەمریکا | ٣٨٩ | ٦٠٠٠,٠٠٠ | ١٩٣٠ |
| دوروشاك | ئەمریکا | ٢٠٤ م٣ | – | – |
| ریاس | ئەمریکا | ٥٤٠ | ١٤٠٥٠٠٠ | ١٩٤٩ |
| رەزاشا | ئێران | ١٩٥م | – | – |
| ردنی سیات | فەڕانسا | ٣٤٥ | ٤٠٠٠٠٠ | ١٩٤٨ |
| ساریار | تورکیا | ٤٦٠ | ١٥٤٠٠٠٠ | ١٩٥٢ |
| سیسکچوان | کەنەدا | – | ٢٠٦٠٠٠٠٠م٣ | – |
| سفید ڕوو | ئێران | ١٠٥ م | ١٦٨٨ ملیۆن م٣ | – |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سوتی | فرانسا | ٣٩٤ | ١٠٦٠٠٠ | ١٩٥٣ |
| ساستا | ئەمریکا | ١٨٣م | ٤٥٠٠٠٠٠ | ١٩٥٤ |
| فەرەح | ئێران | ١٠٥م | ١١٦٨ مليۆن$^2$ | – |
| فۆرت بیک | ئەمریکا | ٧٤م | ٢٠٠ مليۆن$^2$ | ١٩٤٠ |
| ڤۆلگاگراد | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٢٥,٥ مليۆن$^2$ | ١٩٦٢ |
| فورت رندل | ئەمریکا | – | ٢٨٤ مليۆن$^2$ | ١٩٤٥ |
| کاخوفکا | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٢٥٦ مليۆن$^2$ | ١٩٤٥ |
| فورت رندل | ئەمریکا | – | ٢٨٤ مليۆن م$^2$ | ١٩٥٦ |
| کاخوفکا | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٢٥٦ مليۆن م$^2$ | ١٩٤٥ |
| کاریبا | رۆدیسیا | ٤٢٠ | ١٣٠ مليۆن م$^2$ | – |
| کیبان | تورکیا | ٢٠٥م | – | – |
| کەرج | ئێران | ١٨٠م | ٢٠٥ مليۆن م$^2$ | ١٩٦١ |
| کرمنچۆک | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٢٧٥ مليۆن م$^2$ | ١٩٥٩ |
| کیمەر | تورکیا | ٣٦٠ | – | ١٩٥٩ |
| کورویە | یابان | ١٨٦م | – | – |
| کونتزا | سویسرا | ٢٢٥ | – | – |
| کویبیشف | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٣٢٩ مليۆن م$^2$ | – |
| کییف | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٤٥ مليۆن م$^2$ | – |
| کینکزلی | ئەمریکا | – | ٨٤,٥ مليۆن م$^2$ | ١٩٤٢ |
| گاتون | پەنەما | – | ١٧ر٦ مليۆن م$^2$ | ١٩١٢ |
| گاستلودو | – | – | – | – |
| بودە | پورتەغال | ٣٧٧ | ٨٩٣,٢٠٠ | ١٩٥١ |
| گراس | ئەمریکا | ٣٤٠ | ٤٢٠٠٠ | ١٩٥٥ |
| گراندیکسانس | سویسرا | ٢٨٤م | – | ١٩٦٢ |
| گراندکولی | ئەمریکا | ١٦٨ | ٩٤٠٢٠٠٠ | ١٩٤٢ |
| گریسن | ئەمریکا | – | ٥٠,٦ مليۆن م$^2$ | ١٩٥٤ |
| گریمل | سویسرا | ٢٧٣ | ٨١,٠٠٠ | ١٩٥٤ |
| گۆرکی | یەکیەتی سۆڤییێت | – | ٤٤,٣ مليۆن م$^2$ | ١٩٥٥ |
| لوزون | سویسرا | ٢٠٨ | – | ١٩٦٤ |
| لیم بیرگ | نەمسا | ٣٩٤ | ٦٦٥٠٠ | ١٩٥١ |
| لیەین | سویسرا | ٥٢٥ | – | ١٩٥٦ |
| مانگلا | پاکستان | ٣٦٥ | ٢٥٠٠٠٠٠ | – |
| مانیکواکان | کەنەدا | ٢٢٦ | – | ١٩٦٣ |
| متوور | هیندستان | ٧٣م | ٣٢٠ مليۆن م$^2$ | – |
| ناواچوو | مەکسیک | ٢٨٣ | ١٠٧٢٠٠٠ | – |
| نورک | سۆڤییێت | ٣٠٠ | ٤٥٠ مليۆن م$^2$ | ١٩٦٠ |
| واراگامبا | ئوسترالیا | ٤٥٠ | ١٤١١٦٩٢ | ١٩٤٩ |
| وایونت | ئیتالیا | ٢٦٢م | – | ١٩٦٠ |
| ڤۆلگاگراد | سۆڤییێت | – | – | – |
| هوم | ئوسترالیا | ٦٠م | ٣٠٠ مليۆن م$^2$ | ١٩٥٣ |
| هیراکود | هیندستان | – | ٢٠,٦ مليۆن م$^2$ | ١٩٦٣ |

**رامیاری**

رامیاری یان سیاسەت؛ وشەی سیاسەت لە عەرەبیدا لەکاری (ساس یسوس)ەوە هاتووە بەمانا رام کردنی ئەسپ و چاوەرییە. هەر بۆیە رامیارییش لە رام کردنەوە وەرگیراوە. لە ئینگلیزیدا (پۆلیسی) و لە فرانسەییدا پولیتیک *Politque* لە واژەی (پۆلیس)ی یۆنانی بەمانا لە (شار)ەوە وەرگیراوە و واژەی لاتینی لەگەڵ تێکەڵ کراوە و بووە بە پولیتیکۆس *Politicus* واتا رشتەیەك یان رێبازێك کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ فەرمانڕەوایی و میللەت و دەوڵەت دا.

## سیاسەت و رابردووی دوور

### ئەفلاتون وسیاسەت:

لە ئەکادیمیاکەی ئەفلاتون دا زۆرتر دەربارەی چۆنیەتی رەوشت و سیاسەت دەدوان کە هەردووکیان لەیەکەوە نزیکن. ئەفلاتون دەربارەی سیاسەت بەسەریەکەوە سێ نووسراوی نووسیوە:

١. بیروڕای سیاسەتی ئەو لە ناوەڕاستی تەمەنیدا لە کتێبی "کۆماری" (الجمهورية) دا روون کردۆتەوە.

٢. پاشان ئەختێك بە شێوەیێکی وردتر نووسراوێکی دی نووسیوە بەناوی رامیار (السياسي).

٣. لەدوادوای ژیانیشیدا کتێبێکی دوور و درێژی بەناوی "یاساکان" نووسی، ئەم کتێبە لەبەر ئەوەی لە زۆر شت و رەوشت و کاروباری کۆمەڵایەتیی فراوان دواوە، بووە بە رێبازی ژیانی یاساگەری "هیلینستی" و لە دواییدا ئەفلاتون بە یەکەمین دانەری ئەم قوتابخانەیە ناسراوە.

کۆمارە خەیاڵ کردەکەی ئەفلاتون کە بە ناونیشانی نموونەیێکی هەڵبژێراو داینابوو کۆمارێکی گەلێك بچووك بوو، هەتاوەکو لە شاری ئەثیناش بچووکتر بووە. دانیشتوانی وڵاتە هەڵبژاردەکەی (ئەفلاتون) کراون بە سێ بەشەوە:-

١. فەرماندەکان

٢. سەربازان

٣. پاسەوان و تێکرای میللەت کە دەکەنە ٨٠٪ی خەڵك.

لەو کۆمارەدا ئەم سێ چینەی بە سێ گیان لەیەك بەدەن دا چواندووە کە، بێ یەك لەش نەتوانێت بژین، هەروەها فەرماندەکانی تەشبیە کردووە بە شوان کە ئاگایان لە ژیانی تێکڕای میللەت بێت.

### ئەرستۆ و سیاسەت

دەڵێن گوایا کتێبە بەناوبانگەکەی "رامیار"ی ئەرستۆ لە رووی گیانلەبەر ناسییەوە نووسیویەتی. هەر لەو کتێبەدا دەربارەی چۆنییەتی فەرمانڕەوایی دەدوێت، زۆر لە گیانلەبەرانی کۆڵیوەتەوە، رەوشت و سروشتیانی شی کردۆتەوە و لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەیەش کۆمەڵ و کۆمەڵایەتی و فەرمانڕەوایی لێك داوەتەوە کە، چۆن هەر کەسێك لە کۆمەڵ دا کارێکی پێسپێردراوە وەکو کشتوکاڵ و پیشەسازی و سەربازی یا ئەندامەتیی رێکخراوەکان — ئەرستۆ یەکەمین کەسە توانیویەتی لەش و قەوارەی مرۆڤ بە چوارچێوەکانی سیاسەت بچووێنێ (واتا تەشبیە بکات) هەروەکو بەپێی زانیاری سروشتی.

ئەرستۆ دەڵێ: سروشت دەوڵەتی دروست کردووە مرۆڤیش گیانلەبەرێکی سیاسییە. لەم رووەوە بەسەریەکەوە هەشت کتێبی هەیە.

## چۆن سیاسەت لێك دراوەتەوە؟

**١ـ لیترە *Littre***

زمان زانێکە فرانسایییە، دەڵێ:

سیاسەت زانستە، هەر دەوڵەتێکیش دەبێت ئەم زانستە بزانێت.

**٢ـ رۆبەرت *Robert***

زانایەکی رامیاری ناسە دەڵێ:

هونەر و دەسەڵاتی رامیاری بێگومان بەر لە دەوڵەت هەبووە لە هەموو کۆمەڵ وبرو دەستە و هۆزێك دا زانستی رامیاری هەبووە، لە هەموو کۆمەڵێك دا فەرماندە و فەرمانبەر هەبووە، تەنانەت لە هۆزە سەرەتایەکانیش دا.. بەدی هاتنی دەوڵەت واتە پێگەیشتنی ژیانی کۆمەڵایەتی.

**٣ـ ژان ژاك شوڤالی:**

مامۆستایێکی زانکۆی پاریسە دەڵێ:

لەبەر ئەوەی واژەی پولیتیك *Politique* لە واژەی "پولیس"ی یۆنانییەوە وەرگیراوە بەمانا شار، ئەمەش وا دەگەیێنێ زانستی رامیاری لە سەردەمی شارنشینییەوە گەشەی کردووە و بووە بە زانستێکی ناسراو.

**٤ـ پرۆفیسۆر منو دەڵێ:**

سیاسەت زانستێکە پێوەندیی بە هۆیەکانی فەرمانڕەوایی و ئەنگێزەکانییەوە هەیە.

**٥ـ مارسیل پرلۆ:**

مامۆستا لە زانکۆی پاریس دەڵێ:

سیاسەت واتا چۆنیەتی زانین و ناسینی دەوڵەتێك دەربارەی دەوروبەری خۆی.

**٦ـ موریس دورۆژە:**

دەڵێ: سیاسەت: واتا ناسین و ئاگاداری لە کاروبارێك دا کە پێوەندیی بە زانین و هونەر و ئاگایی دەوڵەتەوە هەیە چ دەربارەی وڵاتەکەی خۆی و چ دەربارەی دەرەوەی وڵاتەکەی خۆی.

**٧ـ ژان دابن:**

دەڵێ: سیاسەت زانستی دەوڵەتە.

**٨ـ ماکس ویبەر:**

دەڵێ: سیاسەت پلەیێکە بۆ مرۆڤ دانراوە، ئاگادارانی ئەم رێگەیە دەتوانن بەسەر ئەو پلەیەدا سەربکەون چ بۆ بەشداربوون لە دەوڵەت دا یان دەوڵەتێك لەناو دەوڵەتان دا.

**٩ـ جۆرج شلنیك:**

دەڵێ سیاسەت کۆمەڵە زانستێکە پەیوەندیی بە کۆمەڵەوە هەیە.

**١٠ ـ جۆرج ڤودل:**

سەرۆكی زانكۆی حقوقی پاریس دەڵێ:

ئەگەر بێتو بە كورتی باسی سیاسەت بكەین دەبێ بڵێین "سیاسەت واتا زانستی دەسەڵات".

## چەشنەكانی فەرمانڕەوایی:

**١ـ ئابسۆلۆتیزم: *Absoluitisme***

واتا حوكمڕانیی بێ‌لێدان و بەرەڵا، دەسەڵاتێكی بێ‌سنوور بەدەست فەرمانڕەواوە دەبێت "ئیمپراتۆ بێت یان شا یان قەیسەر یان هەرچی دی".

**٢ـ ئوتۆكراسی:**

سیستەمێكی فەرمانڕەواییە كە تەواوی دەسەڵات و هێز و كاروباری بەدەست یەك كەسەوە بێت، جیاوازی ئەم شێوەیە لە "ئۆتوریتایانیسم" ئەوەیە كە لە ئۆتۆكراسیدا هێز و دەسەڵات بەدەست تاكێكەوەیە بەڵام ئۆتۆریتایانیسم مەرج نییە زۆر دەسەڵات تەنیا بەدەست كەسێكەوە بێت.

ڕێبازەكانی وەك: أ- ئۆلیگارشی ب - ئابسۆلۆتیسم ج – ئۆتۆریتاریانیسم لەم باوەرە وەكو یەك وان.

**٣ـ ئەریستۆكراسی:**

واتە دەوڵەتی شازادەكان، تەواوی كاروباری دەوڵەتیش بەپێی بیروڕای چینێكی دەوڵەمەند بەڕێوە بچێت و نرخ و ڕێزی سیاسیی ئەو كەسانەش بەپێی توانا و دەسەڵاتی ئابووریانە یان دەسەڵاتی سەربازی یان ئاینی هەر كێ بەپێی ئەندازەی دەست ڕۆیشتنی.

**٤ـ ئیستعمار:**

حوكمرانیی دەوڵەتێك بەسەر وڵاتێكی تردا بەزۆر ئیستعمار لەسەدەی پانزدە و شانزدەوە بە بۆنەی زۆربوونی سەرمایەوە لە چەند وڵاتێكی ڕۆژاوادا پێك هات و لەدایك بوو، بەتایبەتی دوای دۆزینەوەی زۆر جێگا و شوێن لەلایەن ئەوروپاییەكانەوە. لەسەرتاوە وڵاتە داگیركراوەكان وەكو كۆگا و عەماری وڵاتە داگیركەرەكان وا بوون. بەڵام لە دواییدا نەختێك توندوتیژی و خوێن ڕێژییەكەی كەم بووەوە و چەند كراسێكی تری لەبەركرد، لە شێوە ڕوخسارێكی دیدا خۆی بۆ گەلانی ژێر دەستە دەرخست و ناوی تری لە خۆی نا و شێوەی فەرمانڕەوایی خۆی گۆڕی. ئێستاش بە شێوەیێكی دیكە خۆی دەنوێنێ وەكو: یارمەتی دان و هاوكاریكردن لەگەڵ دەوڵەتان دا، پاراستنی ئاسایشی گەلان، پەیمان و پەیمانكاری.

**٥ـ بەلشەفیسم:**

بەشێكە لە قوتابخانەی ماركسیسم كە لەلایەن كۆمەڵێك شۆڕشگێری ڕووسەوە پێك هاتووە. ئەم ڕێبازە لەباوەڕێك دایە كە: دەبێت چینی كرێكار (پرولیتاریا) لەڕێگەی پێك هێنانی ڕێكخراوی ناوچەكانەوە كە لەژێر فەرمانی لیژنەی ناوەندیدا هێز و دەسەڵات بەدەست بهێنن و نابێت چاوەڕوانی ئەوەبن كەی سەرمایەداری لەخۆیەوە بێ هێز دەبێت وەكو ماركس گوتوویەتی و ئەو كاتە دەسەڵات بگرنە دەستەوە.

حزبی بەلشەفیك لە ساڵی ١٩١٧دا ڕژێمی (كرنیسكی) ڕووخاند و دەوڵەتی سۆڤیەتی پێك هێنا، ئەم حیزبە لەساڵی ١٩١٨دا ناوی خۆی گۆڕی و ناوی "حزبی كۆمۆنیستی" لە خۆی نا، تاكو ئێستاش تاكە حزبی یەكیەتی سۆڤییەتە.

### ٦- پارلمانتاریم:

واتە سیستەمی پەرلەمانی، واتا دەوڵەت هەر کارێك بکات دەبێت لە پارلەمان دا لێی بکۆڵدرێتەوە و لە کردەوەکانی دا بەشێوەیێکی راستەوخۆ بەرامبەر پارلەمان بەرپرسیارە.

### ٧- سۆسیالیسم:

لەسەرەتاوە قوتابخانەی سۆسیالیسم هەر بە خەیاڵ و ونارەزوو دانراو دەگوترا تا پەرەسەندنی یاسای سەرمایەداری کە ئەو کاتە بوو بە قوتابخانەیێکی زانستی.

سۆسیالیسم دەڵێ: ئەگەر بڕوانیت دەبینی یاساکانی کۆیلەداری و موڵك داری و سەرمایەداری میراتگری یەکتری بوون و ئەمەش بەپێی هەڵکەوت نەبووە؛ سۆسیالیسم یاسایێکی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە دەبێتە جێنشینی یاسای سەرمایەداری، لەیاسای سۆسیالیسم دا چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە بەرچاو ناکەوێت و بەرهەم بۆ خەڵکی تێکرایە.

### ٨- فاشیسم:

ئەم رێبازە لە شەڕی یەکەمی جیهان دا پەرەی سەند و لە زۆر بیروڕای جۆراوجۆر تێکەڵە: بیروڕای ناسیونالیسمی لە رێبازی هیگڵەوە وەرگرتووە، سۆسیالیسم لە مارکسەوە و زەبروزۆر لە مکیافیلی و رەگەز پەرستی لە تۆماس کارلایلەوە. ناودارانی ئەم رێبازە:

١- مۆسۆلینی لە ئیتالیا.
٢- هیتلەر لە ئەڵمانیا

بەرنامەی فاشیسمیان لە دە خاڵ روون کردۆتەوە:

١- دیکتاتۆری.
٢- دژی پەرلەمان.
٣- رێگەی تاکە حزبی.
٤- هاوبەستەکی حزب لەناو یەك دا.
٥- کوشت وبڕینی دوژمنانی سیاسی.
٦- سەلماندنی رۆشنبیری و بیروڕای فاشیسم بە میللەت.
٧- ژیانی کۆمەڵایەتی دەبێ لەژێر چاودێری دەوڵەت دا بێت.
٨- چوارچێوە دانان بۆ ئایدۆلۆژیی حزبایەتی.
٩- جێ بەجێ کردنی فەرمانی حزب بەبێ لێ دوان.
١٠- دابەش کردنی گەل و وڵاتانی دنیا بە دوو بەش: ا - فەرمان دەر ب – ژێر دەستە و فەرمانبەر

### ٩- فیودالیم "دەرەبەگی"

یاسایەکی ئابووری کۆمەڵایەتی سیاسییە، لەم رێگەیەدا خاوەن زەوی و زارە گەورەکان خاوەنی تەواوی بەرهەمن، جووتیاریش لەم یاسایەدا بچووکترین مافی بۆ تەرخان نەکراوە. فیودال (واتا دەرەبەگ) لە دام و دەزگای دەوڵەت دا دەست رۆیشتووە. ئەم شێوە یاسایە لەزۆر وڵاتی دنیادا لە کۆنەوە تاکو ئێستا هەبووە، ئێستاش بە شێوەی جۆراوجۆر لە زۆر وڵات دا بەرچاو دەکەوێت.

### ١٠- کۆمۆنیسم:

بەشێوەی دەوڵەتێك دەگوترێت کە لەسەر بنەڕەتی بیروباوەڕی مارکس و ئینگلس دامەزراوبێت، لەساڵی

١٨٤٨از دا كۆمۆنیستەكانی دنیا دوای كۆبوونەوەیان بۆ ئەم مەرامە هەول و تەقەلالایێكی فراوانیان دا بۆ میللی كردنی سەرمایە و كارخانە و هەموو داراییەكانی دی.
ماركس دەڵێ: دەوڵەتی كرێكاركرد و پرۆلیتاری دەبێ جێگری هەموو جۆرە شێوەیێكی فەرمانڕەوایی بێت.

**١١- نازیسم:**

وشەی (نازی) لە كورتەی ناوی حزبی (ناسیونالیسم سوسیالیستی كرێكاری ئەڵمان)ەوە وەرگیراوە. ئەم حزبە هی سەردەمی فەرمانڕەوایی هیتلەرە و بیروڕاكانی هیتلەر خۆی لە كتێبەكەیدا"خەباتی من" روون كراوەتەوە. ڕەگی بیروڕای نازیسم لەسەر دوو تەماڵ داكوتراوە:

أ – شێوەی فاشیسمی ئیتالیا.

ب – بیروڕای رەگەز پەرستیی ئەڵمان.

نازیسم لە باوەڕێك دابوو كە ڕەگەزی جەرمەن لە هەرچی رەگەزەكانی كە هەیە پاك و خاوێن ترە، میللەتی ئەڵمانیش لە هەرچی میللەتانی جیهان بەرزتر وەیا بڵندتر.

نازیسم دەڵێ: دەوڵەت رێكخراوێكی رەگەزایەتییە نەك ئابووری، بۆ ئەوەش دەسەلاتی هەبێت و بە گوێی بكرێت، دەبێ پڕ چەك و بە توانا بێت. شەڕ و شۆڕیش دەبێتە هۆی پێش كەوتنی شارستانەتی و پاك كردنەوەی رەگەزە ناپاكزەكان، وەكو رەگەزی جوولەكە و سلافەكان پێویستییەكی مرۆڤە، دەبێ لەناو ببردرێن.

# سیاسەت زان و رابەرە بەناوبانگەکانی گەلانی جیهان

**١- ئەباضە پاشا:**

خاوەن دەسەلاتێکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە کە بە دەستی سولتان مرادی چوارەم کوژراوە.



**٢- ئاتا تورك:**

مصطفەفا کەمال ئاتا تورك (١٨٨١ – ١٩٣٨ز) یەکەمین سەرۆك کۆماری تورکیایە و رابەری ئازادی ویستەکانی تورکیا بووە لە شەڕی یەکەمی جیهان دا. لەیاسای بنەڕەتی تورکیادا تەواوی دەسەلات و توانای خستە ژێر دەستی سەرکۆمارەوە، پەیڕەوی سیستەمی یەك حزبی و دکتاتۆری بووە، هەروەها ئاینی لە سیاسەتەوە جودا کردووە و چوار جار بوو بە سەرکۆمار، پایتەختی گوێزایەوە بۆ (ئەنکارە) و لە ئەستەمبول دا مردووە.



**٣- ئاتیلا (٤٥٣ ز مردووە)**

لەسالی ٤٣٤ز دا بووە بە شای بەربەرەکان. لەپێش دا لەگەل براکەیدا تەنیا پێکەوە فەرمانڕەواییان دەکرد بەلام بۆ ئەوەی لە حوکم دا تەنیا بمێنێتەوە برایەکەی خۆی کوشت. هەشت سال فەرمانڕەوایی کرد و هەمیشە لە شەڕ و شۆڕدا بوو. لەشکرەکەی لە ٧٥ هەزار شەڕکەر زیاتر بوو لە مێژوودا بە ئازا و خوێن ڕێژ و دڵ ڕەق ناو دەبرێت.

**٤- ئادیناور (١٨٧٦ز لەدایك بووە) *Adenaver***

بە یەکەمین سەرکۆماری ئەلمانیای رۆژاوادا دەژمێردرێت.

**٥- ئاراکچیڤ (١٧٦٩ – ١٨٣٤ ز) *Arakcheyev***

وەزیری شەڕی زەمانی ئەلەکساندەری یەکەمی رووسیای سپی بووە.

**٦- ئارتیگاس . جۆزێ (١٧٦٤ – ١٨٥٠ز) *Artigas. J***

قارەمانی گەلی ئۆرگوای و لەپێناوی سەربەستیی ولاتەکەیدا هەمیشە لەخەبات دابووە.

**٧- ئاشوور بانیبال:**

پاشای ولاتی ئاشوور بووە. لەسالی ٦٦٩ ی پ. ز بووە بە شا، شۆڕشی ولاتی میسری کوژاندەوە، پاشای عیلامییەکانی کوشت زۆر حەزی لە شارستانەتی و کتێب و نووسین کردووە، گەورەترین کتێبخانەی داناوە.

**٨- ئەلفرێدی گەورە (٨٤٨ – ٩٠٠ ز) *Alfred***

تەمەنی بیست و سێ سال بوو کە بوو بە پاشای ئینگلتەرە، کردارە بەناوبانگەکانی ئەلفرێد ئەمانەن:

أ – دوورخستنەوەی هێرش بەرەکانی ولاتی دانیمارك لە ولاتی ئینگلیز.

ب – دانانی سپا و لەشکرێکی دامەزراو.

ج – دانانی هێزێکی دەریایی.

د – بلاوکردنەوەی زانین و خوێندن.

٥ – نەهێشتنی زوڵم و زۆر.
لە ئاکام دا لەلایەن گەلەوە بە (یاریدەری زۆرلێکراوان) ناونرا.

**٩ـ ئامهرست** (١٧١٧ – ١٧٩٧ز)
مارشاڵێکی ئینگلیز بوو، وڵاتی کەنەدای داگیرکرد، لەدواییدا بوو بە فەرماندەی هێزی تێکڕای وڵاتی ئینگلیز.

**١٠ـ ئانی بال** (٢٤٧ – ١٨٣ پ. ز) *Annibal*
سەردار و سەرکردەی بەناوبانگی کارتاژ "قرطاج" کوڕی ئامیلکار بارکایە. باوکی لە نۆ ساڵی دا سوێندی دا کە تا دەمێنێت دەبێ دژومنی ڕۆمانەکان بێت.
لەڕێگەی ئیسپانیاوە لەچیاکانی (پیرنێ)وە بەسەد هەزار شەڕکەرەوە پەلاماری وڵاتی ڕۆمەکانی دا، دوای زەحمەتێکی زۆر بە بیست و چوار هەزار شەڕکەرەوە گەیشتە وڵاتی ئیتالیا، لە دووسێ شەڕدا ڕۆمانەکانی شکاند و لە شەڕێك دا چاوێکی کوێر بوو، لەبەر ئەوەی لە قرطاجەوە هیمدادی پێ نەگەیشت لە شەڕدا سەرنەکەوت و خۆی کوشت.

**١١ـ ئیبراهیم پاشا** (١٤٩٣ – ١٥٣٦ز)
یەکێك لە سەروەزیرانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە لەسەردەمی سوڵتان سلێمان دا. لە بنچینەدا کۆیلەیەکی گاور بووە. پاشان بە فەرمانی سوڵتان کوژراوە.

**١٢ـ ئەبو سەلەمە** (ئەل خەللال)
وەزیری ئەبو عەبباسی سەفاح بووە، یەکەمین کەسێك بووە کە لە دنیای ئیسلام دا بە وەزیر ناوبراوە و بەناوی (وزیر آل محمد) بەناوبانگ بووە، دوژمنی سەرسەختی بنەماڵەی ئەمەوییەکان بووە. لە ١٣٢ك لەلایەن ئەبو عەبباسی سەففاحەوە کوژراوە.

**١٣ـ ئەبوو عوبێدە** (لە ١٣ی ك مردووە)
باوکی (مختار الثقفي) بووە، سەرکردەیێکی سپای ئیسلام بوو، لە شەڕی (واقعة الجسر) لەلایەن ئێرانییەکانەوە کوژراوە.



**١٤ـ ئەسکەندەر** (٥٣٦) *Alexander*
لەتەمەنی بیست ساڵان دا بووە بەشای مەکەدۆنیا، گەلێك زیرەك و ئاگاداری زانیاریی سەردەمی خۆی بووە، لە بەهاری ساڵی ٣٣٤ی پ. زدا بە چل هەزار شەڕکەرەوە پەلاماری وڵاتی ئێرانی دا و لە ناوچەی "گۆگامل" نزیکی شاری هەولێر داریۆشی سێیەمی بەزاند. ئەوجا توانی وڵاتی ئێران داگیربکا. ئەوە بوو گەیشتە پایتەختی وڵاتەکەیان و سووتاندی. زیاد لە شەست شاری بەناوی خۆیەوە لەچوار گۆشەی دنیادا دروست کرد.



**١٥- ئەلیزابیثی یەکەم ( ١٥٥٢ -١٦٠٣ ) *Elisabeth***

کچی هێنری سێیەم و شاژنە ئان پۆلین بووە، ساڵی ١٥٥٨ بووە بە شا، لەبەر ئەوەیش کە لایەنگری ئاینی پرۆتستان بووە هیچ پەیرەوییێکی لە پاپای فاتیکان نەکرد. چل و پێنج ساڵ شایی کرد و شووی نەکرد. شکسپیر لە زەمانی ئەودا ژیاوە.

**١٦- باتیستا : *Batista***

سەرکۆماری وڵاتی کووبا بوو، لەساڵی ١٩٥٩ز دا دوای سەرکەوتنی شۆڕشی میللیی کووبا بە سەرۆکایەتی فیدل کاسترۆ لە کووبا رای کرد و کووبای بەجێ هێشت.

**١٧- بارودی "مەحموود سامی" ( ١٢٥٥ – ١٣٢٢ك )**

ناودارێکی گەلی میصرە، بیست و حەوت ساڵ لە میصر دوور خراوەتەوە و شاعیرێکی گەورەش بووە.

**١٨- باندرانایکا ( ١٩٠٧ – ١٩٥٩ ) *Bandaranaike***

سیاسەت کارێکی وڵات سیلان بووە، لەپێش دا مەسیحی بووە، پاشان بووە بە بوودایی، سەرەك وەزیرانی سیلان بوو لەلایەن دوژمنانییەوە کوژرا. لەبەر ئەوەیش خۆشەویست بوو ژنەکەی جێگەی گرتەوە.



**١٩- بایار "جەلال" *Bayar. G***

یەکێکە لە ناسراوانی وڵاتی تورکیا، لە ناوچەی (بوسای)ی تورکیا لەدایك بووە، ساڵی ١٩٥٧ بووە بە جێگیری سەرەك وەزیران و بووە بە سەرەك وەزیران لە جێگەی ئینۆنۆ دا، ساڵی ١٩٥٤یش بوو بە سەرکۆمار.



**٢٠- برێژنێف "لیونید ئیلیڤیچ" *Breghner. Ly***

یەکێك بووە لە رابەرانی وڵاتی سۆڤیەت. لە زانکۆدا بەشی ئاسن تواندنەوەی تەواو کردووە لە ساڵی ١٩٤١ – ١٩٤٦ بووە ئەفسەی بەشی رامیاریی سپای سوور، بووە بە سکرتێری یەکەمی حزبی کۆمۆنیستی ناوچەی (ئاپورژی)، بووە بە ئەندامی سیاسیی لیژنەی ئۆکراین، لە ساڵی ١٩٥٠دا بووە بە سکرتێری لیژنەی ناوەندیی ناوچەی مۆلداڤیا، لە ساڵی ١٩٥٢دا بووە بە ئەندامی لیژنەی ناوەندیی حزبی کۆمۆنیستی هەموو یەکێتی سۆڤیەت سکرتێری یەکەمی حزبەکە. لەساڵی ١٩٨٤یشدا بوو بە سکرتێری یەکەمی حزبەکە.



**٢١- بەرمەکی "جەعفەر کوڕی یەحیا" ( ١٤٩ – ١٨٧ ك )**

یەکێك بووە لە وەزیرەکانی هاروونە ڕەشید، بە فەرمانی هاروونە ڕەشید کوژراوە لەگەڵ تێکڕای بنەماڵەکەیدا.

**٢٢- بیریا "لاڤرتنی باڤلوڤیچ" (١٩ – ١٩٥٣ ز) *Beria***

سەرەکی پۆلیسی نهێنی سەردەمی ستالیف و لەهەمان کات دا ئەندامی لیژنەی ناوەندیی حزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت بوو، پاش مردنی ستالین بە فەرمانی لیژنەی ناوەندیی حزبەکە گوللە باران کرا و کوژرا.

**٢٣- بۆناپەرت. ناپلیۆن (١٧٦٩ – ١٨٢١ ز) *Bonapart. N***



لە قوتابخانەی سەربازی دا خوێندنوویەتی و لەشەڕی (تۆلۆن) دا خۆی پیشان داوە و بووە بە فارەمانێکی نەتەوەیی و لە سالی ١٧٩٧دا بووە بە سەر لەشکری سپاییکی گەورە، کە بۆ داگیرکردنی میصر و رێگا دۆزینەوە بۆ ولاتی هیندستان بەڕێ کرا. هێزی دەریایی ئینگلیز بە فەرماندەیی نێلسن ناپلیۆنی بەزاند. لەسالی ١٧٩٩دا بوو بە کۆنسولی یەکەم لە فرانسادا و دەسەلاتی گرتە دەست تا لە سالی ١٨٠٤ بوو بە ئیمپراتۆری فرانسە. لەبەر نەزۆکی جۆزەفینی ژنی تەلاق دا، ماری لوییزی کچی شای نەمسای مارەکرد. هێرشی بردە سەر ڕووسیا لە شەڕەکان دا سەرکەوت بەلام ساردیی زستانی ولاتی ڕووسیا تۆلەی لێ کردەوە بەدەست بەتالی گەڕایەوە ولاتی خۆی.

لەسالی ١٨١٣دا هاوپەیمانەکان – برووسیا و نەمسا و رووسیا، لەناوچەی لایبزیك دا بە سەریدا زال بوون و لە ئیمپراتۆری دەریان کرد و لە دوورگەی ئەلپ بەندیان کرد. بەلام دووبارە گەڕایەوە فرانسە.. ئەم جارەش لە شەڕی واترلۆدا دیسان بەسەریدا زال بوونەوە و بە دەستەسەری بۆ دورگەی سانت هێلانە دووریان خستەوە و هەر لەوێ دا مرد.



**٢٤- بۆرقیبە "حەبیب کوری عەلی" (١٩٠٣ز – )**

لەسالی ١٩٥٠دا بووە بە سەرۆوەزیرانی توونس و لە سالی ١٩٥٧دا بووە بە سەرکۆمار لەلایەن دەوڵەتەوە بە (المجاهد الاکبر) نا دەبرێت.

**٢٥- بوو میدیەن "هەواری" (١٩٢٧ز – )**

دوای سەربەخۆیی ئەلجەزایر لەدەست فرانسا لەسالی ١٩٦٢دا کرا بە وەزیری بەرگری، لەسالی ١٩٦٥دا سەرکۆماری ولات (بن بیللا)ی دەرکرد و خۆی بوو بە سەرکۆمار.



**٢٦- بسمارك (١٨١٥ – ١٨٩٨ز) *Bismarek***

بە تەقەللای ئەو ئیمپراتۆریەتی ئەلمانیا پێك هات. لە بنەمالەیەکی خانەدانە و زانکۆی سەربازی تەواوکردووە. سالی ١٨٥٩ بووە بە سەفیری ئەلمانیا لە ڕووسیا، سالی ١٨٩٠ بووە بە سەرۆوەزیرانی ئەلمانیا، لە شەڕدا بەسەر دانیمارك دا سەرکەوت. بیسمارك یەکیەتیی ئەلمانیای بەشەڕ دەست هێنا و ئاشتی چەسپاندی.

**٢٧- باسکوڤیچ (١٧٨٢ – ١٨٥٦) *Basklevltch***

سەر لەشکرێکی سپای رووس بووە، لە شەڕەکانی ١٨٥٦دا لەگەڵ ئێران دا فەرماندە بووە و بەسەر ئێران دا زال بووە.



٢٨ـ پۆمپێ *Pompee*

فەرماندەیێکی لەشکری رۆم بووە لەساڵی ٨٨ی پێش زایین دا بە دەستی سەربازەکانی خۆی کوژراوە.



٢٩ـ پۆمپیدۆ .جۆرج. *Pompidou*

لە دەوڵەتی جەنراڵ دیگۆل دا بەشدار بوو، دوای میشێل دوبرێ بووە بە سەرەك وەزیران و لەئاکام دا بووە بە سەرکۆماری فرانسا.



٣٠ـ تالیران "پریکۆر" (١٧٥٤ – ١٨٣٨ز) *Tolleyrand. P*

لەبەشی ئایین دا دەرسی خوێندووە، زۆر توند و خوو رەفتاری ناشیرین بووە، بووە بە قەشەی شاری ئوتون، لەساڵی ١٧٨٩دا بووە بە نوێنەری قەشەکان لە شۆرشی فرانسادا. لە ساڵی ١٧٩٤دا دیسانەوە گەڕایەوە فرانسا دوای لەناوچوونی پاشایی رایکردە ئینگلتەرە، لە ساڵی ١٧٩٩دا لەسەر دەمی فەمانرەوایی لویسی هەژدەمین دا بوو بە وەزیری دەرەوەی وڵات. سیاسەت زانێکی ناودار و فێڵباز بوو.



٣١ـ ترۆتسکی "لیۆن" *Trotesky. L*

یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکیەتی سۆڤیەت. لە ساڵی ١٨٩٤دا چووەتە جەرگەی خەباتی گەلی رووسیاوە لە ساڵی ١٩٠٠دا بۆ سیبریا دوور خراوەتەوە بەڵام لە ساڵی ١٩٠٢دا توانیویەتی رابکات و خۆی بگەیەنێتەوە خەباتگێران. یار و یاوەری "لینین" بوو. لەرێك خستنی سپای سووردا دەستێکی باڵای هەبووە. دوای مردنی "لینین" لەگەڵ "ستالین"دا تێك چوو، لە حزب و لە یەکیەتی سۆڤیەت دا دەریان کرد. زۆر لە وڵاتان پەنایان نەدا تا تورکیا گرتییە خۆی لەدواییدا بە پلانی دام و دەزگای ستالین لەلایەن کابرایێکەوە کە خەڵکی بلژیکا بوو بە تەور کوژرا.



٣٢ـ تیتۆ "یوسف برۆز" (١٨٩٢ – ١٩٨٠) *Tito*

کوڕە ئاسنگەرێکی هەژار بوو، لەبەر دەست کورتی بوو بە کۆمۆنیست. لە ژیانیدا بەند و ئازاری زۆر دیوە. بووە بە رابەری پارتیزانەکان کە بە جەرگانە دژی ئەڵمانی نازی شەڕیان کرد. حزبێکی دانا بەناوی "بەرەی ئازادی میللەت". لە هەڵبژاردنی تێکراییدا، بەسەر پاشادا – بطرسي دووەم – سەرکەوت و لە پاشایی خست و بوو بە سەروەزیرانی یۆگۆسلافیا. زۆر مل کەچی یەکیەتی سۆڤیێت نەبووە. بووە بەسەر کۆماری یۆگۆسلافیا تا مردن.



٣٣ـ جەناح "محمد علی" (١٨٧٦ – ١٩٤٨) *Jannah. M*

رابەری میللەتی پاکستان بووە، لە بەریتانیا لە بەشی (یاسا)دا زانکۆی تەواوکردووە. لە بنەماڵەیێکی دەوڵەمەند بووە، سەرەتا باوەڕی وابوو کە دوو میللەتی هیند و پاکستان دەتوانن پێکەوە لەژێر سێبەیر یەك رژیم دا بژین. بەڵام لە دواییدا جیابوونەوەی پەسندکرد. بوو بە سەرۆکی حزبی "مسلم لیك" لە ئەنجام دا بوو بە سەرۆکی رەسمی وڵاتی پاکستان.



### ٢٤ـ چیرچڵ "وینستون" (١٨٧٤ – ١٩٦٤) *Churchill*

سیاسەت زانێکی بەناوبانگی وڵاتی ئینگلیزە لەساڵی ١٩٠٠ بووە بە ئەندامی پەرلەمانی ئینگلیز، ساڵی ١٩١١ بووە بە وەزیرە دەریاداری، لە ساڵی ١٩٤٠دا بووە بە سەرەك وەزیرانی وڵاتی ئینگلیز. نووسەرێکی ناسراو بووە و دەربارەی شەڕی دووەمی جیهان زۆری نووسیوە لەساڵی ١٩٥٣دا پاداشتی ئەدەبیی (نۆبل)ی پێ براوە.



### ٢٥ـ چەمبێرلین "ئۆستن" (١٨٦٣ – ١٩٣٧) *Chamberlain*

لەساڵی ١٨٩٢دا بووە بە ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیا، ئنجا بووە بە وەزیری دارایی. لە ساڵی ١٩٢٣دا بووە بە وەزیری دەرەوە. لە ساڵی ١٩٢٦دا پاداشتی نۆبلی وەرگرتووە.

### ٢٦ـ جەنگیز "تیمۆجین یوسای" (٥٤٩ – ٦٢٤ ك)

باوکە جەنگیز سەرکۆماری هۆزی "قیات" بوو، باجی داوە بە ئیمپراتۆری چین، توانی هۆزەکانی دەوروبەری خۆی لە خۆ کۆبکاتەوە و پەیمانیان لەگەڵ ببەستێت.. ئەوەبوو پەلاماری سوپای ئیمپراتۆری دا و بەزاندی و بنچینەی حوکمڕانی بۆ خۆی دانا.

لە ساڵی (٦٠٠ ك) دا (نایمان)ە بەسەر یەك دا شکاند و لەساڵی ٦٠٣دا هۆزەکانی قەرقیزیای خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و شاری پەگینی بگرێت. لەساڵی ٥١٦دا بە لەشکرێکی دووسەد هەزار کەسییەوە پەلامارە وڵاتی ئێرانی دا و کوشتارێکی زۆری لەخەڵك کرد.

جەنگیز جیهانگیرێکی دڕ و خوێن خوار و زیرەك و باوەڕ بە خۆ و کارساز بووە.

### ٣٧ـ جوێن لای: (١٨٩٨ - ) *Chov-en-lai*

شۆڕشگێڕێکی وڵاتی چینە، لە فەرەنسا زانکۆی تەواوکردووە، یەکەمین سەرەك وەزیری چینی کۆمۆنیستە.



### ٣٨ـ چۆمبە "موسی" *Ischombe. M*

خەڵکی کاتانگا بووە لە ئەفریقا. ماشەی دەستی داگیرکەری بلژیك بووە. بە ئازارەوە ڕابەری ئازادیخوازانی کاتانگای کوشت کە ناوی لۆمبۆمبا بوو.



### ٣٩ـ چان کای چیك: (١٨٨٢ - ) *Chan Kal Chek*

مارشاڵێکی وڵاتی چین بوو لە ژاپۆن زانکۆی تەواوکردووە، ساڵی ١٩٢٨ بووە بە فەرماندەی هێز و سپای چین، دوای شەڕی دووەمی جیهان و شەڕی ناوخۆی وڵاتی چین کۆمۆنیستەکانی چین لە وڵات دەریان کرد. بەڵام توانی لە دورگەی فەرمۆزەدا دەوڵەتی چینی نیشتمانی دا بمەزرێنێت.

٤٠ـ خرۆشچەڤ: (١٨٩٤ - ) *Khrucheher*



دوای مالینکۆڤ بووە بە سکرتێری یەکەمی حزب لە وڵاتی یەکیەتی سۆڤیەت دا. بەشی کرێکارانی زانکۆی (خاکۆڤ)ی تەواوکردووە. پێنج ساڵ لەناوچەی ئۆکراین خەباتی کردووە، لە شەڕی جیهانیدا بەشدار بووە. کە بوو بە فەرمانڕەوا تا ئەندازەیەك لەناو وڵاتی سۆڤیەت دا سەربەستیی بڵاوکردەوە و پەیڕەوی سیاسەتی ئاشتی خوازانە بوو لەگەڵ رۆژاوادا.



٤١ـ حەججاج کوڕی یوسف (٤١ –٩٥ ك):

لەلایەن خەلیفەوە فەرمانی پێدرا هێرش بباتە سەر عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر لە مەککە. لەو شەڕەدا مەنجەنیقی بەکارهێنا و کەعبەش مەنجەنیقی بەرکەوت. کە مەککەی گرت عەبدوڵڵای کوشت و سەری بە دیاری نارده شام لەشەکەشی بە داردا هەڵواسی. دڕ و سەخت بووە. کراوە بە فەرمانڕەوای عیراق، لە بیست ساڵ زیاتر لە کووفە و بەصرەدا حوکمڕانی کردووە، شاری (واسط)ی دروست کردووە. لە زەمانی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك دا لە پەنجا و چوار ساڵی دا بە نەخۆش مردووە.



٤٢-حەموورابی: (لە ١٩١٣ پ.ز مردووە):

لە ساڵی ١٩٤٥ ی پێش زاییندا بووە بە شا، پاشایەکی هەرە بەناوبانگی بابلییەکان بووە لە یاسا بەناوبانگەکانی هێشتا هەر ستایشی لیدەکری، یاسای حەموورابی بریتی بووە لە پاراستنی ئەم خاڵانە: بەدرۆ سوێند خواردن، بوختان، بەرتیل دان بە قازی، شایەت سەندن، نارەوایی، دەست درێژکردن بۆ دارایی خەڵك، پێوەندی لەنێوان گەورەو بچووکیدا، مافی خێزان و زۆر شتی دی.

٤٣ـ دی گۆل (١٨٩٠ - ) *De Gaulle*



یەکەمین سەرکۆماری جمهوورییەتی پێنجەمی وڵاتی فرانسا بوو، لەشەڕی یەکەمی جیهان دا بەشداری کردووە، لەشەڕی دووەمی جیهانیشدا لەسەرەتاوە ڕایکرد بۆ ئینگلتەرە و لەوێوە سپای ئازادی فرانسای پێك هێناو دژی ئەڵمانیای داگیرکەری وڵات کەوتە تێکۆشان. لەساڵی ١٩٤٥دا بوو بە سەرکۆماری جمهوورییەتی چوارەم. دوای شۆڕشی گەلی (ئەلجەزایر) دژی فرانسا کە داگیری کردبوو بوو بە سەرەك وەزیران و لە ساڵی ١٩٤٩دا بوو بە سەرکۆماری جمهوورییەتی پێنجەمی وڵاتی فرانسا. لەسەردەمی ئەودا ئەلجەزایر و چەند وڵاتێکی تری ژێردەستە سەربەخۆییان وەرگرت، هەروەها فرانسا توانی لە ڕیزبازی (ئەتۆمی)دا پلەیێکی شایان بەدەست بهێنی. چینی میللیشی بە ڕەسمی بە دەوڵەت ناسی.



٤٤ـ راسپۆتین (١٨٧٢ – ١٩١٠ز) *Raspouitin*

پیاوێکی بەناوبانگی کۆشکی نیکۆلای دووەمی قەیسەری رووسیا بوو. راسپۆتین دەیگوت خۆشبەختی مرۆڤ و رووحیی مرۆڤ بە جووڵانەوەی ئاینی تێکەڵ بە رابواردنی توخم بازی (جنس) بەدەست دێت. لەوڵاتی بولسك دا لە رووسیا لەدایك بووە و بە خاوەن توانای رووحی بێ وێنە ناوی دەرکرد. تا دوو جار کوڕەکەی قەیسەری لە نەخۆشیی (هیموفیلی) چارەکرد، ئەم چارەکردنە بووە هۆی پەرەسەندنی نرخ و ڕێزی

لای قەیسەر و ژنەکەی. لەکاتێك دا وڵاتی رووسیا لە هەرا و دەردەسەری ماوەی پێش شەڕی یەکەمی جیهان دا بوو، کۆشك و دەربـاری قەیـسەری رووسـیا کـەوتبووە ژێـر فـەرمان هـەوەس بـازیی راسـبۆتین. چـەند گەورەپیاوێکی رووسیا دەرمان خواردیان کرد بەڵام ژەهر کاری تێنەکرد، تا لەدواییدا بە گوللە کوشتیان کرد و لاشەکەیان فڕێدایە رووباری "توا"دوە.



٤٥ ـ رۆبسپێر ( ١٧٥٧ – ١٧٩٤ز) *Robesbierre*

یەکێکـە لـە پیـاوە ناودارەکـانی شۆڕشـی فڕانـسا، زانکـۆی "پاسـا"ی لـە پـاریس تەواوکردووە و بووە بە پارێزەر، لایەنگری بیروڕای ژان ژاك ڕوسۆ بـووە و بـەپێی بیروڕای تایبەتی خۆی باوەڕی بە دیـن هـەبووە. لە ئەنجامـدا لەلایـەن شوڕشگێڕانەوە لە گیوتین (مقصلە) کوژراوە.



٤٦ ـ رۆمیل ( ١٨٩١ – ١٩٤٤ز)

فیلد مارشاڵی ئەڵمانییە، لە شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانیدا بەشداربووە، لە ساڵی ١٩٣٢دا بووە بە پارێزەری تایبەتی هیتلەر، لە ١٩٤١ دا بووە بە فەرماندەی سپای ئـەڵمان لـە ئەفریقیا لە ساڵی ١٩٤٢دا بووە بە فەرماندەی سوپای ئەڵمان لە فڕانـسا و بـە بەشـداربوون لە کوشتنی هیتلەردا تاوانبار کرا، بۆیە زۆریان لێ کـرد کـە خـۆی دەرمـان خـوارد بکات و خۆی بکوژێت. رۆمیل لە شەڕدا بە (ڕێوی بیابان) ناوبانگی دەرکرد.



٤٧ ـ رۆبنترۆپ ( ١٨٩٣ – ١٩٤٦ز)

وەزیری دەرەوەی سەردەمی هیتلەر بوو، لە دادگای نۆرینبورگ دا بڕیاری مردنی درا.

٤٨ ـ زاپاتا "ئەملیانۆ" ( ١٨٧٩ – ١٩١٩ز) *Zapata*

لە ١٩٠١ز لەژێر دروشمی (زەوی و سەربەستی) بۆ شۆڕش دەستی دایە چەك، لەساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٥ سێ جار شاری مەکسیکۆی داگیرکرد. لەلایەن دەوڵەتەوە بە فێڵ کوژرا بە قارەمانێکی میللەتی مەکسیك ناسراوە.

٤٩ ـ زەغلوول "سعد" ( ١٨٥٠ – ١٩٢٧ز)

رابەری ئازادیخوازانی میللەتی میصر دژی ئینگلیزی داگیرکەر بوو، زۆر جار لە میصر دوورخراوەتەوە، سەرۆکی حزبی (الوفد) بوو. ساڵی ١٩٣٤ بوو بە سەرەك وەزیران ئەمەش دوای هەڵبژاردنی پەرلەمان. تا مـردن لە پێناوی ئازادیی میصردا هەر لە خەبات دا بوو.



٥٠ ـ ژاندارك ( ١٤١٢ – ١٤٣١ز) *Janndare*

لە (دومری) لەدایك بووە، قارەمانی میللەتی فڕانسا و زۆر بەدین بووە. لە ساڵی ١٤٢٩ز دا جل و بەرگی پیاوانەی لەبەرکرد لە پێناوی سەربەستیی فڕانسادا کەوتـە تێکۆشـانەوە و شاری ئۆرلیـانی گـەمارۆدا، لای ئینگلیزەکـان بـە کچی ئورلیـان بەناوبانگـە. لـە شـەڕێك دا بریندار کرا و لە رووداوی دا بە فێڵ لەلایـەن دەسـتەی (بورجنیون)ەوە دەسـتگیرکرا و بـە ئینگلیزە داگیرکەرەکانی فڕانسایان فرۆشت. ئینگلیزەکانیش بەپێێ بڕیاری کڵێسای بریتانیا لە گۆڕەپانی بۆمارشێدا سووتاندیان.



٥١ ـ سون یات سەن (١٨٦٦ – ١٩٢٥ز) *Sun Yat Sen*

سیاسەت زانێکە بەناوبانگی میللەتی چینە لەساڵی ١٩١٧ز دا بووە بە سەرکۆماری وڵاتی چین.

٥٢ ـ سپارتاکۆس *Spartacus*

لە ساڵی ٧١ی پێش زایین کوژراوە، سەرکردەی کیلە شۆڕشگێڕەکانی سەردەمی دەسەڵاتی رۆما بووە، لە سەری سرویل دا بە دەستی کراسوس کوژراوە.

٥٣ـ ستالین "یوسف ڤیسارونوڤج" (١٨٧٩ – ١٩٥٣ز) *Stalina*

دوای ئەوەی چووە جەرگەی شۆڕشگێرانەوە ناوی خۆی نا ستالین وا پۆڵایین. لە سەرەتاوە لە قوتابخانەی ئایینی تفلیس خوێندی بەڵام دەرکرا، دوایی بۆ بە ئەندامی حزبی سوسیال دیموکراتی قەفقاسیا، پاشان حزبەکەی خۆی لەناو بەلشەفیك دا تواندەوە و بوو بە یەکێك لە باوەڕپێکراوانی لینین. لە ساڵی ١٩٢٢دا بوو بە سکرتێری حزبی کۆمۆنیست دوای مردنی لینین لەگەڵ کامنین و زینوبوف دا دەزگای رابەرییان گرتە دەستەوە. لە ساڵی ١٩٢٧دا دوو دوژمنی هەرە گەورەی خۆی لەناوبرد یەکەمیان ترۆتسکی و دووەمیان زینوبوف. ئیتر بوو بە سەرۆکی بێپرسیاری سۆڤیەت. لە کۆبوونەوە بەناوبانگەکانی تاران یالتا، بوتسدام دا بەشداربووە. گەلێك توند و تیژ و دڵڕەق ناوبراوە. بە خوێن پژانی مێشك مردووە.

٥٤ ـ شیشەکلی

لە ١٩٠٠ لەدایك بووە، سیاسەت زانێکی خەڵکی سووریا بوو لە رێگەی هەڵگێڕانەوەی سپاییدا ساڵی ١٩٥٢ بوو بە سەرکۆماری سووریا.



٥٥ـ طارق کوڕی زیاد

سەرلەشکری ئیسلام بوو وڵاتی ئیسپانیای داگیرکرد دوای ئەوەی لە دەریا پەڕییەوە چیایێکی داگیرکرد کە تاکو ئێستا هەر بەناوی ئەوەوەیە. ساڵی (١٠٢ك)مرد.



٥٦ـ عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر

یەکێك لەو پێنج کەسانە کە بەیعەتی لە (یەزید) نەکرد. ساڵی (٧٣ك) لەلایەن حەجاجەوە کوژرا.

٥٧ـ عەبوڵڵای کوڕی زیاد (٢٨ – ٦٧ك)

سەرکردەیێکی سەردەمی یەزید بوو، کرا بە فەرمانڕەوای کووفە و عیراق. رووداوی بەناوبانگی کەربەلا و شەهیدبوونی ئیمام (حسێن) (ع) بە پیلانی ئەو ئەنجام دراوە. لەلایەن ئیبراهیمی کوڕی مالکی ئەشتەرەوە کوژراوە.



٥٨ ـ عرابی پاشا: (١٨٤٠ – ١٩١١ز)

ئەحمەد عرابی ئازادیخوازی میللەتی میصرە، لەم رووەوە هەر لە تێکۆشان دا بووە. ئینگلیزەکان بۆ دورگەی سیلان دووریان خستۆتەوە و لە ساڵی ١٩٠١ ز دا ئازادکراوە.

٥٩- عەمری کوڕی عاس

فەرماندەی بەناوبانگی ئیسلام لە سەردەمی خەلیفایەتیی حەزرەتی عومەردا لەگەڵ ڕۆمییەکان دا لە شام شەڕی کردووە و وڵاتی میسری ئازادکردووە.



٦٠- فرانکۆ (١٨٢٢ - ) *Franco*

ژەنراڵی بەناوبانگی ئیسپانیا، دەوڵەتێکی دکتاتۆریی (مطلق)ی پێك هێنا دوای ئەوەی رژێمی کۆماری ڕووخاند. بڕیاری دا تا مردن دەسەڵات بە دەستییەوە بێت، دوای مردنیشی دەسەڵات بگەڕێتەوە بۆ شا.



٦١- فردریکی گەورە (١٧١٢ز لەدایك بووە)

لەساڵی ١٧٤٠ز دا بووە بە شای بڕووسیا، وڵاتی نەمسای داگیرکرد، تێ کۆشاوە ڕۆشنبیری و زانین و هونەر و کشتوکاڵ و پیشەسازی لە وڵاتەکەیدا بڵاو ببێتەوە.



٦٢- فووشە "جۆزێف" (١٧٥٩ - ١٨٢٠ز) *Fooche. J*

سیاسەت ناسی ناسراوی وڵاتی فرانسا لە سەردەمی ناپلیۆن دا بووە بە وەزیری پۆلیس. لە گەڕانەوەی سەد ڕۆژەی ناپلیۆن دا خیانەتی لێ کرد. دوای گەڕانەوەی بنەماڵەی بوربون دیسان کرایەوە بە وەزیر.

٦٣- قوبیلای قائان (١٢١٢ - ١٢٩٤ز)

کوڕەزای جەنگیزخان بوو، دە ساڵ لەگەڵ باپیریدا لە شەڕەکانیدا بەشداری کردووە، دوای مردنی باپیری لەگەڵ براکەی دا لەسەر شایەتی تێك چوو، بەڵام بەسەریدا زاڵ بوو، پەکینی کردە پایتەخت. مارکۆ پۆلۆی زۆر خۆش دەویست.



٦٤- کاترینی گەورە (١٧٢٩ - ١٧٩٦ز)

لەتەمەنی پانزدە ساڵیدا بووە بە دەزگیرانی (پتروس)ی ڕووسیا و بە درێژایی پانزدە ساڵیش لەگەڵیدا بە ئازار و ناڕێکی ژیاوە، لەدواییدا دەسەڵات و هێزی لە چنگ دەرهێنا و بۆ ماوەی سی و چوار ساڵ خۆی فەرمانڕەوایی وڵاتی ڕووسیای کرد، دڵداری کاترین لەگەڵ بۆ تەمکین و زۆر لە ئەفسەرەکانی بەناوبانگە. لەدواییدا دڵی وەستاوە و مردووە.



٦٥- کراسوس (١١٥ - ٥٣ پ. ز) *Carsus*

دەسەڵاتدار و فەرماندەیێکی ناسراوی ڕۆمانی بوو بە سەرکردەیی ئەو شۆڕشەکەی سپارتاکۆس کوژێندرایەوە.



٦٦- كله مانسو ( جۆرج ) *Clemenceau*

سیاسەت زانی وڵاتی فەرەنسا لە ١٩٠٦دا بوو بەسەرۆک وەزیران، لە ساڵی ١٩١٩دا کۆنفرانسی ئاشتی فەرسای پێک هێنا.



٦٧- گاریبالدی "جۆزێ" *Garibaldi*

لەشاری (دنیس)ی ئیتالیا لەدایك بووە، لەساڵی ١٨٤٩دا چووەتە ریزی شۆڕشگێڕانەوە و توانی سپای فەرەنسا بەرەو دوا بگەڕێنێتەوە. لەئەنجام دا دەستگیرکراو بۆ نیویۆرك دوور خرایەوە. لەساڵی ١٨٥٣ دا گەڕاوەتەوە ئیتالیا.



٦٨- گاندی "مهاتما"

لەزانکۆکانی ئینگلیز دەرسی خوێندووە، لە سەرەتادا کە دەستی بە سیاسەت بازی کرد لە شاری (بۆمبای) و لە ئەفریقای خوارووەدا، دەربارەی مافی ئەو هیندییانەی لەوێدا دەژیان تێکۆشا.

گاندی بە دیمەنی ئازادیی میللەتی هیندوستان دەژمێردرێت رێگەی تایبەتی بەربەرەکانێ و خەباتی گاندی لە پێناو ئازا دیدا بەناوبانگە، کە باوەڕی بە بەکارهێنانی زۆر و چەك و تەقەمەنی نەبوو، خواردنی تەنیا شیری ئەو بزنە بوو کە خۆی بەخێوی دەکرد. ساڵی ١٩٢٢ ئینگلیزەکان بە شەش ساڵ بەندیخانە حوکمیان دا، بەڵام دوو ساڵ تێ پەڕاند و ئازادکرا. لەئەنجامی خەباتی گەلی هیندستان دا بەرامبەریی گاندی و بەو شێوە تایبەتییەی کە باس کرا بەریتانیا ناچار بوو دان بە سەربەخۆیی هیندستان دا بنێ. لەساڵی ١٩٤٨دا لەلایەن هاونیشتمانێکی خۆیەوە کوژرا.



٦٩- لافایێت ( ١٧٥٧ – ١٨٤٤ز ) *Lafayeitte*

لە شازادەکانی فەرەنسا بوو، ویستی یارمەتیی گەلی ئەمریکا بدا دژی ئیستعماری ئینگلیز، بەڵام لویسی شانزدەمین پلانەکەی بەدڵ نەبوو. لەگەڵ سیانزدە کەس بەرەو ئەمریکا کەوتە رێ و گەیشتە رووباری واشنگتۆن. دیسان گەڕایەوە فەرەنسا و ئەم جارە خەڵکێکی زۆری لەگەڵ خۆیدا بردە ئەمریکا بۆ پشتگیری شەڕکەرانی دژی ئینگلیز. لەدواییدا گەڕایەوە پاریس و لەوێدا مرد.



٧٠- لینین "ڤڵادمیر ئیلیچ" *Lenine*

دانەری گەورەترین شۆڕشی دنیای ئەمرۆی مرۆڤە. کوڕی مامۆستایێکی بێ ناوی خەڵکی رووسیا بوو، لەکاتێك دا لە زانکۆی شاری (قازان) دەیخوێند، گیرا و بۆ سیبریا دوورخرایەوە. تەواوی نووسینەکانی کارل مارکسی بەلاوە گرنگ و بەرێز بوو کتێبێکی نووسی بەناوی (سەرمایەداری لە رووسیادا). رۆژنامەیێکی شۆڕشگێڕانەی دەرهێنا و بە یارمەتیی بەلشەفیەکان توانی دەسەڵات لە دەستی (کرنسکی) دەربهێنێ و لە ١٩١٧دا بوو بە یەکەم سەرۆکی دەوڵەتێکی سۆشیالیست لە دنیادا. لەساڵی ١٩١٨دا لەلایەن دوژمنانییەوە بریندار کراو لە ساڵی ١٩٢٤دا مرد و لەشەکەی لە تەلاری (کرملین) پارێزراوە.

| | |
|---|---|
| ١٣- فیلیمور | ١٨٥٠ ز |
| ١٤- پیرس | ١٨٥٣ ز |
| ١٥- بوکانان | ١٨٥٧ ز |
| ١٦- لینکۆلن "ئەبراهام" | ١٨٦١ ز |
| ١٧- جانسون "ئەندریو" | ١٨٦٥ ز |
| ١٨- گرانت | ١٨٦٩ ز |
| ١٩- هایز | ١٨٧٧ ز |
| ٢٠- گارفیلد | ١٨٨١ ز |
| ٢١- ئارتور | ١٨٨١ ز |
| ٢٢- کلیولند (گروڤر) | ١٨٨٥ ز |
| ٢٣- هاریسون | ١٨٨٩ ز |
| ٢٤- کلیولند | ١٨٩٣ ز |
| ٢٥- ماك کینلی | ١٨٩٧ ز |
| ٢٦- رۆزفلت (تیودۆر) | ١٩٠١ ز |
| ٢٧- تافت (ولیام) | ١٩٠٩ ز |
| ٢٨- ویلسون | ١٩١٣ ز |
| ٢٩- هاردتیك | ١٩٢١ ز |
| ٣٠- کولیج کولوین | ١٩٢٣ ز |
| ٣١- هوڤەر | ١٩٢٩ ز |
| ٣٢- رۆزفلت (فرانکلین) | ١٩٣٣ ز |
| ٣٣- ترومەن (هاری) | ١٩٤٥ ز |
| ٣٤- ئەزنهاوەر (دوایت) | ١٩٥٣ ز |
| ٣٥- کەنەدی (جان) | ١٩٦١ ز |
| ٣٦ – جانسون (لیندون) | ١٩٦١ ز |
| ٣٧- نیکسون | ١٩٦٦ ز |

**١٣- ئیتالیا**

مێژووی نوێی ئیتالیا لەدوای ساڵی ١٨٥٩ ەوە دەست پێ دەکات. دوای شەڕی یەکەمی جیهان جووڵانەوەی فاشیسم بە رابەریی مۆسۆلینی پەرەی سەند (دژی کۆمرنیسم و سۆسیالیسم) لە ساڵی ١٩٢٢دا فاشستەکان هاتنە سەر کار و ئیتالیا هێرشی بردە سەر حەبەشە و لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا یاریدەری فرانکۆی دا دژ بە جەمهوری خوازەکان. لەدوا دوای شەڕە گەورەی دووەم دا مۆسۆلینی لەلایەن پارتیزانە ئیتالیاییەکانەوە گیرا و کوژرا و لە هەڵبژاردنێکی گشتیدا رژێمی پاشایەتی پێچرایەوە و ئیتالیا بوو بە جەمهورییەت. ئەنریکۆ دو نیکولا بوو بە یەکەمین سەرۆکۆماری ئیتالیا لە ئەنجامی هەڵبژاردن دا.

**١٤- ئیرلەندە *Irland***

نزیکەی پێنج سەدە بە دەست بەریتانیاوە بوو ئینگلیزەکان یەکسەر سەرپەرشتی حوکمرانییان دەکرد لەو وڵاتەدا. لە ساڵی ١٩٣٧دا سەربەخۆییەکی رووکەشی پێدرا، بەڵام زووری ئیرلەندە تاکو ئێستاش هەر بە دەستی ئینگلیزەوەیە. پایتەختی ئیرلەندەی باشوور شاری (دبلن)ە.

١٥- ئیسلەندە
ولاتی ئیسلەندە و نەرویج هەردووکیان ژێر دەستەی دانیمارك بوون. لە ساڵی ١٨١٤دا نەرویج لە دانیمارك جودا بووەوە, بەڵام ئیسلەندە هەر لەژێر چەپۆکی دانیمارك دا مایەوە تا ساڵی ١٩١٨ز. لە ئەنجام دا ساڵی ١٩٤٤ بوو بە کۆمارێکی سەربەخۆ.

١٦- برازیل
مێژووی نوێی ولاتی برازیل لە ساڵی (١٨٨٩)ز دوە دەست پێ دەکات. (نورکاس) کرا بە یەکەمین سەرکۆماری ئەم ولاتە, ماوەی سەرکۆماری لە برازیل دا پێنج ساڵە.

ناودارانی برازیل
١- پیتئون: بۆ یەکەم جار بەشی سەرەوەی ولاتی برازیلی دۆزییەوە.
٢- گابرال
٣- پیدرۆی یەکەم: (١٨٢٢ — ١٨٣١ز) بوو بە یەکەمین ئیمپراتۆر.
٤- پیدرۆی دووەم: (١٨٣١ — ١٨٨٩ز)
٥- ژتولیۆ وارکاس: (١٨٨٩ — ١٩٣٠ ز)
٦- ئەمپەرتۆ کاستیلو بارانکۆ: ١٩٦٤ز

١٧- بورما "بورمانیا"
خەلکی ولاتی بورما لە بنەڕەت لە سەدەی حەوتەمی زایین دا لە ولاتی چینەوە چوونەتە ئەم ولاتە. لە سەدەی سیانزدەهەم دا لە لایەن (قوبلای قائان)دوە داگیرکراوە. لە چەرخی تازەدا بە دەست بەریتانیاوە بوو تا لە ساڵی ١٩٤٨ دا سەربەخۆیی وەرگرت و رژێمی کۆماری تێدا دامەزرا.

١٨- بولگاریا
گەلی بولگاری لە رەگەزی سلاڤ, ئەم ولاتە لە ساڵی ١٣٩٣دا لەلایەن عوثمانییەکانەوە داگیرکرا و لە ساڵی ١٨٧٨دا سەربەخۆیی وەدەست هێنا, سیزار فردیناندی یەکەم بوو بە شاه لە شەڕی دووەمی گەورەدا بەشدار بوو, لە ساڵی ١٩٤٦دا رژێمی پاشایەتی پێچرایەوە و بوو بە دەوڵەتێکی سۆشیالیستی بەسرۆکایەتیی "دیمترۆف".

ناودارانی بولگاریا

| | |
|---|---|
| ١- ئەلەکساندەر | ١٨٧٩ — ١٨٨٦ز |
| ٢- فردیناند | ١٨٨٧ — ١٩١٨ ز |
| ٣- بۆریسی سێیەم | ١٩٤٣ ز |
| ٤- سیمۆنی یەکەم | ١٩٤٦ ز |
| ٥- کولازوف | ١٩٤٦ — ١٩٦٤ ز |
| ٦- تریکو | ١٩٦٤ ز |

### ١٩- بەلجیکا

دوای لەناوچوونی ناپلیۆن لە ساڵی ١٨١٥ز دا کەوتە دەستی هۆڵەنددوە, لە ساڵی ١٨٣٠ دا سەربەخۆیی بەدەست هێنا و لیۆپۆڵد ساکس کوبورک کرا بە شای وڵات.

**شاهەکانی بەلجیکا**

| | |
|---|---|
| ١- لیۆپۆڵدی یەکەم | ١٨٣١ – ١٨٦٥ ز |
| ٢- لیۆپۆڵدی دووەم | ١٩٠٩ ز |
| ٣- ئەلبەرتی یەکەم | ١٩٣٤ ز |
| ٤- لیۆپۆڵدی سێیەم | ١٩٥١ ز |
| ٥- بۆدوانی یەکەم | لە (١٩٥١ ز)ەوە |

### ٢٠- بۆلیڤیا

وڵاتێکە لە وڵاتەکانی ئەمریکای لاتین واتا ئەمریکای باشوور. ساڵانی دوور و درێژ ژێر دەستەی ئیسپانیا بوو, لە ساڵی ١٨٢٥ز دا سەربەخۆیی بەدەست هێنا و یاسای کۆماری تێیدا دامەزرا.

### ٢١- پارەگوای

ماوەیەکی زۆر ژێردەستەی ئیسپانیا بوو, لە ١٨١١دا سەربەخۆیی بەدەست هێنا و بە یەکەمین کۆماری ئەمریکای لاتین دادەنرێت کە سەربەخۆیی وەرگرتبێ.

ناودارانی ئەم وڵاتە:

١- فرانسیا

٢- ك. آ. لوپس

٣- ئەلفەردۆ ئاسترۆسز

### ٢٢- پاکستان

لە ساڵی ١٩٤٧دا دەوڵەتی پاکستان پێك هات, بەڵام لەسەر ناوچەی کشمیر لەگەڵ هیندستان دا هەمیشە ناکۆك و لە کێشەدان.. بەو پێیە کە ناوچەی کشمیر زۆربەی ئیسلامن. لە ساڵی ١٩٧٤دا محەممەد عەلی جەناح بوو بە رابەری وڵاتی پاکستان, دوای ئەو لیاقەت عەلی خان, پاشان غولام محەممەد تا بە هۆی کودەتایەکی سەربازییەوە محەممەد ئەییوب خان بوو بە سەرکۆمار.

### ٢٣- پورتوگال

پورتوگال لەسەدەی دوانزدەوە سەربەخۆ بووە, هەتا ساڵی ١٩١٠ ی ز لەم وڵاتەدا رژێمی پاشایەتی بەرێوە چووە.

**ئەو بنەماڵانەی پاشایەتیی پورتوگالیان کردووە:**

١- بروگوندی: کە تێکڕا شەش شایان هەبووە.

٢- نورا ناویز: تێکرا هەشت شایان هەبووە.

٣- براکانزا. تا ساڵی ١٨٥٣ز فەرمانڕەواییان کردووە و تێکڕا (١١) پاشا بوون.

٤- براکازا کوبورك: تێکڕا (٥) شایان هەبووە.

**٢٤ - تایلەند**

لە ساڵی ١٩٣٢ز دا دەوڵەتی سەربەخۆی تێدا دامەزراوە ناوی شاکانی ئەو وڵاتە بە (راما) بەناوبانگ بوون.

| | |
|---|---|
| ١- رامای یەکەم | ١٧٨٢ — ١٨٠٩ ز |
| ٢- رامای دووەم | ١٨٠٩ — ١٨٢٤ ز |
| ٣- رامای سێیەم | ١٨٢٤ — ١٨٥١ ز |
| ٤- رامای چوارەم | ١٨٥١ — ١٨٦٨ ز |
| ٥- رامای پێنجەم | ١٨٦٨ — ١٩١٠ ز |
| ٦- رامای شەشەم | ١٩١٠ — ١٩٢٥ ز |
| ٧- رامای حەوتەم | ١٩٢٥ — ١٩٣٥ ز |
| ٨- رامای هەشتەم | ١٩٣٥ — ١٩٤٦ ز |
| ٩- رامای نۆیەم | ١٩٤٦ ز |

**٢٥- تورکیا**

دوای شەڕی یەکەمی جیهان و بەپێی پەیمانی (سور) ئیمپراتۆریەتی عوثمانی بەسەر دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی ئەم شەڕەدا دابەش کرا. لە ساڵی ١٩٢٣دا دوای سەدان ساڵ رژێمی سوڵتانی و ئەمپراتۆری کۆماری تورکیای تازە بە سەرۆکایەتیی "مصطفا کەمال ئاتاتورک" دامەزرا. سوڵتانەکانی عوثمانی لە ساڵی ١٣٤٢ تا ١٩٢٢ تێکڕا (٣٨) سوڵتان بوون بەناوبانگترینیان سوڵتان محەممەدی دووەم (فاتح) و سوڵتان سولێمانی قانوونییە.

**سەرکۆمارانی تورکیا جەمهوورییەت**

| | |
|---|---|
| ١- مصطفا کەمال ئاتاتورک | ١٩٢٣ — ١٩٣٨ ز |
| ٢- عیصمەت ئینونۆ | ١٩٣٨ — ١٩٥٠ ز |
| ٣- جەلال بایار | ١٩٥٠ — ١٩٦١ ز |
| ٤- جەمال گورسێل | ١٩٦١ — ١٩٦٦ ز |
| ٥- جەودەت سۆنای | ١٩٦٦ ز |

**٢٦- توونس**

لەساڵی ١٩٥٧ز دا رژێمی پاشایەتی لە توونس دا هەڵ گیرا و کرا بە جەمهوورییەت. یەکەمین سەرکۆمار (حەبیب بۆرقیبە)یە کە تاکو ئێستاش هەر سەرکۆمارە.

توونس یەکێکە لەو وڵاتانەی کە لە مێژوودا زۆر ناوی هاتووە و گەلێك رووداوی مێژوویی تێدا رووی داوە. توونیس گوزەرگای فینیقی بووە پێش زایین و شاری (کارتاج) مەڵبەندێکی گرنگیان بووە. دوای لەناوچوونی هانیبالی سەرکردەی بەناوبانگی شاری کارتاج رۆمانەکان دەستیان بەسەر وڵاتەکەدا گرت و تا هاتنی ئیسلام مانەوە.

**٢٧- چیکۆسلۆڤاکیا**

لە کۆن دا بەشێك بووە لە فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی رۆما لە ساڵی ١٤٧١ز دا شاهەکان مەجرستان داگیریان کردووە و دوای ئەوان کەوتووەتە دەست نەمساوە هەر لە ساڵی ١٥٢٦ز وە تا ١٩١٨ز. میللەتی چیك لە

پێناوی ئازادیدا زۆر تێ کۆشاوە بەڵام سەرنەدەکەوت ئازادی بەدەست بهێنێ. لە شەڕی یەکەمی جیهان دا دژی نەمسا بە سەرۆکایەتیی (مازاریک) بە شەڕ هاتن و توانییان کۆماری چیکۆسلۆڤاکیا دابمەزرێنن. بەڵام لەبەر ناپاکی (خیانەتی) چەند رابەرێکیان لە ساڵی ١٩٣٨ ز دا دابەش کرا و بوو بە یەکێک لە هۆیەکانی هەڵگیرساندنی شەڕی دووەمی گەورەی دنیا. لەکاتی شەڕدا لەلایەن ئەڵمانیا و یەکیەتی سۆڤیەتەوە داگیرکرا بەڵام سەرەنجام لە ساڵی ١٩٥٦دا وڵاتەکە بوو بە وڵاتێکی سۆشیالیست. چیکۆسلۆڤاکیا ئەندامی پەیمانی وارشۆیە.

**٢٧- چین**

وڵاتێکی کۆن و ئەفسانەیی مەڵبەندی شارستانەتیی کۆنی مرۆڤە. لە چوار هەزار ساڵ پێش زایینەوە خەریکی کشتوکاڵ بوون ئێستاش ٨٠٪ی گەلی چین خەریکی کشتوکاڵە.

کاتێك بنەماڵەی شاکانی "شانگ" بوون بە خاوەن دەسەلات لە وڵاتی چین دا نووسین رەواجی پەیدا کرد. دووەمین بنەماڵەی فەرمانڕەوایی چین "چوو"ەکان بوون کە کۆنفۆشیۆس و مۆنکیوس و لائوستە لە سەردەمی ئەوان دا بیروڕای خۆیان بڵاو کردۆتەوە. سێیەمین بنەماڵەی پاشایەتیی ناوی "چین" بووە. لەسەردەمی شایەکی ئەم بنەماڵەدا دیواری گەورەی بەناوبانگی چین دروست کراوە. لەسەردەمی بنەماڵەی "هان"دا ئایینی بوودا لە چین بڵاوبۆتەوە. نوئان یان جوانتر مەغۆلەکان بوونە هۆی یەك پارچەیی وڵاتی چین هەروەها بۆ ئەوەی بەرەو رۆژاوای ناوەڕاست بەرێ بکەون.

تەقەلاو تێکۆشانی رۆشنبیرەکانی وڵاتی چین بە رابەریی سون یان سن لە ئاکام دا لە ساڵی ١٩١٢ز دا کۆماری دیموکراتیی لە چین دامەزراند. دوای مردنی ئەم رابەرە لەنێوان سەرۆکەکان دا ناکۆکی دەستی پێکرد. چان کای شیك لەگەڵ کۆمۆنیستەکان بوو بە هەرایان و شەڕی ناوخۆ دەستی پێ‌کرد. سەرکردایەتیی کۆمۆنیستەکان بەدەست ماوتیسۆنگەوە بوو دوای هێرشی یابان بۆ سەر وڵاتی چین لە ساڵی ١٩٣١ ز دا چان کای شیك لە باشووری چین دا خۆی شاردەوە. دوای شەڕی دووەمی جیهان ماوتسی تونگ هەموو وڵاتی چینی گرتە دەست و چان کای شیك لە دورگەی فەرمۆزەدا بەناوی چینی نیشتمانییەوە حوکمی دەگێڕا.

**٢٨- حەبەشە "ئەثیوبیا"**

یەکێکە لەسەرزەمینە کۆنەکانی مێژوو. پێش دوو هەزار ساڵ پێش زایین شارستانەتی تێدا هەبووە تا رادەیەکیش دیموکراتیەت. موسڵمانەکانی سەردەمی پێغەمبەر کە لە ترسی قوردیش کۆچیان کرد بۆ ئەوێ. ئەگەر چی گەلی حەبەشە مەسیحیش بوون. لەگەڵ ئەوەش دا زۆر ریزیان لێ گرتن.

لە سەدەی سیانزدەدا شایەتی لە حەبەشەدا دامەزرا کە خۆیان بە توخماتی سلێمان و بەلقیس دادەنێن.

لە ساڵی ١٩٣٥ز دا ئیتالیای فاشیسم هێرشی بردە سەر وڵاتی حەبەشە و پایتەختی هیلاسیلاسیی ئیمپراتۆریان گرت, بەڵام بە هاوکاریی بەریتانیا حەبەشییەکان توانییان ئیتالیا بشکێنن.

زمانی حەبەشە ناوی "ئاماهارا"یە. لەم دواییەدا رژێمی پاشایەتی لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە هەڵ گیرا و بوو بە کۆماری و تا ئەندازەیەك سەر بە چەپە.

**٣٠- دانیمارك**

گەلی دانیمارك رەگەزیان جەرمەنە, سەر بە رێبازی پرۆتستانن. رژێمەکەیان پاشایەتییە.

**٣١- رۆمانیا**

فەرمانڕەوا و پاشا ناسراوەکانی رۆمانیا

١- میخائیلی ئازا لە ١٦٠١ز دا مردووە

٢- ئەلەکساندەر کۆزا ١٨٥٩ — ١٨٦٦ ز
٣- کارلی یەکەم ١٨٦٦ — ١٩١٤ ز
٤- فردیناند وال ١٩١٤ — ١٩٢٧ ز
٥- کارلی دووەم ——
٦- میخائیل ١٩٣٠ ز
٧- کارلی دووەم (دووبارە) ١٩٤٠ ز
٨- یۆن ئانتۆنیسکۆ ——

کۆماری سۆشیالیست
١- گیۆرگ گیۆرگی ١٩٤٧ ز
٢- شاوشیسکۆ

٣٢- ژاپۆن "یابان"

بەپێی ئەفسانەکانی ئەم وڵاتە لە ساڵی ٦٦٠ ی پێش زایین دا ئیمپراتۆریەتی تێدا دروست کراوە و "جیمۆتۆنۆ" فەرمانڕەوایی کردووە. مێژووی ژاپۆن لە سەدەی چوارەمی زایین دا دەست پێ دەکا و لە سەدەی شەش تا هەشت پەیڕەوی شارستانیەت و فەرهەنگی وڵاتی چین بوون. لە سەدەی دوانزەدا شەڕی ناوخۆ لە ژاپۆن دا دەستی پێکردووە "بۆریتیمو" توانی فەرمانڕەواییەکی دکتاتۆری لە ژاپۆن دابمەزرێنێت. لە ساڵی ١٩٠٤ — ١٩٠٥ ز لە شەڕی نێوان وڵاتی ژاپۆن ورووسیادا ژاپۆنەکان بەسەر رووسەکان دا زاڵ بوون و دورگەی (ساخالین)یان داگیرکرد. لە ١٩١٠ ز دا کۆرییایان داگیر کرد. لە ساڵی ١٩٣١ دا مەنچووریای چینیان داگیر کرد. لە ساڵی ١٩٣٢ ز دا هێرشیان بردە سەر وڵاتی چین و پەکین و شانگەهایان گرت.

دەوڵەتی ژاپۆن لە شەڕی دووەمی جیهان دا بەشداری کرد و لە ١٩٤١ دا هێرشی بردە سەر (بێرل هابر) کە بنکەیێکی گەورەی دەریایی ئەمریکا بوو لە زەریای هێمن دا. لە ساڵی ١٩٤٥ دوای تەقینەوەی دوو بۆمبای ئەتۆمی بەسەر دوو شاری هیرۆشیما و ناکازاگیدا، ژاپۆن ناچار بوو شەڕ رابگرێت و تەسلیمی ئەمریکا بوو.

٣٣- سوێد

هۆزی سونار یەکێکە لەو هۆزانەی لە سەرەتاوە لە وڵاتی سوێد دا ژیاون. ئەم هۆزە لە سەدەی شەشەمی زایین دا لەگەڵ هۆزەکانی گوتار و ڤایکینگ و نورمانەکان دا یەکیەتییان پێك هێنا و هەمیشە پەلاماری وڵاتانی هاوسایەیان دەدا.

لەوڵاتی سوێد دا رژێمی حوکمڕانی پاشایەتی بووە تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە، ئەم رژێمە پاشایەتییە لە ساڵی ١١٣٠ز دا دەستی پێکردووە و تێکڕا پەنجا شا لە سێ بنەماڵەی جیاوازدا کاریان گێڕاوە.

٣٤- سویسرا

ئەم وڵاتە ئەوسا ناوی "هلوسیا" بووە و لە ساڵی ٥٨ ی پێش زایین دا لە ژێر دەسەڵاتی رۆمانەکان دا بووە. وڵاتی سویسرا لە هیچ جۆرە پەیمانێك بەشداری نەکردووە و لە شەڕە گەورە بەناوبانگەکان بێلایەن بووە.

٣٥- شیلی

لە ساڵی ١٥٣٦ز دا دۆزراوەتەوە لەلایەن والدبویا کە فەرماندەیێکی ئیسپانیاییە داگیر کراوە. هەر ئەویش لە ساڵە ١٥٦١ز دا شاری (سانتیاگۆ)ی دروست کردووە و لە ساڵی ١٨١٨ز دا سەربەخۆیی بەدەست هێناوە.

**٢٦- فرانسە**

لە ساڵی ١٧٨٩ – ١٧٩٣ز دا شۆڕشی گەورەی فرانسە ڕووی دا و ڕژێمی پاشایەتی لەلایەن شۆشگێرانەوە لابرا و بوو بە جەمهورییەت. بەپێی مێژووی فرانسە چەند بنەماڵەیێکی شاهانە لەو وڵاتەدا فەرمانڕەواییان کردووە:

١. شاکانی بنەماڵەی مرووشری:

تێکڕا دە پاشا بوون، لە ساڵی ٤٢٨ز تا ٧٥١ ز

٢. بنەماڵەی کارولنژی:

تێکڕا پانزدە پاشا بوون، لە ساڵی ٧٥١ – ٩٨٧ز دا فەرمانڕەواییان کردووە.

٣. بنەماڵەی کاپاسن:

هەشت پاشا بوون لە ساڵی ٩٨٧ – ١٢٢٦ ز دا فەرمانڕەواییان کردووە.

٤. بنەماڵەی بۆربۆن:

تێکڕا شەش پاشا بوون، لە ساڵی ١٥٨٩ – ١٧٩٥ ز دا فەرمانڕەواییان کردووە و دوا مەلیکیان لویسی شانزدەمین بووە کە ئیعدام کرا.

٥. کۆماری فرانسە

لە ساڵی ١٧٩٢ز تا ١٨٠٢ ز

٦. ناپلیۆن بۆنابارت

١٨٠٢ – ١٨٠٤ ز

٧. گەڕانەوەی پاشایەتی

١٨١٤ - ١٨٤٨ ز

٨. کۆماری دووەم

١٨٤٨ – ١٨٥٢ ز

٩. گەڕانەوەی پاشایەتی

١٨٥٢ – ١٨٧٠ ز

١٠. کۆماری سێیەم

١٨٧١ – ١٨٨٧ ز

١١. ماری فرانسوا سادی کارنو

١٨٨٧ - ١٩٤٠ ز

١٢. دەوڵەتی ڤیشی

١٩٤٠ — ١٩٤٤ ز

١٣. دەوڵەتی (موەقەتی) فەرانسە
١٩٤٤ — ١٩٤٦ز

١٤. کۆماری چوارەم
لەساڵی ١٩٤٧وە دەستی پێکردووە تاکو ئێستا کە ساڵی (١٩٨٧) و فرانسوا میتران سەرکۆمارە.

٣٧- فلیپین
لەساڵی ١٥٢١ز دا لەلایەن ماجەلانەوە بە دنیا ناسرا و لە ساڵی ١٥٦٥ز دا ئیسپانیا داگیری کرد, لە ساڵی ١٩٤٢ دا لەلایەن ژاپۆنەوە داگیکرا, لە ساڵی ١٩٤٦دا سەربەخۆیی وەرگرت و کۆمارە فلیپینی لێ پێك هات.

٣٨- کوبا
لەلایەن کریستۆفر کۆلۆمپسەوە دۆزراوەتەوە, لەساڵی ١٤٩٢دوە تا ساڵی ١٨٩٨ز ئەو وڵاتە ژێر دەستی ئیسپانیا بووە, لەساڵی ١٩٤٨ز دا دکتۆر پریوسوکاراس کراوە بە سەرکۆمار بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەم وڵاتەدا لە ساڵی ١٩٥٢ز دا پاتێستا بوو بە دکتاتۆری کوبا و فیدل کاسترۆ دژ بە رژێمی پاتێستا شەڕی پارتیزانی دەست پێ کرد و لە ساڵی ١٩٥٩ز دا رژێمەکەی ڕووخاند و بوو بە سەرەك وەزیر, ئێستاش سەرکۆمار و پەیڕەوی رژێمی سۆشیالیستە.

٣٩- مەجەر "هەنگاریا"
لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (ستیفن)ی یەکەم دا (٩٧٧ — ١٠٣٨)ز ئاینی مەسیحیەتی تێدا بلاو بووتەوە, لەساڵی ١٥٢٦ز دا لەلایەن عوثمانییەکانەوە داگیر کراوە, دوای شیڕی گەورەی یەکەم رژێمی کۆماری تێدا دامەزراوە, لەساڵی ١٩٤٥ز دا لەلایەن سۆڤیەتەوە داگیرکرا و لەساڵی ١٩٤٦دا کۆماری تێدا دامەزرا و لە ساڵی ١٩٤٧ز دا بوو بە رژێمێکی سۆشیالیستی.

٤٠- مۆناکۆ
لە سەردەمی شۆرشی گەورەی گەلی فرانسەدا بوو بە بەشێك لە فرانسە و لە ساڵی ١٨٤٦ز دا لەلایەن ساردینیاوە داگیرکرا و لە ساڵی ١٨٦١ زدا لەلایەن ئیتالیاوە بە فرانسە فرۆشرا. ئێستاش میرنشینە.

٤١ - نەرویج
رژێمی ئەم وڵاتە پاشایەتییە, لەساڵی ١٣٨١ز دا تا ساڵی ١٨١٤ز لەگەڵ وڵاتی دانیمارك دا یەکیەتییەکیان پێك هێنابوو لەساڵی (١٨١٤)دوە تا ساڵی ١٩٠٥ ز لەگەڵ سویددا بوونە یەك و لە ساڵی ١٩٠٥ز لێك جیا بوونەوە.

٤٢- هۆڵەندە

لە سەردەمێکی دوورەوە ئەم ولاتە پەیڕەوی ڕژێمی پاشایەتییە, لە ساڵی (١٥٧٩)ەوە کە پاشایەتی دەستی پێکردووە تاکوئێستاش هەر بەردەوامە.

## ٤٣- هیندستان

لە ولاتی هیندستان دا پێش چوار هەزار ساڵ شارستانەتی تێدا بووە لە ساڵی ٣٢٧ی پێش زایین دا لەلایەن ئەسکەندەری مەکەدۆنییەوە بەشێکی گەورەی لێ داگیر کرا. هەزار ساڵ پێش زایین بوودا لەم ولاتەدا ئایینی خۆی بلاوکردۆتەوە. لە ساڵی ٧١٢ی ز بەشێکە لەلایەن (محەممەدی بن قاسم)ی ئیسلامەوە داگیرکرا. یەکەمین دەوڵەتێك کە پەیڕەوی ئاینی ئیسلام بووە لە هیندستان دا دامەزراوە ساڵی ١١٩٢ ز لەلایەن (شەهابەددین محەممەد ئەل غوری)یەوە بووە. لەساڵی ١٥٢٠از دا "بابی" کە لە نەوەکانی تەیموور بووە فەرمانڕەواییەکی پان و پۆری لێ داناوە. ساڵی ١٧٣٨ یش نادرشای ئێران هێرشی بردۆتە سەر ئەم ولاتە. لە ١٧٥٧از دا بووە بە ولاتێکی ژێر دەستەی بەریتانیا, دوای شەڕی گەورەی یەکەم بەریتانیا ناچار کرا تا ڕادەیەك مافی ئەم میللەتە ئەوەندە پێشێل نەکات سەرەنجام بە پێشەوایی (گاندی)ی مەزنەوە ئەم ولاتە گەیشتە سەربەخۆیی خۆی.

## ٤٤- یۆنان

یەکێکە لە ولاتە کۆنەکان و سەرچاوەی شارستانەتیی مرۆڤ لە زەمانی کۆن دا. پێنج سەد ساڵ پێش زایین بە هێز و دەسەلات ترین فەرمانڕەوایی تێدا هەبووە, لەساڵی ٤٦ ی پێش زایین دا لەلایەن ڕۆمانەکانەوە داگیرکرا و لەلایەن عوثمانیەکانیشەوە لە ساڵی ١٨٣٠از دا داگیرکرا. گەلی یۆنان لە ئەنجامی شۆڕش و یارمەتیی فڕانسە و بەریتانیا و رووسیادا توانی سەربەخۆیی بەدەست بهێنێت.

لەساڵی ١٩٢٥از ڕژێمی کۆماری تێدا دامەزرا و لە ساڵی ١٩٣٥ادا دیسان بووەوە بە پاشایەتی دوای کودەتایێکی سوپایی پاشایەتی نەما و ئەمڕۆ ڕژێمی کۆمارییە.

## ٤٥- یەکیەتی سۆڤیەتی

(سکوت)ەکان حەوت سەد پێش زایین کەناری دەریای ڕەشیان بەدەستەوە بوو, دوای ئەوان بە چوار سەد ساڵ هۆزەکانی "سرمت" جێگەی ئەوانیان گرتەوە, دوای ئەوان چەند میللەتێکی دیکە وەکو گوتیەکان, هوونەکان و خەزەرەکان لە روسیادا ژیاون.

یەکەمین دەوڵەت لەلایەن خەزەرکانەوە لە باشووری رووسیادا دامەزراوە. بولگارەکان بۆ یەکەمین جار لە دەوروبەری ڤۆلگادا فەرمانڕەواییەکیان پێك هێنا و باکووری نۆکراین بوو بە جووڵانگایان. هۆزەکانی وارگ لە سەدەی نۆیەمی زایین دا زۆر لە ناوچەکانی رووسیایان داگیرکرد و لەوە دەچێت ناوی رووسیا ناوی یەکێك لە فەرمانڕەواکانی وارگ بووبێت.

تا ساڵی ١٩٦٩ادا پێتەختی روسیا شاری کێیف بووە و لە زەمانی فەرمانڕەوایی ڤلادمیری یەکەم روسیا ڕێبازی ئاینی ئەرثەدوکسی وەرگرت. دوای ڤلادمیر دەوڵەتی کێیف دابەش کرا و هەر بەشێکی لەلایەن سەردارێکەوە کە لە بنەماڵەی رودیك بوون فەرمانڕەوایی کراوە.

لەسەدەی سیانزدەمین دا پاتوخانی تاتار ولاتی رووسیای داگیرکرد و لەساڵی ١٣٨٠از دا توانیان دوای شەڕێکی خوێناوی تاتارەکان لەولاتی خۆیان دەرکەون دەوڵەتی دوکی مۆسکۆ دابمەزرێنن.

ئیڤانی ترسێنەر یەکێکە لەم بنەماڵە بەدەستەڵاتە خۆی ناونا (تزار) (قەیسەر) بەڵام جێگیرەکانی ئیڤان نەیانتوانی ئەو دەسەڵاتە رابگرن تا لەئەنجام دا بنەماڵەی رۆمانۆڤ هاتنە سەر کار لە رووسیادا و تا ساڵی ١٩٠٧ز فەرمانڕەواییان کردووە.

پەتروسی گەورە یەکێکە لە گەورەترین ئیمپراتۆرەکانی روسیا و نیکۆلای دووەم دوا تزاری روسیا بووە.

لەساڵی ١٩٢١ز داله روسیادا یەکەمین دەوڵەتی سۆشیالیستی لەلایەن (لینین)ەوە دامەزرا.

**رابەر و ئیمپراتۆرەکانی روسیا:**

| | |
|---|---|
| ١- رۆدریك | سەدەی نۆیەمی زایین |
| ٢- ئولگەك | جێگری رۆدریك |
| ٣- ئیگورز | جێگری ئولگەك |
| ٤- سپاتڤسلاڤ | ٩٧٢ ز |
| ٥- ڤلادیمیری یەکەم | جێگری سپاتڤسلاڤ |
| ٦- یارو سلاڤ | دوك نشین |
| ٧- ئیڤانی یەکەم | |
| ٨- ڤاسیلی | |
| ٩- ئیڤانی گەورە | ١٤٦٢ — ١٥٠٥ ز |
| ١٠- ئیڤانی ترسێنەر | ١٥٣٣ — ١٥٨٤ ز |
| ١١- ڤیدۆری یەکەم | کوڕی ئیڤان |
| ١٢- گادنۆڤ | سەردەمی بەرەڵلایی |
| ١٣- ڤیدۆری دووەم | ١٦٠٥ ز |
| ١٤- دیمتری | ١٦٠٥ — ١٦٠٦ ز |
| ١٥- رومانۆڤ میخائیل | یەکەمین تزاری بنەماڵەی رۆمانۆڤ |
| ١٦- ئەلیکسی میخایلوڤچ | ١٦٤٥ — ١٦٧٤ ز |
| ١٧- ڤیدوری سێیەم | ١٦٧٦ — ١٦٨٢ ز |
| ١٨- ئیڤانی پێنجەم | ١٦٨٢ — ١٦٩٦ ز |
| ١٩- پەتروسی گەورە | ١٦٨٢ — ١٧٢٥ ز |
| ٢٠- کاترینی یەکەم | ١٧٢٥ — ١٧٢٧ ز |
| ٢١- پەتروسی دووەم | ١٧٢٧ — ١٧٣٠ ز |
| ٢٢- ئانا ئیڤانۆڤا | ١٧٣٠ — ١٧٤٠ ز |
| ٢٣- ئیڤانی شەشەم | ١٧٤٠ — ١٧٤١ ز |
| ٢٤- ئەلیزابێت | ١٧٤١ — ١٧٦٢ ز |
| ٢٥- پەتروسی سێیەم | ١٧٦٢ ز |
| ٢٦- کاترینی دووەم (گەورە) | ١٧٢٩ — ١٧٩٦ ز |
| ٢٧- پاڤلی یەکەم | ١٧٩٦ — ١٨٠١ ز |
| ٢٨- ئەلەکسەندەری یەکەم | ١٨٠١- ١٨٢٥ ز |
| ٢٩- نیکۆلای یەکەم | ١٨٢٥ — ١٨٥٥ ز |
| ٣٠- ئەلەکسەندەری دووەم | ١٨٥٥ — ١٨٩٤ ز |

٢١- ئەلەکسەندەری سێیەم ١٨٨١ — ١٨٩٤ ز
٢٢- نیکۆلای دووەم ١٨٩٤ — ١٩١٧ ز

رابەرانی دوای شۆڕشی سۆڤیەتی

١- ئەلەکسەندەر کرینسکی حکوومەتی مووەقەت ١٩١٧ ز
٢- ڤلادیمیر لینین ١٩١٧ — ١٩٢٤ ز
٣- ئەلەکسی ئیڤانوڤج ریکو ١٩٣٠ ز
٤- مۆلۆتۆڤ ١٩٤١ ز
٥- ستالین ١٩٥٣ ز
٦- مالنکۆڤ ١٩٥٥ ز
٧- خرۆشێڤ ١٩٦٤ ز
٨- کۆسەگین
٩- برژنیڤ

******************************************




ئارژەنتین
ئەوروکوای
بەلجیکا
مۆناکۆ
فەنزویلا
ئەکوادۆر
ئینکلترە
ئەلبانیا
ئەمریکا
فرانسە
پورتکال
چین
پیرۆ
سوید
سویسرا
ئیسپانیا
ئیتالیا
توونس
نەرویج
لۆکسامبورك


ئەڵمانیای رۆژئاوا


کووبا


بەرازیل


کەنەدا


فنلەندە


چیکۆسلۆڤاکیا


ڤێتنامی باکووری


پەنەما


زیلاندی نوێ


پارگوای


هائیتی


نەمسا


تۆگۆ


ژاپۆن


پاکستان


سرالئون


ئەندەنووسیا


تایلاند


پۆڵەندە


مکسیک


هۆڵەندە


فلپین


یەکیەتی سۆڤیەتی


لیبیریا


هندستان

# کرنۆلۆژی مێژووی جیهان

١) ٢٩٠٠ — ٢٧٠٠ پ. ز زنجیرەی یەکەم و دووەمی فەرمانڕەوایانی میصر "پایتەختی تینس".

٢) ٢٧٠٠ — ٢٢٠٠ پ. زسەردەمی فەرمانڕەوایی زنجیرەی سێیەمی تا شەشەمی میصر "پایتەختی مەمفیس".

٣) ٢٢٠٠ — ٢١٠٠ پ. ز دەورەی فەرمانڕەوایی زنجیرەی حەوتەم تا دەیەمین.

٤) ٢١٠٠ — ١٧٨٨ پ. ز فەرمانڕەوایی زنجیرەی پانزدومین "٢١٠٠ - ٢٠٠٠ پایتەختی تیبە" و زنجیرەی بنەماڵە دوانزدەمین "٢٠٠٠ — ١٧٨٨" لەم دەوردا شارستانەتی لە میصردا ڕێگایەکی زۆری پێ دراوە.

٥) ١٧٨٨ — ١٥٨٠ پ. ز سەردەمی فەرمانڕەوایی بیانی (بێگانە) لە میصردا.

٦) ١٥٨٠ — ١٠٩٠ پ. ز دەورانی ئیمپراتۆریەتی کۆنی میصر کە بە سەردەمی نوی ناسراوە.

٧) ١٥٨٠ - ١٣٥٠ پ. ز فەرمانڕەوایی بنەماڵەی هەژدەمین "پایتەختی تیبە" پاشا ناسراوەکانی ئەم بنەماڵەیە:

١- ئینوفیسی یەکەم

٢- نوتمسی یەکەم

٣- توتمسی سێیەم

٤- ئەمونوفیسی چوارەم "ئەخناتون" یەك تاکە پەرستی لە میصردا بردو پێدا.

٨) ١٣٥٠ — ١٢٠٠ پ. ز فەرمانڕەوایی سی و یەکەم "پایتەختی تیبە" پاشا ناسراوەکانی ئەم سەردەمە:

١- هارم هاب

٢- وستوسی یەکەم

٣- رامسیسی دووەم

٤- مەرتپتان

٩) ١٢٠٠ — ١٠٩٠ پ. ز "پایتەخت تیبە" فیرعۆنە ناسراوەکانی ئەم دەورە:

١- رامسیسی سێیەم

٢ رامسیسی چوارەم

لەم خولەدا زێوانی پەرستگاکان پەرەی سەندووە.



رامسیس



١٠) ١٠٩٠ – ٩٥٠ پ. ز پاشایەتی زنجیرەی بیست و یەکەم دەژمێردرێت، فیرعۆنەکانی ئەم بنەماڵەیە کارێکی شایان و دیاریان نەکردووە.

١١) ٩٤٠ – ٨٤٥ پ. ز
فەرمانڕەوایی زنجیرەی بیست و دوو و بیست و سی شەڕی ناوخۆ و هەرا و بەزم لە وڵاتی میسردا بڵاو بووەوە.

١٢) ٧١٣ – ٦٦٣ پ. ز
پاشایەتیی زنجیرەی بیست و پێنجەم کە لەلایەن کەسێکەوە دامەزرا خەڵکی وڵاتی حەبەشە بووە و وڵاتی میسر لەلایەن (ئاشوور بانیبال)ەوە هێرشی براوەتە سەر.

١٣) ٨٠٠ پ. ز
دەسەڵاتی کارتاج پێك دێت.


داریوش

١٤) ٧٩٠ پ. ز
حەبەشە میسر داگیر دەکات.

١٥) ٧٩٠ پ. ز
یەکەمین ئولومپیاد

١٦) ٧٥٣ پ. ز
رۆما دروست کراوە

١٧) ٧٤٥ پ. ز
تکلات پلیسەری سێیەمی بابلی داگیرکرد و ئیمپراتۆریەتی نوێی بابلی دامەزراند.

١٨) ٧٢٥ پ. ز
یۆنانییەکان دەگەنە دورگەی سیسیل.

١٩) ٧٢٢ پ. ز
سورگون ئاشورییەکان بە چەکی ئاسن چەکدار دەکات.

٢٠) ٧٢١ پ. ز
جوولەکە کۆچیان پێ دەکرێ.

٢١) ٧٠١ پ. ز
لەشکری سەنحاریب بۆ سەر میسر تووسی بەڵای خوایی دەبێت و لەناو دەچێت.

٢٢) ٦٨٠ پ. ز
تیبە لەلایەن ئەسەر حەدونەوە داگیر دەکرێت و دەسەڵاتی حەبەشییەان لەناو دەچێت.

٢٣) ٦٦٧ پ. ز
ساردانا پالوس دەبێ بە پاشا.

٢٤) ٦٠٦ پ. ز
داگیر کردنی نەینەوا لەلایەن نابوپ، لاساری پاشای کلدانییەکانەوە دامەزراندنی دەسەڵاتی کلدانی.

٢٥) ٥٨٦ پ. ز
بەختونەصر "نەبوخوز نەسسر" جوولەکەکان بۆ بابل کۆچ پێ دەکات. زۆریشیان بەرەو میسر هەڵدێن.

٢٦) ٥٥٠ پ. ز

کۆرش جێگەی سیاگزار دەگرێتەوە دامەزراندنی زنجیرەی هەخامەنشی "ئەخمینی" ببودا و کۆنفوشیۆس و لائوتسە لەم سەردەمەدا ژیاون.



نیرۆن

٢٧) ٥٣٩ پ. ز

کۆرش بابل داگیر دەکات.

٢٨) ٥٢٧ پ. ز

بیزیسی ترانوسی پاشای یۆنان دەمرێت.

٢٩) ٥٢٥ پ. ز

کمبوجیە میصر داگیر دەکات.

٣٠) ٥٢١ پ. ز

داریۆش هێرش دەباتە سەر وڵاتی "سەکها".

٣١) ٤٩٠ پ. ز

شەڕی ماراتۆن

٣٢) ٤٨٤ پ. ز

هیرۆدۆت لەدایك دەبێت. ئاشیل بۆ یەکەم ترازیدی گرەو دەباتەوە و پاداشت وەردەگرێت.

٣٣) ٤٨٠ پ. ز

شەڕی ترمپیل و سالامیس.

٣٤) ٤٧٩ پ. ز

شەڕی پلاتە

٣٥) ٤٦٦ پ. ز

بریکلیس لە یۆنان دا بووە بە شا و سەردەمی زێرینی وڵاتی یۆنان.



کوشتنی فیلیپ باوکی ئەسکەندەر

٣٦) ٤٦٥ پ. ز

کوژرانی خشابار شاه .

٣٧) ٤٣١ پ. ز

دەست پێ کردنی شەڕی پلوپونەر لەنێوان ئیسپارتە و یۆنان دا.

٣٨) ٤٢٨ پ. ز

مردنی هیرۆدۆتس و بەریکلیس.

٣٩) ٤٢٧ پ. ز

ئەفلاتون لەدایك دەبێت.

٤٠) ٤٠١ پ. ز

گەڕانەوەی دە هەزار سەربازی یۆنانی لە ئێرانەوە بۆ یۆنان. برت نووس شاری رۆما تالان دەکات.

٤١) ٣٥٩ پ. ز

فیلیپ دەبێ بە شای مەکەدۆنیا.

٤٢) ٣٣٤ پ. ز
کوشتنی فیلیپ لەشکرکێشیی یۆنان بۆ ئاسیا.


لەناوچوونی دەسەڵاتی کارتاژ

٤٣) ٣٣٤ پ. ز
شەڕی کرا نیکوس.
٤٤) ٣٣٣ پ. ز
شەڕی ئیسۆس.

٤٥) ٣٣٢ پ. ز
ئەسکەندەر گەیشتە میصر.

٤٦) ٣٣١ پ. ز
شەڕی ئەبلا.
٤٧) ٣٣٠ پ. ز
کوشتنی داریۆشی سێیەم.
٤٨) ٣٢٣ پ. ز
مردنی ئەسکەندەری مەکەدۆنی.
٤٩) ٣٢١ پ. ز
چندراگوباتا لە وڵاتی پەنجاب دا بووە بە شا.
٥٠) ٣٠٢ پ. ز
جندرا گوبتا سلووکییەکان ناچار بە کشانەوە دەکات.
٥١) ٢٨١ پ. ز
پیرهە هێرش دەباتە سەر ئیتالیا.
٥٢) ٢٨٠ پ. ز
شەڕی هراکلیا.
٥٣) ٢٦٤ پ. ز
شەڕی پۆنیک و سەرەتای پاشایەتی (ئاشوکا) لە هیندستان دا و نیشان دانی یاریی کلادیاتورەکان لە ڕۆما بۆ یەکەم جار لە مێژوودا.
٥٤) ٤٢١ پ. ز
دوایی شەڕی پۆنیکی یەکەم.
٥٥) ٢٢٥ پ. ز
شەڕی تلامون، سپای ڕۆما دەڕواتە شاری ئیلیریاوە.
٥٦) شەڕی دووەمی پۆنیک.
٥٧) دەست پێ کردنی دیواری بەناوبانگی وڵاتی چین.
٥٨) ٢١٠ پ. ز


ئەسکەندەر گەیشتە وڵاتی مصر

مردنی تسن شی هوانگ نی.

٥٩) ٢٠٢ پ. ز

شەڕی ناما.

٦٠) ٢٠١ پ. ز

کۆتایی شەڕی پۆنیك.

٦١) ١٩٧ — ٢٠٠ پ. ز

شەڕی رۆمان و مەکەدۆنییەکان.

٦٢) ١٩٢ پ. ز

شەڕی سلووکییەکان.

٦٣) ١٩٠ پ. ز

شەڕی ماگنسیا.

٦٤) ١٤٩ پ. ز

شەڕی چوارەمی مەکەدۆنییەکان و بەزینیان.

٦٥) ١٤٩ پ. ز

شەڕی سێیەمی پۆنیك

٦٦) ١٤٩ پ. ز

لەناوچوونی دەسەڵاتی (کارتاج) - قرتاجە

٦٧) ١٣٢ پ. ز

شەڕی یەکەمی کۆیلەکان لە سیسیل بە سەرکردەیی ئوتوس و سەرنەکەوتنیان.

٦٨) ١٠٣ — ٩٠ پ. ز

شەڕی دووەمی کۆیلەکان بە سەرکردەیی تریفون و سەرنەکەوتنیان.

٦٩) ١٠٢ پ. ز

ماریۆس بەرگری لە هۆزی ئەڵمانەکان دەکات.

٧٠) ٨٨ پ. ز

مردنە ماریۆس.

٧١) ٧٣ پ. ز

شۆڕشی کۆیلەکان بە سەرۆکایەتیی سپارتاکۆس.

٧٢) ٧١ پ. ز

لەناوچوونی شۆڕشی سپارتاکۆس.

٧٣) ٦٦ پ. ز

لەشکرکێشیی پەمبێی بۆ دەریای خەزەر

٧٤) ٦٦ پ. ز

مردنی میتریداتس پونتس.

٧٥) ٥٣ پ. ز

کوشتنی کراسۆس لە کارهەدا.

٧٦) ٤٨ پ. ز

شکانی پەمبێی لەلایەن ژۆل سیزارەوە لە فارسالوس دا.
٧٧) ٤٤ پ. ز
کوژرانی ژۆل سیزار.
٧٨) ٣٤ پ. ز
شەڕی ئەکتیۆم
یەکەمی زایین لەدایك بوونی حەزرەتی عیسای مەسیح.



لەدایك بوونی حەزرەتی عیسا. (لە کارە هونەرییەکانی مایکل ئەنجیلۆ)



تێشکانی کۆیلەکان لەلایەن سوپای رۆماوە

٧٩) ١٤ ز
مردنی ئەگۆستوس و بوونی تیبریوس بە شا.
٨٠) ٣٣ ز
لە چوارمێخەدانی حەزرەتی عیسا.
٨١) ٣٧ ز
گالیوکۆلا بوو بە شا.
٨٢) ٤١ ز
کلۆدیۆس بوو بە شا.
٨٣) ٥٤ ز
سەرەتای پاشایەتیی نیرۆن.
٨٤) ٦١ ز
کوشتنی رۆمانەکان لە بەریتانیادا لەلایەن شاژن بۆدیکاوە.
٨٥) ٦٨ ز
خۆ کوشتنی نیرۆن.
٨٦) ٦٩ ز
ڤسپاسیان زنجیرەی فلاوینی دامەزراند.
٨٧) ٧٩ ز

تیتۆس بوو بە شا دوای ڤیپاسیان.

٨٨) ٨١ ز

دۆمیسیان بوو بە شا

٨٩) ٨٤ ز

سەرەوەی وڵاتی بەریتانیا بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی رۆما.

٩٠) ٩٦ – ٩٧ز

ئیمپراتۆریەتی مارکۆس کۆك سیلوس نێروا

٩١) ٩٨ ز

تیراژان بوو بە جێگری نێروا.

٩٢) ١٠٢ ز

هێرشی سەکا بۆ سەر وڵاتی هیندستان.

٩٣) ١١٧ ز

هادریان لە جێی تیراژان دا بوو بە ئیمپراتۆر و دەست پی کردنی سەردەمی دەسەڵاتی رۆما.

٩٤) ١٣٨ ز

ئەنتۆنینۆس پایس بووە بە شا دوای هادریان.

٩٥) ١٥٠ ز

لەم سەردەمەدا زنجیرەی پاشاکانی کانیشکا لە کاشفەر و خوتەن دا فەرمانڕەواییان کردووە.

٩٦) ١٦٠ ز

پاشایەتیی ئاورل.



لەناو چوونی ئەشکانیەکان

٩٧) ١٦٤ ز

بڵاوبوونەوەی تاعوون و مردنی ئاورل بە نەخۆشیی تاعوون.

٩٨) ١٨٠ ز

بە مردنی ئاورل ماوەی سەد ساڵ نا ئارامی و شەڕ و شۆڕی ناوخۆ لە ئیمپراتۆرییەتی رۆمادا بەردەوام بوو.

٩٩) ٢٢٠ ز

لەناوچوونی بنەماڵەی هان.

١٠٠) ٢٢٧ ز

لەناوبردنی دەسەڵاتی ئەشکانییەکان لەلایەن ئەردەشێری یەکەمی پاشای ساسانییەوە.

١٠١) ٢٤٢ ز

(مانی) رێبازی ئاینەکەی بڵاوکردەوە.

١٠٢) ٢٤٧ ز

گووتەکان لە دانووب پەڕینەوە.

١٠٣) ٢٥١ ز

سەرکەوتنی گووتەکان و کوژرانی ئیمپراتۆر دیسیۆس.

١٠٤) ٢٦٠ ز

شاپووری یەکەم ئەنتاکیای داگیرکرد و ئیمپراتۆر (ڤالەرین)ی بەدیل گرت.



شاپووری یەکەم



مانی

۱۰۵) ۲٦۹ ز
کلۆدیوس گووتەکانی شکاند و لە نیش دا بەسەریان دا زاڵ بوو.
۱۰٦) ۲۷۰ ز
ئورەلین بوو بە ئیمپراتۆر.
۱۰۷) ۲۷۲ ز
شاژنە زەنووبیا بە دیلی دەبرێت بۆ رۆما. لەناوچوونی ناوبانگی پالمیرا.
۱۰۸) ۲۷٥ ز
پرۆبس جێگای ئورەلین دەگرێتەوە و دەبێتە ئیمپراتۆر.
۱۰۹) ۲۲۸ ز
کوشتنی مانی لە ئێران دا.
۱۱۰) ۲۸٤ ز
دیۆکلیسیان بوو بە ئیمپراتۆر
۱۱۱) ۳۰۳ ز
دیۆکلیسیان ئازادی مەسیحییەکان دەدات.



ئورەلین بووە بەئیمپراتۆر

۱۱۲) ۳۱۱ ز
گالیرۆس کۆتایی بە ئازاردانی مەسیحییەکان دەهێنێت.
۱۱۳) ۳۱۲ ز
قوستەنتین دەبێتە ئیمپراتۆر.
۱۱٤) ۳۱۳ ز
بڕیاری بەرابەری تەواوی ئاینەکان لەلایەن قوستەنتینەوە دەدرێت و سامانە تالآن کراوەکانی مەسیحییەکانیش دەدرێتەوە.
۱۱٥) ۳۲۱ ز
پەلاماری تازەی گووتەکان بەردەگرێت.
۱۱٦) ۳۲۳ ز
پێك هێنانی شوورای ئاینی بە سەرۆکایەتیی قوستەنتین.
بۆ لابردنی جیاوازیی نێوان دەستە مەسیحییەکان، ئەوەبوو دەستەی قەشە ئاریۆس دەیان گوت کە حەزرەتی مەسیح بەشێك نەبووە لە خودا، دەستەی ئەلەکساندەر دەیان گوت: نەخێر حەزرەتی عیسا بەشێك بوو لە زاتی خواوەند.
۱۱۷) ۳٥٤ ز
لەدایك بوونی قەشەی گەورە (ئەگوستین).
۱۱۸) ۳٦۱ ز
تەقەلای (ژۆلیان) ئیمپراتۆری رۆما بۆ لابردنی ئاینی مەسیحیەت.
۱۱۹) ۳٦٥ ز
مردنی ژۆلیان.
۱۲۰) ڤایگوتەکان بە سەرۆکایەتیی ئالاریك شاری رۆمایان داگیرکرد.
۱۲۱) ٤۲۹ ز
ڤاندالەکان کارتاج داگیر دەکەن.

١٢٢) ٤٨٨ ز

برسیکۆس و ئاتیلا یەکتری دەبینن.

١٢٣) ٤٥١ ز

هێرشی ئەتیلا بۆ سەر گال و شکانی لەلایەن رۆمانەکان و ئەڵمانەکانەوە.

١٢٤) ٤٥٣ ز

مردنی ئەتیلا.

١٢٥) ٤٥٥ ز

رۆما لەلایەن ڤاندالەکانەوە تالان کرا.

١٢٦) ٥٢٩ ز

بە ئەمری (ژۆستینیان)ی ئیمپراتۆری رۆما قوتابخانەکانی یۆنان داخران دوای هەزار ساڵ کۆشش.

١٢٧) ٥٣١ ز

خسرەوی یەکەم بوو بە شای ئێران.

١٢٨) ٥٤٣ ز

نەخۆشیی تاعوون لە شاری قوستەنتینیە خەڵکێکی زۆری کوشت.

١٢٩) ٥٥٦ ز

مردنی شۆستنیانی ئیمپراتۆری ڕۆما.

١٣٠) ٥٧١ ز

لەدایک بوونی پێغەمبەری خوا محەممەد کوڕی عەبدوڵلا (ص).

١٣١) ٥٧٩ ز

مردنی خسرەوی یەکەم "ئەنۆشیروان".

١٣٢) ٥٩٠ ز

بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تاعوون لە رۆما. سەرەتای پاشایەتیی خسرەوی دووەمی بە خسرەوی پەرویز بەناوبانگە.

١٣٣) ٥٨٩ ز

لەدایک بوونی حەزرەتی عەلی.

١٣٤) ٦١٠ ز

سەرەتای فەرمانڕەوایی هیراکلیوس ئیمپراتۆری رۆم.

١٣٥) ٦١٩ ز

لەشکرکێشیی خسرەوی پەرویز بۆ سەر میصر و ئۆرشەلیم و دیمەشق و داگیرکردنیان. سەرەتای فەرمانڕەوایی بنەماڵەی تانگ لە چین دا.

١٣٦) ٦٢١ ز

کۆچی پێغەمبەری خوا (ص) بۆ مەدینە. سەرەتای ساڵی کۆچی.

١٣٧) ٦٢٣ ز

شەڕی (بەدر).

١٣٨) ٦٢٦ ز

شکانی سپای ئێران لەلایەن هیراکلیسەوە لە نەینەوا.

١٣٩) ٦٢٨ ز

کوشتنی خسرەو پەرویز لەلایەن (قوبادی دووەمەوە، پاشایەتیی قوباد).


مردنی هیراکلیوس

١٤٠) ٦٢٩ ز
ئازادی کردنی مەکە لەلایەن ئیسلامەوە.
١٤١) ٦٣٢ ز
مردنی پێغەمبەری ئیسلام و خەلیفایەتی ئەبوو بەکر.
١٤٢) ٦٣٤ ز
شەڕی یەرمووك و ئازاد کردنی سووریا. خەلیفایەتیی عومەر.
١٤٣) ٦٣٧ ز
ئازادکردنی ئۆرشەلیم لەلایەن ئیسلامەکانەوە.
١٤٤) ٦٤٢ ز
مردنی هیراکلیۆس.
١٤٥) ٦٣٢ ز
عوثماني کوڕی عەففان بوو بە خەلیفە.


شەڕی زات الصواری

١٤٦) ٦٥٥ ز
تێك شکانی هێزی دەریایی بیزانتە لەلایەن موسڵمانەکانەوە.
١٤٧) ٦٥٤ ز
کوشتنی عوثمان لە مەدینە و خەلیفایەتی عەلیی کوڕی ئەبوتاڵب.
١٤٨) ٦٦١ ز
شەهید کردنی عەلی.
١٤٩) ٦٦٢ ز
سەرەتای خەلیفایەتیی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان.
١٥٠) ٦٧٥ ز
هێرشی دەریایی ماعویە بۆ سەر شاری قوستەنتینیە.
١٥١) ٧١١ ز
هێرشی موسڵمانەکان بۆ سەر ئیسپانیا لە ژووری ئەفریقاوە.
١٥٢) ٧١٥ ز
بەربڵاوی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەمەوی لە زەمانی وەلیددا.
١٥٣) ٧١٧ ز
سلێمان کوڕی وەلید نەیتوانی شاری قوستەنتینیە داگیر بکات.
١٥٤) ٧٣٢ ز
شارل مارتل لە نزیك (بواتێ)دا موسڵمانەکانی شکاند.
١٥٥) ٧٤٩ ز
رووخانی دەوڵەتی ئەمەوی، ئەبو عەباسی سیففاح بووە یەکەمین خەلیفەی عەباسی. وڵاتی ئیسپانیا هەر بەدەست ئەمەوییەکانەوە مایەوە.
١٥٦) ٧٥١ ز
پیپن بوو بە شای فڕانسە.

١٥٧) ٧٧١ ز
شارلمان بوو بە شای فرانسە.


ئۆتۆی ئیمپراتۆری ساکسون

١٥٨) شارلمان دەست بەسەر لومپاردی دا دەگرێت.
١٥٩) ٧٨٤ ز
هاروونە رەشید بوو بە خەلیفەی عەباسی لە بەغدا.
١٦٠) ٨١٢ ز
مردنی شارلمان و بە پاشابوونی لویسی لە خواترس.
١٦١) ٨٤٣ ز
مردنی لویسی لە خواترس و لەناوچوونی ئیمپراتۆرییەتی کارولنژی.
١٦٢) ٨٥٢ ز
بۆریس یەکەمین شای مەسیحی لە بولگاریادا بوو بە شاه.
١٦٣) ٨٥٦ ز
هێزی دەریایی رووسەکان پەلاماری قوستەنتینیەیان دا.


ئۆتۆ

١٦٤) ٩٦٢ ز
ئۆتۆی یەکەم یەکەمین ئیمپراتۆری ساکسون لە وڵاتی ئەڵمانیادا تاجی لەسەر دەنرێت.

١٦٥) ٩٦٩ ز
دامەزراندنی خەلافەتی جیاوای فاتمییەکان لە میصردا.
١٦٦) ١٠١٦ ز
کنیوك دەبێت بەشای بەریتانیا و دانیمارك و نەرویج.
١٦٧) ١٠٦٦ ز
ولیامی ئەمیری نۆرماندی بەریتانیا داگیر دەکات.
١٦٨) ١٠٧١ ز
دەسەڵاتی سلجوقیەکان.
١٦٩) ١١٨٧ ز
صەلاحەددینی ئەیوبی بوو بە سوڵتانی میصر.
١٧٠) ١١٨٩ ز
شەڕی سێیەمی خاچییەکان (صلیبی).
١٧١) ١١٩٨ ز
مردنی ئیبن روشدی قورتوبەیی.
١٧٢) ١٢٠٢ ز
شەڕی چوارەمی خاچییەکان.
١٧٣) ١٢٠٤ ز
لاتینەکان قوستەنتەنییە داگیر دەکەن.
١٧٤) ١٢١٤ ز

جەنگیزخان پەکین داگیر دەکا.
١٧٥) ١٢١٨ ز
هێرشی جەنگیزخان بۆ سەر ولاتی خەوارزم.
١٧٦) ١٢٢١ ز
سەرنەکەوتنی لەشکری مەسیحی لە شەڕی پێنجەمی صەلیبیدا و کشانەوەیان.
١٧٧) ١٢٢٧ ز
مردنی جەنگیزخان.
١٧٨) ١٢٢٨ ز
(فردریك)ی دووەم رابەری شەڕی شەشەمی صەلیبی دەکات و ئۆرشەلیم داگیر دەکات.
١٧٩) ١٢٣٤ ز
مەغۆلەکان بە یارمەتی ئیمپراتۆریەتی سونگ، ئیمپراتۆریەتی کین دەخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە.
١٨٠) ١٢٤٠ ز
مەغۆلەکان شاری کێیف وێران دەکەن.
١٨١) ١٢٤٤ ز
سوڵتانی میصر ئۆرشەلیم ئازاد دەکات و شەڕی صەلیبی دەست پێ دەکات.
١٨٢) ١٢٥١ ز
مەنگو قائان دەبێت بە خانی هەرە گەورە.
١٨٣) ١٢٥٨ ز
شاری بەغدا لەلایەن هۆلاکۆوە داگیر دەکرێ.
١٨٤) ١٢٦١ ز
یۆنانییەکان قوستەنتنییە لە دەستی لاتینەکان دەردەهێنن.
١٨٥) ١٢٧١ ز
مارکۆپۆلۆ گەشتەکەی دەست پێ دەکات.
١٨٦) ١٢٨٠ ز
قوبلای قائان زنجیرەی یووان لە چین دادەمەزرێنێت.
١٨٧) ١٢٩٢ ز
مردنی قوبلای قائان.


قوبلای قائان


لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی چین

١٨٨) ١٣٤٧ ز
بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تاعوون بە شێوەیێکی تێکرایی.
١٨٩) ١٣٦٠ ز
لەناوچوونی دەسەڵاتی بنەماڵەی یووان لە چین دا. دامەزراندنی زنجیرەی مینگ.
١٩٠) ١٣٦٧ ز
تەیموور لەنگ دەبێت بە خان.
١٩١) ١٣٨١ ز


تەیموور لەنگ


سولتان سەلیم

شۆرشی جوتیاران لە بەریتانیادا.

١٩٢) ١٤٥٥ ز

مردنی تەیموور لەنگ

١٩٣) ١٤٥٣ ز

عوثمانییەکان بە رابەریی سولتان محەممەدی شاری قوستەنتنییە داگیر دەکەن.

١٩٤) ١٤٨١ ز

دوای مردنی سولتان محەممەدی فاتح بایەزیدە دەبێت بە سولتانی عوثماني.

١٩٥) ١٤٩٢ ز

کریستۆف کۆلۆمپس ئەتلانتیك دەبڕێت و وڵاتی ئەمریکا دەدۆزێتەوە.

١٩٦) ١٤٩٢ ز

ماکزیمیلن دەبێت بە ئیمپراتۆر.

١٩٧) ١٤٩٣ ز

ڤاسکۆ دی گاما دەگاتە هیندستان لە  دەریاوە.

١٩٨) ١٤٩٩ ز

سویسرا جەمهوورییەتێکی سەربەخۆی تێدا دامەزرا.

١٩٩) ١٥٠٠ ز

شارلی پێنجەم لەدایك بووە.

٢٠٠) ١٥٠٩ ز

هانریی هەشتەم بوو بە شای بەریتانیا.

٢٠١) ١٥١٢ ز

سولتان سەلیم بوو بە سولتانی عوثماني.

٢٠٢) ١٥١٧ ز

سولتان سەلیم وڵاتی میصر داگیر دەکات و دەیکات بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتەکەی.

بیری لوثەر بڵاودەبێتەوە.

٢٠٣) ١٥١٩ ز

مردنی لیۆناردۆ دافنشی.

ماجەلان گەشتە بەناوبانگەکەی دەست پێدەکات.

٢٠٤) ١٥٢٥ ز

سولتان سلێمان دەبێت بە سولتانی عوثماني.

٢٠٥) ١٥٢٥ ز

بابر لە شەڕی پانیپات دا سەردەکەوێت و شاری دەلهی داگیر دەکات.

٢٠٦) ١٥٢٧ ز

لەشکری ئەلمان بە سەرکردەیی کونستابل بۆربۆن شاری ڕۆما تالان دەکا.

٢٠٧) ١٥٢٩ ز

سولتان سلێمان شاری ڤیەنا گەمارۆ دەدات.

٢٠٨) ١٥٢٠ ز
بیزارو وڵاتی پیرۆ داگیر دەکات.
شارلی پێنجەم لەلایەن پاپاوە تاجی لەسەر دەنرێت.
هانری شەشەم ناکۆکیی خۆی لەگەڵ پاپادا دەست پێ دەکات.
٢٠٩) ١٥٤٣ ز
مردنی کۆپەر نیکۆس.
٢١٠) ١٥٤٠ ز
مردنی مارتن لۆثەری زانای ئایینی.
٢١١) ١٥٧٤ ز
ئیڤانی چوارە "ئیڤانی ترسێنەر" دەبێتە تزار (چار)ی رووسیا.
فرانسیسی یەکەم دەمرێت.
٢١٢) ١٥٤٩ ز
یەکەمین کۆمەڵەی ئاینی مەسیحیەت دەگاتە وڵاتی ئەمریکا.
٢١٣) شارلی پێنجەم لە شایەتی کەنار دەگرێت.
٢١٤) ١٥٥٨ ز
مردنی شارلی پێنجەم.
٢١٥) ١٥٦٢ ز
مردنی سوڵتان سلێمان عوثماني.
٢١٦) ١٥٦٤ ز
لەدایك بوونی گالیلۆ.
٢١٧) ١٥٦٧ ز
شۆرشی هۆڵەندە.
٢١٨) ١٦٠٣ ز
جێمسی یەکەم دەبێتە شای ئینگلتەرە و سکۆتلەندە.
٢١٩) ١٦٠٩ ز
هوڵەندە ئازاد دەبێت.
٢٢٠) ١٦٢٠ ز
شا جیهان دەبێت بە ئیمپراتۆری هیندستان.


شاجیهان

٢٢١) ١٦٣٢ ز
گشتاوس ئادولفس لە شەڕی لۆتزن دا دەکوژرێت.
٢٢٢) ١٦٣٨ ز
گەلی ژاپۆن دەرگای وڵاتەکەی لە خەڵکی ئەوروپا داخست و تا ساڵی ١٨٦٥ ز هاتوچۆی ئەوانی قەدەغەکرد.
٢٢٣) ١٦٤٠ ز
شارلی یەکەم پارلەمانی دانا.
٢٢٤) ١٦٤٢ ز
مردنی گالیلۆی زانای بەناوبانگ.
٢٢٥) ١٦٤٣ ز

لویسی چواردەمین پاشایەتیی حەفتاو دوو ساڵی خۆی دەست پێکرد.
٢٢٦) ١٦٤٨ ز
پەیمانی ڤیستفالیا.
٢٢٧) ١٦٤٩ ز
خنکاندنی شارلی یەکەم شای بەریتانیا.
٢٢٨) ١٦٧٤ ز
شارێک کە هۆڵەندییەکان بەناوی (نیو ئەمستردام) لە ئەمریکادا دروستیان کردبوو ناوی گۆڕا و کرا بە نیویۆرک.
٢٢٩) ١٦٨٣ ز
دوا هێرشی عوثمانی‌یەکان بۆ سەر شاری ڤیەنا و سەرنەکەوتنیان.
٢٣٠) ١٦٨٨ ز
شۆرشی بەریتانیا و ڕاکردنی جێمسی دووەم. بە پاشابوونی. ولیام و ماری.
٢٣١) ١٦٨٩ ز
پەتروسی گەورە بوو بە پاشا.
٢٣٢) ١٦٩٤ ز
ڤۆلتێر لەدایک بوو.
٢٣٣) ١٧٠١ ز
فردریکی یەکەم بووە بە پاشای برووسیا.


(لویس)ی 13


(لویس)ی 14


(لویس)ی 15


(لویس)ی 16




شارلی یەکەم




ئۆرینگ زیب

٢٢٤) ١٧٠٧ ز
مردنــی ئیمپراتــۆری مــەغۆل لــە هیندســتان ئــۆرینگ زیــب و لەناوچــوونی ئیمپراتۆرییەتەکەی.
٢٢٥) ١٧١٥ ز
لویسی پانزدەمین بوو بە پاشا.
٢٢٦) ١٧٢٧ ز
مردنی (نیوتن)ی زانای بەناوبانگ.
٢٢٧) ١٧٣٦ ز
نادر شا هێرشی بردە سەر هیندستان.
٢٢٨) ١٧٦١ ز
ئەلیزابێت بوو بە شاژنی رووسیا.


ناپلون

٢٢٩) ١٧٥٥ ز
شەڕی بەریتانیا و فرانسە لەسەر داگیرکردنی ئەمریکا و هیندستان.
٢٤٠) ١٧٥٧ ز
سـەرکەوتنی ئینگلیزەکـان لـە شـەڕی بـەنگال دا لەگـەڵ سراج الدولـه و ئیـستعمار کردنی هیندستان لەلایەن ئینگلیزەوە لەو ساڵەوە دەستی پێکرد.
٢٤١) ١٧٦٠ ز
مردنی شاژنە ئەلیزابێتی رووسیا و کوشتنی تزار (پۆڵ). لەدواییدا بوونی کاترینی گەورە بە شاژنی رووسیا.
٢٤٢) ١٧٦٣ ز
پەیمانی ئاشتیی پاریس و وڵاتی کەنەدا درا بە بەریتانیا.
٢٤٣) ١٧٤٩ ز
لەدایك بوونی ناپلیۆن بۆنابەرت.
٢٤٤) ١٧٧٦ ز
ئازادیی وڵاتی ئەمریکا.


شاژن ئێلیزابێتی روسیا

٢٤٥) ١٧٧٨ ز
مردنی ژان ژاك رۆسۆی فەیلەسووف..
٢٤٦) ١٧٨٩ ز
هێرش بردنە سەر بەندیخانەی پاستیل لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە.
٢٤٧) ١٧٩١ ز
شۆڕشی یەعقووبییەکان (ژاکوپینەکان) و ڕاکردنی لویسی شانزدەمین.

٢٤٨) ١٧٩٢ ز
فرانسە بڕیاری شەڕیدا لەگەڵ نەمسا, برووسیا لایەنگیری نەمسای کرد لە شەڕی (فالەی)دا.
فرانسە بوو بە جەمهووری.
٢٤٩) ١٧٩٣ ز
خنکاندنی لویسی شانزدەمین.
٢٥٠) ١٧٩٤ ز
کوشتنی رۆبسبیر.
٢٥١) ١٧٩٩ ز
سپای ناپلیۆن بۆنابەرت گەیشتە ولاتی بە کونسۆل.
٢٥٢) ١٧٩٩ ز
گەڕانەوەی ناپیلۆن بۆ فرانسە و هەڵبژاردنی بە کونسل.
٢٥٣) ١٨٠٠ ز
شەڕی ناپیلۆن لەگەڵ نەمسادا.
٢٥٤) ١٨٠٤ ز
ناپلیۆن کرا بە ئیمپراتۆر.
٢٥٥) ١٨٠٥ ز
شەڕی ترافلکار, شەڕی ئاولم و شەڕی ئاسترلیز.
٢٥٦) ١٨٠٨ ز
ناپلیۆن. جوزێفی برای کردە مەلیکی ئیسپانیا.
٢٥٧) ١٨١٢ ز
ناپلیۆن هێرش دەباتە سەر رووسیا.
٢٥٨) ١٨١٤ ز
کەنارگرتنی ناپلیۆن و لویسی هەژدەمین بوو بە شا.
٢٥٩) ١٨١٥ ز
شەڕی واترلۆ.
٢٦٠) ١٨٢٩ ز
ولاتی یۆنان ئازادی بەدەست دەهێنێت.
٢٦١) ١٨٧٥ ز
بۆ یەکەمین جار وشەی سۆسیالیسم بەکاردەهێنرێت.
٢٦٢) ١٨٧٧ ز
سەرەتا فەرمانڕەوایی شاژنە ڤیکتۆریا لە بەریتانیا.


شاژنی ڤیکتۆریا



٢٦٣) ١٨٤٨ ز
ساڵی شۆرشە جۆراوجۆرەکانی ولاتانی فرانسە و ئیتالیا و ئەڵمانیا.
٢٦٤) ١٨٥٢ ز
ناپلیۆنی سێیەم دەبێت بە ئیمپراتۆر.
٢٦٥) ١٨٥٤ ز
شەڕی "کریمە".

٢٦٦) ١٨٥٩ ز
ئەبرەهام لینکۆڵن دەبێت بە سەرکۆماری ئەمریکا. دەست پێکردنی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا.

٢٦٧) ١٨٦٠ ز
ژاپۆن دەرگای وڵاتەکەی دەکاتەوە لە بەردەم بیانییەکان دا.

٢٦٨) ١٨٧٧ ز
شەڕی رووس لەگەڵ سان ستیڤانۆ و پەیمانی ئاشتیی سان ستیڤانۆ..

٢٦٩) ١٨٨٢ ز
داگیر کردنی وڵاتی میصر لەلایەن بەریتانیاوە.

٢٧٠) ١٨٩٠ ز
دەرکردنی بسمارك لەسەر شانۆی سیاسەت.

٢٧١) ١٨٤٤ ز
شەڕی ژاپۆن و چین.

٢٧٢) شەڕی ئیتالیا و عوثماني و داگیرکردنی لیبیا لەلایەن ئیتالیاوە.

٢٧٣) ١٩١٤ ز
سەرەتای شەڕی گەورەی یەکەمی جیهان.

# گەورەترین یا ترینە جۆرا و جۆرەکان

١- گەورەترین دراوی زێڕ لەولاتی لیدی دا ٧٠٠ ساڵ پ. ز بەکار هاتووە.
٢- گەورەترین بورکانی زیندوو (گەرم) لە ناوچەی نیستیوا دایە بەناوی کولاتر.
٣- گەورەترین ئۆقیانووس (زەریا) لە دنیادا ئۆقیانووسی هێمنە کە ١٧١٥١٨٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
٤- گەورەترین بینایێکی کۆنی مێژوو لە وڵاتی مەکسیك دایە بە ناوی هەرەمی شولولا کە ١٨,٩٨ هێکتار زەویی گرتوتەوە.
٥- گەورەترین نەخۆشخانە لە شاری نیویۆرك دایە کە ٣٤٥١ ژووری تێدایە.
٦- گەورەترین شێتخانە دیسان لە شاری نیویۆرك دایە کە ١٤٠٢١ ژوورە.
٧- گەورەترین تەختەنیگار بەناوی (شەڕی ئەتلانتا )ودیە کەسێ هونەرمەندی ئەڵمانی کردوویانە و ١٢,٩٠ مەتر درێژە ١٥,٤٤٠ مەتر بەرزە و هەشت تەن قورسە.
٨- گەورەترین هێلکە ١٨ × ١٢ سم هێلکەی نەعامەیە (حوشتر مر).
٩- گەورەترین توونێلی ژێر زەوی لە شاری نیویۆرك دایە کە درێژیی ٢٩,٢ کیلۆمەترە.
١٠- گەورەترین دورگە دورگەی گرینلاندە.
١١- گەورەترین گیانلەبەری گۆشت خۆری دەریایی (بالن)ە کە قورسایی لە ١٥٠ تەن زیاترە.
١٢- گەورەترین دڕندەیەکی گۆشت خۆری سەر زەوی ورچی قاودیییە کە لە ئالاسکادا دەژی و قورساییەکەی ٧٢٥ کیلۆگرامە.
١٣- گەورەترین دەریاچە دەریاچەی قەزوینە کە ١٤٢٥٥٠ میلی چوار گۆشەیە.
١٤- دیواری چین درێژترین و گەورەترین دیوارە لەدنیادا لە سەردەمی تسەهوانك سی لە پێش زایین دا دروست کراوە، درێژیی ٢٧١٠ کیلۆمەترە و بەرزیی ٤,٥٠ تا ١١,٨٠ مەترە و پانیشی ٩,٧٥ مەترە.
١٥- گەورەترین کاتژمێر لە ئەمریکا دایە کۆمپانیی پالالیف لە جەرسی ستیدا دایمەزراندوە، تیرەکەی ١٥,٢٤ مەترە، سەعات ژمێرەکەی ٥,٤٩ مەتر درێژە، دەقیقە ژمێرەکەی ٨,٧٠ مەتر درێژە.
١٦- بەرزترین ئاوبەست (سەد)ێك لەلایەن بەرزییەوە لە ئیتالیا دایە کە ٢٦٥,٨٠م بەرزە و ناوی (واژونت)ە.
١٧- گەورەترین شاری ئاسیا شاری تۆکیۆیە لە ژاپۆن دا گەورەترین شاری ئەوروپا شاری لەندەنە پایتەختی بەریتانیا گەورەترین شاری ئەمریکا شاری نیویۆرکە.
١٨- گەورەترین گوێچکە ماسی لە مۆزەی سروشتی ئەمریکادایە لە شاری نیویۆرك کە ١٠٩ سم درێژە و ٢٦٢,٦ کغم قورسە.
١٩- گەورەترین دەهۆڵی دنیا لە زانکۆی (تکزاس) دایە تیرەکەی ٧,٦٢ مەترە.
٢٠- گەورەترین قاڵی لە دنیادا ٨١٧٥ مەتر چوار گۆشەیە و لەشاری نیویۆرك دایە.
٢١- گەورەترین (نەهاتی) لە ساڵی ١٨٧٧ ز دا لە وڵاتی چین دا رووی دا کەبووە هۆی مردنی ٩,٧ ملیۆن کەس.
٢٢- بەرزترین لوتکەی کێوی دنیا لە چیای هیمالایا دایە بەناوی بەرزایی ئەفرست کە ٨٨٨٠ م لە رووی دەریاوە بەرزە.
٢٣- گەورەترین کتێبێك کە تا ئێستا لە چاپ درابێت ناوی "مێژووی باشوور"ە کە هەر دانەیەکی ٢٢٥ کیلۆگرام قورسە.
٢٤- گەورەترین کلێسای دونیا لە واتیکان دایە بەناوی سان پییرکە ١٥١٥٠ م$^2$ رووبەرەکەیەتی.
٢٥- گەورەترین گۆڕستان لە شاری پاریس دایە کە لەساڵی ١٨٠٤ ز دا دروست کراوە ٤٣,٧ هێکتار زەویی گرتوتەوە.

٢٦- گەورەترین پەیکەر لە وڵاتی ئەفغانستان دایە کە لە ساڵی ٦٣٠ ز دروست کراوە لە "بودا" کە بەرزییەکەی ٥٢,٧٠ مەترە.
٢٧- گەورەترین مرواریی سمراو ٧,٢٢ گرام قورسە و نەسمراویش ١١٦ ملغم قورسە.
٢٨- گەورەترین مزگەوتی دنیا لە شاری دەلهی دایە کە ٨٤٠٠ مەتری چوارگۆشەیە.
٢٩- گەورەترین و قووڵترین کانگای زێر لە ئەفریقای باشوور دایە کە ٤٥٪ی زێڕی دنیای تێدایە.
٣٠- گەورەترین هوتێل لە شاری شیکاگۆدا لە ئەمریکا کەوا ٣٠٠٠ ژووری تێدایە.
٣١- درێژترین سمێڵی دنیا هی کابرایێکی خەڵکی هیندستانە کە ٢٥٥,٥ سم درێژە.
٣٢- درێژترین ئافرەتی دنیا لە ساڵی ١٨٦٦ ز دا و ٢,٥٥ م بەرز بوو.
٣٣- شاری تۆکیۆ ساڵی ١٩٦٢ بە تەنیا دە ملیۆن کەسی تێدا دەژیا.
٣٤- خێراترین درندە جۆرە پڵنگێکە پێی دەڵێن "شینا" کە لە سەعاتێك دا ١٢٥ کم دەبڕێت.
٣٥- قەڵەوترین پیاوی دینا "روبەرت نال" بووە کە ٤٨٤,٩ کیلۆغرام قورس بووە.
٣٦- گەورەترین زەنگی کڵێسا لەشاری مۆسکۆدایە پێی دەڵێن تزار کلوکل ١٩٣ تەن قورسە.
٣٧- لە ساڵی ١٩٥٩ ز دا گەورەترین تەرزەیەك کە باریوە لە وڵاتی ئیسپانیادا بووە کە هەر دانەیێکی دوو کیلۆغرام قورس بووە.
٣٨- بەهێزترین بوومەلەرزەیەك کە تاکو ئێستا رووی داوە بە هێزی ٨,٦ پلە تۆمارکراوە لەناو دەریادا لە نزیکی کالیفۆرنیادا بووە.
٣٩- درێژترین نامەی نووسراو نامەی ژنێك بووە بۆ سەربازێك کە درێژایی ٩٧٥,٤ مەتر بووە.
٤٠- قووڵترین دەریاچەی دنیا لە یەکیەتی سۆفیەت دایە ناوی دەریاچەی بایگالە.
٤١- کۆنترین پیانۆ لە ساڵی ١٧٢٠ لە شاری فلۆرەنسا دروست کراوە و هێشتا هەر ماوە.
٤٢- کۆنترین کاتژمێر لە کڵێسای سالسبوری بەریتانیا دایە.
٤٣- کۆنترین سینەمای دنیا لە شاری (لویس ئینگلس)ی ئەمریکا دایە.
٤٤- کورت ترین وەسیەتنامە سێ وشە بوو کە لە ساڵی ١٩٠٦ز دا لە زانکۆی بەریتانیا دا نووسراوە هەمووی بۆ دایکم.
٤٥- بچووکترین کڵێسای دنیا لە فەرەنسە دایە بەناوی هۆت ساوا کە تەنیا جێی دە کەسی تێدا دەبێتەوە.
٤٦- بچووکترین ماسیی دنیا لە وڵاتی فلپین دایە درێژیی ٩ ملیمەتر و قورساییشی ٦ میللی گرامە.


Seven Wonders
OF THE ANCIENT WORLD
EUROPE
The Statue of Zeus
The Temple of Artemis
Ephesus
Olympia
The Mausoleum at Halicarnassus
The Colossus of Rhodes
The Hanging Gardens of Babylon
AFRICA
The Lighthouse of Alexandria
The Pyramids of Egypt

## دەگمەنەکان

١- هەرەم



بەناوبانگترین فیرعۆنەکانی میصر سێ پاشای بەرەبابی چوارەمن بەناوی "خنویس" خفرن، میکرفیوس، ئەمانە ٢٨٠٠ ساڵ پێش زایین دەژیان. بەو هەرەمانەی دروستیان کردووە، دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئەوانمان بۆ دەردەکەوێ. ئەوەی کە لە هەمووان گەورەترە گۆڕی "خنویس"ە بەرزیی ١٣٧ گەزە هەر پەلێك (ضلع) ٢٢٧ گەزە، بە گەورەترین و بە شکۆترین ساختمانی بەردین دەژمێردرێت هەرەمی خفرن ١٣٦ گەز بەرزە و هەرەمی میکرنیوس ٦٦ گەزە بەرزە.

٢- پەیکەری ژووپیتەر



پەیکەرتاشی بەناوبانگی مێژووی کۆنی یۆنان "فیدیاس" پێنج سەدە پێش زایین دروستی کردووە، ماوەی نۆ ساڵ کاری تێدا کردووە لەلایەن عوثمانییەکانەوە تێك دراوە.



٣- چراگای بەندەری ئەسکەندەرییە

لەساڵی ٢٧٩ پ. ز بەتلیمۆس دروستی کرد و بەرزییەکەی ١٥٠ مەتر بووە.



٤- پەیکەری ئەپۆلۆن

لە میتۆلۆژیای یۆنان دا ئەپۆلۆن خوای هونەر و مۆسیقا بووە، ئەم پەیکەرە لە بەندەری رۆدس دروست کراوە، ساروس دولیندوس بە دوانزدە ساڵ لە ساڵی ٣٠٠ – ٢٨٨ پ. ز درێژەی کێشاوە و بەرزییەکەی ٦٠ مەتر بووە. بەداخەوە بوومەلەرزە لەناوی بردووە.




**٥- باخە هەڵواسراوەکانی بابل**

لەلایەن نەبوخذنەسرەوە بەیادی ژنەکەیەوە لە شاری بابلی ئەوسادا دروستی کردووە.



**٦- پەرستگای دیانە:**

ساختمانێکی گەورە و تەماشاکار بووە، درێژایی ١٢٨ م و ١٢٧ ستوونی هەبووە، بە فەرمانی گرزوسی شای لیدییەکان دروست کرا، هۆزی ویزیکتەکان لەماوەی یەك ساڵدا توانیای بیرووخێنن.




**٧- گۆرستانی مۆزووڵد:**

ئەم گۆڕستانە بەیادی مێردەکەی ئارتیمس لە هالیکارناس دا دروست کراوە ٤٢ م بەرز بووە لە ساڵی ٣٩٢ پ.ز دروست کراوە.

# بینا بەرزەکانی جیهان

| ناوی بینا | شار و وڵات | بەرزی بە مەتر |
|---|---|---|
| ١- إمپاریر ستیت بیڵدنگ | نیویۆرك ـ ئەمریکا | ٤٤٨ |
| ٢- قوللەی شیبابارك | تۆکیۆ ـ ژاپۆن | ٣٣٣ |
| ٣- کرایسلەر بیڵدنگ | نیویۆرك ـ ئەمریکا | ٣١٩ |
| ٤- قوللەی ئیڤل | پاریس ـ فەڕانسە | ٣٠٠ |
| ٥- بانکی مانهاتن | نیویۆرك ـ ئەمریکا | ٢٨٣ |
| ٦- بینای ئلر. سی. ئای | نیویۆرك ـ ئەمریکا | ٢٥٩ |
| ٧- زانکۆی لومونوسوڤ | مۆسکۆ ـ سۆڤیەت | ٢٠٨ |
| ٨- هوتێل دورگو میلۆسکی | مۆسکۆ ـ سۆڤیەت | ١٧٥ |
| ٩- والدرۆڤ استوریا | نیویۆرك ـ ئەمریکا | ١٦٩ |
| ١٠- قوللەی واشتنتۆن | واشنتۆن ـ ئەمریکا | ١٦٧ |
| ١١- شارەوانیی فیلادلفیا | فیلادلفیا ـ ئەمریکا | ١٦٣ |
| ١٢- کڵێسای کۆلۆن | کۆلۆن ـ ئەڵمانیا | ١٦٠ |
| ١٣- کڵێسای رۆیین | رۆیین ـ فەڕانسە | ١٥١ |
| ١٤- کڵێسای ستراسبورگ | ستراسبورگ ـ فەڕانسە | ١٤٣ |

# چەند بینایەکی مێژوویی بەناوبانگ

**١- ئەل حەمرا:**

پاشماوەی دەسەڵاتی موسڵمانەکانە لەبارەی ناواکارییەوە لە وڵاتی ئیسپانیادا، ئەم کۆشک و تەلارە بەناوبانگە تەنیا تاقەکانی دەرەوە شێرەکانی ١٢٤ پایەی تێدایە، لەم کۆشکەدا هونەری ئیسلامی بە شێوەیێکی پڕ لە وردەکاری خۆی دەرخستووە، لە (مقرنصة)وە تێیدایە تا کاشی کاری و سیرامیك و ناونما و گەچ کاری.

**٢- مەزاری ئەکبەر:**

لەشاری ئەگرەی هیندستانەوە حەوت کیلۆمەتر دوورە، شێوەیێکی ناواکاری (معماری) هونەری هیندوویی تێکەڵ بە سەلیقەو ناواکاریی ئیسلامییە.

**٣- ئەبولهەول:**

ئەم پەیکەرە زەلامە کە رووبەرووی هەرەمی (خفرن) پاڵ کەوتووە لە ساڵانی ٢٨٠٠ پ. ز دروست کراوە، درێژایی ئەم پەیکەرە ٢٤٠ پێیەو بەرزییەکەشی ٦٦ پێیە.




**٤- مزگەوتی ئەزهەر:**

مزگەوتی بەناوبانگی قاهیرەیە و یەکەمین مزگەوتیشە لەو شارەدا، لەلایەن (جەوهەر)ی سەرکردەی (معز الدولة)وە دروست کراوە. لە ساڵی ٣٥٩ ك دا دەستی پێ کردووە و لەساڵی ٣٦١ ك دا تەواوی کردووە. بێ گومان ئێستا هەر ئەو بینایە نییە کە جەوهەر دروستی کردووە ساڵە و ساڵ گەورە و گەورەتر بووە.



### ٥- ئەیا سۆفیا:

مزگەوتێکی بەناوبانگە لە شاری ئەستانبول، لە سەرەتاوە کڵێسا بووە و لە ساڵی (٥٣٢ ـ ٥٣٧ز) دا لەلایەن (ئەنتیمۆس ترالی و ئیزید ورملیطي)یەوە دروست کراوە لەسەر ڕاسپاردەی (یۆستینیا توس). لەساڵی ١٤٥٣ز دا لەلایەن محەممەدی فاتیحەوە کرا بە مزگەوت.



### ٦- باستیل:

قەڵایەک بووە لە پاریس لەسەردەمی شارڵی پێنجەم دا لە ساڵی ١٣٧٠ ـ ١٣٨٢ز لەلایەن (هوگ ئوبریۆ) ناوێکەوە دروست کراوە، سەرەتا قەڵاییکی سەربازی بووە لە دواییدا کراوە بە بەندیخانەیێکی قایمی دەوڵەتی. لە ١٤ی تەمووزی ١٧٨٩ز شۆڕشگێڕانی خەڵکی پاریس ڕووخاندیان.



### ٧- قوللەی ئیڤل:

ئەم قوللەیە نیشانەی شاری پاریسە، لەساڵی ١٨٨٩ز دا گۆستاف ئیڤلی ئەندازیار دروستی کرد بە بەرزیی ٨٨٤ پێ.



### ٨- قوللە لارەکەی بیزا:

لەسەدەی دوانزدەی زایین لە ئیتالیا دا دروست کراوە بەرزییەکەی ١٧٩ پێ دەبێ. ناوبانگەکەی زیاتر لەبەر ئەوەیە کە دەمێکە لاربوەتەوە.

### ٩- تاج محەل:



مەزارێکە لە هیندستان لەساڵی ١٠٤٠ك دا لەلایەن شاە جیهانەوە بۆ یادی نورجیهانی ژنی دروست کراوە و گۆڕی پاشا و ژنە پاشای تێدایە.

### ١٠- بودگایا:

شوێنی لەدایك بوونی بوودایە و هەر لەوێ دا بوودا راستیی ژیانی بۆ دەرکەوت، لەو پەرستگایەدا پەیکەرێکی زێڕی نایابیان بۆ دروست کردووە.

### ١١- قەڵای هاملێت:

ئەم قەڵایە لە هلسنکوی دانیمارك بە شێوەی ئاواکاریی دەمی راپەڕین (رەنیسانسی) هۆڵەندی دروست کراوە، ئێستاش کراوە بە موزەی گیانلەبەرانی دەریا.

### ١٢- کۆشکی ئەلیزە:

لەساڵی ١٧١٨ ز دا لە پاریس و لەسەردەمی لویسی پانزدەهەم دا دروست کراوە تاکو ئێستاش بنکەی دەوڵەتی فەرانسە هەر لەوێدایە.



### ١٣- کرملین:

کۆشکی کرملین یەکێکە لەو کۆشکانەی تزارەکانی رووسیا تیێدا دەژیان و کۆشکێکی بەناوبانگە لە جیهاندا، ئەمڕۆش بارەگای دەوڵەتە لە یەکیەتی سۆڤیەتدا.

## ١٤- کەعبە :

ماڵی خودایە، بەتایەبتی لە دەوروبەریدا مزگەوتێکی تەماشاکاریان دروست کردووە.




## ١٥- گوالیور:

سارێکە لە هیندستان، جێگای شانازیی هیندوکەکانە و دەستکردی دەسەڵاتی ئەوسای راچپوتەکنی تێدایە، ئەم شارە زۆر جار لەلایەن بێگانانەوە پەلامار دراوە.

## ١٦- گۆڕی تەیموورلەنگ:

لەو بینایەدا لاشەی دنیاگیری بەناوبانگ تەیموورلەنگی تێدایە.

## ١٧- پەرستگای زێرین:

یەکێکە لەو جێگایانەی کە لە هیندستان دا بەناوبانگی زۆرە زیارەتگای ئایینی سیکەکانە، بەشی سەردوەی ئەم پەرستگایە سەرتاسەر زێڕە.

وشەی جوغرافیا *Geography* وشەییەکی یۆنانییە لەدوو وشە پێك هاتووە (جیۆ) واتە زەوی (گراف) لێك دانەوە، زانیاریی جوغرافیا بە شێوەیێکی تێکڕایی دوو بەشە؛ جوغرافیای سروشتی و جوغرافیای مرۆڤانە.

**أ - جوغرافیای سروشتی:**

ئەو شتانەیە کە مرۆڤ دەستکاری تێدا نەکردووە بەڵکو بەپێی سروشت و بە ملیۆنان ساڵ پێك هاتوون وەکو گۆڕانی ئاو هەوا و چوار وەرزی ساڵ و سووڕاندنەوەی زەوی و چیاو دۆڵ و رووبارە و دەریاکان.

**ب - جوغرافیای مرۆڤانە:**

واتە نیازی مرۆڤ دروستی کردووە بۆ ئاسایش و حەسانەوەی مرۆڤان. ئەم جۆرە جوغرافیایەش دیسان دەبێت بە دوو بەشەوە:

**١- جوغرافیای سیاسی:**

کە دەربارەی خەڵك و رەگە و ئاین و چۆنیەتی یاسای فەرمانڕەوایی و چۆنیەتی رۆشنبیری و سیاسیی وڵاتەکان دەدوێت.

**٢- جوغرافیای ئابووری:**

دەربارەی کشتوکاڵ، ئاژەڵ بەخێوکردن، پیشەسازی و بازرگانیی گەلان دەدوێت.

## ئیشکانییەکانی جیهان

### ١- ئیشکانیی ئاسیا

گەورەترین ئیشکانیی (قارە)ی دنیایە رووبەرەکەی ٤٤،٢٠٠،٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. ئاو و هەواکەی دەم دەمە، لە زستان دا سارد و لە هاوین دا گەرمە.

**رەگەزەکانی ئەم ئیشکانییە:**

أ- زەرد: تورك، تورکمان، قەرقیز، سامۆید، یاکووت، تونگوز، مادشوس، مەغۆل، چین، ژاپۆن، تیبت، پیرمانیم، ئانامی، سیامی.

ب- سپی: عەرەب، کورد، ئێرانی، ئەرمەنی، هند و ئەوروپا، جوو. ج. ماله: دراوید، ئائینوس، بەنگال.

دانیشتوانی ئەم قارەیە تا ساڵی ١٩٦٣ز ١،٦٧٩،٠٠٠،٠٠٠ کەس بووە.

**ئاینەکانی ئەم ئیشکانییە:**

موسڵمان، مەسیحی، کۆنفوشیۆس، شینتونی، جوولەکە، براهمە.

**وڵاتەکانی قارەی ئاسیا:**

ئەردون، ئەفغانستان، ئێران ئەندنوسیا، بەحرین بەنگلادش، تایلاند، تورکیا، چینی نیشتمانی، چینی کۆمۆنیست، پاکستان، بورما، سعوودیا، سووریا، سیلان، ژاپۆن، کوومیت، کامبۆج، کوریای باکوور، کۆریای باشوور، لاووس، لوبنان، مالاییزیا، مەنغۆلیا، میرنشینی یەکگرتووی عەرەب، عیراق، عومان، فلیپین، فەلەستین، قیبرس، یەمەنی ژووروو، یەمەنی خواروو، یەکیەتی سۆڤیەت' نیپال، ڤێتنام.

## ٢- ئیشکانیی ئەوروپا:

رووبەری ئەم قارەیە ١٠,٠٠٠,٠٠٠ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە، ئاو و هەوای بەشی سەرەوەی سارد و وشکە، بەشی ناوەراست و رۆژهەڵاتی لە گۆڕان دایە و بەشی رۆژاوای بەهۆی هەڵ کردنی بای زەریایی (ئۆقیانووسی) ئەتلەسەوە ئەختێك شێ دارە. بەشی خوارووی ئەورووپاش ئاو و هەواکەی میدەتریانەیە (ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاستە تا ساڵی ١٩٦٣ز دا دانیشتوانی ٥٧٣,٢٥٣,٠٠٠ ملیۆن کەس بووە.

### وڵاتەکانی ئەورویا

ئیسپانیا، پورتەغال، سوێد، ئەرویج، بەریتانیا، دانیمارك، هۆڵەندە، بەلجیکا، فڕانسە، سویسرا، ئێرلەندە، پۆلۆنیا، سۆڤیەت، فنلاندە، چیکۆسلۆڤاکیا، ئەمسا، یۆگۆسلاڤیا، مەجەڕ، رۆمانیا، بولگاریا، ئەلبانیا، تورکیا، لەگەڵ سێ میرنشین کە ئەمانەن:

١- مۆناکۆ
٢- لیختن شتاین
٣- لۆگسەمبورگ

لەگەڵ دەوڵەتی ئاینی فاتیکان لە ناوەند ئیتالیادا.

## ٣- ئیشکانیی ئەفریقیا:

سەر زەویی ئەفریقیا تێکڕا ٢٩,٨٥٧,٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. ئاو هەواکەی چوار بەشە.

١- ناوچەکانی ئیستیوا: کە زۆر گەورم و باراناوییە و هەمیشە بارانە.
٢- ناوچەی خۆلگەیی: واتا سەروو خواری هێڵی ئیستیوا ئەمەش زۆر گەرم و کەم بارانە.
٣- ناوچەی بیابانەکان: گەلێك گەرم و بێ باران و وشك و قاقڕە.
٤- ناوچەکانی کەناری دەریای ناوەڕاست کە نە گەرم و نەساردن.

### خەڵك و رەگەز و ئاینی ئەفریقیا

تا ساڵی (١٩٦٣) ٢٢٢,٧١٩,٩٠٠ ملیۆن کەسی تێدا دەژیا. رەگەزی دانیشتوانیش دەکرێن بەدوو بەشەوە: رەش و سپی سپێکانیش دوو رەگەزن: سامی و حامی ئەم دوو رەگەز لەگەڵ بەشێك لە رەشەکان دا موسڵمانن.. بەشێکیش لە سپییەکان ئەوانەن کە لە وڵاتانی ئەورووپاوە هاتوون و مەسیحین.. هەروەها بەشێکیش لە رەشەکان مەسیحین. بەشەکەی تری رەشەکان هێشتا هەر بت پەرستن.

### وڵاتانی ئەفریقیا:

مۆریتانیا، مەغریب، ئەل جەزایر، توونس، لیبیا، میصر، حەبەشە، سوودان، سۆماڵ، چاد، کینیا، ئەفریقیای ناوەڕاست، داهۆمی، بینین، بۆرندی، رواندا، زامبیا، ئۆگەندە، ساحل عاج، سەنگال، سیرالیون، غانا، کامیرۆن، کۆنگۆ، گابۆن، لیبەریا، مالەگاشی، مالی، نیجەریا، ڤۆلتای ژووروو، تەنجانیکا، گامبیا، ئەنگۆلا، مۆزامبیك، زەمبابۆی.

## ٤- ئەمریکای باکوور و ناوەند:

٢٥) زۆلا "ئەمیل" ١٨٤٠ – ١٩٠٢ ز



لە شاری پاریس لە دایك بووە، نەیتوانی زانكۆ تەواو بكات. ماوەیێك لە رۆژنامە و گۆڤاران دا دەینووسی. زۆلا یەكێكە لە پەیڕەوانی قوتابخانەی ئەدەبی (ناتورالیسم) - واتە سروشت كردی. بەرهەمە ناسراوەكانی ئەمانەن:

نان، خەیاڵ، هەوەس، رووداوی، ئاسیای، سەوز، مرۆڤی، درندە، دارستانەكانی، نینۆن، جەنابی نوژون، رۆكۆن، می كوت، ئارەزووی پیاوێك، رۆما، پاریس، راستەقینە.

٢٦) جید "ئەندری" ١٨٦٩ – ١٩٥١



نووسەری ناوبانگی فەرانسە لە شاری پاریس لەدایك بووە نەیتوانیوە زانكۆ تەواو بكات. دژی ئاین و دیانەت بووە، لە سەرەتاوە هەڵبەستی دادەنا و گۆشەگیربوو ئەوەندە تێكەڵی خەڵك نەدەبوو. ئامانۆیلی كچی خاڵی خۆی هێنا. لەگەڵ مالارمێی شاعیری ناسراوی ئەو سەردەمەدا بووە بە هاوڕێ، تووشی نەخۆشیی سیل هاتووە. لە ساڵی ١٩٤٧دا خەڵاتی ئەدەبیاتی نۆبلی پێ دراوە.

بەرهەمە ناسراوەكانی ئەمانەن:

١. سكەساز.
٢. برۆمیتەی زنجیر شل.
٣. ئاهەنگی لادێیی.
٤. پەروەردەی ژنان.
٥. گەڕانەوە لە رووسیا.
٦. ئێزابێل.
٧. وڵاتی ڤاتیكان.
٨. دستەیۆفسكی.
٩. ئۆدیپ.
١٠. دەفتەری رەش.
١١. دەفتەر سپی.

٢٧) سافۆ

ژنە شاعیرێكی بەناوبانگی مێژووی مرۆڤانە لە سەدەی شەشەمی پێش زایین دا لە دورگەی ئەسیوس دا لەدایك بووە، لەبەر كودەتایێك لەو وڵاتەدا روویدا دورگەكەی بەجێهێشت بەڵام لەدواییدا گەڕاوەتەوە وڵات.

سافۆ نۆ كتێبی هەڵبەستی هەبووە، بەڵام بەداخەوە جگە لە دوو پارچە هەڵبەستی درێژ و چەند پارچە هەڵبەستێكی كورت هیچی ترمان بەدەستەوە نەماوە.

٢٨) ساگان "فرانسوا"

لە ساڵی ١٩٣٩دا لە پاریس لە دایك بووە، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا كتێبێكی نووسی بەناوی "مەرحەبا ئەی غەم" بوو بە هۆی دەنگدانەوەی ناو و دەنگی و بە هەموو زمانانی زیندووی دنیا تەرجەمەكرا. ئەمانەش چەند بەرهەمێكی خاتوو ساگانن:

ئایا برامست خۆش دەوێ؟ ، لێ دانی تەپڵ.

٣٩) سپنسەر "ئەدمۆن" ١٥٥٢ - ١٥٩٩ ز
نووسەری سەدەی پانزدەی بەریتانیایە و لە لەندەن لە دایك بووە. زانکۆی "کامبریدج"ی تەواو کردووە.
رۆمانە بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

١. رۆژنامەی شوان.
٢. ئامورتی.
٣. شاژنی پەریان.



٤٠) شتاین بێك "جۆن"
لە ساڵی ١٩٠٢ز دا لە ناوچەی سالیناسی کالیفۆرنیای لە دایك بووە. باوکی ژمێریار "محاسب" و دایکیشی "دەرس بێژ" بووە. لە ساڵی ١٩١٩دا لە زانکۆ وەرگیرا لەگەڵ خوێندن دا کاریشی دەکرد .. بۆ ئەوەی بتوانێ بخوێنێ ئەم کارانەی کردووە: قاپییەوانی، بەننایی، بۆیاخ چێتی، رۆژنامەنووسی. بەڵام دوای چل ساڵ هەر نەیتوانی زانکۆکەی تەواو بکات.
ناوباوی شتاین بێك بە چیرۆکی (هێشوودکانی تووڕەیی) بە هەر چوارلادا بڵاوبووەوە، لە ساڵی ١٩٦٢دا پاداشتی ئەدەبیی نۆبلی وەرگرت. نووسینە بەناوبانگەکانی ئەمانەن:
فنجانی زێرین، بەو خوایەی وا نەناسراوە، لە شەڕی گومان دا، بارگیری کوێت، مشکان و پیاوان، مرواری ئاگری دردەخشان، لادێی لە بیرچوو.

٤١) شاتۆبریان ١٧٦٨ - ١٨٤٨ ز



لە شاری سان مالوی وڵاتی فەرەنسە لی دایك بووە و ناوی راستەقینەی خۆی (فرانسوارنە)یە لە ریزی سپادا کاری کردووە، لە هەرا و خوێن رژانەکانی ناوخۆدا چووەتە ئەمریکا دوایی چووەتە کەنەدا و لەوێ ساڵێك ماوەتەوە. گەڕاوەتەوە وڵات، ئەم جارە بۆ بەریتانیا کۆچی کردووە. دوای ئەوەی بۆناپەرت بووە بە خاوەن دەسەڵات گەڕاوەتەوە فەرەنسە و لەگەڵ دەوڵەت دا هاوکاریی کردووە.. هێندەی پێ نەچوو لە دەوڵەت زویر بووە و گەشتێکی کردووە بۆ قودس، رۆما، یۆنان، شام، میسر، توونس، ئیسپانیا. دوای ئەوەی بنەماڵەی بۆربۆنەکان دەسەڵاتیان گرتەوە دەست دیسان گەڕاوەتەوە فەرەنسە و بووە بە وەزیری دەرەوە. ئەمانەش هەندێ ناوی بەرهەمەکانی شاتۆبریانە:
ئاتالا، رنە، شەهیدەکان، شکۆی مەسیحیەت.

٤٢) شیللی "پرسی" (١٧٩٢ - ١٨٢٢)
یەکێکە لەو شاعیرە هەست ناسکانەی کە لە وڵاتی بەریتانیادا لەدایك بووە، ئەگەرچی لە تەمەنی سی ساڵیدا جوانەمەرگ بوو بەڵام بەهۆی هەڵبەستەکانییەوە ناوبانگێکی زۆری پەیداکرد. شیللی هەمیش لایەنگری دڵداری و سەفا و ئازادی بوو، سەراسەر ژیانی دژ بە زۆردار و ناڕەوایی تێپەڕاندووە.
بەرهەمە بەناوبانگەکانی:
یاخی بوونی ئیسلام.
گیانی تەنیا.
پرومیتۆسی ئازاد.
بای رۆژاوا.
ئونائیس.

٤٣) شۆلۆخۆف "میخاییل"



لە ناوچەی رستۆڤی سۆڤیەت دا لەدایك بووە، دایکی قۆزاقی و باوکی جوتیار بووە. لە شەڕەکانی ناوخۆی سۆڤیەت دا بەشدار بووە. یەکەمین نووسینی لە ساڵی ١٩٢٣ دا لە رۆژنامەی کومسەمۆل دا بڵاو کردوەتەوە. لە ساڵی ١٩٢٦دا رۆمانێکی نووسی بەناوی "دۆنی مەند" کە بە مایەی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی. لە ساڵی ١٩٦٥دا خەڵاتی ئەدەبیی نۆبلی پی درا. ئەمەش ناوی هەندێك بەرهەمی بەناوبانگی ئەون:

١. دۆنی مەند (یان ئارام).
٢. چارەنووسی مرۆڤێك.
٣. داستانەکانی دۆن.
٤. زەویی زیندووکراوە.
٥. ئەوانەی بۆ نیشتمان شەڕدەکەن.

٤٤) فاکنەر "ولیام" (١٨٩٧ – ١٩٦٢)



لە شاری نیوئەلبانی هەرێمی میسەسیپی لە دایك بووە. باپیری نووسەرێکی ناسراو بووە، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا فاکنەر لە هێزی ئاسمانیدا بەشداری شەڕی کردووە، دوایی چووەتە شاری نیوئۆرلیان و لە رۆژنامەیێکی ئەم شارەدا دەستی بە نووسین کردووە. لە ساڵی ١٩٢٦ ز دا یەکەمین رۆمانی بەناوی "پاداشتی سەرباز" بڵاو کردەوە، چەند ساڵێکیشی خایاند تا کۆمەڵی چیرۆك و رۆمانی نایابی بڵاو کردەوە. لە ساڵی ١٩٤٩ ز خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە. بەرهەمەکانی فاکنەر ئەمانەن:

١. میحراب
٢. هەرگیز ناگیرێت
٣. هاملێت
٤. ورچ
٥. پەناگا
٦. چڵە سەوزەکان
٧. تولە
٨. گوڵی سپی.

٤٥) فلۆبیر "گۆستاڤ" (١٨٢١ – ١٨٨٠)



لە شاری (روان)ی فرانسە لە دایك بووە، باوکی پزیشکێکی دەوڵەمەندی ناوچەی نۆرماندی بووە، زانکۆی تەواو کردووە (بەشی یاسا) دوای مردنی باوکی بوو بە خاوەن پووڵ و پارەیێکی زۆر. ئەگەرچی ئەم نووسەرە نووسینی زۆری نییە ئەڵام ئەو چەند رۆمانەی ك هەیەتی بە شاکار دەژمێردرێن ئەمانە چەند بەرهەمێکی ئەم نووسەرەن:

١. مادام بۆڤاری
٢. سالامبۆ
٣. سەرگوزشتەی سان جۆلین

٤. میوان نەواز
٥. عیشقی بێ نارایش



٤٦) فرانس "ئەناتۆل" (١٨٤٤ – ١٩٢٤ ز)

لە شاری پاریس لە دایك بووە یەکەمین بەرهەمی لە گۆڤارێکی حەفتانەدا بلاوکردەوە، بەلام لە سالی ١٨٧٩ ز دا توانی بەرهەمێك بنووسێ بە ناوی "ژاکیت و پشیلەی لەڕ" کە بووە هۆی ناوبانگی زۆری لەناو فرانسەدا. هەروەها کتێبی "تاوانی سیلوستر بونارد" شۆرەتی گەلێك زۆر بوو.

لە سالی ١٨٩٠ بوو بە ئەندامی ئەکادیمیی فرانسە، لەبەر ئەوەیش زۆربەی بەرهەمەکانی شێوەی گالتە پێ کردن و لاقرتێی تێدا بوو کاربەدەستانی کلێسا زۆر لێی رازی نەبوون. لە سالی ١٩٢١ز دا خەلاتی ئەدەبیی نۆبلی پێ بەرا. لە زۆربەی نووسینەکانیدا رەخنەی لە ئاین و سیاسەت و ژیانی کۆمەلایەتی گرتووە. ئەمانەش ناوی چەند بەرهەمێکی فرانسە.

١. بالتازار
٢. ریکە
٣. بیروباوەڕی جیرم کوانیا
٤. بەسەر بەردی سپییەوە
٥. دورگەی پنگوینەکان
٦. رووداوی پێکەنین
٧. یاخی بوونی فریشتان
٨. خوا تینووەکان
٩. عیشق و یاخی بوون
١٠. کچەکەی کلیمانتین
١١. ژیانی ژاندارك



٤٧) کافکا "فرانش" (١٨٨٣ – ١٩٢٦ ز)

خەلکی ولاتی چیکۆسلۆڤاکیایە و زانکۆی تەواو کردووە لە بەشی یاسادا دکتۆرای وەرگرتووە. زۆر تێکەلی خەلك نەبووە. ژنی نەهێناوە. کاتێك کە مرد وەسیەتی کرد هەرچی نووسیودیەتی بیسووتێنن تا هیچ کەس ئەمی بیر نەکەوێتەوە ئەمەش چەند بەرهەمێکی کافکایە.

١. عاجباتی
٢. دیواری چین
٣. کۆمەلە بەرزەکان
٤. پزیشکی لادێ
٥. ئاتەشگا

٤٨) **کۆکتۆ "جان"**



ئەم هونەرمەندە فەڕانساییە لە زۆر هونەردا شارەزا بووە جگە لە نووسەری، نیگارکێش، هونەرکار، شانۆگەر، دەرهێنەر بووە. لە نووسینیش دا دەستێکی باڵای هەبووە، ئەمانەش ناوی چەند بەرهەمێکی ئەون:

١. نورفە و ئەنتیگۆن
٢. رۆمیۆ و جوولێت

٤٩) **کۆلێت "مادام فرانس" (١٨٧٣ – ١٩٥٤ ز)**



نووسەرێکی ژنی ناوداری وڵاتی فرانسەیە، لە شاری (یورگیسنون) لەدایك بووە، باوکیجەنراڵێکی ماوەی ناپلیۆن بووە. شووی بە رۆژنامەنووسێك کرد، لەبەر ئەوەی مێردەکەی دەیویست رۆمانەکانی لێ بدزێت و بەناوی خۆی بڵاوی بکاتەوە لێی جیا بووەوە. بە درێژایی ژیانی زیاد لە ٧٥ کتێبی بڵاو کردۆتەوە.

فیلمێکی سینەمایی زۆریش لەسەر بناخەی چیرۆکەکانی ئەو دەرچووە.

٥٠) **گۆتێه (١٨١١ – ١٨٨٢)**



لە شاری شارپ لە دایك بووە، شاعیرێکی ناودار و خاوەنی بیروڕای خۆی بووە، ناوبانگی بە شاعیری ناو و رەنگ دەرچووە، چونکە لە هەمان کات دا نیگارکێشێکی بەتواناش بووە. یەکەمین بەرهەمی لە ساڵی ١٨٣٠ز دا بڵاو کرایەوە. بەناوبانگترین هەڵبەستەکانی ئەمانەن:

١.ئەلبەرتۆس. ٢.کۆمیدیی مەرگ. ٣- ئیسپانیا. ٤.پای مۆمیایی. ٥.کاپتن کراکاس. ٦. مێژووی هونەری دراماتیك. ٧.مێژووی رۆمانتیسم.

گۆتێه لە باوەڕێك دا بوو کە دەبێت: "هونەر لە پێناوی هونەردا بێت". دەیگوت: هونەرمەند جگە لە هونەرەکەی خۆی نابێت پابەندی هیچ بەند و بارێکی کۆمەڵایەت یان ئەخلاقی بێت. هونەر و بەس.. ئەویش بۆ هونەر.

٥١) **گۆرکی "ماکسیم (١٨٦٩ – ١٩٣٦ز)**



لە شاری گۆرکیگرادی سۆڤیەتی لەدایك بووە. پێنج ساڵان بووە باوکی مردووە، دایکی دووبارە شووی کردەوە و بەسەر باپیری دادا، چەند ساڵێك بەسەر باپیرییەوە بوو بەڵام بۆی دەرکەوت باپیرەی توانای بەخێوکردنی خۆی نییە تا بە ئەودا بگات.. جا بەجێی هێشت بەرەو شاری ئۆدیسا کەوتەڕێ و لەوی بوو بە کۆڵ هەڵگر، ئیتر شاران گەڕا و زۆر کاری جۆراوجۆری وەکو شاگرد نانەوا، پاسەوان، مووچەخۆری رێگەی ئاسن. لەم ماوانەش دا خەریکی خوێندنەوە بوو. بۆ یەکەم جار چیرۆکێکی لە رۆژنامەیێکی قەفقاسیادا بڵاو کردەوە کەم کەم ناوبانگی دەرکرد بەرەو ئەوروپا کەوتە ڕێ و لەوی مایەوە، تا شۆڕشی ئەکتۆبەری ١٩١٧ ئەوجا گەڕایەوە بۆ وڵاتی سۆڤیەتی.

بەرهەمە ناوارەکانی ئەمانەن:

١. خوێرییەکان. ٢- ئەوانەی ئەوسا مرۆڤ بوون
٣.زانکۆکانی من. ٤.لێمشت
٥.سێ هاورێ. ٦- نۆیەمی ژانۆیە

٧- هاوسەفەر. ٨-بووران
٩-یەکەمین عیشقی من. ١٠- ماموستاکانی ژیان
١١- پاسەوان بووم. ١٢-وردە بەرجوازی
١٣- ڤاسکا. ١٤-بەند کراوەکان. ١٥- دایك



**٥٢) گۆگۆل "نیکۆلای" (١٨٠٩ - ١٨٥٢ ز)**

لە بۆلتاڤیای ناوچەی ئۆکرانیای سۆڤیەتی لە دایك بووە، لە بنەماڵەیێکی ناسراوی ناوچەکەیە. کە باوکی لە ساڵی ١٨٢٥ ز دا مرد لەگەڵ دایکی بەرەو شاری پەتروسبورگ چوون و لەوێش گیرسانەوە. بۆ ماوەیەك بووە ماموستای مێژوو لە قوتابخانـەیێکی کـچانەدا. یەکـەم بەرهـەمی لـە سـاڵی ١٨٣١ زدا بـەناوی "شـەو نشینییەکانی کێڵگەی دیکانا" بڵاو کردەوە. دوای نووسینی رۆمانی بەناوبانگی (تـاراس بۆلبا) ئـاوازەی ناوبانگی لە هـەموو جێیـەك دا دەنگی دایەوە. گەشتی کردووە بۆ ئەڵمانیا، سویسرا، فرانسە، ئیتالیا. سـاڵی ١٨٤٨ گەڕاوەتـەوە بـۆ شـاری مۆسکۆ.

ئەمانەش ناوی چەند بەرهەمێکی ناسراوی ئەم نووسەرەن:

١- تاراس بۆلبا
٢ گیانە مردووەکان
٣ پشکنەری گشتی
٤- شەنەل
٥ ئارابسك
٦- لووت
٧- نووسینەکانی شێتێك
٨- ئەفسانەکان
٩- دیمەنەکانی نوسکی
١٠- تەختەنیگار
١١- شایی

**٥٣) لامارتین "ئەلفۆنس" (١٧٩٠ - ١٨٦٠ز)**



لـە شـاری مـاکون لـە فەرانسـەدا لـەدایك بـووە، دایکـی زۆری خـۆش دەویسـت، بـۆ ئـەوەیش زمـانی لاتـینی فێرببێـت لای قەشـەیەکیان دانـاوە بـەڵام نـەی توانیـوە چ فێرببێت. لە جیاتی ئەوە دەستی کردووە بە خوێندنـەوەی بەرهـەمی نووسـەران و شاعیرانی وەکو دانتی، بترِاك، میلتۆن، شاتوبریان.

لە بیست ساڵیدا چووەتە ئیتالیا و لە شاری نـاپۆلی حـەزی لـە کچێك کـردووە بـەناوی گرازیلا کە بووە بە مایەی ئیلهامی زۆر لە هەڵبەستەکانی.

لەتەمەنی شەست ساڵیدا قەرزدار دەبێت بۆیە پارلەمانی فرانسە مووچەی بۆ دەبڕێتەوە. ئەمانەش ناوی هەڵبەستە ناسراوەکانیەتی:

١- مردنی سوقرات
٢- بیروڕای نوی

٣. گەشتی رۆژهەلات
٤. زۆسلین
٥. گرازیلا
٦. رازی نوێ
٧. گۆم

٥٤) لەندن "جاك" (١٨٧١ – ١٩١٦ ز)

لە شاری سانفرانسیسکۆی ئەمریکا لە دایك بووە، باوکی راوچییەك بووە لە راوچییەکانی کالیفۆرنیای ئەمریکا. سەردەمێك ئاوارە و دەربەدەر بووە بۆ ئەوەی بنێردرێتە قوتابخانە فێری خوێندنەوەیان کردووە، هەمیشە گاڵتەی بە هاوتەمەنەکانی خۆی دەکرد. لە دوانزدە ساڵیدا لەگەڵ باوك و دایکیدا چوونە شاری ئۆکلاند و لەوێ ماوەیێك چووە قوتابخانە، ماوەیێکیش هەر خەریکی خواردنەوە بوو. سەردەمێك رۆژنامەفرۆشی کردووە بۆ ماوەیەك بۆ ڕاوی مرواری و ئەهەنگ لەگەڵ ڕاوچیاندا بەرەو دورگەکانی ژاپۆن کەوتە ڕێ ماوەیەکیش بەدوای زێڕ دۆزینەوەدا گەشت و گەڕانی کردووە..

لەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا ڕێگەی دەکەوێتە کتێبخانەیێك و چیرۆکی (روبنسۆن کرۆزۆ) دەخوێنێتەوە و ئیتر ئەوە دەکا بە پیشە. گەڕایەوە قوتابخانە و بە گورجی کاری چوار ساڵی بڕی و رۆیشتە زانکۆوە. جاك هەمیشە هەر خەریکی نووسین بوو، ئەمانەش ناوی چەند چیرۆك و رۆمانێکی ئەم نووسەرەن:

١. لوورەی درندە
٢. پازنەی ئاسنین
٣. دانە سپییەکان
٤. سەگی سێرك
٥. بێ دەنگیی سپی
٦. مارتین ئایدن
٧. تای زێڕ
٨. دورگەی ترس
٩. چیرۆکەکانی دەریای باکوور
١٠. گورگی دەریا
١١. کەشتیی شکاو
١٢. کچی بەفر
١٣. کوڕی هەتاو
١٤. لە پێناوی ئاگردا
١٥. جیری لە دورگەدا
١٦. دزەکانی کەنداو
١٧. سەر گوزەشتەی کەشتیی ستارك

٥٥) مەترلینگ "مۆریس" (١٨٦٢ – ١٩٤٩ ز)

لە شاری گان لە دایك بووە، خەڵکی وڵاتی بلجیکایە، نووسەر و شاعیر و فەیلەسووف و دراما نووس بووە. زانکۆی تەواو کردووە (بەشی یاسا)، کاری نووسینی لە ساڵی ١٨٨٩ ز دا دەست پێ کردووە چونکە لە پێش دا هەر لە شانۆ نووس ناوبانگی دەرکردووە بۆیە زیاتر بە شانۆیی نووس ناسراوە، دەنا بەرهەمی ئەدەبیی

جۆراوجۆری زۆره. له ساڵی ١٩١١ دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووه. لەدوا دوای تەمەنیدا تووشی دەردی شێتی بوو و له پاشاندا دڵی وەستاوه. بەرهەمە ناسراوەکانی ئەم بلیمەته ئەمانەن:

١- له شانۆ

درامای ماری کاگدولین

مۆنوانا

باڵندەی شین

مردنی تن تاژیل

ئاریان و برپار

٢- جۆراوجۆر

پەرستگای نێژراو، زیرەکیی گوڵان، گەنجینەی بێ نرخ، خاوەن خووی نەناسراو، یاسای گەورە، سێبەری باڵەکان، جاڵجاڵۆکەی شووشەیی، رازی گەوره، مۆریانه مێشەنگ، مێرووڵەکان، هۆش و سەرنووویشت، جادەکانی کەژوکێو، سەعاتی بەردین، دیوانی هەڵبەست.

٥٦) موپاسان "هانری گی دو" (١٨٥٠ – ١٨٩٣ ز)



شاعیر و نووسەری بەناوبانگی فرانسەیە، باوکی دەوڵەمەند بووە مووچە خۆری وەزارەتی دەریاداری فرانسه بووه، یەکەم جار دیوانه هەڵبەستێکی بڵاو کردوەتەوە بەناوی "خواوەند تەعالا" دوای ئەم دیوانه چیرۆکێکی نووسیوه بەناوی گولله تۆپ لەگەڵ (تۆرجنێف)ی نووسەری رووس زۆر هاوڕێ بووه.

ئەمانەش هەندێك بەرهەمی ئەم نووسەرەن که کۆڵەکەی کورته چیرۆك نووسینی هەموو جیهان دادەنرێ:

١-یەك ژیان. ٢- بەهێز هەروەکو مردن. ٣-پیرو ژان

٤- ئاشتی له ماڵ دا. ٥-بزەی بەخت. ٦-هولار.

٧-جوانکیله کوڕ

٥٧) مورێه (دافنی)

له ساڵی ١٩٠٧ دا له شاری لەندەن لەدایك بووه. بۆ خوێندن چووەته پاریس و لەوێ دەستی به چیرۆك نووسین کردووه. له ساڵی ١٩١٣دا یەکەمین چیرۆکی بڵاوکردوەتەوه.. بەڵام بڵاوکردنەوەی "رێگا" دەنگی داوەتەوه. خاتوو دافنی شووی به جەنراڵێکی هێزی ئاسمانیی بەریتانیا کردووه که ناوی (فردریك برونگ) بووه و دوو کچ و کوڕێکی لێ بووه.

ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی ئەم نووسەرەیه:

١- من هەرگیز گەنج نابمەوه

٢- نەناسراو دیسان ماچم که

٣- کچی مامه راشیل

٤- سێبەری بەڵا

٥- باڵندەکان

٦- بێ هۆ

٥٨) مۆم "سامرسێت" (١٨٧٤ – ١٩٦٥ ز)



له شاری پاریس لەدایك بووه، ده ساڵان بووه باوکی مردووه و هەتیو کەوتووه، بەهەر کەم دەستی گەڕاوەتەوە لای مامی له بەریتانیا. پاشان لە ئەڵمانیا بەشی پزیشکی لە زانکۆی هایدلبورگ تەواو کردووه. یەکەم بەهەمی خۆی بەناوی (لیدی فردریك) له پاریس بڵاوکردەوە. له شەڕی یەکەمی گەورەدا له پێشا له تیپی "خاچی سوور"دا کاری کردووه پاشان چووەتە دەزگای هەواڵ زانیی بەریتانیاوە (استخبارات). تووشی نەخۆشیی سیل هاتووه، ئەمانەش ناوی هەندێك له بەرهەمەکانی سامەرسێت مۆمن:

١. تیزبی تیغ
٢. ڕاگوزەری پڕمەترسی
٣. ئەڵقە و نامە
٤. حەوتەمین نامە
٥. ژنەی هەڵ خلیسکاو
٦. پەردەی ڕەنگین
٧. ناکامی تەمەن
٨. ده داستانی گەوره
٩. خاتوو کردوك

٥٩) جۆل ڤێرن (١٨٢٨ – ١٩٠٥ ز)



له شاری نانتی له فەرانسە دا لەدایك بووه، چووەتە پاریس و له بەشی یاسای زانکۆی پاریس دا دەستی کرۆدتە خوێندن بەڵام تەواوی ناکات. دەس دەداتە چیرۆك نووسین بەڵام سەرناکەوێ. له شانۆیەك دا کارێکی پێ دەسپێردرێت و له پاڵ ئەمەش دا دەست دەکا بە خوێندنەوە. دۆستایەتیی لەگەڵ ئەلەکسەندەر دۆماس دا دەبەستێ و یەکەمین چیرۆکی خەیاڵی زانیاریی بەناوی "پێنج حەفتە له باڵۆن دا" دەبێتە ناوبانگی جۆل ڤێرن و نیتر بەر ڕێچکە نەدەبییەوە ناسرا. له ساڵی ١٨٨٦ دا کابرایێکی شێت تەقەی لێ دەکات و برینداری دەکات:
بەرهەمە بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

١. بیست هەزار فەرسەنگ لەژێر دەریادا
٢. دەوری جیهان له هەشتا ڕۆژدا
٣. گەشتێك بۆ ناو جەرگەی زەوی
٤. دورگەی پڕنهێنی
٥. له زەوییەوە تا مانگ
٦. ڕووداوەکانی کاپتەن هاتراس



٦٠) هێرمان هسسە (١٨٧٧ – ١٩٦٢ز)

له شاری کلۆ خوارووی ئەڵمانیادا له دایك بووه، دایکی خەڵکی سویسرا بووه. شاعیر و نووسەرێکی قابیل و بەناوبانگه لە ساڵی (١٨٩٩ ز) دا یەکەمین بەرهەمی شیعری بڵاوکردەوە. بۆ ماوەیێکی زۆر له هیندستان دا ژیاوه له زۆربەی نووسینەکانی دا باسی جۆنیەتیی ژیانی بوودابییەکانی کردووه، له ساڵی ١٩١٢ دا چووەتە سویسرا و هەر لەوێش

ماوەتەوە تا مردنی. لە ساڵی ١٩٤٥ ز دا خەڵاتی ئەدەبیی نۆبلی وەرگرتووە. ئەمەش ناوی هەندێ بەرهەمی بەناوبانگی نووسەرن:

١. گورگی بیابان
٢. گرتروود
٣. سیزارتا
٤. گەشتی رۆژهەڵات
٥. شادیی نیگار کێشان

٦١ ) **همنگوای ( ئەرنست ) ( ١٨٩٨ - ١٩٦١ز)**



لە شاری ئیلی نویزی ئەمریکا هاتووەتە دنیاوە، باوك ودایکی لەگەڵ یەك دا ناڕێك بوون، ئەم ناڕێکییەش لە ژیانی دا رەنگی داوەتەوە، باوکی حەزی دەکرد کوڕەکەی فێری راوەماسی ببێت، دایکی پێی خۆش بوو خەریکی رشتەی ئاین بێت. لە دە ساڵیدا تفەنگی ناسی. لە ساڵی ١٩١٧ دا کاتێك ئەمریکا چووە شەڕەوە، هەمنگوای چووی ریزی سپاوە و بوو بە لێخوڕی ئوتومبیلی بریندااران، لە شەڕدا بریندار بوو و مەدالیای ئازایەتیی وڵاتی ئیتالیای پێشکەش کرا.

پاشان لەگەڵ نووسەرە ناسراوەکان دا ئاشنایەتیی پەیدا کردووە لە ساڵی ١٩٢١دا لەگەڵ ژنەکەی دا بە ناونیشانی رۆژنامەنووسی سەربازی چوونە بەرەی شەڕی تورکیا و یۆنان. پاشان لە ژنەکەی جیا بووەوە. دووبارە لەگەڵ ئافرەتێکی ناو پۆلین دا رێك کەوت و کردییە هاوسەری خۆی. هەمنگوای راوچییەکی کارامە و زیرەك بوو هەمیشە دەچووە ئەفریقیا راوی درندە گەورەکانی دەکرد. لەشەڕی ئازادیخوازانەی گەلی ئیسپانیادا لەگەڵ چەند رۆشنبیرێك دا بەشداری کرد و هەر لەو کاتەدا چیرۆکی فرە ناوداری "زەنگولەی بۆکێ دەزرنگێنەوە؟ "ە نووسی لە تەواوی دنیادا دەنگی دایەوە. ژنی سێیەمی هێنا دوای جیابوونەوە لە ژنی دووەمی.. لەویش جیابووەوە، چوارەمی هێنا، لە ساڵی ١٩٥٤دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرت. لە ساڵی ١٩٦١دا بە تفەنگی ڕاو خۆی کوشت. ئەمانەش ناوی هەندێك لە بەرهەمەکانی ئەون:

١ پیاو کوژان. ٢ ماڵاوایی لە چەك. ٣-رەهێڵەی بەهار.
٤-هەتاو هەر هەڵاتوو دەبێت. ٥-ئەو بەری رووبا لەناو دروخت دا.
٦ پیرەمێرد و دەریا. ٧ بوون و نەبوون. ٨ لە زەمانی ئێمەدا.
٩-ژیانی خۆی وکورتی فرانسیس. ١٠-رەنلی پێنجەم.
١١-چەرداخەکەی سوورەکان. ١٢- خەڵك لە شەڕدا .
١٣-بەفرەکانی کلیمانجارۆ. ١٤-مردن دوای نیوەرۆ.



٦٢ ) **هۆگۆ "ڤیکتۆر" ( ١٨٠٢ - ١٨٨٥ز)**

لە شاری "بزانسۆن" لە وڵاتی فرانسەدا لە دایك بووە کۆنت هۆگۆی باوکی ژەنراڵی سوپای فرانسە بووە، سەردەمی منداڵیی هۆگۆ کەوتوتەوە سەردەمی ناپلیۆنەوە و خێزانی هۆگۆ لەگەڵ براکەی ناپلیۆن دا کە کرابوو بە پاشای ئیسپانیا دەچنە ئەوێ و دوای سێ ساڵ گەڕاونەتەوە فرانسە.

لە ساڵی ١٨٢٢'دا دیوانە هەڵبەستێکی بڵاوکردەوە کە ستایشی بەنەماڵەی بوربونی

تێدا کردبوو. دوای مردنی هۆگۆ لە گۆرستانی (پانتائون) نێژرا کە شوێنی نێژرانی گەورە پیاوانی فەرانسەیە، پەنجا هەزار فرانکی لە پاش بەجێ ما لەسەر وەسیەتی خۆی بەسەر هەژاران دا دابەش کرا. ئەمانەش ناوی هەندێك بەرهەمی هۆگۆن:

١- دوا رۆژی بڕیاردراوێکی مەرگ
٢- قەمبووری نۆتردام
٣- کلۆدی خوێری
٤- هەژاران
٥- ناپیلۆنی بچکۆلە
٦- بەدبەختەکان
٧- کرێکارانی دەریا
٨- پیاوێك کە پێدەکەنێ
٩- مێژووی تاوانێك
١٠- رەفتار و کردارەکان
١١- نەوەدرسێ
١٢- شانۆی ئازار کراو
١٣- ناکامی شەیتان
١٤- لە گەشت دا
١٥- فەرنسە و بەلجیکا

**٦٣) هۆمێر**

دەربارەی ئەم شاعیرە کوێرە بەناوبانگەی یۆنان هێندەمان بەدەستەوە نییە. هیرۆدۆت دەڵێ: هومێر لە ساڵی ٥٨٠ی پێش زایین دا ژیاوە. بەڵام نزیکەی حەوت شاری ئێستای یۆنان بە خەڵکی شاری خۆیانی دەزانن، وەکو: ئەثینا، سالامیس، کۆلۆفن، رۆدس، ئەلکورس، کیوس، سمیرنا. ئەم هونەرمەندە جگە لە هەڵبەست دانان گەلێك جوان مۆسیقای "جنگ"ی لیداوە. ئەلیادە و ئۆدیسە کە بەرهەمی ئەو بەناوبانگن، دەڵێن یەکێك بەناوی "بیسی شراتوس" گلێری کردوەتەوە. ئەم دوو شاکارە باسی ژیان وچۆنیەتیی خواکانی یۆنانی دەکات لەگەڵ چیرۆکی دڵداری هێلین و شەڕی تەروادە.

**٦٤) یەسنین (١٨٩٥ – ١٩٢٥ ز)**

شاعیری هەڵبەستی شێوەگۆرانیی بەناوبانگی رووسیایە. لەتەمەنی سی ساڵیدا لە شاری لینینگراد خۆی کوشت. ماکسیم گۆرکی دەربارەی ئەم شاعیرە گوتوویەتی: دوای بوشکین بە یەکەمین شاعیری گۆرانی سازی رووس دەژمێردرێت.

# شاکارە بەناوبانگەکانی ئەدەبیاتی جیهان

| ناوی شاکار | ناوی نووسەر | ناوی وڵات |
|---|---|---|
| ئاوابوونێک | ئەمیل لودویل | فرانسه |
| ئەفسانەیەک | فاگنەر | ئەمریکا |
| ئاسیاو | پیرلامور | فرانسه |
| ئەڤین ئاوازێکی کۆنه | ولیام سارۆیان | ئەمریکا |
| ئەڤین و یەک درۆ | مارگریت وست | فرشانسه |
| ئەڤین هەرگیز نامرێت | ئەمیلی برونتێ | بەریتانیا |
| ئەڤینی زووروووم کوانیار | ئەناتۆلی فرانس | فرانسه |
| ئەشکەوت نشینەکان | ولیام سارۆیان | ئەمریکا |
| ئەڤین لەناو یونجەدا | لۆژنس | بەریتانیا |
| ئەڤین و یاخی بوون | ئەناتۆل فرانس | فرانسه |
| ئەڤین و داوێن پاکی | شاتوبریان | فرانسه |
| ئازایی | ئەفلاتون | یۆنان |
| ئەفسانەی خەیاڵ | ئەدگار ئالان پۆ | ئەمریکا |
| ئاسۆی گوم بوو | جیمس هلتون | بەریتانیا |
| ئاوابوونی خواکان | نیتشه | ئەڵمانیا |
| ئەمیل | ژان ژاک رۆسۆ | فرانسه |
| ئیلیاد | هومێر | یۆنان |
| ئاهەنگی لادێیی | ئەندری جید | فرانسه |
| ئاهەنگە شاعیرییەکان | لامارتین | فرانسه |
| ئایندەی مرۆڤ | برتراند راسل | بەریتانیا |
| ئیڤانهۆ | والتەر سکۆت | بەریتانیا |
| ئەتنێک | سپینوزا | هۆڵەندە |
| ئودیسه | هومێر | یۆنان |
| ئوروستورات | سارتر | فرانسه |
| ئەسپی سوور | جۆن شتاین بیک | ئەمریکا |
| ئاوە بەهارییەکان | ئیڤان تۆرگینێف | سۆڤیەت |
| ئاتالا | شاتوبەریان | فرانسه |
| ئاگری دردخشان | جۆن شتاین بیک | ئەمریکا |
| ئارتامۆنۆفەکان | مەکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| ئارەزووە گەورەکان | چارلز دیکنز | بەریتانیا |
| ئارەزووە لەدەست چووەکان | ئەنوری دی بالزاک | فرانسه |
| ئارنوین | ئەلفۆنس دودێ | فرانسه |
| ئاسواگش | ئالن بوزاند | فرانسه |
| ئاسیه و یەکەمین عیشق | ئیڤان تورگنیف | سۆڤیەت |
| ئانا کارنینا | تۆلستۆی | سۆڤیەت |
| ئەو کاتە خەوەکانی گەنجی دێنەوە | تۆماس فادل | ئەمریکا |
| بیر و بڕیار | نیتشه | ئەڵمانیا |
| باباگۆریو | بالزاک | فرانسه |
| باوکی لنگ درێژ | جین وستەر | ئەمریکا |
| بابک | ڤۆلتێر | فرانسه |
| بە خوێن ساردییەوە | کاپون | فرانسا |
| بای رۆژهەڵات بای رۆژاوا | بێرل باک | ئەمریکا |

| | | |
|---|---|---|
| پیاوێك كه مردبوو | لۆرنس | بەریتانیا |
| پیاوی سەرباز | فاكنەر | ئەمریكا |
| بەیردو | پول پۆرجێه | فرانسه |
| پەیمانه كۆمەڵایەتییەكان | ژان ژاك رۆسۆ | فرانسه |
| باشایەتی | ئەلكگسەندر دۆما | فرانسه |
| پیاو جاكان | جۆل رۆمن | فرانسه |
| بیسەی غەم | بالزاك | فرانسه |
| بیاو كوزدكانی كۆلانی گەوره | ئەدگار ئالان پۆ | ئەمریكا |
| باسی سەرگەردان | جۆن شتاین بیك | ئەمریكا |
| بازنەی ناسنین | جاك لندن | ئەمریكا |
| بەر | ماتیس | بەریتانیا |
| بەریی روویانی ناكام | پیرلۆتی | فرانسه |
| بردێك بەسەر رووباری دریندادا | نیقا ئەندەرویچ | یۆگۆسلاڤیا |
| بیرد كچ | بالزاك | فرانسه |
| بسیلەی رەش | ئەدگار ئالان پۆ | ئەمریكا |
| بەلكی گیا | والت ویتمن | ئەمریكا |
| تانیس | ئەناتۆل فرانس | فرانسه |
| تام جۆنز | فیلدتیك | بەریتانیا |
| تاراس بۆلبا | گۆگۆڵ | سۆڤیەت |
| تورتیلانت | جۆن شتاین بیك | ئەمریكا |
| توورديی و هەرا | فاكنەر | ئەمریكا |
| ترس | تسوایك | ئەمسا |
| ترس له گیان | پومالاپارته | ئیتالیا |
| ترس له ژیان | هانری بردۆ | فرانسه |
| تریستان وایزون | جوزێف بده | فرانسه |
| تزد | ئەندرێ جید | فرانسه |
| تۆم ساوێر | مارك تواین | ئەڵمانیا |
| تۆنیو كروگر | تۆماس مان | ئەڵمانیا |
| تیفۆس | چیخۆف | سۆڤیەت |
| تاوانی سیلڤستەر بورنارد | ئەناتۆل فرانس | فرانسه |
| تاوانبار | چیخۆف | سۆڤیەت |
| تەڵەی مرۆڤ | لوئیس | ئەمریكا |
| تەڵە سەوزەكان | فاكنەر | ئەمریكا |
| تۆڵەی سەگ | بیراندیللۆ | ئیتالیا |
| توانایی نەخوێندەواری | تۆلستۆی | سۆڤیەت |
| تۆڵە | تۆلستۆی | سۆڤیەت |
| جادەی تووتن | كلدۆیل | ئەمریكا |
| جێی پای هەتاو | جاك لندن | ئەمریكا |
| جەمهوورییەت | ئەفلاتون | یۆنان |
| جەمیله | هانری بردۆ | فرانسه |
| جین نیر | شارلۆت برونتێ | فرانسه |
| جلگاش | ماكسیم گۆركی | سۆڤیەت |
| جوتیاری شیكاگۆ | مارك تواین | ئەمریكا |
| جێگای راو | چیخۆف | سۆڤیەت |
| جوتیاران | چیخۆف | سۆڤیەت |
| جیوه دۆڵ | بالزاك | فرانسه |

| | | |
|---|---|---|
| جیوەی سوور | ئەناتۆل فرانس | فڕانسە |
| جێگایەك لە شاردا | هوارد فاست | ئەمریکا |
| جۆرێك لە بزدگەنین | فرانسوا ساگان | فڕانسە |
| حاجی مراد | تۆلستۆی | سۆڤیەت |
| حەوتەمین تاوان | سومەرسێت مۆم | بەریتانیا |
| حەربا | چیخۆف | سۆڤیەت |
| خویرییەکان | ماکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| خەڵکی لە شەڕدا | هەمنگوای | ئەمریکا |
| خانە خۆبی نەناسراو | مەتر لینگ | بەلجیکا |
| خەیاڵ | ئەمیل زۆلا | فڕانسە |
| خوا حافیزی | بالزاك | فڕانسە |
| خواکان تینوویانە | ئەناتۆل فرانس | فڕانسە |
| خەواڵوو | چیخۆف | سۆڤیەت |
| خوێن و لم | جیاکو مولاوارندا | ئیتالیا |
| خاکی چاك | بیرل باك | ئەمریکا |
| خێزانی تیبو | مارتن دوکار | فڕانسە |
| دوا رۆژەکانی بریاری مەرگ دراوێك | هۆگۆ | فڕانسە |
| دورگەی پر لە نهێنی | جۆل ڤێرن | فڕانسە |
| دورگەی پنگوینەکان | ئەناتۆل فرانس | فڕانسە |
| دورگەی گەنج | روبرت لوئیز ستیڤنسن | بەریتانیا |
| دورگەی ترس | جاك لندن | ئەمریکا |
| دەرمانی خۆشەویستی | ئۆهینری | ئەمریکا |
| داخی بن نابروویی | هاثورن | ئەمریکا |
| داخنیس و گلونە | لوتگوس | یۆنان |
| دەروازەی گەورە | مەترلینگ | بەلجیکا |
| دزیرە | ماری سلینکو | فڕانسە |
| داهۆل | ئەناتۆل فرانس | فڕانسە |
| دوزمنان | چیخۆڤ | سۆڤیەت |
| دکامیرون | بۆکا چیۆ | ئیتالیا |
| دکتۆر ژیفاگو | بۆریس باسترناك | سۆڤیەت |
| دکتۆر جیکل و مستەر هاید | روبەرت لوئیز ستیڤنسن | بەریتانیا |
| دمیان | هیرمان هسسە | ئەڵمانیا |
| دونی مەند | شۆلۆخۆف | سۆڤیەت |
| دنیای ئیشارەت | دیڤید کاسکوین | بەریتانیا |
| دوبروفسکی | پوشکین | سۆڤیەت |
| دووریتی بچکۆڵە | چارلز دیکنز | بەریتانیا |
| دووژن | ئەلبەرتۆ مۆرافیا | ئیتالیا |
| دۆزەخ | سارتر | فرانسا |
| دووەمین شانس | گیورگیۆ | رۆمانیا |
| دۆن کیشۆت | سەرڤانتس | ئیسپانیا |
| دیوار | سارتر | فڕانسە |
| دیواری چین | کافکا | چیکۆسلۆڤاکیا |
| دیپلومات | کامیون | فڕانسە |
| دڤید کابرفیلد | جارلز دیکنز | بەریتانیا |
| دێوی خۆپەرست | ئۆسکار وایلد | بەریتانیا |
| دەرکراو | ئەلار کرین | سۆڤیەت |

| | | |
|---|---|---|
| دلی هەمالایا | له کونت دولیل | فرانسە |
| دادگای سوقرات | ئەفلاتون | یۆنان |
| دزگیرانی | لازوس ژیلاهی | مەجەر |
| دیلی قەفقاسیا | تولستوی | سۆڤیەت |
| دیلی مرۆڤ | سومەرسێت مۆم | بەریتانیا |
| رووداوێکی بچکۆلە | چیخۆف | سۆڤیەت |
| رووداوەکانی پاشایەتیی شارلی نۆیەم | مریمێ | فرانسە |
| ردجەلەك | نادام میتسکیوفج | پۆلەندە |
| رووداوی ئاسیای سەوز | ئەمیل زۆلا | فرانسە |
| راستگۆ | ڤۆلتێر | فرانسە |
| راتومون | ئاگو ئاکاوا | ژاپۆن |
| ریکە | ئەناتۆل فرانس | فرانسە |
| ریکا | دافنە دی مۆرێ | بەریتانیا |
| رەنگی بچکۆلە | گی دی موپاسان | فەرەنسە |
| ردح و سەربەستی | ئیروتینگ ستون | ئەمریکا |
| رنی | شاتوبریان | فرانسە |
| رۆبنس کروزۆ | دانێیل دۆفە | بەریتانیا |
| روحی یاساکان | مونسکیۆ | فرانسە |
| روحی مرۆڤ | هوگۆ | فرانسە |
| رودن | تورگنیف | سۆڤیەت |
| روسلان و لودیمیلا | بوشکین | سۆڤیەت |
| رۆشنایی له مانی ئاوتا | فاگنەر | ئەمریکا |
| رۆمیۆ و جولێت له دێ دا | گود فرید کلەر | ئەڵمانیا |
| رازی گەورە | مەترلینگ | بەلجیکا |
| رشانەود | سارتر | فرانسە |
| زەردەشت وای وت | نیتشە | ئەڵمانیا |
| زانکۆکانی من | ماکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| زیندووی ئاگادار | ابن الطفیل | عرب |
| زەردەخەنەی بەخت | گی دی موپاسان | فرانسە |
| زەردەخەنەی جۆکۆند | ئەلدوس هەکسلی | بەریتانیا |
| زیانێك | گی دی موپاسان | فرانسە |
| ژنێکی ترسێنەر | تۆماس فارل | ئەمریکا |
| ژنانی هونەرمەندان | ئەلفونس دودێ | فرانسە |
| ژووری ژمارە شەش | چیخۆف | سۆڤیەت |
| ژیانی پیاوە ناسراوەکان | بلوتارك | یۆنان |
| ژیانی من | چیخۆف | سۆڤیەت |
| ژیانی میکالانژ | رومن رۆلان | فرانسە |
| ژنی سێ ساڵە | بالزاك | فرانسە |
| ژنێك کە ڕای کرد | هربرت لۆرنس | بەریتانیا |
| ژنی خۆپەرست | تاگری | بەریتانیا |
| ژنی خاوەن خۆی | دستەیوفسکی | سۆڤیەت |
| ژن و یارییەکان | لوئیس | فرانسە |
| ژاندارك | مەترلینگ | بەلجیکا |
| ژان کریستف | رومن رۆلان | فرانسە |
| ژان ماریو | ئەناتۆل فرانس | فرانسە |
| ژان و کۆلن | ڤۆلتێر | فرانسە |

| | | |
|---|---|---|
| ژوزێف پالسامو | ئەلکساندەر دۆما | فرانسە |
| ژوزێف فوشە | ستیڤن تسوایك | ئەمسا |
| ژیل پلاس | ئەلەن رنێ لۆساژ | فرانسە |
| سبەینێ دەگریم | لیلیان روت | ئەمریکا |
| سیاسەت | ئەرستۆ | یۆنان |
| سیمان | گلاد کوف | سۆڤیەت |
| سیزارتا | هیرمان هسسە | ئەڵمانیا |
| سوور و رەش | ستاندال | فرانسە |
| سەر زەوی ویران | ئەلیوت | بەریتانیا |
| سەر گوزەشتەی کرمی دار | ماری کرلی | بەریتانیا |
| سروودی کریسمس | چارلز دیکنز | بەریتانیا |
| سزار پیروتو | بالزاك | فرانسە |
| سەفەرەکانی من | هۆگۆ | فرانسە |
| سەفەرنامەی گالبور | جۆناتان سویفت | ئیرلەندە |
| سککە لێدەرەکان | ئەندرێ جید | فرانسە |
| سڵاو لە غەم | فرانسوا ساگان | فرانسە |
| سواری ئەسپی شێ | تیودور شتورم | ئەڵمانیا |
| سێ تفەنگ دار | ئەلەکسەندەر دۆما | فرانسە |
| سادە دڵ | ڤۆلتێر | فرانسە |
| سالامبو | گۆستاف فلوبیر | فرانسە |
| سێبەری بەڵا | دافنەدی مۆرێ | بەریتانیا |
| سیی دان | جاك لندن | ئەمریکا |
| سەردەمی منداڵی | ماکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| سەردەمی نابڵوقە | فادییع | سۆڤیەت |
| سامانی روگنەکان | ئەمیل زۆلا | فرانسە |
| سەرکەوتنی نایندەی دیموکراتی | تۆماس مان | ئەڵمانیا |
| شتی مرۆڤایەتی گەڵێك مرۆڤایەتی | نیتشە | ئەڵمانیا |
| شەری نایندە | ولز | بەریتانیا |
| شارلی دوازدەهەم | ڤۆلتێر | فرانسە |
| شاعیر لە نیویۆرك | لۆرکا | ئیسپانیا |
| شازادە خانم بابل | ڤۆلتێر | فرانسا |
| شازادە و سوالکەر | مارك تواین | ئەمریکا |
| شەوێکی خەیاڵی | ستیڤن تسوایك | ئەمسا |
| شەو دانیشتنەکانی تست | پل والری | فرانسە |
| شەوە سپییەکان | دستەیوفسکی | سۆڤیەت |
| شەرابی شیراز | تورگنیف | سۆڤیەت |
| شنل | گۆگۆل | سۆڤیەت |
| شەیتان | لێرمەنتۆف | سۆڤیەت |
| شەیتان | تۆلستۆی | سۆڤیەت |
| شێرە گەنجەکان | ئیروین شاو | ئەمریکا |
| شاپلیتەی هەلگیرساو | مەك نیس | ئیرلەندە |
| عاشقی لێدی چاترلی | لورەنس | بەریتانیا |
| عاشقی داهۆڵ | هستیتگز | بەریتانیا |
| عەنبەر | کاتلین و ینسور | ئەمریکا |
| فشەبازی | نۆهێنری | ئەمریکا |
| فلیس | دوسگور | فرانسە |

| | | |
|---|---|---|
| ڤکتۆریا | کنوت هامسون | نەرویج |
| ڤۆلگا دەڕژێتە خەزەرەوە | پیلنیاک | سۆڤیەت |
| قۆزاقەکان | تۆلستۆی | سۆڤیەت |
| قومار باز | دستەیۆفسکی | سۆڤیەت |
| قوربانەکانی کالاوراس | مارک تواین | ئەمریکا |
| قارەمانی سەردەمی ئێمە | لیرمەنتۆف | سۆڤیەت |
| قەمبووری نۆتردام | هۆگۆ | فرانسە |
| کەنگاوری نارام | تورگنیف | سۆڤیەت |
| کتێبی هاورێیەکەم | ئەناتۆل فرانس | فرانسە |
| کەشتیی شکاو | تاگوور | هیندستان |
| کۆلیتەکەی مامەتۆم | پیچراسیوو | ئەمریکا |
| کۆلیتی هیندی | دۆسن پیر | فرانسە |
| کلۆد و خوێری | هۆگۆ | فرانسە |
| کلیما | ئەندرێ مۆرا | فرانسە |
| کۆمیدیای خوایی | دانتی | ئیتالیا |
| کۆمیدیای مرۆڤایەتی | سارۆیان | ئەمریکا |
| کۆنت مونت کریستۆ | ئەلەکسەندەر دۆما | فرانسە |
| کیسکی سوود خۆر | بالزاک | فرانسە |
| کۆشك | کافکا | چیکۆسلۆڤاکیا |
| گاپیتانی ناگادار | کۆنت روبەرت | فرانسە |
| کار لە کار ترازاوە | سارتر | فرانسە |
| کرێکارانی دەریا | هۆگۆ | فرانسە |
| کارمن | پروسپە مریمە | فرانسە |
| کازانۆڤا | ستیڤن تسوایک | ئەمسا |
| کاکانی | چێخۆف | سۆڤیەت |
| کەوا | لوید دۆگلاس | ئەمریکا |
| کچە بەفر | جاك لندن | ئەمریکا |
| کچە لادێیی | بوشکین | سۆڤیەت |
| کچەی چاو زێڕین | بالزاك | فرانسە |
| کچی سەروان | بوشکین | سۆڤیەت |
| کچی مامە بت | بالزاك | فرانسە |
| کچی مام راشیل | دافنە دی مۆرێ | بەریتانیا |
| کچە رەشەکە بەدوای خوادا | بەرناردشۆ | بەریتانیا |
| کچی کلمانتین | ئەناتۆل فرانس | فرانسە |
| کوڕی هەتاو | جاك لندن | ئەمریکا |
| کوڕە رەشەکە | رایت | ئەمریکا |
| کچە شاکلو | مادام دی لاڤاییێت | فرانسە |
| گردە سەر سەوزەکانی ئەفریقیا | هەمنگوای | ئەمریکا |
| گیانە مردووەکان | گۆگۆل | سۆڤیەت |
| گورگی بیابان | هێرمان هسسە | ئەڵمانیا |
| گورگی دەریا | جاك لندن | ئەمریکا |
| گوڵی سپی | ویلیام فاکنەر | ئەمریکا |
| گوم بووەکان | چیخۆف | سۆڤیەت |
| گوڵاڵەی رەش | ئەلەکسەندەر دۆما | فرانسە |
| گرتروود | هێرمان هسسە | ئەڵمانیا |
| گرتا | کلدویل | ئەمریکا |

| | | |
|---|---|---|
| | مارك تواين | ئەمريكا |
| گردوی دوو ملیاردەر | تسوایك | ئەمسا |
| گیرفان بڕ | ئەریش ماریا مارك | ئەڵمانیا |
| گەڕانەوە | ئەندرێ جید | فرانسە |
| گەڕانەوە لە سۆڤیەت | دستەیۆڤسکی | سۆڤیەت |
| گێلَ | کونراد | بەریتانیا |
| گەوجی ئەملایر | جاك لندن | ئەمريكا |
| لووردی درندە | جاك لندن | ئەمريكا |
| لێ بوردنی ژنان | جۆل ڤێرن | فرانسە |
| لە زدوییەوە تا مانگ | نیتشە | ئەڵمانیا |
| لە دایك بوونی تراژیدی | جۆن شتاین بێك | ئەمريكا |
| لەوەرگاکانی ئاسمان | ستوارت میل | بەریتانیا |
| لە ئازادی دا | ئۆسکار وایڵد | بەریتانیا |
| لە قوولاییدا | ماکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| لە قوولایی کۆمەڵ دا | ماکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| لە بیناوی نان دا | ئەندرێ جید | فرانسە |
| لە دەربەندا | ماریا مارك | ئەڵمانیا |
| لە رۆژاوای هیچ باسێك نییە | جاك لندن | ئەمريكا |
| لە ولاتێکی دووردا | نیتشە | ئەڵمانیا |
| لەولای خێر و شەڕەوە | ئەنتوان چیخۆف | سۆڤیەت |
| لەناو جاڵ دا | جۆن شتاین بیك | ئەمريكا |
| لە شەرێکی گومان داردا | فرانسوا ساگان | فرانسە |
| لەمانگێك دا لە ساڵك دا | ئەلەکسەندەر دۆما | فرانسە |
| لارون مارکو | چارلی چاپلن | بەریتانیا |
| لایم لایت | ستیڤن تسوایك | ئەمسا |
| لودند | ئەلبەرتۆ مۆرافیا | ئیتالیا |
| لیدا | مونتسکیۆ | فرانسە |
| لیزیماك | ئەدگار ئالان پۆ | ئەمريكا |
| لی جیا | ئەلفونس کار | فرانسە |
| لەژێر دار زیزەفۆنەکان دا | ئیڤان تورگنیف | سۆڤیەت |
| مرۆڤی زیادە | هیرو بازن | فرانسە |
| مار لە مشتا | ئەمیل زۆلا | فرانسە |
| مرۆڤی سەرەتایی | روشفور | فرانسە |
| منداڵە ورتکەی ئەم سەردەمە | مارك تواین | ئەمريكا |
| مرۆڤ چییە؟ | کالدویل | ئەمريكا |
| ماڵێك لە چیاکان دا | لیلیان وینیچ | بەریتانیا |
| مێشە کەرانە | مۆریس مەترلینگ | بەلجیكا |
| مێش هەنگ | گۆستاڤ فلۆبیر | فرانسە |
| مادام بۆڤاری | ئەمانتس | هۆڵەندە |
| مادمۆزێل لینا | چارلز دیکنز | بەریتانیا |
| مارتن جوزیل ویت | جاك لندن | ئەمريكا |
| مارتین ئیدن | لۆرەنس | بەریتانیا |
| ماری پەردار | شیللەر | ئەڵمانیا |
| ماري ستیوارت | سامائول پیکت | ئیرلەندە |
| مالون ئەمرێت | پرەوو | فرانسە |
| مانن لیسکۆ | پیرلۆتی | فرانسە |
| ماسی گری ئیسلەندە | | |

| | | |
|---|---|---|
| مانگ شاردرایەوە | جۆن شتاین بیك | ئەمریکا |
| مانفرد | لۆرد بایرون | بەریتانیا |
| مشکان و پیاوان | جۆن شتاین بیك | ئەمریکا |
| مومو | تورگنیف | سۆڤیەت |
| مرواری | جۆن شتاین بیك | ئەمریکا |
| مسیۆ توماس | ئەناتۆل فرانس | فرانسە |
| میرات | ماکسیم گۆرکی | سۆڤیەت |
| میکرومیکاوس | ڤۆلتێر | فرانسە |
| مورینای سەوزدپۆش | ماتیسن | بەریتانیا |
| مۆریانە | مەترلینگ | بەلجیکا |
| مەیخانەی جامانیك | دافنەدی مۆرێ | بەریتانیا |
| میوانی | ئەفلاتون | یۆنان |
| مردنی دوای نیودرۆ | هەمنگوای | ئەمریکا |
| مەولەوی | پیکت | ئیرلەندە |
| میشێل ستروگوف | جۆل ڤیرن | فرانسە |
| مونیرا | جۆلین گرین | فرانسە |
| مۆمیاییەك | ئونێل گۆتیە | فرانسە |
| ماڵاوایی لەچەك | هەمنگوای | ئەمریکا |
| نووسینەکانی پەنهانی | دستەیۆفسکی | سۆڤیەت |
| نووسینەکانی ئینگلیزی | ناتانیل هاثورن | ئەمریکا |
| نۆیەمی ژانۆیە | گۆرکی | سۆڤیەت |
| ئەهنگی سپی | هرمان ملۆیل | ئەمریکا |
| نەوەتوس | هۆگۆ | فرانسە |
| نیتۆچکا | دستەیۆفسکی | سۆڤیەت |
| نیورونزی جوانکیلە | ئەلفۆنس دودێ | فرانسە |
| نەناسراو ماچم بکە | دافنەدی مۆرێ | بەریتانیا |
| نامەی ژنەکان | مارسێل پردوو | فرانسە |
| نامەیەك لە ئیسلەنددوە | مەك تیس | ئیرلەندە |
| نوێنەرە گەورەکان | ئەندرێ مالرۆ | فرانسە |
| نیگاری دۆریان گرای | ئۆسکار وایلد | بەریتانیا |
| نیگاری هونەرمەندێك | جۆیس | ئیرلەندە |
| هەزاردکان | هۆگۆ | فرانسە |
| هەڵقەی حەوتەم | ستیفن گورگە | ئەڵمانیا |
| هەتاو هەروا گەرمە | هەمنگوای | ئەمریکا |
| هێشوو تریێی تووڕەیی | جۆن شتاین بیك | ئەمریکا |
| هەرا لە تاریکیدا | سنیتسلەر | ئەمسا |
| هێز و توانا | گراهام گرین | بەریتانیا |
| هەسونە زێرینە | هەربەرت لۆرەنس | بەریتانیا |
| هاکل بریفین | مارك تواین | ئەمریکا |
| هلوئیزی نوێ | جان جاك رۆسۆ | فرانسە |
| هاونیشتمان تۆم پێن | هوارد فاست | ئەمریکا |
| هەمیشە مێرد | دستەیۆفسکی | سۆڤیەت |
| هەوەس | ئەمیل زۆلا | فرانسە |
| هەوەسەکانی ئیمپڕاتۆر | سینکویچ | پۆڵەندە |
| ویلسونی گێل | مارك تواین | ئەمریکا |
| وەزارەتی ترس | گراهام گرین | بەریتانیا |

| | | |
|---|---|---|
| واسکا | گۆرکی | سۆڤیەت |
| واژە | سارتر | فرانسە |
| یەکەمین خوێن | جاك شیفەر | ئەڵمانیا |
| یادی مامۆستایەك | چیخۆف | سۆڤیەت |
| یەکەمین ئەڤین | تۆرگینیف | سۆڤیەت |
| یەکەمینی ئەڤینی من | گۆرکی | سۆڤیەت |
| یەك بنگۆس لە خولی خوا | کالدویل | ئەمریکا |

# خەڵات و پاداشتە ئەدەبییەکانی جیهان

ئەدەبیات لە کۆنی کۆنەوە یەکێك لە حەوت هونەرە ناسراوەکان ژمێردراوە, لەناو گەلان دا هەمیشە بە چاوی رێز و قەدرزانییەوە سەیر کراوە, ئەوانەی خاوەن بیری رۆشن و پێنووسی رەوان و شیرین بوون بەلای رۆشنبیرانی تەواوی دونیاوە چ ئەوسا و چ ئێستاش لە گلێنەی چاودا دانراون. پێم وایە نەتوانین باسی پاداشتە کۆنەکان بکەین ئەوانەی بە خاوەن بیر و خاوەن پێنووسان دراوە, بەڵام لە دنیای ئەمڕۆدا چەند پاداشتێکی بەناوبانگ لە دنیادا دیاری کراوە بۆ بلیمەتەکان و بە پێی یاسایەك و چەند مەرجێك پێش کێش دەکرێت.. یەکێك لەو پاداشتە گرنگانە خەڵاتی نۆبلە. بابزانین نۆبل کێیە ؟

**ئەلفرێد بەرنهارد نۆبل :**

لە ساڵی ١٩٣٣ دا لە شاری سکۆنەی وڵاتی سویدا لە دایك بووە. ئەم مرۆڤە زۆر لەڕ و لاواز و رێودلە بوو, لە ساڵێك دا هاتۆتە دنیاوە کە باوکی ناسراو و زانای تووشی تی شکانێکی سەخت و زۆر دەبێت و دەبێتە هۆی کۆچ کردنی بەرەو شاری پیترسبورگی رووسیا, لەوێ کارگایەکی ئەندازیاری پێك دەهێنێت. دەوڵەتی ڕووسیا فەرمانی پێ دەدا کە خەریکی دروست کردنی کەشتی و ژێردەریایی بێت و لەو کاردا سەرکەوتنێکی شایانی بەدەست هێنا, بەڵام لەبەر ئەوەی کاروبارەکانی پەخش و بڵاوبوون دوای شەڕی "کریمە" دیسانەوە کەوتەوە سەر ساجی عەلی. ئەلفرێد نۆبل تا شانزدە ساڵان هەر بە شێوەیێکی تایبەتی دەرسی خوێندنەوە و دەرسی دراوەتێ. لە تەمەنی بیست ساڵیدا کیمیاگەری چاك فێربوو لەگەڵ زمانانی ئەڵمانی, فەرانسی, رووسی, سویدی و لە ئەنجامی هەوڵ و تاقیکردنەوەدا نۆبل دۆزییەوە ئەگەر سوود لە کەرەستەکانی تەقینەوەی نترۆگلیسرین تێکەڵ بە کەرەستەیەکی وەکو (گلیسلکوهر) بکرێت ئاسان و بێ زیان تر دەبێت. ئەم دۆزینەوەیە لە ساڵی ١٨٦٧دا بەناوی (دینامێت) بەناوی خۆیەوە تۆمار کرد لەدوایدا نترۆگلسرینی لەگەڵ باروودا تێکەڵ کرد جەلاتینی تەقینەوەی بەدەست هێنا و لە ساڵی ١٨٧٥ دا ئەمەش بەناوی خۆیەوە تۆمار کرد.

بە دروست کردنی دینامیت و کەرستەی تەقینەوە و بەدەست هێنانی نەوتی باکۆ و کانگاکان بوو بە خاوەن سامانێکی گەورە. لە هەمان کات دا دینامیت بوو بە هۆی گۆڕینی چۆنیەتیی دروست کردنی رێگە و تونێل و بیناسازی لە تەواوی دنیادا.

نۆبل لە ساڵی ١٨٩٦دا مرد. بەڵام ساڵێك پێش مردنی وەسیەت نامەیەکی نووسی و بە پێی ئەو وەسیەت نامەیە دەبێ سامانەکەی کە ٣١ ملیۆن کرۆنی سوێدی بوو بکرێت بە پارەی رووت و پاش وەبەرهێنانی. قازانجەکەی بۆ ئەو بلیمەتانەی کاری شایان و بە کەڵك دەکەن بۆ مرۆڤ بە خەڵات پێش کەش بکرێت. کارەکانیش کە نۆبل بۆ پاداشتەکە دیاری کردوون ئەمانەن:

١. کیمیا
٢. پزیشکی
٣. ئەدەبیات
٤. ئاشتی

## پاداشتی نۆبل ناوی ئەدەبیاتی پاداشت وەرگر
## پاداشتی ئەدەبیاتی نۆبل

| ساڵ | ناوی پاداش گر | وڵات |
|---|---|---|
| ١٩٠١ | سوللی پرودۆم | فرانسه |
| ١٩٠٢ | كریستیان ماتیاس تیۆدۆر مۆمسن | ئەڵمانیا |
| ١٩٠٣ | مارتیتۆس بیورنسون | نەرویج |
| ١٩٠٤ | فردریك میسترال | فرانسه |
| | رۆزه ئیزاگیره | ئیسپانیا |
| ١٩٠٥ | هینریك سینكویچ | پۆڵەندە |
| ١٩٠٦ | گیوسۆ ئەكاردوچی | ئیتالیا |
| ١٩٠٧ | رودیار كیپلینگ | بەریتانیا |
| ١٩٠٨ | رودلف كریستۆف یوگن | ئەڵمانیا |
| ١٩٠٩ | سلما لاگرلف | سوێد |
| ١٩١٠ | لودڤیك هایسه | ئەڵمانیا |
| ١٩١١ | مۆریس مەترلینگ | بەلجیكا |
| ١٩١٢ | گرهارت یۆهان روبرت هوپێمان | ئەڵمانیا |
| ١٩١٣ | رابندرانات تاگور | هیندستان |
| ١٩١٤ | بۆ ساڵی داهاتوو داندرا | |
| ١٩١٥ | رۆمان رۆلان | فرانسه |
| ١٩١٦ | كارل گۆستاڤ و ورنر ڤۆن هایدنستام | ئەڵمانیا |
| ١٩١٧ | كارل گیلروب | دانیمارك |
| ١٩١٨ | بۆ ساڵی داهاتوو هەڵگیرا | |
| ١٩١٩ | پاداشتی ساڵی پێشوو خرایه خەزنەوه و پاداشتی ئەم ساڵەش دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | |
| ١٩٢٠ | ١- كارل فردریك شپیلەر (پاداشتی ساڵی ١٩١٩) | سویسرا |
| | ٢ كنوت هامسۆن (پاداشتی ساڵی ١٩٢٠) | نەرویج |
| ١٩٢١ | ئەناتۆل فرانس | فرانسه |
| ١٩٢٢ | جاسینتو بناو | ئیسپانیا |
| ١٩٢٣ | ویلیام باتلر ییتز | ئیرلەندە |
| ١٩٢٤ | ڤلادیلاڤ ستانیلا رایمونت | پۆڵەندە |
| ١٩٢٥ | دانراو بۆ ساڵی داهاتوو | |
| ١٩٢٦ | جۆرج بەرناردشۆ (پاداشتی ساڵی پێشوو) پاداشتی ئەم ساڵەش دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | بەریتانیا |
| ١٩٢٧ | هی ساڵی ١٩٢٦ درا بە: گراتسیا دلّدا | ئیتالیا |
| ١٩٢٨ | هانری برگسون (هی ساڵی پێشوو) | فرانسه |
| | زیگرید ئوندست (هی ئەم ساڵ) | نەرویج |
| ١٩٢٩ | تۆماس مان | ئەڵمانیا |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩٣٠ | سینکلیر لویس | ئەمریکا |
| ١٩٣١ | ئەریک کارلفلت | سوید |
| ١٩٣٢ | جان کالزورثي | بریتانیا |
| ١٩٣٣ | ئیڤان بوتیف | سۆڤیەت |
| ١٩٣٤ | لویجی پیراندللۆ | ئیتالیا |
| ١٩٣٥ | دانرا بۆ ساڵی ئاینده | |
| ١٩٣٦ | گەڕاوەتەوە خەزینە و هی ساڵی پێشووش دراوە بە یوجین ئونیل | ئەمریکا |
| ١٩٣٧ | مارتن دوکار | فرانسه |
| ١٩٣٨ | بیرل باك | ئەمریکا |
| ١٩٣٩ | ئیمیل سیلانپێ | فرانسه |
| ١٩٤٠ | سێیەکی پاداشتەکە خراوەتە سندووقی ئاشتییەوە | |
| ١٩٤١ | هی ئەم ساڵەش نەدرا لەبەر شەڕی جیهانی | |
| ١٩٤٢ | نەدرا | |
| ١٩٤٣ | نەدرا | |
| ١٩٤٤ | یۆهانس ویلهلم یەنسن | دانیمارک |
| ١٩٤٥ | گابریێلا میسترال | شیلی |
| ١٩٤٦ | هێرمان هسسه | ئەڵمانیا |
| ١٩٤٧ | ئەندرێ جید | فرانسه |
| ١٩٤٨ | تۆماس ئەلیۆت | بریتانیا |
| ١٩٤٩ | دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | |
| ١٩٥٠ | ولیام فۆکنەر (پاداشتی ١٩٤٩) | ئەمریکا |
| | برتراند راسل (پاداشتی ١٩٥٠) | بریتانیا |
| ١٩٥١ | پارلاگر گویست | سوید |
| ١٩٥٢ | فرانسوا مۆریاك | فرانسه |
| ١٩٥٣ | وینستۆن چرچل | بریتانیا |
| ١٩٥٤ | ئەرنست هەمنگوای | ئەمریکا |
| ١٩٥٥ | هالدور لاکنس | ئایسلەندە |
| ١٩٥٦ | خوان رامون خیمینز | ئیسپانیا |
| ١٩٥٧ | ئەلبێر کامۆ | فرانسه |
| ١٩٥٨ | بۆریس باسترناك "بەڵام وەرینەگرت" | سۆڤیەت |
| ١٩٥٩ | سالڤاتۆره کوازیمۆدۆ | ئیتالیا |
| ١٩٦٠ | سان جان پێرس | فرانسه |
| ١٩٦١ | ئیڤان ئەندرویچ | یۆگۆسلاڤیا |
| ١٩٦٢ | جۆن شتاین بێك | ئەمریکا |
| ١٩٦٣ | جۆرج سفریس | یۆنان |
| ١٩٦٤ | جان پۆل سارتر "پاداشتەکەی وەرنەگرت" | فرانسه |
| ١٩٦٥ | میخائیل شۆلۆخۆف | سۆڤیەت |
| ١٩٦٦ | نیلی ساش _ سامۆئیل ئاگنۆن | سوید فەلەستین |

# درێژەی خەڵاتەکانی ساڵانی دواتر
# لە بەرگەکانی تردا هاتووە



سوللی پرودۆم



کاموس



میسترال



پیرسن





رولاند

## پاداشتەکانی بریتانیا

١. پاداشتی ئەدەبی یادگاری جێمس تیت بلاك لە ساڵی ١٩٥٠از دا دەستی پێ کردووە.
٢. پاداشتی رۆژماری گراش: دەربارەی ئەدەبیات لە ساڵی ١٩١٤ ز دا دەستی پێکردووە.
٣. پاداشتی رۆیال: لە ساڵی ١٩٥٤از دا دەستی پێکردووە.
٤. پاداشتی یادی داف کووپەر لە ساڵی ١٩٥٧ ز دا دەستی پێکردووە.
٥. پاداشتی هەڵبەست هی ولیام فویل: لە ساڵی ١٩٥٠ ز دا دەستی پێ کردووە.
٦. پاداشتی هاثورندن: لە ساڵی ١٩٢٢ ز دا دەستی پێکردووە.
مەدالیاکانیش کە لە پاداشتدا دەدرێن ئەمانەن:
أ مەدالیای کارنکی. لە ساڵی ١٩٤٠ ز دانراوە.
ب مەدالیای کیت گرینوی. لە ساڵی ١٩٥٨ ز دا داویانەی بە خەڵك.
٧. پاداشتی سومەرسێت مۆم. لە ساڵی ١٩٤٦از دا دەستی پێ کردووە.
٨. پاداشتی سێر رۆجەر نیودیکیت: تەنیا بۆ میللەتی ئینگلیزە و لە ساڵی ١٩٣٨دا دەستی پێکردووە.
٩. پاداشتی یادی جان لولین رایس: لە ساڵی ١٩٤٢از دانراوە.
١٠. پاداشتی ئەنجومەنی ئەدەبیاتی شاهانە. لە ساڵی ١٩٤٧از دانراوە.
١١. پاداشتی ئەدەبیی و. هـ سمیث و کوڕەکەی. لە ساڵی ١٩٥٩ دانراوە.

## پاداشتەکانی فرانسە :

١. پاداشتی ئەکادیمیی ئەدەبیاتی فڕانسە زۆرە، بەڵام دوو پاداشتە ناسراوەکانی ئەم دوانەن:
أ – پاداشتی گەورەی ئەدەبیات. لە ساڵی ١٩١٢از دا بڕیار دراوە.
ب – پاداشتی رۆمان. لە ساڵی ١٩١٥ ز دا دراوە.
٢. پاداشتی وەرگێرانی دنیس کلرویین. لە ساڵی ١٩٤٦ ز دا دانراوە.
٣. پاداشتی فەمینا. لە ساڵی ١٩٠٤ زدا داندراوە.
٤. پاداشتی گۆنگور. لە ساڵی ١٩١٦ ز دا دانراوە.
٥. پاداشتی ئەنترالیە. لە ساڵی ١٩٣٠ زدا دانراوە.
٦. پاداشتی پیرکنێت دونوی. لە ساڵی ١٩٥٤ داندراوە.
٧. پاداشتی تیو فراست ردنوود. لە ساڵی ١٩٢٦از دانراوە.

## پاداشتەکانی ئەمەریکا

لە وڵاتی ئەمریکادا یەك رێکخراوی پاداشت هەیە کە وەك (نۆبل) وابێت، بەڵام بچکۆلەترە ئەم خەڵاتە لەلایەن رۆژنامە نیگاریکەوە دانراوە بەناوی پولیتزەر *Pulitzer* بە سەرپەرشتی زانکۆی کۆلۆمبیا هەموو ساڵێك دراوە بە چاکترین: رۆژنامەنووس، مۆسیقازان، نووسەر، لێکۆڵەر. ئەمەش لە ساڵی (١٩١٧)دوە دەستی پێکردووە.

## ١ـ مێژووی سروشت زانی لە کۆنەوە:

بە پێی چەند نووسراوێکی (گڵین) کە دۆزراوەتەوە. بابلییەکان ئاشناییەکی زۆریان لەگەڵ ناسینی زۆر گیا و زۆر گیانلەبەردا هەبووە. "فادر شیل" کە زۆربەی نووسینەکانی (لارسا)ی خوێندوەتەوە نووسراوێکی بەدەست هێناوە کە ناوی ئەو جۆرە ماسییانەی تێدایە کە لە بازاڕی لارسادا رۆژانە فرۆشراون، جۆرەکان لە ٢٠ زۆرترە و دوانزدە جۆرە ماسی بە دانە فرۆشران و ئەوانی دی بە کێشان یان بە زەمبیلە، بایی جۆری یەکەم بە ئاسانی ڕوون ناکرێتەوە بەڵام بەشی دووەم نرخەکانی دیارە.. ئەمە دەری دەخات کە چاک جۆرەکانی ماسییان ناسیوە. گەلێک نووسراوی سۆمەری و ئەکەدی ناوی زۆر گیانلەبەر و ناوی زۆر گیا دەرمانیان تێدایە، کەوا گیایەکان لە ٢٥٠ جۆر زۆرترە و زاناکانی ئاشووری بە ئەواوی ئەیان زانیوە ئەو ناوەی کە هی چ جۆرێک گیایەکە بە زمانی سۆمەری زانیویانە بەرامبەرەکەی بە زمانی ئەکەدی چییە. تاکو ئێستاش هەندێک لەو ناوانە ئێمە یان ڕێک وەکو ئەوسا بەکاریان دەبەین یان لەو ناوە کۆنانەوە وەرگیراون.

## ٢ـ تیۆرییەکانی پەیدابوون:

### ١. پەیدا بوونی ژیانی ئاسمانی:

بەپێی ئەم بیروڕایە ژیان لە سەرەتاوە لە ئەستێرەکانی دیکەی ئاسمان دا هەبووە و دوایی گوێزراوەتەوە بۆ زەوی. ئەو بیروڕایە لە ساڵی ١٨٢١ لەلایەن زانایێکی فەرەنسەییەوە کە ناوی "مۆنت لیفو"یە گوتراوە. لە ساڵی ١٨٦٥یش دا (یختر)ی زانای ئەڵمانی دانی پێدانا و سەلماندی.

### ٢- تیۆریی گیانلەبەرەوە ئاگرینەکان:

بە پێی ئەم ڕایە گوایا زەوی کە لە هەتاو جیابووەتەوە وەکو گڕێکی ئاگری تەواو وابووە، بەڵام بە پێی تێپەربوونی ملیۆنان ساڵ کەم کەم ئەو گڕ و گەرمایە نەماوە و، توێژی گرتووە و ، ئارام گژوگیای سەوز بووە و گیانلەبەر تێیدا خولقاوە. کە توانایەکی زۆریا هەبووە، بەرامبەر بە گروگەرمای زۆرجار بەپێی زەمان گیا و دار و سەوزی و گیانلەبەرانی ئەمڕۆی زەوی جێگەی ئەوانیان گرتوەتەوە.

### ٣- هەروەهایی "فیکسیسم"

بە پێی ئەم بیروڕایە لە سەرەتای پەیدابوونی گیانلەبەری سەرزەوی دا تاکو ئێستا هیچ جۆرە گۆڕانێکی لێ ڕوونەداوە، چۆن خولقاوە لە سەرەتاوە تاکو ئەمڕۆ هەروەها بووە وبێ گۆڕان و گەورە بوون یان بچووک بوونەوە ئەم بیروڕایە زانایەکی فەرەنسەیی بەناوی "کوویە" خاوەنیی کردووە.

### ٤- کاسترۆفیسم

بەپێی ئەم بیروڕایە لە سەرەتای زەوییەوە تاکو ئێستا زۆر ڕووداوی بنەڕەتی تێدا ڕووی داوە، کە بە جۆرێکی وا بووە هەر جارەی هیچ جۆرە گیانلەبەرێکی تێدا نەماوە و پاش ئەم ڕووداوە دووبارە ژیانی تێدا پەیدا بووەتەوە کە هیچ پێوەندییەکی بە پێش خۆیەوە نەبووە.

### ٥- لامارکیسم

کۆمەڵـە بیروڕایـەکی لایـەنگرانی لامـارکی زانـای بەناوبانگـە دەربـارەی گیانلەبـەران دەڵـێن: تـەواوی گیانلەبەرانی ئەمڕۆ هەتاوەکو گیا و داریش ئاکامی پێگەیشتنی گیانلەبـەرەکانی پـێش ملیۆنـان ساڵن، کە بە هۆی تێپەڕبوونی سالانی زۆر بوون بەوەی کە ئێستا دەبینرێن.. چونکە گۆڕانی دەوروبـەری گیانلەبـەر بـەپێی ملیۆنان ساڵ لەش و و ڕەوشت و بەدەنی تووشی گۆڕان کردووە، وە ئەو بەشەی لەشی کە پێویستی زۆرتر پێی هەیە بە هێزتر بووە، ئەوەشی کە نیازی پێی نەماوە لاواز بووە یان هەر لەناو چووە.

### ٦- داروینیسم

شەڕی ژیان لە سروشت دا تەواو نابێت ئـەم شـەڕەش بـۆ مانـەوەی ژیـان سـاتێک ئەوەستاوە و بێ گومان ئەوانەی کە لە ئەنجام دا دەمێننەوە بە هێز و شیاون و لەگـەڵ سـەختییەکانی سروشت دا دەگونجێن و ژینی خۆیان دەبەنەسەر. هـەر لـەو کاتیـشدا بـەپێی تێپـەڕبوونی زەمـان ئەنـدام و بـەدەنی گیانلەبـەران بـەرەو خۆ گونجاندن لەگەڵ سەختییەکانی دەوروبەردا لە گۆڕانن تا سنووری نیاز و بەیەک خواردن لەگەڵ سروشت دا.

مـرۆڤ و مـەیموون کـە نموونـەی رێکی ئـەم گیانلەبەرانـەن ڕۆڵـەی یـەک بـاپیرن. ئـەم بیروڕایـە زانـای بەناوبانگ (داروین) خستوویەتییە ڕوو بەتایبەتی لە کتێبی "بنچینەی جۆرەکان"دا.

### ٧- میچورینسم

ئەگەر گیانلەبـەرێك بهێـنین و بیخەینـە جێگایێکی جوێ لـەوەی تـێدا ژیـاوە و بەتـەواوی و بـە هـەموو جۆرێك دەوروبەرەکەی رگۆڕین ئەوسا یـان ئـەوەتا گیانلەبەرەکە لەگـەڵ سـەختییەکانی دەوروبـەرە تازەکیدا بەرەبەرەکانێ دەکات و ناگونجێت و هەروەکو جارانی خۆی دەمێنێتەوە لە ئاکام دا دەمرێت، یان ئەوسا لەگەڵ ژینگەی تازەکەیدا دەسازێ و بەپێی زەمان گیانلەبەرێکی دیکەی لێ دەردەچێت.

# زەوی ناسی




زەوی لــە دەرەوە تـــا نـــاخ و قولاییەکەی لـە چینانە پێـك هاتووە:

١- چینی هەوا (با).
٢- چینی ئاو.
٣- چینی وشکە توێژ (سیال).
٤- چینی گڕە توێژ (سیما).
٥- چینی گۆی قورسە هەناوی زەوی (نیفە).

١- چینی هەوا : *Atmosphere*

غازە توێژێکە هەموو لایێکی زەویی گۆتوەتە خۆ بەم ئەندازەیەش غازەکانی ڕادەیەکیان ڕاگرتووە:

٧٥,٧٪ ئازۆت "نتروجین"

٢٢,٠١٪ ئۆکسجین

١,٢٨٪ کاربۆن و گازە نایابەکانی دی.

٢- ئاوە بەرگ *Hydrospher*

لە پێنج بەش چواری زەوی ئاو دایپۆشیوە کە دەکاتە یەك ملیار و سێصەد و حەفتا کیلۆمەتری سێ جا.

٣- وشکە توێژ *Lithoshere*

چینێکە بە قوولایی ٥٠ تا ١٠٠ کم کەوا زۆر بەشی سیلسێم و ئالنیۆمە.

٤- گڕە توێژ (الغلاف الملتهب) *Pyrosphere*

ئەستوورایی ئەم چینە ٢٠٠٠ کیلۆمەترە و وەکو ئاگرێکی تەواوە وایە و زۆربەی ئەم چینە سیلیس و مەنیزیۆمە.

٥- گۆی قورسە هەناو (الکرة اباطنیة الثقیلة) *Baryiosphere*

ناوەرۆکی زەوی یان گۆی فلزە جۆراوجۆرەکانە. لەبەر ئەوەش زۆربەی لە ئاسن و نیکل بریتییە، پێشی دەگوترێ "نیفە". ئەستوورایی ئەم تۆپە یان تیرەکەی ٥٠٠٠ کیلۆمەترە.

# ڤیتامین

مادەیێکی تایبەتییە کە لە خواردنی زیندووەکان پێک دێت و هەر یەکێک لە ڤیتامینەکانیش لە خواردنێکی تایبەتیدا هەیە نەبوونی هەر یەکێکیشیان دەبێتە هۆی نەخۆشییەک لە لەش دا لەبەر ئەوش لەش توانای دروست کردنی ڤیتامینی نییە بۆ خۆی – جگە لە ڤیتامین D کە پێستی مرۆڤ دەتوانێ لە تیشکی هەتاو دروستی بکات – دەبێ مرۆڤ لە خواردن دا دەستگیریان بکات. ڤیتامین چەند جۆرێکی هەیە ئەمەش ناوی ڤیتامینە گرنگەکانە: A،B، C، D، E، K

## کاری ڤیتامینەکان:

١- ڤیتامین A

بوونی ئەم ڤیتامینە لە لەشدا چاو بەهێز دەکات و نەخۆشییەکانی چاو کەمتر کاریگەر دەبن، هەروەها وزەی تێکڕایی لەش و بەربەرەکانی بەرامبەر بە نەخۆشییەکان کەمتر دەبێت.

٢- ڤیتامین B

نەبوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتە هۆی لاوازیی دڵ، ئیفلیج بوون، نەخۆشیی پێست و لاوازییەکی تێکڕایی.

٣- ڤیتامین C

نەبوونی ئەم ڤیتامینە لە لەشدا دەبێتە هۆی ئەم نەخۆشییانە:

کەم خوێنی، پووکاندنەوەی پووک و ددان کەوتن، نەخۆشیی گەدە و ریخۆڵە و سەرمابوون.

٤- ڤیتامین D

نەبوونی ئەم ڤیتامینە لە لەشدا دەبێتە هۆی ئەم نەخۆشییانە:

ئێسک نەرمی، کزیی بەربەرەکانێی لەش بەرامبەر بە سەرمابوون.

٥- ڤیتامین E

نەبوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتە هۆی نەزۆکی و وجاغ کوێری، هەروەها بێ هێزیی توانای ژن و پیاوی.

٦- ڤیتامین K

بۆ خوێن چاکە. نەبوونی دەبێتە هۆی درەنگ وەستانەوەی خوێن بڕان.

### کاری ڤیتامینەکان

**هەر سەد گرام لەم خواردنانە چەند تاووزە (سعرە)ی تێدایە؟**

| | |
|---|---|
| ١٠٠ گرام پەنیر | ٢٨٠ کالری |
| ١٠٠ گرام هێلکە | ١٧٠ کالری |
| ١٠٠ گرام گۆشتی گا | ٢٩٠ کالری |
| ١٠٠ گرام گۆشتی مەڕ | ٣٢٠ کالری |
| ١٠٠ گرام گۆشتی گوێرەکە | ١٢٥ کالری |

١٠٠ گرام گۆشتی بەراز ٣٧٥ کالری
١٠٠ گرام ماسیی دەریا ٨٠ کالری
١٠٠ گرام ماسی روبار ٢٤٥ کالری
١٠٠ گرام کەرێ ٧٦٠ کالری
١٠٠ گرام رۆنی نەباتی ٧٥٠ کالری
١٠٠ گرام دانەوێڵە ٢٥٥ کالری
١٠٠ گرام ئاردە گەنم ٣٣٠ کالری
١٠٠ گرام ئاردە جۆ ٣١٥ کالری
١٠٠ گرام برنج ٣٤٠ کالری
١٠٠ گرام نانی سپی ٢٤٥ کالری
١٠٠ گرام نانی بۆر رەش ٢١٠ کالری
١٠٠ گرام پەتاتە ٨٥ کالری
١٠٠ گرام گێزەر ٣٨ کالری
١٠٠ گرام کەلەرمی سەوز ٦٠ کالری
١٠٠ گرام سپێناخ ١٧ کالری
١٠٠ گرام کاهوو (خاس) ١٧ کالری
١٠٠ گرام سێو و هەرمی ٥٠ کالری
١٠٠ گرام تەماتە ٢٢ کالری
١٠٠ گرام چکلێت ٤٨٠ کالری
١٠٠ گرام شەکر ٤٠٠ کالری
١٠٠ گرام گوێز ٥٥٠ کالری
١٠٠ گرام شیری دایک ٦٩ کالری
١٠٠ گرام شیری مانگا ٦٦ کالری
١٠٠ گرام شیری بزن ٧٣ کالری

## رۆژانەئەندازەی ڤیتامینی پێویست بۆ هەرکەسێك بە پێی تەمەن

| هەر کەسە و پێی تەمەن | تاووزە (کالری) | پرۆتین | کالسیۆم | ناسن | A | B | C | D | E |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پیاوێك (بە جووڵانـەوەی رۆژانـە نەکەم و نە زۆر) | ٢٠٠٠ | ٧٠ | ١ | ١٢ | ٥٠٠٠ | ١,٥ | ١,٨ | ٧٥ | - |
| ژنێـك (بەجووڵانـەوەی رۆژانـە نەکەم و نەزۆر) | ٢٤٠٠ | ٦٠ | ١ | ١٢ | ٥٠٠٠ | ١,٢ | ١,٥ | ٧٠ | - |
| ژنی دوو گیان (زك پڕ) | ٢٤٠٠ | ٨٥ | ١,٥ | ١٥ | ٦٠٠٠ | ١,٥ | ٢,٥ | ١٠٠ | ٤٠٠ |
| منداڵی ٣-١ ساڵان | ١٦٠٠ | ٥٠ | ١ | ٨ | ٢٥٠٠ | ٠,٨ | ١,٢ | ٥٠ | ٤٠٠ |
| منداڵی ٦-٤ ساڵان | ٢٠٠٠ | ٦٠ | ١ | ١٠ | ٢٥٠٠ | ١ | ١,٥ | ٦٠ | ٤٠٠ |
| منداڵی ٩-٧ ساڵان | ٢٥٠٠ | ٧٠ | ١,٢ | ١٢ | ٤٥٠٠ | ١,٢ | ١,٨ | ٧٥ | ٤٠٠ |
| کچی ١٥-١٢ ساڵان | ٢٦٠٠ | ٨٠ | ١,٢ | ١٥ | ٥٠٠٠ | ١,٢ | ٢ | ٨٠ | ٤٠٠ |
| کچی ٢٠-١٦ ساڵان | ٢٤٠٠ | ٧٥ | ١ | ١٥ | ٥٠٠٠ | ١,٢ | ١,٨ | ٨٠ | ٤٠٠ |
| کوڕی ١٥-١٣ ساڵان | ٣٢٠٠ | ٨٥ | ١,٤ | ١٥ | ٥٠٠٠ | ١,٥ | ٢ | ٩٠ | ٤٠٠ |
| کوڕی ٢٠-١٦ ساڵان | ٣٨٠٠ | ١٠٠ | ١,٤ | ١٥ | ٦٠٠٠ | ١,٧ | ٢,٥ | ١٠٠ | ٤٠٠ |
| ژنی شیردار (منداڵ لەبەر) | ٣٠٠٠ | ١٠٠ | ٢ | ١٥ | ٨٠٠٠ | ١,٥ | ٢ | ١٥٠ | ٤٠٠ |

# گیان لەبەران

## ئەم گیانلەبەرانە وا ناسراون

١- ئاسك: نیشانەی ئازادی و بێ گوناحی
٢- ئەسپ: نیشانەی ئازایی و هۆشیاری و نەجیبی
٣- باز: نیشانەی پەلامار و فەرمانڕەوایی
٤- بەبر: نیشانەی ئێش و ئازار و بێ دەسەڵات کوژی
٥- بەرخ: نیشانەی بێ ئازار و بێ گوناحی
٦- بلبل: نیشانەی شەیدایی و دەنگ خۆشی
٧- پەڕەسێلکە: نیشانەی بەهار و خۆشی
٨- پەپوولە: نیشانەی شەیدایی و دڵداری
٩- پڵنگ: نیشانەی مل هوڕی و ئازایی و خۆ بەزل زان
١٠- پشیلە: نیشانەی کاسەلێسی و بێ وەفایی
١١- پەپووسلێمانە: نیشانەی موژدە و هەواڵ
١٢- تووتی: نیشانەی لاسایی و بێبیری
١٣- تاووس: نیشانەی جوانی
١٤- چەقەڵ: نیشانەی زەغەڵی
١٥- حوشتر: نیشانەی قین و سەرسەختی و تامووڵ
١٦- داڵ: نیشانەی خۆپەسندی
١٧- ڕێوی: نیشانەی فێڵ و کاسە لێسی
١٨- کار: نیشانەی جەمووشی
١٩- کەر: نیشانەیگێلی و گەوجی
٢٠- کەورێشك: نیشانەی بێ ئاگایی و بێ خەبەری
٢١- کەڵەشێر: نیشانەی هۆشیار و حەز و ئارەزوو
٢٢- کەو: نیشانەی لەنجە و لار و بێ هۆشیاری
٢٣- کۆتر: نیشانەی ئاشتی و برایەتی
٢٤- کیسەڵ: نیشانەی لەسەرخۆیی
٢٥- گورگ: نیشانەی دڕندەیی و زۆرداری
٢٦- لەق لەق: نیشانەی شادی
٢٧- مێروو: نیشانەی سەرسەختی و قەناعەت
٢٨- مەیموون: نیشانەی لاسکایی و لەچاوکردنەوە
٢٩- مشك: نیشانەی ئازاری بێ نرخ گەیاندن لە دەوروبەر
٣٠- سەگ: نیشانەی وەفاداری

| | |
|---|---|
| ۲۱- سیمرخ | نیشانەی جنگ لە هەر کوتان و خەیاڵ پلاوی |
| ۲۲- شێر | نیشانەی ئازایی و رەوشت بەرزی |
| ۲۳- شابو (کوندەبو) | نیشانەی وێرانە و نەگبەتی |
| ۲٤- قەلەرەش | هاتوهوت و تیوتی و نەگبەتی |
| ۲٥- عەلەشیش | نیشانەی دوو رەنگی و بی باری |
| ۲٦- ورج | نیشانەی فرە خۆریو گێلی |
| ۲۷- هەڵۆ | نیشانەی فیز و لووت بەرزی |



ئاسك



حوشتر

## ناوی ئەو گیانلەبەرانە کە لە مێژوودا ناوبراون

| | |
|---|---|
| ١- ئەژدیها | بەبۆنەی حەزرەتی مووساوە |
| ٢- کەر | کەرەکەی مەلا نەصرەدین |
| ٣- کەر | کەری دەجال |
| ٤- کەر | کەرەکەی حەزرەتی عیسا |
| ٥- رۆکو | ئەو کەروێشکەی بۆ بۆشایی ئاسمان ناردرا |
| ٦- فیل | هێرشی ئەبرەهە بە فیلەوە بۆ سەر مەککە |
| ٧- قەلەرەش | قابیل |
| ٨- گا | ئاپیس |
| ٩- گورگ | باروموس و رومولوس (شاری رۆمایان ئاواکرد) |
| ١٠- ئەسپ | دوانزدە سوارەی مەریوان |
| ١١- گورگ | حەزرەتی یوسف |
| ١٢- لایکا | سەگێك کە سۆڤیەت ناردی بۆ بۆشایی ئاسمان |
| ١٣- مار | مارەکانی سەر شانی زوحاك |
| ١٤- مار | بەبۆنەی دایکە حەواوە |
| ١٥- مارانگوا | ناوی ئەسپەکانی ناپلیۆن |
| ١٦- ئەهەنگ | حەزردتی یونس |
| ١٧- حوشتر | حوشتری پێغەمبەر (ص) |
| ١٨- ئانوا | مەیموونێك کە بۆ بۆشایی ئاسمان ناردرا |
| ١٩- پەپووسلێمانە | حەزردتی سلێمان |
| ٢٠- دوبرا | لە ئەفسانەکانی یۆنان دا هەموو رۆژێك (دوبرا) جەرگی پرۆمیثوسي مرۆڤ دۆستی دەرهێناوە و خواردوویەتی و دیسان لە سبەینێ جەرگی هاتووەتە جێگەی خۆی. |

## ناوی چەند جۆرە ماسی

١- **هەرەماسی:** *Poisson Scie*

بەشێکە لە خێزانیی سفرە ماسی و زۆربەی ئێسکەکانی کرتێنەییە واتا "غضروفي"یە.

٢- **تیر ماسی** *Torpille*

تا ئەندازدیەك پان و پۆرە و لەشی جۆرێك کارەبای تێدایە ئەم جۆرە ماسییانە زۆرتر لە کەناری ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا دەژین.

٣- **پەپوولە ماسی** *Heros Facetus*

درێژیی تا شانزده سانتیمەتر دەبێت و رەنگەکەشی سەوز و قاوەیی و نەختێك زەردە لەگەڵ میلی رەش دا. ئەم ماسییانە زۆرتر لە رووبار و گۆمەکانی ئەمریکای باشووردا دەژین.



٤- پۆلا ماسی *Borbus Pulatinai*

زۆرتر لە دەریای خەزەردا زۆرە.

٥- تاسە ماسی *Esturgeon*

تا ئەندازەیەك زل و بە سەنگ، جار جار دەگاتە شەش مەتر درێژی و پێنجسەد کیلۆگرام قورسی. پێشی دەگوترێ ماسی (خاوپار).

٦- چلچلە ماسی *Polycanthe*

درێژییەکەی دەگاتە شەش سانتیمەتر، زۆرتر لە مەلی پەرەسێلکە دەچێت و لە گۆمەکانی وڵاتی چین و مالیزیدا زۆرە. ئەم جۆرە ماسییانە، نێرە تۆپێکی هەوایی لە دەمییەوە دروست دەکات و مێنگینە هێلکەی تێدا دەکات و دوای شەش سەعات دەبن بە ماسی. ئەم چەشنە ماسییانە زۆرتر گۆشت خۆرن.

٧- سفرە ماسی *Paie*

جۆرە ماسییەکی خێرا و چالاکە و زۆرتر لە بنی دەریادا دەنوێت.

٨- سەگ ماسی *Requins*

جۆرێك ماسیی زۆر زل و زەلام و گۆشت خۆرە.

٩- شا ماسی *Rouget*

ئەم جۆرە ماسییە دوو ریشی لە کاکیلەی خواردوە بەرداوەتەوە، زۆرتر رەنگەکانیان بەلای سوور دایە و لەگەڵ خاڵی خاڵی رەش.

١٠- شمشێر ماسی *Espadon*

درێژی ئەم جۆرە دەگاتە پێنج مەتر و لەبەشی سەرەوە سلکەکەی بە درێژدا وەکو شمشێرێکی تیژ دەرکەوتووە و بۆیە بەو ناوە ناسراوە.

١١- شێر ماسی *Caillev Tassart*

زۆرتر لە کەنداوی عەرەب دا هەیە.

١٢- گاماسی *Gobie*

زۆرتر لە رووبارەکان دا دەژین.

۱۳- ماسی ئازاد *Saumon*

زۆرتر لە دەریای سارد و دەریای ناوەڕاست دا دەژین و درێژیی ئەم جۆرە ماسییانە دەگاتە دوومەتر.

۱٤- ماسی کارەبایی *Gymnote*

زۆرتر لە ماسی دەچێت، درێژییەکەی دەگاتە دوو مەتر و چوار لە پێنجی مەتردا ئەم جۆرە ماسییە ۸۰۰ ڤۆلت کارەبای تێدایە "واتە بە ئەندازە هەشت گڵۆپی سەد نمرەیی".

۱٥- ماسیی باڵدار *Exocetipoison Volant*

ئەم جۆرە ماسییانە لە دەریا گەرمەکان دا دەژین و تا بەرزیی پێنج مەتر لەرووی دەریا بەرزدەبێتەوە و زۆرتر لە سەد مەتر هەڵ دەفڕێت بە ئاسمانەوە، بەم شێوە خۆی لە دوژمنەکانی دەپارێزێت.

۱٦- ماسیی شەڕ *Betta Pugnax*

درێژایی دەگاتە هەشت سانتیمەتر و ڕەنگاوڕەنگە و لە وڵاتانی وەك سۆمەترە، جاوە، بونوای و هیندستان دا دەژیت. ئەم جۆرە ماسییە — چۆن لە وڵاتی کوردەواریی خۆمان دا شەڕە کەڵەشێر و شەڕە بەران و شەڕە گا دەکرا و مەرج و گرەویان لەسەر دەکرد — لەو وڵاتانەدا بۆ شەڕ ماسی بەخێو دەکرێن.

۱۷- ماسیی گۆم *Garassin*

ڕەنگەکانیان سوور و زێڕین و سپییە، درێژییان تا بیست سانتیمەتر دەبێت.

۱۸- ماسیی جۆگەلە *Able*

زۆرتر لە جۆگەلەدا دەژین و پوولەکەکانیان مادەیەك دروست دەکات پێی دەڵێن "ئاسانس" کە مرواریی لیدروست دەکرێت — واتە مرواریی دەستکرد.

۱۹- ماسییە سپی *Ahlettede Mer*

درێژیی ئەم ماسییە تا پەنجا سانتیمەتر دەبێت و گۆشتی زۆر خۆشە.

۲۰- ماسیی (قزل ئالا) *Truite*

زۆرتر لە ناوی شیرین دا دەژیت، درێژی تا چل سانتیمەتر دەبێت، زەیتوون ڕەنگە و دەمی چەند ددانێکی تێدایە.

۲۱- ماسیی کەبور *Carpe*

درێژیی سێ سانتیمەترە لە ئاوی وەستاودا دەژیت و ڕەنگی قاوەییە.

۲۲- ماسیی کەفال *Muge*

لە زۆربەری دەریاکان دا دەبینرێت، درێژی تا پەنجا سانتیمەترە.

۲۳- ماسیی کۆسە *Carcharias*

جانەوەرێکی دڕندە و خوێن خۆرە، درێژیی دەگاتە سیانزدە مەتر. لەدەمەیدا چەند ڕیزە ددانی تیژی هەڕە شێوەی هەیە و دوژمنی زۆربەی گیانلەبەرانی ناو دەریایە.

# پزیشکە ناسراوەکانی ئیسلام



**١- ئیبن ئەبی صادق (ئەبولقاسم)**

بە بووقراتی دووەم ناودار بوودوە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە. دوو کتێبی بە عەرەبی نووسیوە بەناوی:

١. شرح فصول بو قراط.

٢. شرح مسائل الجنین.



**٢- ئیبن سینا (٣٧٠ - ٤٢٨ ك)**

لە بەشەکانی فەلسەفە و هونەردا باس کراوە.

**٣- ئەبو زەکەریا ئیبن ئەلماسەوەیی**

لە ساڵی ٢٤٣ك دا مردووە و لە دەورانی مەئموون و موعتەسەمی خەلیفەی عەباسیدا لە بەغدا ژیاوە. لە پزیشکی دا ناوباوی زۆر بووە و قوتابیی (جبرائیل بەختیشوع) بووە، ئەمانەش ناوی چەند کتێبێکی ئەم پزیشکەیە:

١ دغل العین

٢ النوادر الطبیة.

**٤- ئەبولسەهل ئەلمەسیحی**

لە ساڵی ٤٠٣ی ك دا مردووە و پزیشکی دەربارەی عەباسییەکان بووە و کتێبێکی نووسیوە بەناوی: (المائة في الصناعة الطبیة).

**٥- ئەبو سەعید عەبدوڵڵا**

لە ساڵی ٤٥٠ ی ك دا مردووە، لە بەغدا ژیاوە. جگە لە پزیشکی دەرمانیشی دروست کردووە، ئەمەش ناوی چەند کتێبێکی ئەم پزیشکەیە:

١ الروضة الطبیعیة.

-٢ لغة الحیوان و منافعه.

-٣ طبایع الحیوان و خواصه و منافع اعضائه.

**٦- حونێن ئیبن ئیسحاق (١٤٩ - ٢٦٣ ك)**

ئەم پزیشکە ناسراوە جگە لە رشتەی پزیشکی زۆر کتێبی لە یۆنانی و سریانییەوە کردووە بە عەرەبی.

**٧- ئیبن ئەبی ئوصیبعە (٦٠٠ - ٦٦٨ ك)**

پزیشکی چاو بوو، هونەری پزیشکی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە، کتێبێکی نووسیوە بەناوی: (عیون الأنباء في طبقات الاطباء).

٨- ئەبو عەلائەدین ئیبن زەهر

لە ساڵی ٥٢٥ ك دا مردووە، ئەم پزیشکە هەتاوەکو لە وڵاتە ڕۆژاواییەکانیش دا زۆر ناسراوە و کتێبێکی نووسیوە بەناوی (کتاب التیسیر في المداواة). لە وڵاتی ئەندەلوس دا ژیاوە.

٩- عەلی ئیبن عیسا (سەدەی سێیەم)

پزیشکی تایبەتی موعتەمەدی خەلیفەی عەباسی بووە. کتێبێکی نووسیوە بە ناوی "منافع الحیوان".

١٠- ئەبو بەکر محەممەد بن زەکریا یەحیا ئەلرازی (٢٥١ – ٣١٣ ك)

بە جالینۆسی عەرەب ناوداربووە و لە زۆر ڕشتەی دیکەدا دەستی هەبووە وەکو فەلسەفە و ڕیاضیات، ئەستێرەناسی، ئەدەبیات.

ئەمەش ناوی چەند کتێبێکی ئەوە:

١. الحاوي.
٢. الطب المنصوري.
٣. من لایحضره الطبیب.
٤. الفاخر في الطب.
٥. دفع مضار الأغدیة.
٦. المدخل الصغیر.

## پزیشکە ناسراوەکانی جیهان

١- ئابرث (کارل) *Eberth* (١٨٣٥ – ١٩٢٦ ز)
خەڵکی ئەڵمانیایەو بووە بە مامۆستای زانکۆی زوریخ. زۆرتر دەربارەی ئێسکی نەرمە تەقەڵای داوە.

٢- ئەلن "فرانسو"
لە ساڵی ١٨٩٢ ز دا لە شاری پاریس لە دایك بووە، مامۆستای زانکۆی پاریس بووە و بۆ یەکەمین جار کونی دڵی (عەملیات) کردووە.

٣- ئارلیخ "پاول" *Ehrlich* (١٨٥٤ – ١٩١٥ ز)
خەڵکی ئەڵمانیایە و خەڵاتی پزیشکیی نۆبلی وەرگرتووە، زۆرتر دەربارەی نەخۆشی "سفلس" کاری کردووە.

٤- ئەندرس "جان فرانكلین" *Enders . J . F*
لە ساڵی ١٨٩٧ ز لە خێزانێکی ناسراو و دەوڵەمەند هاتوتە دنیاوە، ساڵی ١٩٥٤ دەربارەی نەخۆشیی سوورێژە خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە.



٥- بووقرات *Hipocrate* ٤٦٠ – ٣٧٧ پ. ز
گەورەترین و بەناوبانگترین پزیشکی مێژووی کۆنی مرۆڤە، بە باوکی پزیشکی بەناوبانگە. لە شاری کۆس هاتوتە دنیاوە لە سەردەمی پریکلس دا قوتابخانەی پزیشکی داناوە، تاکو ئێستاش زۆر بیروڕای ئەم پزیشکە شایانی ڕێزە و پەیڕەوی لێ دەکرێت ئەگەرچی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆ ژیاوە.. سوێندنامەکەشی کە پزیشکەکان زانکۆی تەواو دەکەن سوێندی پێ دەخۆن نیشانەی بیروڕای بەرزی ئەم بلیمەتەیە.

٦- جالینوس *Galien . C*
لە ساڵی ١٣١ ز دا لەدایك بووە و بڕوای بە مەسیحیەت نەهێناوە و لە ساڵی ٢٠١ز دا لە شاری ڕۆما مردووە.

٧- شاناق *Chanaky*
"سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی"
خەڵکی وڵاتی هیندستان بووە و وەزیری (چندراکیتیا) و زانایەکی ناسراو بووە بەتایبەتی دەربارەی ژەهرە جۆراوجۆرکان.

٨- کۆخ "ڕۆبەرت" *Koch. R.* (١٨٤٣ – ١٩١٠ ز)

له شاری هارتز له دایك بووه و لەشاری گوتنكن دا زانكۆی تواو كردووه، له سەرەتاوه دەربارەی نەخۆشییەكانی ئاژەڵ له تەقەلادابووه، سەرەنجام میكرۆبی سیلی دۆزیوەتەوه و توانی میكرۆبی كۆلیرا جیابكاتەوه. لەدواییشدا هەر بەو میكرۆبه مرد كه خۆی دۆزییەوه، واتا به نەخۆشیی سیل.

## دۆزراوەكانی پزیشكی

| دۆزراوه | ناوی زانا | ساڵ | وڵات |
|---|---|---|---|
| ناوڵه | جنر | ١٧٩٨ | بریتانیا |
| ئەسپرین | جیرارد | ١٨٥٣ | ئەڵمانیا |
| ئەسپرین (خاسیەتەكەی) | رادزسر | ١٨٩٩ | ئەڵمانیا |
| ئاتر (بۆبی هۆشی) | لانگ | ١٨٤٢ | ئەمریكا |
| سترو پتیومایسین | واكس مەن | ١٩٤٥ | كەنەدا |
| تیشكه ئێكس | رۆنتكن | ١٨٩٥ | ئەڵمانیا |
| ئەنسولین | پنتینگ و بست | ١٩٢١ | بریتانیا |
| سولفامید | دماك | ١٩٣٤ | ئەڵمانیا |
| رشەزام (ئاگره) | پاستور | ١٨٨٠ | فرانسه |
| ئیفلیجی | سالك | ١٩٥٣ | ئەمریكا |
| میكرۆب | پاستور | ١٨٦٠ | فرانسه |
| میكرۆبی گولی (جذام) | هانس رۆبرت | ١٨٧٤ | نەرویج |
| میكرۆبی سووریێژه | ئەبرت | ١٨٨٠ | ئەڵمانیا |
| میكرۆبی دیفیتری | لوفلر فردریك | ١٨٨٠ | ئەڵمانیا |
| مكرۆبی سیل | روبەرت كوخ | ١٨٨٢ | ئەڵمانیا |
| میكرۆبی رشەزام | داون | ١٨٤٠ | فرانسه |
| میكرۆبی تاعوون | برسن ئەلەكساندەر | ١٨٤٤ | فرانسه |
| میكرۆبی وەبا | روبەرت كۆخ | ١٨٨٣ | ئەڵمانیا |
| میكرۆبی هاری | پاستور | ١٨٧٥ | فرانسه |
| میكرۆبی گەزاز | نیكولاید | ١٨٨٤ | ئەڵمانیا |

## ناوی ئەوانەی پاداشتی نۆبلیان وەرگرتووە
## لە پزیشکی دا

| ژ | ناو | ساڵ | وڵات | بۆنە و هۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەمیل ئەدۆلف فۆن | ١٩٠١ | ئەڵمانیا | سیرەی نەخۆشیی دیفیتر |
| ٢ | سێر رۆنالد، روس | ١٩٠٢ | بریتانیا | مالاریا و چۆنیەتی لەناوبردنی |
| ٣ | نیلسون ریبرك ڤینسان | ١٩٠٣ | دانیمارك | دەربارەی نەخۆشیی (فیونس) و فلکاریس |
| ٤ | ئیڤان پترۆڤیچ پاڤلۆڤ | ١٩٠٤ | سۆڤیەت | دەربارەی دەزگای گەدە و ریخۆڵە |
| ٥ | رۆبەرت كۆخ | ١٩٠٥ | ئەڵمانیا | دەربارەی سیل |
| ٦ | گولگی | ١٩٠٦ | ئیتالیا | دەربارەی دەمار (أعصاب) |
| | نیگاگال | ١٩٠٦ | ئیسپانیا | دەربارەی دەمار (أعصاب) |
| ٧ | لاوران | ١٩٠٧ | فرانسە | دەربـارەی پروتـۆزار کـە چـۆن نەخۆشیی دەخولقێنێت. |
| ٨ | بل ئەرلیخ | ١٩٠٨ | ئەڵمانیا | دەربارەی بەرگریی (مناعە)ی لەش |
| | ئیلیا مەچینکوف | ١٩٠٨ | سۆڤیەت | |
| ٩ | ئەمیل کوخر | ١٩٠٩ | سویسرا | دەربارەی تیرۆئید |
| ١٠ | ئەلبەرت کۆسل | ١٩١٠ | ئەڵمانیا | دەربارەی پرۆتین |
| ١١ | ئەلوار گولستراند | ١٩١١ | سوێد | دەربارەی چاو |
| ١٢ | ئەلیکسی کارل | ١٩١٢ | ئەمریکا | دەربارەی کارکردن و جێبەجێ کردنی رەگی لەش |
| ١٣ | شارل رۆبەریشە | ١٩١٣ | فرانسە | دەربارەی ئانافیلاکسی. |
| ١٤ | رۆبەرت بارانی | ١٩١٤ | مەجەر | دەربارەی پەلوپۆی لەش. |
| ١٥ | بۆ ساڵی داهاتوو دانرا | | | |
| ١٦ | خرایە سندووقەوە | | | |
| ١٧ | دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | | | بەهۆی شەڕی یەکەمی جیهانەوە |
| ١٨ | دابەش نەکرا | | | |
| ١٩ | دابەش نەکرا | | | |
| ٢٠ | پاداشـتی سـاڵی پێـشوو لـە ساڵەدا درا: | | | |
| | جۆل بوردە | ١٩١٩ | بەلجیکا | دەربارەی بەرگریی لەش |
| | استین کروك | ١٩٢٠ | دانیمارك | دەربارەی رەگە وردەکانی لەش |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | | | |
| ٢١ | لەم ساڵەدا هی (٢١) خرایە سنووقەوە. | | | |
| ٢٢ | هی ساڵی ١٩٢٢ دانرا بۆ ساڵی هاتوو | | | |
| ٢٣ | پاداشتی ساڵی پێشوو لەم ساڵەدا درا بە: | | | |
| | أ – هیل | ١٩٢٣ | بریتانیا | دەربارەی گرو وزەی ماسولکەکان. |
| | ب – مایر هۆف | – | ئەڵمانیا | دەربارەی پێویستیی بە ئۆکسجین و چۆنیەتیی لەگەڵ خواردن دا. |
| ٢٤ | پاداشتی ساڵی ١٩٢٣ ز درا بە: | | | |
| | أ – فردریك پاتینك | | کەنەدا | دەربارەی ئەنسۆلین. |
| | ب – جان ماکلئود | | کەنەدا | |
| | ویلهلم ئاینتهون | ١٩٢٤ | هۆڵەندە | دەربارەی لیدانی دڵ بەهۆی کارەبا. |
| ٢٥ | دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | | | |
| ٢٦ | خرایە سندووقەوە. هی ساڵی پێشوو و هی ساڵی (٢٦) دانرا بۆ ساڵی داهاتوو. | | | |
| ٢٧ | پاداشتی ساڵی ٢٦ کە نەدرا بوو لەم ساڵەدا درا: | | | |
| | أ – یۆهانس فیبی گر | ١٩٢٦ | دانیمارك | دەربارەی سپیروپتیرا. |
| | ب – جۆلیۆس واگنەر ژورك | ١٩٢٧ | نەمسا | دەربادری ئیفلیجی و شێتی. |
| ٢٨ | شارل نیکۆل | ١٩٢٨ | فرانسە | دەربارەی تیفۆس. |
| ٢٩ | أ- کریستیان ئیکمان | ١٩٢٩ | هۆڵەندە | دەربارەی ڤیتامین، دەربادی دەمار. |
| | ب – فردریك هۆپکنس | | بریتانیا | دەربارەی ڤیتامینی چالاکی بەخش. |
| ٣٠ | لاند ستاینر | ١٩٣٠ | نەمسا | جۆراو جۆر بوونی خوێنی مرۆڤ. |
| ٣١ | واربورك | ١٩٣١ | ئەڵمانیا | دەربارەی ئانزیمی هەناسە. |
| ٣٢ | أ- شرینگتون | ١٩٣٢ | بریتانیا | دەربارەی دەمار. |
| | ب – ئادریان | ١٩٣٢ | | |
| ٣٣ | تۆماس مۆرگان | ١٩٣٣ | ئەمریکا | دەربارەی کرۆمۆزۆم لە ڕەگەزدا. |
| ٣٤ | أ- جۆرج ویپل | ١٩٣٤ | ئەڵمانیا | دەربارەی جەرگ و کەم خوێنی. |
| | ب – جۆرج زماینور | | | |
| | ج – ولیام مورمن | | | |
| ٣٥ | هانز اسپمان | ١٩٣٥ | | دەربارەی ئەتەوە |
| ٣٦ | أ- هێنری دیل | ١٩٣٦ | بریتانیا | دەربارەی دەمار |
| | ب- ئوتو لوئی | | نەمسا | دەربارەی ڤیتامین C . |
| ٣٧ | ناگیر | ١٩٣٧ | مەجەر | دەربارەی ئەسیدوفورمالیك. |
| ٣٨ | دانرا بۆ ساڵی داهاتوو | | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣٩ | هی ساڵی پێشوو درا بە: | ١٩٣٨ | بەلجیکا | دەربارەی ئاتورتیك و سینوس. |
| | جان هیمان | | | |
| | هی ساڵی ١٩٣٩ درا بە: | ١٩٣٩ | ئەڵمانیا | دەربارەی دژی باکتریا. |
| | گرهارد دوماك | | | شەڕی دووەمی جیهان. |
| ٤٠ | دابەش نەکرا. | | | |
| ٤١ | دابەش نەکرا. | | | |
| ٤٢ | دابەش نەکرا. | | | |
| ٤٣ | دانرا بۆ ساڵی داهاتوو. | | | |
| ٤٤ | پاداشتی ساڵی پێشوو لەم ساڵەدا دراوە بە: | | | |
| | أ – هێنری کارل پیتردام | ١٩٤٣ | دانیمارك | دەربارەی ڤیتامین K. |
| | ب- ئەدوارد دویزی | ١٩٤٣ | ئەمریکا | دەربارەی ڤیتامین D . |
| ٤٥ | پاداشتی ساڵی ١٩٤٤ دراوە بە سێ کەس: | | | |
| | ا- جۆزێف ئەرلانکر | | | |
| | ب- ئەرنیست چین | ١٩٤٤ | بریتانیا | دۆزینەوەی پەنسلین. |
| | ج- فلوری | | | |
| ٤٦ | هێرمان مولەر | ١٩٤٦ | ئەمریکا | دەربارەی تیشکی جۆراوجۆر. |
| ٤٧ | أ- کارل کوری | | ئەمریکا | دەربارەی کلیوکوجین. |
| | ب- جرتی کوری | ١٩٤٧ | ئەمریکا | |
| | ج- برنارد هوسی | | ئەرجەنتین | دەربارەی شەکر و هۆرمۆن |
| ٤٨ | پل مۆلەر | ١٩٤٨ | سویسرا | دەربارەی د. د. تی |
| ٤٩ | أ- والتەر هیس | ١٩٤٩ | سویسرا | دەربارەی مێشك و لەش. |
| | ب – ئەنتۆنیۆ فریداگاس | | پرتەغال | دەربارەی دەرمان و مێشك. |
| ٥٠ | أ- ئەدوارد کندال | ١٩٥٠ | ئەمریکا | |
| | ب- تادیوس رایخستان | | سویسرا | دەربارەی هۆرمۆن |
| | ج- فیلیب شوالتزهنج | | ئەمریکا | |
| ٥١ | ماکس تیلەر | ١٩٥١ | ئەمریکا | دەربارەی تای زەرد. |
| ٥٢ | وایزمن | ١٩٥٢ | ئەمریکا | دەربارەی ئەنتی بیۆتیك. |
| ٥٣ | أ- هانس کری | ١٩٥٣ | بریتانیا | دەربارەی ئەسید ستریك. |
| | ب- ئەلبەرت لیپمان | | ئەمریکا | دەربارەی ئانزیم. |
| ٥٤ | ا- جان فرانکلین ئەندرسن | ١٩٥٤ | ئەمریکا | |
| | ت- تۆماس فولەر | | ئەمریکا | دەربارەی ئیفلیج بوونی منداڵ. |
| | ج- رابینس | | ئەمریکا | |
| ٥٥ | تئورل | ١٩٥٥ | سوێد | دەربارەی ئەکسید ئەسیۆن |
| ٥٦ | ا- ئەندرێ کورنالد | ١٩٥٦ | ئەڵمانیا | |
| | ب- ورنەر فورسمان | | ئەڵمانیا | دەربارەی دڵ و دەزگای خوێن. |
| | ج- ریشارد جونیور | | ئەمریکا | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| دانیل بوت | ١٩٥٧ | ئیتالیا | دەربارەی ماسولکە و ئێسك بەندی |
| ا- جۆرج بیدل | ١٩٥٨ | ئەمریکا | دەربارەی ژین بەهۆی دەرمانەوە. |
| ب- ئەدوارد تاتوم | | ئەمریکا | |
| ج- لیدر بێرك | | ئەمریکا | |
| ا- سوروا ئەکوا | ١٩٥٩ | ئەمریکا | دەربارەی تێکەڵ بوونی ژینی لەش |
| ب- ئەرتور گۆرتبرك | | ئەمریکا | دەربارەی ئەسید ریبونو. کلینیك و ئەسید دیوکسید. |
| ا- فرانك بورنت | ١٩٦٠ | ئوسترالیا | دەربارەی بەرگریی. دەستکەوتووی لەش. |
| ب- پیتەر مداوار | | بریتانیا | |
| جۆرج فون بکزی | ١٩٦١ | ئەمریکا | دەربارەی گوێ. |
| ا- جێمس واتسۆن | ١٩٦٢ | بریتانیا | دەربارەی ئەسید نوکلینك. |
| ب- فرانسیس کریك | | بریتانیا | |
| ا- ئەلن هوچکین | ١٩٦٣ | بریتانیا | دەربارەی دەمار |
| ب- ئەندرێ هاکسل | | بریتانیا | |
| ج- سێرجان کاروا کلس | | ئوسترالیا | |

## درێژەی خەڵاتەکانی ساڵانی دواتر
## لە بەرگەکانی تردا هاتووە





باوە ئادەم و دایە حەوا

## ١ـ ئاین لە یۆنانی کۆن دا

یۆنانییەکان هێزی گەورە و ناسراو یان نەناسرا و هەر کاروبارێکی ڕۆژانەیان بەو خوایانە بەستوەتەوە کە لە وڵاتی یۆنان دا بیروڕا لەسەر بوونیان هەبووە و تەواوی ئەندێشەیان لە سنووری یەکێك لە خواکان دا نەچوەتە دەردوە، لەم ڕووەشەوە خواکانیان کردوەتە حەوت کۆمەڵەوە یان حەوت بەشەوە،

١ خواکانی ئاسمانی
٢ خواکانی سەر زەوی
٣ خواکانی پیت و کشتوکاڵ
٤ خواکانی چوارپێ و دڕندەکان
٥ خواکانی ژێر زەوی
٦ خواکانی پێشوو
٧ خواکانی ئۆلیپۆس

خوای خواکانی یۆنان هەروەکو خوای هیندییەکانی کۆن هەر ئەو خوا گەورە و مەزنەیە کە لە ئاسمان دایە و کەم کەم گۆڕاوە و لە مرۆڤەوە زۆر نزیك بوەتەوە و سەر ئەنجام بووە بە "ئورانۆس" فەرمانڕەوای هەور و باران و بریسکە و ئاسمان.

ترسێنەرترین خواکانی لە ژێر زەویدا دەژیان و بەشێکیان لە ئەشکەوت و شەق و درزی کێوەکان دا جێ یۆنانییەکان بەرۆژ زۆر کەم تەرخەم بوون بەرامبەر خواکانی ژێر زەوی و بە پێچەوانەشەوە شەوان پەنایان دەبردەوە بەریان و دەیان پەرستن.

یۆنانییەکان دەربارەی ژیانەوەی مرۆڤ و ڕوح هێندە خۆیان پێوە ماندوو نەکردووە، بۆیە لەم ڕووەوە شتێکی وا ڕاستەوخۆ بە دەستەوە نییە کە بیروباوەڕیانی دەرخستبێت.

زۆربەی خواکانی یۆنان لە مرۆڤەوە زۆر نزیك بوون و لە شێوەی مرۆڤ دا بوون بەڵام باش نەیان توانیوە ڕوحی ئاینی و فەلسەفیی پەیڕەوانیان ئارام و خۆش بەخت و ڕازی بکەن.

## ٢ـ ئاین لە ڕۆمی کۆن دا :

سەر زەویی ئیتالیاش هەروەکو وڵاتی یۆنان لە کۆن دا قۆناغی شارستانەتییان بڕیوە و بە پێی بیروڕایەك ژیاون ئەگەر بێتو لەگەڵ دنیای ئەو ساکەدا بەراوردی بکەیت سەروگەردنێك لە کۆمەڵی مرۆڤی ئەو سەردەمە بەرزتر بوون.

لەسەرەتاوە گەلی ڕۆمان هەموو شتێکیان لە ڕوانگەی خوادا دەبینی و باوەڕیان بە هێز و توانایەکی نەبینراو هەبووە بەڵام کەم کەم بیروڕای ڕۆمانەکان لەگەڵ بیروڕای یۆنانییەکان لەلایێکەوە و بیروڕای میللەتانی ڕۆژهەڵاتیش لەلایێکی تردوە تێکەڵ بووە , بەڵام بەپێی تێپەڕبوونی زەمان فەرمانڕەوایانی ڕۆمان شێوە و کاراکتەرێکی خواییان لە خۆ ناوە و بەڵکو زۆربەیان بەخوا زانیوە و لەگەڵ پەیدا بوونی ئاینی مەسیحیدا ئەو بیروڕا ئاینییەش سەری تێدا چوو.

## ٣ـ ئاینی هیندوئیسم :

بە شێوەیێکی تێکڕایی ئاینی هیندوئیسم کە ئاینێکی کۆنی هیندستان بووە دەتوانین بەم شێوەیە باسی ئەو قۆناغە بکەین کە لە وڵاتی هیندستان دا بڕیویەتی:

أ- سەردەمی سەرەتایی:
یان سەردەمی پێش مێژوو، لەم ڕووەوە هیچیان بە دەستەوە نییە.

ب – سەردەمی شارستانەتیی دۆڵی سەند:
دەربارەی ئەم سەردەمەش دیسان شتێکی وامان بە دەستەوە نییە بەڵام بەپێی هەڵ کەندن و پشکنینێکی زۆر لەم دۆڵەدا دەرکەوتووە کە بت و پەیکەری زۆر دۆزراوەتەوە و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بت پەرست بووبن.

ج – سەردەمی ڤیدالی:
ئەم سەردەمە لە سەرکەوتنی گەلی شیمالییەکانەوە دەست پێ دەکات کە لە سەرووی هیندستان دا زیاون تا ۸۰۰ ساڵ پێش زایین.

د- سەردەمی براهمی:
لەم سەردەمەدا دام و دەزگای ئاینی پێك هاتووە و لەوە دەچێت دوای "برهمن"ەکان ئوپانیشادەکان پەیدا هاتوون.

ە – سەردەمی زیندووکردنەوەی هیندوئیسم و باوەڕ بەبوونی نیشانەکانی خواوەند.

## کتێبە ئاینییەکانی هیندوئیسم:

بە کتابی ئاینی هیندوئیسم دەڵێن ڤیدا *Veda* , تێکڕای ڤیداش بریتییە لە چوار کتێب:

١- ریگ ڤیدا *Rig-Veda* : کە زۆربەی سروودەکانە.
٢- یاجوور ڤیدا *Yajur-Veda* دەربارەی چۆنیەتی قوربانی کردنە.
٣- ساما ڤیدا *Sama-Veda* دەربارەی مۆسیقایە.
٤- ئەتهرڤا ڤیدا *Atharva-Veda* کە زۆربەی دەربارەی جادوو و ئەفسانەکانە.

هەریەکێکیش لەم بەشانە بریتییە لە چوار بەش:

١- سەنهیتا *Sanhita* : سروود – دوعا – نوێژ ویرد بۆ قوربانی.
٢- برهمن: دەربارەی کرداری ڤیداکانە.
٣- ئارینك: دەربارەی ڕەفتاری پیرەکانە.
٤- ئوپانیشاد: دەربارەی فەلسەفەی پیرەکانە. ژمارەی پەیڕەوانی ئەم ئاینە لە ٣١٠ ملیۆن کەس زیاترە.

## خوا ناسراوەکانی هیندو:

١- ئاگنی: خوای ئاگر.
٢- ئاندەر: خوای باران.
٣- ئاشنی کۆمار: خوای پزیشکی.
٤- برەهما: فریشتەی خواوەندگار.
٥- برن: سەرپەرشتی ئاو.

برجانت: خوای پێك هێنان.
٦- دیۆس: خوای ئاسمان.
٧- سورج: خوای هەتاو.
٨- شیوا: خوای لەناو بردن.
٩- گیان ئاندری: خوای بیر و ئەندێشە.
١٠- مروت: فریشتەی با.
١١- میتر: سەرپەرشتی هەتاو.
١٢- مریتو: سەرپەرشتی مەرگ.
١٣- ماترسوا: سەرپەرشتی با.
١٤- ویشنو: خوای لەناو بردن.
١٥-

## ٤- ئاینی بوودایی:

ئاینی بوودا لەپێش هەموو شتێك دا تێ دەکۆشێت بۆ ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ دەروونی خۆی دا بگاتە ئامانجێکی رەوا و پەسەند کە دوور بێت لە خۆپەرستی و خۆپەسندی.

ئەم ئاینە لە ساڵی ٦٠٠ پ. ز دا رووی داوە و بوودا دانەری ئەم ئاینە شازادەیێکی وڵاتی هیندستان بووە بەناوی "هرتها گوتامابوودا" کتێبی ئاینی ناوی (تری پیتاکا)یە بە مانای سێ سەبەتە زانیاری و سێ بەشە:

١- بەشی عیرفان و حیکمەت.
٢- بەشی رەوشتی پێشەوای ئاینن.
٣- بەشی روون کردنەوەی ئاین.

ئاینی بوودا سێ جۆر پەیڕوانی جۆراوجۆری تێدایە کە لە جێگای جیاوازدا دەژین:

١- هانایانا *Hinayana*
ئەم بەشە زۆرتر لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دا دەژین.
٢- ماهایانا *Mahayana*
لە سەردوەی وڵاتی چین دا دەژین.
٣- لامائیسم *Lamaisme*
ئاین دارانی بوودا ٣٨٠ ملیۆن کەسە.

## ٥- ئاینی کونفۆشیۆس:

ئەم ئاینە ٦٠٠ ساڵ پ. ز پەیدا بووە بە رابەریی (چیوگونگ), کتێبی ئاینەکە ناوی "ئەنالکتنر"ە زۆرتر دەربارەی رەوشتی مرۆڤە. کاکڵی فەرمانەکانی ئەم فەیلەسووفە ئەمەیە کە "هەرچی بۆ خۆتی بە چاك نازانیت بۆ خەڵك بە ڕەوای دامەنێ". پەیڕەوانی ئەم ئاینە ٢٠٠ تا ٤٠٠ ملیۆن کەسە.

## ٦- ئاینی تائونیسم:

لەلایەن فەیلەسووفێکی وڵاتی چینەوە داهاتووە بە ناوی "الاوتسو" پێش ٥٢٤ ساڵ پێش زایین پەیڕەوانی ئەم ئاینە ٥٠ ملیۆن کەسە.

## ٧- ئاینی زەردەشت:

ئەم ئاینەش ٦٠٠ ساڵ پێش زایین لە ئێران دا پەیدا بووە لەلایەن کەسێکەوە بەناوی (زەردەشت) و کتێبی ئەم ئاینە ناوی ئاڤێستایە. پەیڕەوانی ئەم ئاینە ئێستا ١٢٥٠٠٠ کەسێکە.

### ٨- ئاینی جوو:

لەسەدەی سیانزدەی پێش زایین دا حەزرەتی (موسا) بووە بە پێغەمبەری خوا و ئاینی (یەهوودی) بۆ کردەوە کتێبی ئاینی یەوودی ناوی (تەورات)ە. تێکڕای پەیڕەوانی ئەم ئاینە (١٥) ملیۆن کەس دەبێت.

### ٩- ئاینی مەسیحی:

ئەم ئاینە سەرەتا لە وڵاتی فەلەستین دا پەیدا بوو، کە حەزرەتی عیسا بووە بە پێغەمبەری خوا، ئاینی مەسیحی لەدوای ئەودا بە دنیا بڵاو بوەتەوە. پەیڕەوانی ئەم ئاینە نزیکەی ٧٠٠ ملیۆن کەس دەبێت.

### ١٠- ئاینی ئیسلام:

پەیامبەری ئەم ئاینە حەزرەتی (محمد)ە (ص) کە لە ساڵی ٦١٢ی زایین لە شاری مەکە بڵاوی کردەوە، کتێبی ئەم ئاینە قورئانی پیرۆزە کە بە زمانی عەرەبییە و پەیڕەوانی ئەم ئاینە لە ٤٢٠ ملیۆن کەس زیاترە.

## پێغەمبەران و ناودارانی ئایین لە مێژووی مرۆڤ دا

### ١- حەزرەتی ئیبراهیم:

بە (خلیل الله) واتا دۆستی خوا بەناوبانگە و پێغەمبەری خودا بووە، لە ساڵی ١٩٩٤ی پێش زایین دا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بابلییەکان دا بە ناوی (نی تیاس) کوڕی شاژنە ئەفسانەییەك بەناوی (سمیر امیس) هاتوەتە دنیاوە، لەبەر ئەوەی باوەڕی بە یەکایەتیی خوا هەبووە و دژی بت و ئاینی بابلییەکان بووە. لە شار دەریان کردووە لە وڵاتی کەنعان دا گیرساوەتەوە.

### ٢- حەزرەتی ئیسماعیل:

کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم و برای ئیسحاق بووە لە باوکەوە حەزرەتی ئیسماعیل لەگەڵ باوکی دا خانووی کەعبەیان دروست کردووە و ڕەگەزی تیرەی قورەیش دەگەڕێتەوە سەر حەزرەتی ئیسماعیل. لە ساڵی ١٨٩٩ پ. ز لە تەمەنی سەد و سی حەوت ساڵی دا مردووە.

### ٣- ئەندریاس:

برای بەتروس بووە، پێش ئەوەی باوەڕ بە حەزرەتی عیسا بهێنێ ماسی گر بووە، لە ئاکام دا بووە بە یەکێك لە نزیکانی عیسا پێغەمبەر، بۆ برەو پێدانی ئاینی مەسیحی بەرەو کەنارەکانی دەریای ڕەش و رووسیا بەڕێ کەوتووە و لە ئاسیای بچووك و یۆنانیش دا لە بڵاوکردنەوەی ئاینەکە بەردەوام بووە. لە ئەنجام دا لە یۆنان گیراوە و چوار پەلیان داکوتاوە و بە داردا هەڵیان واسیوە.

**٤- برتلما "تولماوس":**

بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی چووەتە حیجاز و هیندستان و ئێران و ئەرمینیا. لە وڵاتی ئەرمینیادا گیراوە و بە زیندوویی پێستیان کەنووە.

**٥- بوودا "گوتاما":**

لە ساڵی ٥٦٣ی پ. ز دا لە دایك بووە, کچێکی ئامۆزای خۆی هێناوە بەناوی یاسودهارا لەتەمەنی نۆزدە ساڵی دا و کوڕێکی بووە ناوی ناوە "راهولا" بوودا بۆ ماوەی شەش ساڵ هەر لە بیرکردنەوە و رامان بوو دوو لە خەڵك تا بۆی دەرکەوت کەوا راستەقینەی دۆزیوەتەوە, جا دەستی لە ماڵ و منداڵ و کەس و کاری شازادەیی هەڵ گرتووە و بیروڕاکانی لەناو خەڵك دا بڵاوکردوەتەوە لە ساڵی ٤٨٢ پ. زدا مردووە.

**٦- تۆما:**

لەشاری جەلیل لە دایك بووە, مرۆڤێکی سەخت کوش بووە. درەنگ باوەڕی پەیدا دەکرد تا نەیدیبا بە ئاسانی دانی بە هیچ دانەدەنا. یەکێك بووە لە نزیکانی حەزرەتی عیسا ئەویش وەکو زۆربەی شاگردانی مەسیح بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی بەردو وڵاتان رۆیشتووە و لە وڵاتی هیندستان دا بەنیزە کوژراوە.

**٧- جەرجیس:**

هەندێك مێژوونوس لایان وایە کە لە شاگردەکانی مەسیح بووە, هەندێکیش دەڵێن گوایا خۆی پێغەمبەر بووە. زۆر دەوڵەمەند بووە بە ئەندازەیێکی وا کە نەیان توانیوە سامانی بژمێرن.

**٨- جەعفەر کوڕی محەممەد:**

بە (صادق) بەناوبانگە ئیمامی شەشەمی رێبای شیعەکانە و تەنانەت بەناوی ئەویشەوە ناونراوە شیعەی جەعفەری.

**٩- حسێن کوڕی عەلی (ع):**

ئیمام حسێن کوڕی ئیمام عەلی سێیەمین پێشەوای رێبازی شیعەی ئیمامییە. لە شاری مەدینەوە چووەتەوە مەککە, لەو شارەش دا دەستوپێوەندی یەزیدی کوڕی معاویە دژ بەو هەر خەریکی پیلان گێران و خەڵك هان دان بوون. تا لە عیراقەوە بە تایبەتی لە شاری کووفەوە خەڵکێکی زۆر داوایان لیکرد بەرەو ئەوێ بڕوات. بۆ ئەوەی فرمانەکانی جێبەجێ بکەن, بەڵام دەسەڵاتی ئەمەوییەکان بە سەرۆکایەتیی عوبیدیڵڵای کوڕی زیاد تەواوی لایەنگیرانی تەفروتونا کرد و حەزرەتی حسێن بە تەنیا لە دەشتی کەربەلادا مایەوە و لە ئەنجام دا کوژرا. ئەم کوشتارە دوور لە مەردایەتییە لە رۆژی دەی مانگی موحەرەمی ساڵی ٦١ی کۆچیدا رووی دا.

**١٠- حزقیل:**

چواردمین پێغەمبەری جوولەکانە کوڕی "بوری کاهی" لە شاری "یهودیە" لە دایك بووە, لە ساڵی ٥٩٨ی پێش زایین دا لەلایەن نەبوخذ نەسرەوە بە دیلی براوە بۆ شاری بابل.

**١١- خضر:**

پێغەمبەری خوایە و ناوی ئیندوویی خواردەوەتەوە لای کورد بە خدری زیندە ناسراوە.

**١٢- دانیال:**

لە سەردەمی دەست بە سەریی جوولەکەکان دا لە بابل ژیاوە لەبەر ئەوەی داهاتووی لێک داوەتەوە لە پاشای بابلەوە نزیک بوەتەوە. تا سەردەمی ئەسکەندەری (ذولقەرنین) ژیاوە.

**١٣- داود:**

حەزرەتی داود لە ساڵی ١٠٣٣ پ. ز دا لە شاری بێت لەحم لەدایک بووە و لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا مردووە. حەزرەتی داود بەرخەوان بووە, ئەگەر چی لەش و ئەندامی زل و زەلام نەبووە بەڵام ئازا و نەترس بووە, کاتێک کە نانی هێناوە بۆ براکانی کە لە شەڕدا بوون پاڵەوانێکی زۆر زەلامی بەهێزی (جالووت) ناو داوای مەیدانداری و بەرامبەرکێ دەکات داودیش بەو ئەندام بچووکییەوە بەرامبەری دەوەستێت و بە بەردەقانی دەی کوژێت. فەرمانڕەوایی حەزرەتی داود ٤٠ ساڵ بووە.

**١٤- زەردەشت:**

لە ساڵی ٦٤٠ ی پێش زایین دا لە شاری ئورمیە لە دایک بووە, لە سەردەمی فەرمانڕەوایی زنجیرەی ساسانی دا ئاینی زەردەشت بووە بە ئاینی تێکرایی ئێران. لە ساڵی ٥٨٣ پ. ز دا لەلایەن کابرایەکی تورکەوە بە ناوی براتورک رەش لە شاری بەیداخ کوژراوە.

**١٥- سلێمان:**

کوڕی حەزرەتی داود و سێیەمین پاشای جوولەکانە. لە ساڵی ١٠٠٦ی پێش زایین دا بووە بە شا و لەسەر پاشایەتیی (عدون)ی برای خۆی لەناو بردووە و لە ساڵی ٩٢٦ پ. ز دا مردووە.

**١٦- شیت:**

دەڵێن کە قابیل هابیلی کوشتووە, حەزرەتی ئادەم بۆی نارەحەت بووە و هەمیشە لەگریان و زاری دا بووە تا خوا کوڕێکی جوان و ئێسک سووکی پێ داوە بەناوی شیت.

**١٧- صالح:**

دوای لەناوچوونی نەتەوەی عاد, میللەتی ئەموود جێی ئەوانیان گرتەوە و دیسان دەستیان بە بت پەرستی کردەوە. صالح سەریان و داوای لێ کردن واز لە بت پەرستی بهێنن و ڕوو لە خوا بکەن. صالح ١٥٠ ساڵ تەمەنی کردووە.

**١٨- عەلی (ع):**

حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبوتالب لە ڕۆژی سیانزدەی رەجەبی ساڵی ٢٣ی پێش کۆچی دا هاتوەتە دونیاوە و لەتەمەنی شەست و سێ ساڵیدا لە مزگەوتی کووفەدا لەلایەن کابرایێکەوە بەناوی عەبدوڕەحمان کوڕی مەلجەم کوژرا. حەزرەتی عەلی چوارەمین خەلیفەی ئیسلام بووە.

**١٩- فاطمە:**

کچی پێغەمبەری خوا (محمد)ە (ص) ژنی حەزرەتی عەلی و دایکی حەسەنو حسێن بووە. لە ساڵی دووەمی پەیامی پێغەمبەرێتیدا لەدایك بووە و حەفتا ڕۆژ دوای مردنی پێغەمبەر (ص) لە دنیادا دەرچووە.

**٢٠- کالۆن (جان):**

لەساڵی ١٥٠٩ ز لە دایك بووە، یەکێکە لە پێشەوا ڕۆشنبیرەکانی ئاینی مەسیحی لە ئەوروپادا، کۆمەڵەکەی زۆرتر لە پرۆتستانەکانەوە نزیکترن. بیروڕای کالۆن دژی ڕەفتاری کاثولیکەکان و چۆنیەتی ئەنجام دانی ڕا و ڕەسمە ئاینییەکانیان بووە، لایەنگرانی ئەم بیروڕایە زۆرتر لە فەرانسە و هۆڵەندە و سویسرەدان کالۆن لە ساڵی ١٥٦٤ ز مردووە.

**٢١- کۆنفۆشیۆس:**

لە ساڵی ٥٥٠ پ. ز لە دایك بووە، قوتابخانەیێکی بیروڕای نوێی بۆ گەنجەکان پێك هێنا تا کاربەدەستان چاو لە ڕەفتاریان بکەن و هەنگاوی جوان بنێن و فەرمانڕەواییەکان پەسەند بکرێت لەتەمەنی چل و حەوت ساڵیدا کارێکی دەوڵەتییان پێ سپارد، ئەو لەو ڕێگەیەوە توانی بیروڕای خۆی بە خەڵکێکی زۆر بسەلمێنێت و ئەم سەرکەوتنە بوو بە هۆی ئەوەی پیلانی بۆ ڕێك بخەن و بۆ ماوەی سیانزدە ساڵ لە وڵات دووری بخەنەوە. دوای گەڕانەوەی هەر خەریکی نووسین و باسی فەلسەفی بوو تا مردنی.

**٢٢- لۆپەر "مارتین":**

لە ساڵی ١٤٨٣ ز دا لە شاری ئیزل بن لە دایك بووە باوکی کرێکاری کانگا بووە. دوای تەواو کردنی خوێندن لە (دار الفنون)ی شاری ئارفۆرت دا لە ساڵی ١٥٠٥ ز دەچێتە کڵێساوە و دەبێ بە قەشە. لە دواییدا بەرهەڵستی هەندێك کردەوەی دەربارەی کۆشکی پاپای کرد و بەزمی کڕینی بەهەشت و فرشتنی گوناحەکانی ڕەت کردەوە. ویستیان بە زیندوویی بی سووتێنن بەڵام خۆی شاردەوە. لەو کاتەدا ئینجلیی وەرگێرایە سەر زمانی ئەڵمانی. لە ساڵی ١٥٤٦ز دا مرد.

**٢٢- محمد پێغەمبەری خوا (ص):**

محمد کوڕی عەبدوڵلا لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی دوازدەی مانگی (ڕەبیعول ئەوەل)ی ساڵی فیل دا کە دەکاتە ساڵی ٥٧١ی زایین لە مەککە هاتوتە دنیاوە. لە سکی دایکیدا بووە باوکی مردووە. تەمەنی شەش ساڵان بووە دایکی مردووە. لە دوانزدە ساڵیدا لەگەڵ ئەبو تاڵبی مامیدا ڕۆیشتووە بۆ شام لە بیست و پێنج ساڵیدا (خەدیجە)ی گەورەی مارەکردووە و لە چل ساڵیدا قورئانی بۆ هاتوتە خوارەوە. لەبەر ئازار و دەردەسەریی قورەیش ناچار کۆچی کردووە بۆ شاری (مەدینە) و لەو شاردا ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەهێز بووە و لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەگەڵ موسڵمانان دا گەڕاوەتەوە مەککە و ڕۆژ بە ڕۆژ ئیسلام پەرەی سەندووە. دوازدەی مانگی ڕەبیعول ئەوەلی ساڵی یازدەهەمی کۆچیدا لە دنیا دەرچووە.

**مەسیح:**

عیسای مەسیح پێغەمبەری خوایە و دایکی ناوی مریەمە و بە فەرمانی خوا سکی پڕبووە بۆیە زۆربەی پەیڕەوەکانی حەزرەتی عیسا لە باوەڕێك دان کە کوڕی خوایە. لە قودس گیراوە و چوار مێخە کێشراوە و بە داردا هەڵواسراوە.

**مووسا:**



حەزرەتی مووسا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی رامسیسی دووەم دا لە شاری مەنفیس لەدایك بووە کە دەکاتە سالّی ١٥٧١ی پێش زایین.

لەبەر ئەوەی فیرعون منداڵی کوڕی جوولەکەکان دەکوشت، دایکی حەزرەتی مووسا، مووسای خستە ناو زەمبیلێکەوە و بە ڕووباری نیلی دادا، وا ڕێکەوت کچەکەی فیرعۆن هەڵی بگرێتەوە و لە کۆشکی فرعۆن دا گەورەی بکات. تا ڕۆژێك کابرایێکە میصری جوولەکەیێکی ئازار دا مووسا کابرای میصری کوشت.. لە ئەنجام دا لە شار دەرچوو و لە بیابانی کەناری دەریای سووردا بوو بە شوان. پاشان بوو بە پێغەمبەر و بە یاریدەی هاروونی برای جوولەکەکانی لە میصر دەرهێنا و بردنی بۆ سینا.

نووح:

وەکو گوتراوە، هەزار و حەوت سەد و دوو سالّ دوای مردنی حەزرەتی ئادەم هاتوەتە دنیاوە و لە پەنجا سالّیدا بووە بە پێغەمبەری خوا، هەرچی هەوڵی داوە نەتەوەکەی خوا بناسن بێ سوود بووە، خوا فەرمانی دا کە کەشتییەك دروست بکات. دوای تەواو بوونی کەشتییەکە نووح لەگەڵ سێ کوڕەکەی – سام، یافث، حام و ژنەکانیان و جووتێك لە هەموو زیندەوەران دا سواری بوون ئەوجا چل ڕۆژ باران باری بە شێوەیێکی وا کە خالّێك لە زەویدا بەرچاو نەدەکەوت، سەد و پەنجا ڕۆژ زەوی لەژێر ئاودا مایەوە و هەرچی گیان لەبەر هەبوو لەناو چوو، دوای ئەوەی کەم کەم ئاو نیشتەوە لوتکەی چیاکان دەرکەوتن و کەشتییەکە بەسەر کەژی (جودی)یەوە لەنگەری خست و دیسان سەرلەنوێ ڕەگەزی مرۆڤ زۆر بوودوە.

یەحیا:



حەزرەتی زەکەریا منداڵی نەدەبوو تا تەمەنی نەوەت سالّی هەر وەجاخ کوێر بوو. ئەوە بوو خوا لەو تەمەنەدا کوڕێکی پێدا ناونرا یەحیا و بوو پێغەمبەر.

حەزرەتی یەحیا بیستی کە پاشای فەلەستین بەناوی (هێروود) عاشقی کچە براکەی خۆی بووە، ئەم دڵدارییە نالەبارە بەلای یەحیاوە گەلێك ناپەسند بووە و لە ڕوویان وەستاوە. بەلّام کچەکە داوای لە پاشا کرد کە سەری یەحیای بۆ بنێرێت، ئەویش فەرمان دەدا و سەری دەبڕن و لەسەر لەنگەرییەکەی زێڕ بە دیاری بۆ کچەی دەبەن.

یوسف:

کوڕی حەزرەتی یەعقوب کوڕی حەزرەتی ئیسحاق کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە، لە سالّی ١٧٤٥ پ. ز لە دۆڵی رافیدەین لە دایك بووە و لە سالّی ١٦٣٥ ی پ. ز لە میصر مردووە.

لەبەر ئەوەی باوکی بە تایبەتی ئەوی خۆش ویستووە براکانی ڕقی لێ هەڵ دەگرن و پیلانی کوشتنی دادەنێنەوە. ڕۆژێك دەیخەنە ناو بیرێکەوە و کراسەکەشیان بۆ حەزرەتی یەعقوب هێناوە کە گوایا گورگ خواردوویەتی. کاروانێك یوسف لە بیر دەردەهێنن و لە وڵاتی میصردا بە کاربەدەستێکی دەفرۆشن، ژنی ئەم کاربەدەستە عاشق و شەیدای یوسف دەبێت بەلّام یوسف مل بەو هەوەسە نادا و لە ئاکام دا ئەو ژنە کە ناوی زولێخا بووە کارێکی وادەکا دەخرێتە بەندیخانەوە و چەند سالّێك لە بەندیخانەدا دەمێنێتەوە و لەبەر ئەوەی

خەونی بۆ بەندیەکان لێک دەدایەوە و راست دەردەچوون. هەواڵی ئەم بێش بینیبە گەیشتە دەربارەی کۆشکی فیرعون. ئەویش ناردی بەدوای دا بۆ لێک دانەوەی خەونێک کە دیتبووی. حەزرەتی یوسف بە جوانی خەونەکەی بۆ لێک دایەوە و کرا بە وەزیری دەستەراستی فیرعون و لە ئاکام دا براکانیشتی هێنایە لای خۆی لە میصر.

## ناوی چەند هاوڕێیەکی پێغەمبەری خوا

١- **ئەبو بەکر:**
کوڕی ئەبو قوحافەیە لە ساڵی ١٣ی کۆچی دا لە دنیا دەرچووە, باوکی حەزرەتی عایشەی ژنی پێغەمبەر (ص) و یەکەمین خەلیفەی ئیسلامە.

٢- **ئەبوو ئەییووب ئەلئەنصاری:**
یەکێک بووە لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (ص), لە شەڕەکانی بەدر, ئوحد و خەندەق دا بەشداری کردووە. لەساڵی ٥٢ی کۆچیدا لە ڕێگای قوستەنتەنییەدا نەخۆش کەوتووە و مردووە.

٣- **ئەبوو ذەڕڕی غەفاری:**
جوندوب کوڕی جنادە. گەلێک لە خواترس و ئاگاداری ڕێبازەکانی دنیای ئیسلام بووە. دەربارەی مافی ئیسلام هەمیشە لەگەڵ کاربەدەستان دا لە هەرا دابووە, لە شام و مەدینە دەرکراوە و لە بیابان دا مردووە.

٤- **ئەرقەم:**
لەساڵی ٥٥ی کۆچیدا مردووە و یەکێک بووە لە هاوڕێیەکانی پێغەمبەری خوا.

٥- **جابر کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری:**
کاتێک وەفاتی کردووە تەمەنی نەوەت و چوار ساڵ بووە و بە یەکێک لەوانە دەژمێردرێت کە وتەکانی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە.

٦- **حذیفە کوڕی یەمان:**
لە ساڵی ٣٦ی کۆچی دا لە شاری مەدائن مردووە.

٧- **خالید کوڕی وەلید:**

یەکێك بووە لە سەردارانی سوپای ئیسلام لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا موسڵمان بووە و لە شاری حیمص دا لە دنیا دەرچووە.

٨- **زوبێر کوڕی عەووام:**

هاوڕێی پێغەمبەرە (ص) و کوڕی پووریيەتی. لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا موسڵمان بووە لە شەڕی (جەمەل) دا کوژراوە.

٩- **زەید کوڕی حاریثە کوڕی شورحەبیل:**

کوێلەیەك بووە کە حەزرەتی خەدیجە کڕیویەتی و بە دیاری دراوە بە پێغەمبەر. لە شەڕی تەبووك دا ئاڵا هەڵگری لەشکری موسڵمانان بووە.

١٠- **سەعد کوڕی ئەبو وەقاص:**

یەکێکە لە موسڵمانە پێشینەکان و سەردارێکی گەورەی ئیسلامە و شەڕی قادسیەی بەناوبانگ لە ژێر فەرماندەیی ئەودا بە ئەنجام دراوە. لە تەمەنی نەوەت ساڵیدا مردووە.

١١- **سەلمانی فارسی:**

یەکێکە لە موسڵمانە یەکەمینەکان و خەڵکی دەوروبەری ئەصفەهان بووە، لە سەرەتاوە بووە بە مەسیحی و لە ئاکام دا موسڵمان بووە دوای ئەوەی لە کوێلەیی ئازاد کراوە، هەڵ کەندنی چاڵ لە شەڕی خەندەق دا لەسەر بیروڕای ئەو ئەنجام دراوە. بوو بە فەرمانداری مەدائن و لەوێش لە ساڵی ٢٧ی کۆچی دا مردووە.

١٢- **صهێب کوڕی سنان کوڕی مالك:**

لە ساڵی ٣٢ی کۆچیدا مردووە، یەکێك بووە لە تیرهاوێژە بەناوبانگەکانی ئیسلام و باوکی یەکێك بووە لە ناودارانی سەردەمی گومرایی (جاهلی).

١٣- **تەلحە کوڕی عەبدوڵلا:**

کوڕی مامی ئەبو بەکری صدیق بووە، لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا موسڵمان بووە. لە شەڕی جەمەل دا کوژراوە.

١٤- **عەبدوڕڕەحمان کوڕی عەوف:**

یەکێکە لە دە مزگێنی پێدراوانی بەهەشت، دەڵێن هەشتەمین کەس بوو کە باوەڕی بە ئیسلامی پیرۆز هێناوە. بیستویەك جار بریندار بووە.

١٥- **عوثمان کوڕی عەففان (رض):**

لە ساڵی ٣٢ ك دا لە تەمەنی هەشتا و یەك ساڵیدا شەهید کراوە، زاوای پێغەمبەر بووە کەوا مێردی روقەییە و ئوم کەلثوومی کچانی پێغەمبەر بووە یەك لە دوای یەك بە سێیەمین خەلیفەی موسڵمانان هەڵبژێردراوە.

١٦- عەممار كوڕی یاسر:
لە ساڵی ٣٧ كۆچیدا لە شەڕی صفین دا كوژراوە و یەكێك بووە لە یارانی پێغەمبەر دەژمێردرێت.

١٧- عومەری كوڕی خەتتاب (رض):
بە دووەمین خەلیفەی ئیسلام هەڵبژێردراوە و لە سەردەمی خەلیفایەتی ئەوا ئیسلام زۆر شوێنی لە كوفر و تاریكی رزگار كردووە. شاری كووفە و بەصرە لە سەردەمی ئەو مەزنەدا دروست كراوە و لە ساڵی ٢٣ی كۆچیدا بەدەستی (فەیروز) ناوێكەوە شەهید كراوە.

١٨- عەمر كوڕی عاص:
یەكێك بووە لە هاوەڵانی محمد (ص)، نووسەر و سەردار و ئاگادار و زیرەك بووە. لەتەمەنی نەوەد ساڵیدا مردووە. لەسەر دەستی ئەو میصر ئازاد كراوە.

## ناوی چەند ئیمامێکی ڕێبازی ئاینی ئیسلام

**١- ئەبوو حەنیفە (٨٠ – ١٥٠ ك):**

ئەبوو حەنیفە نوعمان کوڕی ثابتە , لە شاری (کووفە) لە دایك بووە, ئیمامی مەزهەبی (حەنەفی)یە لە ئیسلام دا زانایەکی گەورە و ئاگادار بووە, خەلیفەی عەباسی بەندی کردووە و لە بەندیخانەدا مردووە.

**٢- مالك کوڕی ئەنەس (٩٥ – ١٧٩ ك):**

لە شاری مەدینە لە دایك بووە, زانایێکی ناودار و خاوەن مەزهەبی مالکییە. لە مەدینەش مردووە لە گۆڕستانی (ئەلبەقیع) نێژراوە.

**٣- شافعی (١٥٥ – ٢٠٤ ك):**

محەممەد کوڕی ئیدریس لە مەککە دەرسی خوێندووە و چووەتە مەدینە لای مالك کوڕی ئەنەس خوێندوویەتی و ساڵی ١٩٥ هاتوەتە بەغدا. مەزهەبی (شافیعی) لە ئاینی ئیسلام دا پەیڕەوی بیروڕاکانی ئەم زانا گەورەیە.

**٤- ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی حەنبەل**

لە بەغدادا لە دایك بووە, بە دوا زانیاریدا کووفە و بەصرە و مەککە و مەدینە و شام گەڕاوە لە سەرەتادا لە خزمەت ئیمامی شافیعی خوێندوویەتی دژی ڕێبازی (موعتەزیلە) بووە و بیووڕای ئەوانی بە (بیدعەت) داناوە, لە سەرەتاوە دەوڵەت ئازاری داوە بە تایبەتی لە سەردەمی مەئموون و موعتەصەم دا, بەڵام (متەوەکیل) ڕێزی لێ گرتووە.

## هونەرە جوانەکان

بەرهەمی جوان بە دوو شێوە هەستی پێ دەکرێت، واتە بینین و بیستن، جا لەسەر ئەم بنەڕەتە هونەرە جوانەکان دەکرێن بە سێ بەشەوە:

١. هونەرە بەرچاوەکان، واتا ئەوانەی بە چاو دەبینرێن.
٢. هونەرە گوێ بیستەکان.
٣. ئەو هونەرانەی دەبینرێن و دەبیسترێن.

### ١- هونەری بەرچاو:

تەجەسومی و تەشکیلیشی پێ دەڵێن و بریتییە لە رەنگ و شێوە کە سروشت بە جوانی دەردەخات بە زمانێکی پڕ لە وردەکارییەوە بێ ورتە داستانێکی شیرین یا راستەقینە دەگێڕێتەوە بە جۆرێکی کە هەموو کەس بە گوێرەی خۆی لێی تێ دەگات. کەموکورتیی ئەم هونەرە ئەوەیە کە بێ جووڵانەوەیە، واتە هەر یەك رووی ژیان یان تەنیا گۆشەیەك لە گۆشەکانی ژیان دەردەخات ئەمەش وەکو چوارچێوەیەك وایە ئەم جۆرە هونەرە پێوەند دەکات وەکو هونەرە بیستراوەکان بێ سنوور نییە و لە ڕاستیدا شێوەییێکە لە پێشان دانی (مادە) و ناتوانێت وەکو هونەرە بیستراوەکان پەنجە لە مەعنەویات بکوتێت و جوان جوان بیخاتە خەلسەی روح ووژانەوە. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە هونەرانە هەستێکی دوو مەودایی "دووری" هەیە وەکو نیگار و رەسم، وە بە دروست کردنی سێبەر و رووناکی یان دوورنما مەودای سییەمی تێدا دەردەکەوێت.

هونەرە بینراوەکانیش بریتین لەمانە:

١- نیگار کێشان
٢- وێنەگری
٣- پەیکەرسازی
٤- میعماری "ئاواکاری"

### ٢- هونەری بیستراو

لە هونەردا جوانی بە شێوەی وشە ئاواز و ئاهەنگ خۆی پێشان دەدات.. ئەم هونەرەش چوارچێوەی نییە و پابەندی جێگەش نابێت و مەبەستەکانی خۆی تا ئەندازەی توانا نیشان دەدات بە شێوەیێکی وا کە ئەو جوانییە هەستە ناسکەکانی بیر و حەز بهێنێتە جووڵاندنەوە ئەم هونەرانەش ئەمانەن:

١- مۆسیقا
٢- ئەددەبیات
٣- وتار و تووێژ

### ٣- هونەری بینرا و بیستراو

واتا (سەمعی) و (بەصەری).

لەم شێوە هونەرەدا جوانی شێوەی ئاهەنگ و وشە لەلایێکەوە رەنگ و شێوە لە لایێکی ترەوە دەردەکەوێت و راستەقینەکانی سروشت دەردەخات و لە هەردوو جۆرە هونەرەکەی پێشوو پایە بەرزترە.

هونەرەکانی بینراو و بیستراو و بریتین لە مانە:

١. سەما و هەڵپەرکێ.
٢. مۆسیقا.
٣. شانۆیی.
٤. سینەما.

## زاراوەکانی نیگارکێشی

**١- ئەکسپرسیۆنیسم** *Expressionisme*

شێوەیێکە لە هونەری نیگار، پەیکەرسازی، ئەدەبیات و سینەما، مەبەست لە دەرخستنی هەستەکانی هونەرمەندە لەگەڵ چۆنیەتی بەیانەکەی بۆ دەور و بەری.

**٢- ئیمپرسیۆنیسم** *Impressionisme*

شێوەیێکە لە نیگارکێشان کە لە چاودا زۆرتر خۆی دەردەخات.. ئەم شێوەکاری نیگار کێشانە زۆر لە بلیمەتە ناسراوەکانی جیهان نیگار دایان ناوە و پەیڕەویان لێ کردووە وەکو: مونێ، رێنوار، مانی سیسلە، سیزان، دیگا، گیومن و موریزو.

**٣- پالت**

ئەو تەختەیەیە کە نیگارکێش رەنگەکانی بەسەرەوە ئامادە دەکات بۆ رەنگ لێکدان و ئیش کردن.

**٤- پرسپکێف**

واتا دوورنمای هونەری رەسم کردن بە پێی بینین.

**٥- پۆرترە ( پۆرترێت )**

واتا نیگارکێشانی ڕواڵەت.

**٦- تابلۆ**

واتا ئەو پەردەیە کە نیگاری لەسەر کێشراوە.

**٧- ریالیسم** *Realisme*

واتا نیگارکێشان لە ڕاستەقینەیەك کە لە گلێنەدا هەیە، چ توندوتیژی و زبری بێت یان ناسك و زەریفی.

**٨- رۆکۆکۆ** *Rococo*

شێوەیێکە لە شێوەکانی میعماری (ناواکاری) کە لە بنەڕەت دا شێوەی باروك سوودی وەرگرتووە بەڵام ناسکتر لەو، ئەم هونەرەش زیاتر لاسایی هونەری وڵاتی چین دەکاتەوە.

٩- رۆمانتیسم *Romantisme*

شێوەیێکە لە شێوەکانی نیگارکێشان کە تێ دەکۆشێت هێندە پابەندی جوار چێوە ناسراوەکانی هونەری کلاسیك نەبێت بەلکو زۆرتر گۆیایی هەستەکانی مرۆڤە بەلام بە زمانێکی سادە و ئاسان.

١٠- سوراِمپرسیۆن *Surimpression*

شێوەیێکە لە شێوەکانی نیگارکێشان کە پەیرەوانی قوتابخانەی ئەمپرسیونیسم دایان هێناوە.

١١- سوریالیسم *Surealisme*

شێوەیێکی نیگارکێشییە کە بیروڕای دەروونی نیگارکێشی تێدا دەردەکەوێت.

١٢- سیلویت *Silhouette*

١٣- فرسەنگ

نیگارکێشان بە رەنگی تەڕ.

١٤- فورتوریسم

شێوەیێکە لە شێوەکانی نیگارکێشی کە زۆرتر ئایندەی مرۆڤی بەلاوە گرنگە، دانەری ئەم شێوەیە (ماریتنی)یە.

١٥- فۆیسم

شێوەی بێ دەربەستی و بێ بەند و باری نیگار کێشان دایە، رابەری ئەم رێبازە نیگارکێشی بەناوبانگی فرانسە (گۆگان) بووە.

١٦- کاریکاتۆر

جۆرێکە لە نیگارکێشان کە نیگارکێش هەوڵ دەدا ئەو شتانەی وا زۆرتر لە روالەتی ئەو کەسەدا دەرکەوتووە بە شێوەیێکی گاڵتە و پێکەنیناوی رەسم بکات.

١٧- کاریکاتۆریست

واتا نیگارکێشی شێوەی کاریکاتۆری.

١٨- کلاسیسم *Classisme*

شێوەیێکی نیگارکێشانە کە روخسا رو چۆنیەتیی کەسە ئاینییەکان لەگەڵ خەڵکی تردا جیاواز پیشان بدرێت.

١٩- کوبیسم *Cubisme* "تەکعیبی"

شێوەیێکە لە نیگارکێشان کە تا ئەندازەیەک هەوڵ دەدات باوەڕ بە سەردەمی ژیانی دووروبەر دەردەبڕێت. ئەم شێوە زۆرتر گۆشە و کەناری تایبەتی بیر و زانیارییەکان دەردەخات.

٢٠- **مۆدیل**
ئەو کەسەیە کە نیگاری لی دەکێشرێت.

٢١- **مینیا تور**
شێوەیێکە لە نیگارکێشانی رۆژهەڵاتییەکان.

٢٢- **مینا توریست**
ئەو کەسەیە کە بە شێوەی میناتۆر نیگار دەکێشێت.

٢٣- **ناتورالیسم** *Naturalisme*
بە واتای لاسایی کردنەوەی سروشت.

## نیگارکێشە بەناوبانگەکانی جیهان

١- **ئاپیلس** *Apelles* (**سەدەی چوارەمی پێش زایین**)
خەڵکی یۆنان بووە, لە سەردەمی فیلیپی باوکی ئەسکەندەر و ئەسکەندەری مەکەدۆنیدا ژیاوە.

٢- **ئەپۆلۆ دۆروس** *Apollodorus* (**سەددی پێنجەمی پێش زایین**)
خەڵکی وڵاتی یۆنان بووە.

٣- **ئاراگۆن "ژن"** *Aragon*
نیگارکێشێکی وڵاتی ئیتالیا و کچی فردیناند بووە (لە ژنەکەی خۆی نا) نیگاری ئەم کچە لەلایەن روفائیلەوە کێشراوە و ئێستاش لە مۆزەخانەی لۆڤەری پاریس دا دانراوە.

٤- **ئارکو** *Arco* (**١٦٢٥ – ١٧٠٠ ز**)
خەڵکی ئیسپانیایە و بە لاڵی لە دایک بووە.

٥- **ئالبانی** (**١٥١٨ – ١٦٦٠ ز**)
خەڵکی وڵاتی ئیتالیا بووە.

٦- ئالتدوفەر Altdoffer . A "ئەلبریشت"
هەم نیگارکێش بووە، هەم میعماری، بۆ یەکەم جار چیرۆکەکانی ئنجیلی بە نیگارکێشا.

٧- ئاڕارا Herrera ( ١٥٧٦ – ١٦٥٢ ز)
نیگارکێشێکی ئایینی خەڵکی ئیسپانیا بووە دانەری قوتابخانەی ناتۆرالیسمییە.

٨- اسپادە Spada ( ١٥٧٤ – ١٦٢٢ز)
خەڵکی ئیتالیایە و پەیرەوی قوتابخانەی ریالیست بووە لە نیگارکێشان دا. چەند تابلۆیەکی لە مۆزەی لۆڤەردا هەڵواسراوە.

٩- ئوستاد "ئەدرین وان" ( ١٦١٠ – ١٦٨٥ ز)
لە شاری ئەمستردام لە دایک بووە، چەند تابلۆیەکی لە مۆزەکانی لۆڤەر، ئەمستردام و لاهایدا هەڵواسراوە.



١٠- ئینگر (ژان) Ingres ( ١٧٨٠ – ١٨٠٧ ز)
خەڵکی وڵاتی فرانسە و خاوەنی ئەم نیگارە بەناوبانگانەیە:
١- شایل سکستین.
٢- لەیسی سیانزدە.
٣- پلەی خوادا بە هۆمیرۆس.
٤- گەرماوی تورکان.

١١- ئوتجەللو Uc-ello ( ١٣٩٦- ١٤٧٥ ز)
خەڵکی فلۆرانس و خاوەنی تابلۆی - شەڕی سان رۆمانۆیە.

١٢- ئورکانیا Orcania ( ١٣٠٨ – ١٣٤٨ ز)
پەیکەر ساز، نیگارکێش، میعمار، زەڕەنگەر، خەڵکی فلۆرانسە بووە. ئەمانە ناوی چەند تابلۆیەکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەن:
١- مەسیح لەنێوان تۆماس و پەتروسی خوارێدا.
٢- تاج لەسەریی مریەم.
٣- سەن برنار.
٤- میحرابی مەڕمەڕ

١٣- پاچو ( ١٤٦٩ – ١٥١٧ ز)
خەڵکی ئیتالیایە و لە فلۆرانسە لەدایک بووە بە "پاچو دو لاپورتا" بەناوبانگە.

١٤- پارتۆ لومیو Bartolomeo ( ١٤٧٢ – ١٥١٧ ز)
خەڵکی فلۆرانسەیە و دوایی بووە بە قەشە. ناوی چەند نیگارێکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندە:

١- مریەم لەناو سەنت ستیڤان و سەنت جان دا.
٢- ستایشی مریەمی مەجدەلانی.
٣- سەنت کاترین.
٤- سەنت مارك.
٥- پەیدابوونی حەووا.

١٥- **باسانۆ** ***Bassano*** (١٥١٠-١٥٩٢ ز)

یاکۆبۆ باسانۆ خەڵکی شاری ڤینسیای ئیتاڵیایە, ئەم نیگارانەی کێشاوە.

١- لە دایك بوونی مەسیح.
٢- دەرکردنی سوود خۆرەکان.
٣- مزگێنی بە شوانەکان.

١٦- **باشلیێ "ژان ژاك"** ***Bachelier*** (١٧٢٤ – ١٨٠٦ ز)

لە شاری پاریس لە دایك بووە, چەند تابلۆیەکی لە مۆزەی لۆڤەردا هەڵواسراوە.

١٧- **باکوی زەن** ***Backhuyzen*** (١٦٣١ – ١٧٠٨ ز)

خەڵکی هۆڵەندیە و چەند تابلۆیەکی لە مۆزەخانەکانی لۆڤەر, ئەمستردام و لاهای هەڵواسراوە.

١٨- **براك "جۆرج"** ***Braque***

خەڵکی فەرەنسەیە لە ساڵی ١٨٨١ ز دا لە دایك بووە و پەیڕەوی ڤوتابخانەی کوبیسم بووە, لە ساڵی ١٩٠٨ ز لەگەڵ پیکاسۆدا بۆ پێش خستنی کوبیسم زۆر تەقەلای کرد شێوەی کاری ئەم هونەرمەندە دۆزینەوەی هاوئاهەنگیی نێوان رەنگەکان بووە, زۆربەی کارەکانی لە رەنگی ڤاوەیی, زەرد سوودی وەرگرتووە.

١٩- **بروگل دهاتی** ***Bruegel*** (١٥٢٥ – ١٥٦٩ ز)

تابلۆ بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

١- کوشتاری بێ گوناحەکان.
٢- سەلیب هەڵگر.
٣- کوێر.
٤- هەڵپەرکێی لادێییەکان.
٥- ڤوللەی بابل.
٦- دروێنە کەران.

٢٠- **بیگمان** ***Beckman*** (١٨٨٤ – ١٩٥٠ ز)

خەڵکی ئەڵمانیایە, ئەم نیگارکێشە دەیگوت: من بە دوای پردێك دا دەگەڕێم کە لە دنیای بینراوەوە بم نا بۆ دنیای نەبینراو. ئەمانەش ناوی چەند تابلۆیەکی ناسراوی ئەم هونەرمەندەن:

١- دۆزەخی باڵندەکان.

٢- گومان لێ کراو و کوێر.
٣- بەرلین بازاڕی مەکارە.

٢١- بەللی "یاکوبو" Bellini (١٤٠٠ – ١٤٦٢ ز)
خەڵکی ئیتالیا بووە ئەم تابلۆوانەی کێشاوە:
١- مریەمی عەزرا.
٢- لەدار کێشانی مەسیح.
٣- نیوەی روخساری مەسیح.

٢٢- بۆتە چیللی "ساندرۆ" Botticelli (١٤٤٤ – ١٥١٠ ز)
خەڵکی فلۆرانسە بووە، ئەمەش ناوی چەند تابلۆیەکی ناسراوی ئەم هونەرمەندیە:
١- ستایشی شاکان.
٢- بەهاری ڤینۆس.
٣- بلاس و کنتاورس.
٤- مارس و ڤینۆس.
٥- لەدایك بوونی مەسیح.

٢٣- بوودن "لویس" Beaudin (١٨٢٤ – ١٨٩٨ ز)
خەڵکی وڵاتی فرەنسە بووە، یەکێکە لە پێشڕەوانی قوتابخانەی ئەمپرسیونیسم.

٢٤- بۆس Bos (١٤٦٠ – ١٥١٦ ز)
یەکێك لە تابلۆ بەناوبانگەکانی (رۆژی حەشر)ە.

٢٥- پارسیل "جوزێف" Parrcel (١٦٤٦ – ١٧٠٤ ز)
نیگارکێشی شەڕەکانی لویسی چواردەهەم بووە.

٢٦- پارمانتیا "ژاك" (١٦٥٨ – ١٧٣٠ز)
نیگارکێشێکی مێژووی وڵاتی فەرەنسە بووە.

٢٧- پارمیچانو (١٥٠٣ – ١٥٤٠ ز)
خەڵکی ئیتالیایە و تابلۆی بەناوبانگی کومپیدو کەمانەکەی کێشاوە.

٢٨- پاسن "ژۆل" Pascin (١٨٨٥ – ١٩٣٠ ز)
خەڵکی وڵاتی فەرەنسە بووە و نیگارکێشی بەناوبانگی (ڕووتی)یە.

٢٩- پاگانی "گریگۆری" Pagani (١٥٥٨ – ١٦٠٥ ز)
لە شاری فلۆڕەنسا لە دایك بووە، تابلۆ بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

١- نیایشی موغان له کڵێسای کارمین و دگر.
٢- لووط و کچەکانی.
٣- مریەم و عیسا.

٣٠- پالماروڵی "دین ویسنت" *Palmaroli* (١٨٣٥ – ١٨٩٦ ز)

خەڵکی وڵاتی ئیسپانیایە و جوانترین تابلۆکانی ئەمانەن:

١- کۆترەکانی ڤینیسیا.
٢- تەرمی شەهیدەکانی ١٨٠٨ ز
٣- نیگاری ئەلفۆنسی سیانزدەهەمی پاشای ئیسپانیا.

٣١- پرۆتیاس "ئەلکسەندەر" *Protais* (١٨٢٦ – ١٨٩٠ ز)

له شاری پاریس له دایك بووە، خاوەنی ئەم نیگارانەیە:

١- شەڕی ئینگرمان.
٢- یادگاری سەنگەرەکانی قرم.
٣- خۆراوابوونی دوای شەڕ.
٤- خۆر هەڵهاتنی پێش شەڕ.

له کارەکانیدا پەیڕەوی شێوەیی ریالیسمی کردووە.

٣٢- پروودۆن "پییر" *Prudhon*

خەڵکی وڵاتی فرانسەیە، کارە ناسراوەکانی ئەمانەن:

١- روخساری شاژنە جۆزفین.
٢- داد.
٣- تۆڵەی دوای تاوان.

٣٣- پرووژن *Le Prugin* (١٤٤٦ – ١٥٢٤ ز)

خەڵکی وڵاتی ئیتالیا بووە، شێوەی کارەکانی زۆرتر ئاینییە، بەڵام نیگاری لە ئاین جیاشی هەر هەیە. ئەمە ناوی هەندێ کاری ناسراویتی:

١- عەذراي پاك داوێن.
٢- عیسا و دووپەری.
٣- عیشق و پاکژی "مۆزەخانەی لۆڤەر"
٤- دەرکەوتنی عەذرای پاك داوێن بۆ بەرنار "مۆزەخانەی موینخ".

٣٤- پەنی "ژان فرانسیسکۆ" *Penni*

شاگردی روفائیل بووە و خەڵکی فلۆرانسەیە.

٢٥- پیکاسۆ "پابلۆ" *Picasso*



لە وڵاتی ئیسپانیا لە ساڵی ١٨٨١ دا لە دایك بووە بەڵام هەر لە فرانسە دا ژیاوە. یەکێکە لە دانەران و مامۆستایانی شێوەی (کوبیسم) لە جیهان دا، لە شێوەکانی تری نیگاریش دا کاری کردووە و لەم رووەوە بەرهەمی زۆرە.

نیگارەکانی ماوەی یەکەمی ژیانی ئەم هونەرمەندە زۆرتر دەربارەی چینی هەژارانە.

پیکاسۆ لە ساڵی ١٩٠٧ دا لەگەڵ (براك)ی هونەرمەند بووە بە ئاشنا و پێکەوە شێوەی (کوبیسم) یان پێك هێناوە. لە ساڵی ١٩٣٠ دا پەنای بردوەتە بەر شێوەیەکی دیکەی نیگارکێشان ئەویش بە (کلاسیکی تازە) ناوبانگی دەرکردووە. نیگارەکانی بە زۆر جۆر و زمان لێك دراونەتەوە زۆریان لەسەر نووسراوە.. بەڵام خۆی لە بارەی شیکردنەوە و لێك دانەوەیان دا دەڵێ: ئەوانەی دەیانەوێ تابلۆکان لێك بدەنەوە هەرگیز ناگەنە ئاکامێکی پەسەند چونکە نیگارکێش بۆ ڕاکردن لە غەم وپەژارە نیگار دەکێشێ.

لەم دواییەش دا هونەری (گۆزەگەری)شی دەست پێ کرد بوو.

ژیانی ئەم هونەرمەندە بلیمەتە لەرووی هونەرەوە بەسێ بەش دابەش دەکرێت و وایش ناسراوە:

١- ماوەی کەوەرەنگ:

سەرەتای ناوبانگی لەم ماوەیەدا دەست پێ کردووە کە سوودی لە رەنگی شین یان کەوە وەرگرتووی و تابلۆی (ژیان) هی ئەم سەردەمەیە.

٢- ماوەی ئاڵ:

کە لە ساڵی ١٩٠٦ز دا دەستی پێ کردووە و ئەم تابلۆیانە شاکارەکانی ئەم ماوەیەن:

١- نووما ئەسپ.

٢- گرتوود شتاین.

٣- ماوەی کوبیسم "تەکعیبی":

کەوا هەڵ هەڵەی شاکارەکانی لەم سەردەمەدا بووە.

٣٦- تریشکۆڤیج "کونستانتین" *Terechkviteh*

خەڵکی وڵاتی سۆڤیەتە، تابلۆی (عەلی خان) یەکێکە لە کارە بەناوبانگەکانی.

٣٧- توورنەر "جوزێف" *Turner* (١٧٧٥ – ١٨٥١ ز)

خەڵکی وڵاتی بەریتانیایە، زۆرتر نیگاری دەربارەی کۆشکی شایە. ئەمانەش ناوی چەند تابلۆیەکی ناسراوی ئەم هونەرمەندەن:

١- هسپرید.

٢- خۆر هەڵهاتن لەم تەم دا.

٣- کەشتیی نقووم بوو.

٤- پەڕینەوە لە جۆگە.

٥- هەرووژاندنی کارتاج "قرطاجنة"

٦- گوزەرگا.

٣٨- **تیسین ( ١٤٧٧ – ١٥٧٥ ز )**

خەڵکی ڤینیسیا بووە، کارە بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

١- مردنی سان پەتروس.

٢- ڤینۆسی خەوتوو.

٣- مەسیح لە باخ دا.

٣٩- **جوردانو "لوکا" *Giordano* ( ١٦٣٢ – ١٧٠٥ )**

زۆر لە نیگارەکانی لە مۆزەخانەی ئەوروپادا هەڵواسراوە.

٤٠- **جیما بویە *Cimabue* ( لە ساڵی ١٣٥٢ز دا مردووە )**

خەڵکی فلۆرانسە بووە، زۆر لە نیگاری کڵێساکانی کێشاوە هەروەها مۆزاییک توانیویەتی لە نیگاری سەر و روخساردا گۆڕینێك بەدی بهێنێ و تا ئەندازەیەك نیگارکێشان بخاتە قالێکی ترەوە.



٤١- **دالی "سلڤادۆر" *Dali. S***

لە ساڵی ١٩٠٤ ز لە ئیسپانیادا لە دایك بووە لە نیگارکێشان دا خاوەن شێوەی تایبەتی خۆیەتی و پەیڕەوی قوتابخانەی سور ریالیستە.

٤٢- **داڤید "ژان" *David***

خەڵکی وڵاتی فەرانسەیە، تابلۆ ناسراوەکانی ئەمانەن:

١- سویل.

٢- ترسەکان.

٣- تاج لەسەرنان.



٤٣- **دافنشی" لیۆناردۆ" *Derinci. L* ( ١٤٥٢ – ١٥١٩ ز )**

فەیلەسووفێکی خەڵکی ئیتالیا بووە، زۆربەی هونەرەکانی زانیوە وەکو: نیگارکێشان، پەیکەرتاشی، میعماری، نووسەری، مۆسیقا، فیزیا و داهێنان.

ئەمەش ناوی دوو تابلۆی نێجگار بەنرخ و بەناوبانگی ئەم بلیمەتەن:

١- مۆنالیزا (یان بزەی ژۆکوندە).

٢- دوا شێوەخواردن. (کە لەسەر دیواری کڵێسای سانتا ماریا کێشراوە).

٤٤- **دیگا "ئیلیر ژرمان"** *Degas* ( ١٨٣٤ – ١٩١٧ ز )

خەڵکی وڵاتی فرانسەیە, ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەن:

١- کەناری دەریا.
٢- هەڵپەرکێ کەران.
٣- دیمەنی سەمایەك.
٤- ژنان لە کاتی ئارایشت دا.
٥- خەڵکی ناو چاپخانە.
٦- گرەوی ئەسپ تاودان.

٤٥- **دیلاکروا ( ئوژن )** *Delarcroix. A.* ( ١٧٩٧ – ١٨٦٣ )

خەڵکی وڵاتی فرانسەیە و خاوەن شێوەیێکی تایبەتی خۆی بووە لە نیگار کێشان دا. ئەمانەش چەند تابلۆیەکی ئەم هونەرمەندەن:

١- گەشتی دانتە.
٢- کوشتاری سیو.
٣- ئازادی لە سەنگەرەکان دا.
٤- ژنانی دورگە.
٥- داگیرکردنی قوستەنتەنییە.

٤٦- **دلونە "رابرت"** *Delaunay . R.*

خەڵکی ولاتی فرانسە بووە, بەناوبانگترین تابلۆی ئەم هونەرمەندە ناوی تابلۆی شاری پاریسە.

٤٧- **دۆر ( گۆستاف )** *Dore. G.* ( ١٨٣٣ – ١٨٨٣ )

خەڵکی وڵاتی فرانسەیە, تابلۆی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندە ناوی کتێبی دۆزەخی دانتییە.

٤٨- **دوشان "مارسێل"**

لە ساڵی ١٨٨٧ لەدایك بووە, یەکێکە لە رابەرانی شێوەی دادایسم لە نیگارکێشان دا.

٤٩- **روفائێل** *Raphael* ( ١٤٨٣ – ١٥٢٠ ز )



گەورەترین نیگارکێشی سەردەمی راپەرین (رەنیسانس)ە خەڵکی وڵاتی ئیتالیایە. لە سەرەتاوە تابلۆی لە داردانی مەسیح و تاج لە سەرنانی مەریەمی کێشا, دوای ماوەیەك چەند تابلۆیەکی حەزرەتی مریەمی کێشا کە بوون بە هۆی ناوبانگی زۆر. دوایی چووە شاری رۆما. لە بارەی شێوەی کارەوە پەیرەویی میکائیل ئینجیلۆی کردووە و هەر لەسەر رێچکەی ئەو توانیویەتی ئەم تابلۆ ناودارانە بکێشێت:

١- قوتابخانەی ئەثینا.
٢- سەرکەوتنی ئاین.
٣- دەرکردنی هلیو دوروس لە پەرستگادا.

٤- بەرجۆ (موعجیزە)ی بولسنا.
٥- دەرکردنی ئاتیلا لە رۆما.
٦- مەسیح لە کاتی هەڵگرتنی داری سەلیب دا.
٧- رزاریی پەتروس.
٨- گالاتیا.
٩- پۆلیۆس II
١٠- پاپا لویسی پادو کاردینال.
١١- دونا لاوتا.



٥٠- رامبرانت "هارمانزون واین راین" *Rembrandt* ( ١٦٠٦ – ١٦٦٩ ز)

خەڵکی وڵاتی هۆڵەندەیە و کوڕی کابرایەکی ئاشەوان بووە هەر لە منداڵییەوە حەزی لە نیگارکێشان کردووە, لە ساڵی ١٦٣٢دا لە شاری ئەمستردام چەند تابلۆیەکی دروست کرد بوو بە هۆی ناوبانگ و ناوباوی. ئەو دە ساڵەی وا لە ئەمستردام بوو کلاسی فێرکردنی نیگارکێشی تەواو کردووە و هەر لەو کاتەش دا نیگاری دەکێشا, تابلۆی بەناوبانگی "تشریح"ی لەم سەردەمەدا کێشاوە.. لە ساڵی ١٦٣٤دا ژنی هێنا و خەزوورەکەی زۆر بە دەسەڵات و دەوڵەمەند بوو ژیانێکی خۆشی رابوارد.
رامبرانت روخساری ژنەکەی زۆر وێنە کردووە. لەم سەردەمەدا ئەم تابلۆوانەی کێشاوە:
١- پیرەژن.
٢- گەورە زادەی سلاڤ.
٣- ژن هێنانی ساسون.

لە ساڵی ١٦٤٢ ز دا ژنەکەی بەسەر منداڵەوە مردووە, دوای ئەوە کەم کەم ناوبانگی کەوتە مەترسییەوە و پێویستی بە پارە زۆر بوو.

کەسایەتیی ئەم هونەرمەندە لە رەوشی کاریدا بووە هیچ هونەرمەندێك وەك ئەو نەیتوانیوە بە چەند جووڵانەوەیێکی هونەریی بچووك بەسەر پەردەی تابلۆوە کەسایەتیی ئەو کەسان دەرخات کە دەیەوێ بەرجەستەیان بکات.

ئەم هونەرمەندە زۆرتر خەڵکی سادە و لە هونەر دوو خۆشیان ویستووە چونکە بە زمانی ئەوانیش زۆر قسەی کردووە و زۆری بۆ ڕوون کردوونەتەوە. وەکو دەڵێن لە ٧٠٠ تابلۆ زیاتری نەخشەکێشاوە.

٥١- رێنوار *Renoir* ( ١٨٤١ – ١٩١٩ ز)

پییێر ئۆگست رێنوار خەڵکی وڵاتی فرانسەیە و یەکێکە لە مامۆستایانی قوتابخانەی (ئەمپرسیونیسم), ئەمانەش ناوی چەند شاکارێکی ئەم هونەرمەندەن:
١- دەعوەتێ لە شەودا.
٢- ئاسیای گالت.

٥٢- رۆسۆ "تیودۆر" Rouseau. T. (١٨١٢ – ١٨٦٧ ز)



خەڵكی فەرەنسە بووە، تەواوی كارەكانی دیمەن كێشانی سروشت بووە. تابلۆی بەناوبانگی "كاروان گەیشتەجێ" هی ئەم هونەرمەندەیە.

٥٣- ریبرا "خۆسە" Ribera

خەڵكی وڵاتی ئیسپانیا بووە، پەیرەوی قوتابخانەی ریالیسم بووە، كارە بەناوبانگەكانی ئەمانەن:

١- پای كچ.

٢- سانت ئانتە.

٣- سانت مادلن.

٥٤- ستین "ژان" Steen (١٦٢٦ – ١٦٧٩)

خەڵكی هۆڵەندە بووە، زۆرتر نیگاری سەرخۆشەكانی دەكێشا، تابلۆ بەناوبانگەكانی ئەمانەن:

١- لەدایك بوونی شازادە.

٢- خێزانی بەختیار.

٣- خێزانی نیگاركێش.

٥٥- ستیڤنس "ئەلفرێد" Stevens (١٨٢٨ – ١٩٠٦)

خەڵكی بەلجیكا بووە و لە پاریس دا ژیاوە، زۆربەی نیگارەكانی دەربارەی ژنانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی دووەمی وڵاتی فەرەنسەیە.



٥٦- سیزان ( پۆل ) Cezann. P. (١٨٣٩ – ١٩٠٦)

ئەم هونەرمەندە بەناوبانگە خەڵكی وڵاتی فەرەنسەیە و یەكێكە لەو هونەرمەندانە كە راپەرینی هونەرییان پێك هێنا و لەو سنوور و چوارچێوە كۆنە بهێنێتە دەرەوە. زۆربەی لە دەرەوەدا نەك لەناو ژوور و كارگەدا دروست كردووە.

٥٧- سانیدەرس ( فرانس ) Sanyders (١٥٧٩ – ١٦٥٧)

خەڵكی ئیسپانیا بووە و خاوەنی ئەم شاكارانەیە:

١-كەڵەكێوی. ٢- راوی ئەسپی واوی.

٣- هێرشی شێرەمێ بۆ سەر بەراز. ٤- سەگەكان لە چێشخانەدا.

٥- شێرەكان بەدوای كەڵەكێویدا. ٦- راوە بەراز.

٥٨- سورڤاژ Survage

لە ساڵی ۱۸۷۹ ز لە فرانسە دا لەدایك بووە و لە بنەڕەت دا خەڵكی وڵاتی رووسیایە خاوەنی شاكاری "ماسی فرۆش" ە.

٥٩- فوكێە (ژان) *Fouquet. G.*
نیگاركێش و مینیا تۆرسازی وڵاتی فرانسە بووە.

٦٠- كاراش (ئانیبال) *Carrache* (١٥٦٠ – ١٦٠٩ ز)
خەڵكی ئیتالیایە و خاوەن تابلۆ ناسراوی (كوشتاری بێ گوناحەكان)ە.

٦١- كارڤاج "میكل" *Carravage* (١٥٧٩ – ١٦٠٩ ز)
نیگارەكانی لە چاو ئەو سەردەم دا بێ پەردە و ئازایانە ناودەبرێت پەیڕەوی قوتابخانەی ریالیسم بووە.

٦٢- كاندنسكی" وایلی" *Kandinsky* (١٨٦٦ – ١٩٤٤ ز)
خەڵكی روسیایە و تابلۆی "بێ بیری دوودڵ" دەستكردی ئەم هونەرمەندەیە.

٦٣- كۆل "كورتت" *Cohl. E. C.*
خەڵكی فرانسە بووە زۆربەی كارەكانی كاریكاتۆر بووە.

٦٤- گروز "باتیست" *Greuze. J. B* (١٧٢٥ – ١٨٠٥)
خەڵكی فرانسەیە، ئەم تابلۆیانە دەستكردی ئەم هونەرمەندەن:

١- دەزگیرانی لادێ.
٢- نەفرینی باوك.
٣- كوڕی تەمێ كراو.
٤- باڵندەی مردوو.
٥- خۆشەویستی كوێر.

٦٥- گرۆس "ژان ئەنتوان بارن" *Gras. J. A. B* (١٧٧١ – ١٨٣٥ ز)
خەڵكی وڵاتی فرانسەیە و یەكێكە لە گەورەترین نیگاركێشەكانی سەردەمی شەڕی ئیمپراتۆری ئەم تابلۆیانە دەستكردی ئەم هونەرمەندەن:

١- تاعوون لێ دراوەكان.
٢- مەیدانی شەڕی ئیلو

٦٦- گۆگان "پۆل" Gauguin. P



خەڵکی فرانسەیە و چوار ساڵە لە وڵاتی پیرو ژیاوە. لە ساڵی ١٨٤٨ ز لە دایك بووە و لە حەڤدە ساڵیدا قوتابخانەی ئاینی ئۆرلیانی تەواو کردووە و پاشان بووە بە مووچە خۆری بانك، لە ٣٥ ساڵان دا تەواوی کاتی خۆی بۆ نیگار کێشان تەرخان کردووە.

٦٧- لەرمیت "لیون" Lhermitte. L (١٨٤٤ – ١٩٢٥ ز)

خەڵکی فرانسە و لە نیگارکێشان دا دیمەن ساز بووە زۆربەی تابلۆکان دەربارەی چوارپێ و میوە و دانیشتن بووە.

٦٨- لیوتار "ژان ئاتێن" Liotard (١٧٠٢ – ١٧٩٠ ز)

خەڵکی سویسرایە و لەبەر ئەوەی تابلۆکانی دەربارەی ڕۆژهەڵات بووە ناویان ناوی نیگارکێشی تورك.

٦٩- ماساکیو "تۆماسۆ" Masaccio. T. M

خەڵکی ئیتالیایە، تابلۆی ئادەم و حەوای لەبەهەشت دەرکراو کارێکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەیە.

٧٠- مانێ "ئەدوارد" Mane. E (١٨٣٢ – ١٨٨٣ ز)

خەڵکی فرانسەیە و تابلۆی (منداڵ و گێلاس)ی بەناوبانگە.

٧١- میکائیل ئنجلو "میکل ئانج" Michel-Ange (١٤٧٥- ١٥٦٤ ز)



لەشاری کابرزی ئیتالیا لە دایك بووە، ئەم هونەرمەندە زۆربەی هونەرە جوانەکانی زانیوە وەکو شاعیری، پەیکەرتاشی، نیگارکێشان، میعماری. بەرهەمە ناسراوەکانی ئەمانەن:

١- پەیکەری مووسا.
٢- پەیکەر داود.
٣- مەسیحی لە داردراو.

لە نیگار کێشان دا:

١- ڕۆژی حەشر.
٢- دروست کردنی جیهان.

لە میعماریدا:

١- کۆشکی فارنەر.
٢- کتێبخانەی فلۆرانسە.

٧٢- میگنار "پییێر" *Mignard* (١٦١٢ – ١٦٩٥ ز)

خەڵکی فەرانسەیە و تابلۆی بەناوبانگی:

١- مریەم و مەسیح.

٢- بۆڵە ترێ.

دەست کردنی ئەم هونەرمەندەن.

٧٣- نیچەر "کاسپار" *Netcher. C* (١٦٣٩ – ١٦٨٤ ز)

خەڵکی ئەڵمانیایە و تابلۆی کچی گەنجی ئەم هونەرمەندە بەناوبانگە.



٧٤- واتیو "ئەنتوان" *Watteau* (١٦٨٤- ١٧٢١ ز)

خەڵکی فەرانسەیە و تابلۆی (جۆپیتەر و ئەنتیوب) دەسکردی ئەوە.

٧٥- ڤالادن "سۆزان" *Valaden*

خەڵکی فەرانسەیە و کاری ناسراوی تابلۆیێکە ناوی (ئاتریلۆ و ئەنکی).

٧٦- ڤالۆتۆن "فلیکس" *Vallotton* (١٨٦٥ – ١٩٢٥ ز)

خەڵکی فەرانسەیە، تابلۆی ناسراوی:

١- ژنی رۆمانی.

٢- کراس سوور.

دەستکردی ئەم هونەرمەندەن.

٧٧- ڤان دەرگوس *Van Der Goes* (١٤٤٥- ١٤٨٢ ز)

خەڵکی هۆڵەندەیە و کاری ناسراوی "مردنی مریەمی عەذرا" یە.



٧٨- ڤان کۆخ "ڤنسان" *Van Cogh. V* (١٨٣٥ – ١٨٩٠ ز)

نیگارکێشێکی بەناوبانگی خەڵکی هۆڵەندەیە و لە منداڵییەوە حەزی لە نیگارکێشان کردووە، لە ساڵی ١٨٨٠ دا تووشی ئاڵۆزییەکە گەورە بووە، دوای تەقالایەکی زۆر بۆ ماوەی پێنج ساڵان تابلۆی زۆری دروست کرد لە بەلجیکا و هۆڵەندەدا. ماوەیەکیش لەگەڵ گۆگانی هونەرمەندی ناسراودا پێکەوە ژیاوەن. لە ئاکام دا کۆتایی بە تەمەنی خۆی هێنا و خۆی کوشت.

**٧٩- ڤلاسکوز دوسیلوا Velasques ( ١٥٩٩ – ١٦٦٠ ز)**

خەڵکی فڕانسەیە و تابلۆی بەناوبانگی (کارگەی ئاسنگەری) دەستکردی ئەم هونەرمەندەیە.

**٧٩- ڤلامینك (مۆریس) Vlaminck. M ( ١٨٧٦ – ١٩٥٨ ز)**

پەیڕەوی شێوە (فۆدیسم)ە و خەڵکی فڕانسەیە. (کۆلیتی قوڕ) دەستکردی ئەم هونەرمەندە ناسراوەیە.

**٨٠- ڤیگنتون "کلۆد" Vignon. C ( ١٥٩٣ – ١٦٧٠ ز)**

خەڵکی وڵاتی فڕانسەیە و بە تابلۆی "کرزوس" بەناوبانگە.

**٨٢- هارپینی "هانری" Harpinies . H ( ١٨١٩ – ١٩١٦ ز)**

خەڵکی وڵاتی فڕانسەیە و زۆربەی نیگارەکانی دەربارەی دیمەنە سروشتییەکانە. ئەمانەش ناوی چەند تابلۆیەکی ناوداری ئەم هونەرمەندەن.

١- دیمەنی دورگەی کابری.
٢- دیمەنی لوتکەی بالاتن.
٣- کێویی کەژی ڤیزو.

**٨٣- هارت Hart. S. ( ١٨٠٦ – ١٨٨١ ز)**

خەڵکی وڵاتی بەریتانیایە و لە شاری بلیموت لە دایك بووە، لە سەرەتاوە خەریکی نیگاری مینیاتور بوو بەڵام لە دواییدا دەستی دایە نەخشاندنی نیگاری شەڕە مێژووییەکان . ئەمەش ناوی چەند تابلۆیەکی ناسراوی ئەم هونەرمەندەن:

١- ئانا.
٢- دایکی سامائیل.
٣- قەشەی گەورە.
٤- مەرگی خواوەند.

**٨٤- هالس "فرانس" Hals. F ( ١٥٨٤ – ١٦٦٦ ز)**

نیگارکێشێکی ناوداری هۆڵەندە بووە، ئەمەش ناوی چەند تابلۆیەکی ناسراوی ئەم هونرمەندیە:

١- کچی بۆهیمی.
٢- شێت.

# تابلۆ ناودارەکانی جیهان

**تابلۆ:**

لە دنیای ئەمڕۆدا چەند تابلۆیێک هەیە بە ئەندازەیەک بەناوبانگن بوونەتە سامانی مرۆڤایەتی و لە خاوەنێتی تاکە گەلێک یان نەتەوەیەک دەرچوون. ئەوەندە بە نرخن کە نایەنە کڕین و فرۆشتن. جارجارێک تابلۆیێک دەدزرێت ئەم دزییە هونەرییە تەواوی دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی جیهان بەخۆیەوە خەریک دەکات و لە ئاکامیش دا دزییەکە هەر دەردەکەوێت.

جا بۆ خوێنەوارانی ئازیز ناوی زۆرۆ لەو تابلۆ ناودارانەم گلێر کردوەتەوە بۆ ناسینیان و ئەگەر ڕێیان بکەوێتە وڵاتانی ڕۆژاوا بچنە مۆزەخانەکان و ببینن چۆن ئەم تابلۆیانە بە چ ڕێز و حورمەتێکەوە هەڵواسراون:

| ناوی تابلۆ | ناوی نیگارکێش |
|---|---|
| ئاو | بوگرو |
| ئاگر لە شاردا | روفائیل |
| ئادەم و حەوا | تنتوورە |
| ئادەم و حوای دەرکراو | ماساسیۆ |
| ئارایش | بوتار |
| ئازادیی ڕابەری خەڵك | دیلا کروا |
| ئاشبەزخانە | لوت |
| ئاشنایی لەگەڵ پەرستگادا | ڤارن |
| ئۆلیس لە وڵاتی عەجایب دا | شاری |
| ئالین شادیکو | ئوگست رینوار |
| ئاسنگەری | دوسیلو |
| ئایەتی کاثولیك | موریس دنی |
| ئاتیللو دزمونا | پیکر |
| ئۆزیب | ڤلاسکویز |
| ئەسپە شینە گەورەکان | مارك |
| ئەسپە زەردەکان | مارك |
| ئەسپی سك دڕیاو | پیکاسۆ |
| ئستراڤینسکی | پیکاسۆ |
| ئیسفەنج | لۆتریك |
| ئیلهامی شاعیر | نیکۆلای پۆسن |
| ئوتریلو و ئەنکی | ڤالادن |
| ئەصەد | راساوی |
| ئەستێرەی دەریایی | کالدر |
| ئەم جیهانە هەڵساوە | گرین |
| ئیڤانی ترسێنەر و کوڕەکەی | ئیلیا ڕپین |

| | |
|---|---|
| بابا مرۆڤی نوێ | مایسترمان |
| باپیره | فینش |
| باخی درندان | پوش |
| باخەوانی جوان | روفائیل |
| باڵسوار | رینوار |
| باڵزاك | پیکاسۆ |
| بەبر | مارك |
| بەسەر شاردا | شاگال |
| بزن | پیکاسۆ |
| بەردو سەرو | پل گله |
| بەندەری دیب | فری نیر |
| بەندەری مارسی کۆن | مارکه |
| بویسان | پیسارۆ |
| بولوار ماولن | مارکه |
| بەهار | لیب شیتز |
| بەهار | بوتی چلی |
| بەهاری دۆڵ | وود |
| بێ سەبری | گۆگان |
| بێ سەبری | ئەرشیل گورکی |
| بێ بیری دوودڵ | کاندنسکی |
| باڵندە | هنری مۆر |
| ببوو | پیکاسۆ |
| بەندی | پل دلوو |
| بەلەم | براك |
| بەلەم لێ خورانی ڤۆلگا | ئیلیا رپین |
| بەلەمەکەی کیلۆپاترا | پوشان |
| بزەی ژۆکۆندا (مۆنالیزا) | لیۆناردۆ داڤنشی |
| پیاوێك لە کەناری رووباردا | مایوئان |
| پەردەی نیگار | روفائیل |
| پاریس بە دەستی لەشکری عەبدالقادرەوە | هوراس |
| پەرستنی شوانەکان | فیرانزودی |
| پرد | تیودور رۆسۆ |
| پردی ویست منستەر | درن |
| پەیام بەر | نولده |
| پیری گیوم ئل | سالڤادۆر دالی |
| پێش رۆیشتنە سەر شانۆ | بۆمبوا |
| پێشکەوتوو | رنه مارگریت |

| | |
|---|---|
| پیکاسۆ | گری |
| پەیکەری ڤینۆس | براکس تل |
| پەیکی ڕووت | گۆگان |
| پینسکی | لاورنس |
| پیرۆ | گری |
| پەتاتە خۆران | ڤان کۆخ |
| پیانۆ ژەن | سیزان |
| پیاو | هەمسکرك |
| پیاوی جگەرە بەدەم | بۆرس |
| پیاوی نەبینراو | دالی |
| تاب | رینوار |
| تاج لەسەر نانی مریەم | پولیولو |
| تەصویر | ماسون |
| تەنهایی | شاگال |
| تنیس | بومایستر |
| تۆپ و بووکڵە | بل گلە |
| تولدەنوسی | بوتوچلی |
| تاریك و ڕووناکی | کاندنسکی |
| جادە | بیسارۆ |
| جادەی بازبارو | مۆنێ |
| جادەی گۆڕستانی ئۆرال | گۆگان |
| جومعە بازار | داڤید ئول |
| جەنگەل | لام |
| جوانییەکانی بەرەبەیان | بیلەر |
| جۆرجی قەدیس | روفائیل |
| جۆرجی قەدیس | دناتللو |
| چاپوك سواری گەورە | دوفی |
| چەتر باز | رینوار |
| چاوگەی گوناحەکان | گۆژن |
| چایخانە لە شەودا | ڤان کۆخ |
| حوشتر مر (نەعامە) | پیکاسۆ |
| خولقاندنی جیهان | میکائیل ئنجیلۆ |
| خێزان | پیکاسۆ |
| خانووی ئانروس | ڤان کۆخ |
| خانووی قەنارە دراو | سیزان |
| خەتی سپی | پرێر |
| خۆشتر ژیان | ماتیس |
| خەو | ماتیس |

| | |
|---|---|
| خەوی شەوێکی هاوین | رایدەر |
| خۆ شۆردن | لوتریك |
| خۆ شۆردن | ئەنگر |
| خۆشۆرەکان | سیزان |
| خۆشۆرەکان | پیکاسۆ |
| داود | مایکل ئەنجیلۆ |
| دوا حیکمەت | میکائیل ئینجلۆ |
| دوا نان خواردن | لیۆنارد داڤنشی |
| دەرچوون لە قوتابخانە | نوبار |
| دالی و کالا | سلڤادۆر دالی |
| دانتی ویرژیل | دیلا کروا |
| درەخت لە ژووردا | گیریکۆ |
| دەریا | موندریان |
| دوعای خەیر | شاردن |
| دوا دوعا | جۆرج ژریو |
| دوو شەڕکەر | خبیورجی |
| داگیرکردنی ئاسمان | دولافرنە |
| دوو کەروێشك | پلینی |
| دوو کچی سێرك | رینوار |
| دوو دۆست | پیکاسۆ |
| دوو ژن | ڤلادون |
| دوو ژن | پیکاسۆ |
| دوو بچکۆلە | پین ین |
| دەرداوی | روئو |
| دوسەدو چل و شەش | کاپکەر |
| دادگای بارین | روبنسون |
| دیمەن | پلوم |
| دیمەن | هانری روسو |
| دیمەن | پیسارۆ |
| دیمەنی پاریس | گری |
| دیمەن | ویلون |
| دابەزین لە سەلیب | لورنزنی |
| دانیشتووی رووت | مودیلیانی |
| رامبرانت و ژنی گەنج | پیکاسۆ |
| رامبرانت و ژنەکەی | رامبرانت |
| رۆژی هەینی لە دورگەی گرانژان | سورا |
| رۆژی حەشر | میکائیل ئنجیلۆ |
| رۆمەن لاکو | رینوار |

| | |
|---|---|
| زەرافەی سووتاو | پیکاسۆ |
| زستان | رونۆ |
| ژمارە بیست وچوار | فلایشمەن |
| ژووری بەر چایی | پوتار |
| ژن | فۆترێە |
| ژن | رینولْد |
| ژنی راکشاو | پیکاسۆ |
| ژنی وەستاو | پیکاسۆ |
| ژنی ئیتالیایی | پیکاسۆ |
| ژن لەگەڵ کۆتردا | لۆرانس |
| ژنێك بە شەبقەیەکی رەشەوە | مونێ |
| ژنێك بە کراسێکی سپییەوە | پیکاسۆ |
| ژنی رووت و قووت | براك |
| ژیانی خەڵکی هەژار | فینش |
| ژنی کڵاودار | براك |
| ژنی رۆمانی بە کراسی سوورەوە | ڤالوتون |
| ژنێك بەسەر مۆبیلیاوە | پیکاسۆ |
| ژنێکی گریاو | پیکاسۆ |
| ژن و ئاوێنە | رینوار |
| ژنێکی مەڕاکیشی | کارس |
| ژنی دانیشتوو | پیکاسۆ |
| ژن و سەتل | مالویچ |
| ژنێك لەگەڵ مادۆلین دا | براك |
| ژنێك لەناو دیمەن دا | ئەدگار دیگا |
| ژنێك خۆی دەشوات | پیکاسۆ |
| ژنێك سەر و قژی چاك دەکات | پیکاسۆ |
| ژنێك نانی هەڵگرتووە | پیکاسۆ |
| ژۆکۆند و کلیل | فرناند لزر |
| سەرەتای بەرامبەرکێ | فراگو نارد |
| سەلیب هەڵگر | بوش |
| سەمای هەڵۆ | ئوگوی |
| سەماکەران خۆیان دەڕازێننەوە | دیگا |
| ساختمانی باسیم | پیکاسۆ |
| ساڵی ژن هێنان | شاگال |
| سەربازی پارێزەر | ژریکو |
| سەربا و پایب | لەجر |
| سەرزەویی خۆش | مۆلنار |
| سەری ژن | پیکاسۆ |

| | |
|---|---|
| سەری منداڵ | گروز |
| سەری گا | پیکاسۆ |
| سەری گا | بل گله |
| سەرگەرمی | گۆگان |
| سەری یۆحەننای قەدیس | دوناتلۆ |
| سەگ و قەرێتە | گیاکوموبالا |
| سەنت ماولی | ریبیرا |
| سان جورجر ئەژدیها | روفائیل |
| سوارەی پۆلەندەیی | رامبرانت |
| سویتی ژدیم | رامبرانت |
| سێ ژن لە کەناری سەرچاوەدا | پیکاسۆ |
| سێ جوانکیلە | لاگرته |
| سروشتی مردوو | موراندی |
| سروشتی مردوو | پیکاسۆ |
| سروشتی مردوو | براك |
| سەرکەوتنی جۆلیۆس قەیسەر | مانتینا |
| شتەکانی ئەولای سروشت | موراندای |
| شت و دەوری شیر | پۆل سیزان |
| شەڕ | کوریه |
| شەڕ | دواسمت |
| شەڕ | پیکاسۆ |
| شەڕ | هانری رۆسۆ |
| شەڕ | پالاك |
| شەڕ | بین بن |
| شەڕی ماسییان | ماسون |
| شوانی بێ ئامان | بروگل |
| شادە خواتەوە | جوردانس |
| غەمی شا | ماتیس |
| عەرەبانەی هەتاو | لاڤوس |
| فوتبال | لوت |
| ڤینۆسی خەوتوو | تیسین |
| ڤینۆسی خەوتوو | پوسن |
| ڤینۆسی خەوتوو | رسل ولو |
| ڤوللەی ئیڤل | دلونای |
| قومار باز | پیکاسۆ |
| قوتابخانەی ئەثینا | روفائیل |
| قەسابی | پوشان |
| قەوارە | ڤیون |

| | |
|---|---|
| قەراغی شارێکی شێت | سلڤادۆر دالی |
| موری نیگارکێش لە دوو ساڵان دا | پیکاسۆ |
| کورێك کە ئەسپێکی داوە لەبەر | پیکاسۆ |
| کەڵەشێر | نال کوت |
| کەڵەشێر | پیکاسۆ |
| کچی گەنج و مۆم | جۆرج دولاتور |
| کچی گەنج | نەچر |
| کچی شین پۆش | مودیلیانی |
| کچی کتێب خوێن | ماتیس |
| کچ و گوڵدان | ئەدگار دیگا |
| کچێك بەرامبەر ئاوێنە | پیکاسۆ |
| کچێکی ئینگلیز | ماتیس |
| کۆگای کڵاوفرۆش | ئەدگار دیگا |
| کۆشکی کۆن | هانری رۆژ |
| کارگای نیگارکێش | جان بوی |
| کوشتنی بێ گوناحەکان | کاراس |
| کەناری دەریا | وگا |
| گررزوس | ویگنون |
| گا بازی | گویا |
| گاکان | پیکاسۆ |
| گەڕانی خێزان | پل گلە |
| گرونیکا | پیکاسۆ |
| گوڵدان و گوڵ | فلادیمتیگ |
| گیتار | پیکاسۆ |
| لە دەوروبەری ماسیدا | پل گلە |
| لە بێشەدا | مارشان |
| لە بەرامبەر سۆبەدا | لونارد |
| لە جووڵانەوەدا | ورنەر |
| لە خەیاتیدا | کارل سمیث |
| لیون | روفائیل |
| لە ژێر چاودێری دا | ئیلیا رپین |
| مەلەکەرەکان | پول سیزان |
| مەلەکەرەکان | ئۆگست رینوار |
| مرۆڤ و قەرەوڵ | شاگال |
| منداڵ و ئەسپ | پیکاسۆ |
| منداڵ و گێلاس | میرانلو |
| منداڵ ترێ دەخۆن | گوسن |
| مەمکان و گوڵی سوور | بالاك |

| | |
|---|---|
| مێردەزمە | داڤید |
| میللەتی سابین | سورواج |
| ماسی فرۆش | لوی |
| مردنی ساریدن | واندرگۆ |
| مردنی مریەمی عەذرا | مانتینیا |
| مردنی مەسیح | پل گلە |
| مردن و ئاگر | پل گلە |
| مۆنالیزا | لیوناردۆ دافنشی |
| مامۆستای سەما | کیورك |
| میوە و ژن و گوڵ | رینوار |
| وەستاوی رووت | میرۆ |
| وێنەیەك لە دەریادا | پیکاسۆ |
| وێنەیەك لە کتێبەکانی بالزاك کە نەناسراوە | پیکاسۆ |
| وێنەی ژن | کوسکا |
| وژنیی سەگ | تربورخ |
| یاریی چاو کوێری | گویا |
| یاریی پرمەترسی | سلڤادۆر دالی |
| یەك شەممە بازار | سورا |
| هاوئاهەنگی | نوزانفان |
| هیچ لە بەرانەبوو (رووت) | پاسن |
| هیچ لەبەرا نەبوو (رووت) | ماکس تلیمان |
| هێلین و پاریس | داود |

******************************************

# هەندێك لە تابلۆ بەناوبانگەکانی جیهان





دیمەنی سان ریم
«ڤان کوگ»



مۆنالیزا-
لیوناردۆ دافنشی



ڤینۆسی نووستوو - جیورجونی

*The Museum of Museums*



# Great Artists


Cimabue


Duccio


Giotto


Simone Martini


Fra Angelico


Masaccio


Antonello da Messina


Botticelli


Paolo Uccello


Piero della Francesca


Mantegna


Bellini


Leonardo


Michelangelo


Raphael


Giorgione


Correggio


Titian


Tintoretto


Veronese


Caravaggio


Guido Reni


Tiepolo


Canaletto



سوێندی برایانی هۆراس- دافید-



دەموچاوێکی پاک
فیرمیر



خانمانی ئەفینیۆن- بیکاسۆ



دوو منداڵ لە ترێ و شەمامە ئەخۆن
مۆریللۆ

# زاراوە و فۆرمەکانی مۆسیقا

## زاراوەکانی مۆسیقا

١. مۆسیقا *Musique*
واتە زانیاریی گیانی و لە وشەی Muse دوە وەرگیراوە کە ناوی فریشتەکانی دەوروبەری ئەپۆلۆنە کە لە کەژی پارناس دا دەژین و تێکڕا نۆ فریشتەن و هەر یەکێکیان سەرپەرشتی بەشێك لە هونەرە جوانەکان دەکەن.

٢. نوت *Nunt*
واتە ئەلف و بێی تایبەتیی هونەری مۆسیقا کە بریتییە لە حەوت هەنگاو.

٣. موزیکال *Musical*
واتە لەگەڵ مۆسیقادا

٤. تۆن *Ton*
یەکەیەکی دەنگییە لەنێوان دوو (نوت) پشتی سەری یەك.

٥. مەقام یان تونالیتە *Tonalite*
هەر کاتێك پارچەیەکی مۆسیقا بە پێی نوتێکی تایبەتی ئەنجام درا دەگوترێت ئەو ئاهەنگە تونالیتەی هەیە.

٦. مۆدو لاسیۆن *Modulation*
واتا گۆڕینی مەقام یان تونالیتە.

٧. ئاکرد *Accord*
تێکەڵیی چەند دەنگ بە پێی ئاهەنگێکی تایبەتی پێی دەگوترێ ئاکرد.

٨. ئەوا یان میلۆدی
مایەی ڕەگەزی مۆسیقا کە عیبارەت بێت لە دەنگی هاوسەنگ و پشتی سەری یەك.

٩. پولیفۆن *Polyphone*
میلۆدییەك کە لە چەند ساز و ئاوازێك پێك هاتبێت.

١٠. ریتم *Rythme*
لە مۆسیقادا واتە ڕێك لێدانی ئاهەنگ و بۆ ڕێك خستنی ئەوای مۆسیقا بەکار دەبرێت.

١١. هارمۆنی *Harmonie*
چەند فەرمان و یاسایەکە لەنێوان چەن دەنگ دا کە دەبێتە هۆی هاونانگیی تێکڕایی دەنگەکان.

١٢. ئاریا *Aria*
بە بەشی بنەڕەتی ئۆپرا دەڵێن ئاریا.

١٣. ئەرکستر فیلارمۆنیک *Philharmonique*
ناوی ئەو ئۆرکسترەیە کە لەگەڵ ئەنجوومەنی لایەنگیرانی مۆسیقا پەیوەستە.

١٤. فینال *Final*
واتە دوایی یان کۆتایی لە مۆسیقادا.

١٥. فانتێزی *Fantaisie*
لە پارچەیێکی مۆسیقا دەگوترێت هەست بجووڵێنێت.

١٦. کۆر *Choeur*
واتە ئاوازی تێکڕایی.

## فۆرمەکانی مۆسیقا

١- ئۆپەرا *Opera*
شانۆییەکە لەگەڵ ئاوازدا بە هاوکاریی ئۆکسترای مۆسیقا ئەنجام دەدرێت. ئۆپەراش چەند جۆر و بەشێکە.

ا. ئۆپەرای سەریا *Opera- Seria*
ئەم شانۆییە زۆرتر لە داستان و ئەفسانە و ڕووداوە مێژووییەکان سوود وەردەگرێت و تێکەڵ بە ئاوازە.

ب - ئۆپەرای بوفا *Opera-Buffa*
جۆرێکە لە ئۆپەرای زۆر سادە و زۆرتر بۆ رابواردنە.

ج - کۆمیک:
جۆرێکی تری ئۆپەرایی بە شێوەی جیاواز لەو دوانە.

٢- سویت *Suite*
بە چەند سەمایەکی کلاسیک دەگوترێت کە زۆر ریتمی تێدا نییە.

٣- سونات Sonate

بە فۆرمێك لە مۆسیقا دەڵێن كە یەك ساز یان دوو ساز ئەنجامی دەدات.

٤- سیمفۆنی Symphonie

فۆرمێكە كە بۆ ئۆركسترێكی دانراوە و سیمفۆنیا چوار بەشە و بە ئەنجام دانی ئەو فۆرمە تەواوی ئۆركسترەكە دەبێت بە پێی دانانی ئەو فۆرمە بەشداری بكات.

٥- مۆسیقای مەجلیسی:

ئەم جۆرە مۆسیقایە بۆ دانیشتنی بچووك تەرخان كراوە لە سەدەی هەژدەهەم دا باوی هەبووە، دەس ڕۆیشتووەكان لە كۆشكەكانیان دا سوودیان لێ وەرگرتووە و بووە بە باو.

# ناسراوانی مۆسیقای کلاسیکیی جیهان

**١- ئالپنیس ١٨٦٠ – ١٩٠٩ ز**
گەورەترین پیانۆ ژەنی ئیسپانیا بووە و بەناوبانگترین پارچە مۆسیقاکانی بەناوی (ئیبەریا) و (کاتە لۆنا)یە.

**٢- ئانتیل ( جۆرج ) *Antel***
لە ساڵی ١٩٠٠ ز لەدایك بووە. دوای ئەوەی ئۆپەرای ئەولای ئەتڵەسی دانا شۆرەتی بە ئەوروپادا بڵاو بوودوە. سیمفۆنی (درفا) و مۆسیقای بۆ ئەدیبۆس لە پارچە بەناوبانگەکانی ئەم هونەرمەندەن.

**٣- ئاسمتانا "بدریش" *Bedrich Smetona***
لە ساڵی ١٨٩٤ز دا لە چیکۆسلۆڤاگیادا لەدایك بووە، لە بنەماڵەیەکی ناودنـدی لە شاری براگ خوێندوویەتی. لە ساڵی ١٨٥٦ بووە بە رابەری ئۆکستری سوید و بە یادی خۆشەویستیی وڵاتەکەیەوە پارچەیەکی ناوداری بەناوی "بیرەوەریی بۆهیم" داناوە. پاشان گەڕایەوە شاری براگ و ئۆپەرای بەناوبانگی براندنبورگی دانا، دوا بە دوای ئەودا (بووکی فرۆشراوی) دانا، هەروەها چەند سیمفۆنیاییکی ناوداری بەناوی (مۆلدافیا ولاتەکەم) داناوە. لە ساڵی ١٨٩٤ ز دا مردووە.

**٤- ئوستاد عەلی ئەکبەرخان:**
لە ساڵی ١٩٢٢ ز دا لە شاری جودپوری هیندستان لە دایك بووە، ئەم هونەرمەندە لە پێنج ساڵیدا دەستی کردووە بە فێربوونی مۆسیقا و خاوەنی ناوبانگێکی فراوانە. زۆرتر پەیڕەوی کلاسی مۆسیقازانی سەدەی سیانزدەهەمی سەردەمی مەغۆلەکان بووە.
بەرهەمی ناوداری ئەم هونەرمەندە (راگای رۆژ و شەو)ە.

**٥- سکریابین "ئەلکساندەر" ١٨٧٢ – ١٩١٥ ز**
بە منداڵی دایکی مردووە، خەڵکی روسیایە، لە کۆنسرت ڤتواری مۆسکۆدا دامەزراوە، بووە بە مامۆستای پیانۆ. ئەمانەش ناوی بەرهەمە ناسراوەکانی ئەم هونەرمەندەن.

١- سیمفۆنیی سێیەم "هۆنراوەی خوایانە"
٢- سیمفۆنیی چوارەم "هۆنراوەی شادی دەر"
٣- هۆنراوەی شەیتانی



**٦- شتراوس "یۆهان" ١٨٢٥ – ١٨٩٩ ز**
کوڕی پیاوێکی مۆسیقازان بووە، توانی شێوەی ڤالس بگۆڕێت و زیاد لە چوارسەد ڤالسی داناوە خەڵکی ئەمسا بووە. پارچە مۆسیقا بەناوبانگەکانی ئەمانەن:

١- دانووبی شین
٢- ژن
٣- شەراب و ئاواز
٤- هەزارویەك شەو

## ٧- ئۆفنباخ "جان" ١٨١٩ – ١٨٨١ ز



خەڵکی وڵاتی ئەڵمانیایە، ئەمەش ناوی چەند چارچە مۆسیقای ئەم هونەرمەندەن:

١- ئورفە لە دۆزەخ دا
٢- ژیانی پاریسی

## ٨- باخ "یۆهان" ١٦٨٥ – ١٧٥٠ ز



لە شاری ئیزباخ لەدایك بووە، باوكی مۆسیقاژەن بووە، لە تەمەنی دە ساڵان دا دایك و باوكی مردوون. برا گەورەكەی بەخێوی دەكات. كچی مامی خۆی دەهێنێ و لە ساڵی ١٧٠٨ دا دەبێتە سەرپەرشتی ئۆكستری دوك ساكس لەم سەردەمەدا لەگەڵ لویس مارشانی مۆسیقازانی فرانسەیی لەسەر جوان لێدان گرە و دەكەن، بەڵام پێش رۆژێك لە گرەوەكە مارشان شار بەجێدەهێڵێت.

لەشاری (گوتن)دا دوو كونسرتی بەناوبانگ دادەنێت بەناوی
١- براندنبورگ
٢- سونیتەكانی ئۆركستر.

لە ساڵی ١٧٢٠ ژنەكەی دەمرێت، دیسان ژن دەهێنێتەوە، ئەم جارە ئانا ماگدالینای گۆرانی بێژی سوپرانۆ دەهێنێ كە چواردە منداڵی دەبێت و دەكرێت بە رابەری ئۆرگانیستی كڵێسای "سەن تۆماس" و هەر لەو شارەدا چەند ئاوازی ئاینی بەناوبانگ دادەنێ، لەوانە:

١- بێ ئەی مەسیح
٢- موتت روح
٣- مسی گەورە

## ٩- بیتهۆڤن "لودڤیك ڤان" ١٧٧٠ – ١٨٢٦ ز



لە شاری بۆنی ئەڵمانیادا لەدایك بووە، لە رەگەزا خەڵكی هۆڵەندە بووە باوكی لە كۆشكی میری كولۆن دا گۆرانیبێژ بووە بەڵام پیاوێكی مەست و سەرسەری، كاتێك ژنی هێنا بێوەژنێكی بەناوی "ماگدالینا" مارەكرد و سێ منداڵی لێ بوو كە بیتهۆڤن گەورەكەیان بوو.

بیتهۆڤن باوكی فێری پیانۆلێدانی كردووە، بەڵام ساڵی ١٧٨٧ بە یاریدەی ڤالدشتاین توانیویەتی بچێتە شاری ڤیەنا و بگاتە خزمەتی (مۆتسارت). لە ساڵی ١٧٩٢ دا كاتێك سپای ناپلیۆن دوڵی راینی داگیركردووە بیتهۆڤن شارەكەی بەجێهێشتووە و دیسان دەگەرێتەوە ڤیەنا، لەبەر ئەوەی مامۆستا ئازیزەكەی (مۆتسارت) مردبوو لەلای (هایدن) خۆی خەریك كرد. بەڵام لای ئەماوە چووە لای (ئەلبرختسبرگر) و لە ساڵی ١٧٩٤ دا شازادە لیخۆنسكی بردییە كۆشكی خۆیەوە، لەم كاتەدا لەگەڵ خێزانی (برۆنسویك)دا بووە دۆست و دەرسی بە كچانی ئەم بنەماڵەیە گوتووە و لەگەڵ جۆلیتا گویچیاردی كە كچێكی ئەو بنەماڵەیە بووە پەیمانی دڵداری دەبەستێت، بەڵام جۆلیتا شوو بە یەكێكی دی كە دەكات. كەم كەم گوێیەكانی بیتهۆڤن گران دەبن تا لە ئاكام دا كەڕ دەبێت. لە ساڵی ١٨٣٣دا گەورەترین بەرهەمی بەناوی میساسولوتیس و سیمفۆنی نۆهەم دادەنێت. دەست كردە رەنگینەكانی ئەم بلیمەتە ئەمانەن:

١ سوناتی مانگەشەو
٢- سوناتی پاستورال
٣- سیمفۆنی پێنجەم
٤ وێرانەکانی ئەڤینا
٥ ئۆپەرای فیدیلۆ

**١٠- براهمس (یوهانس) ١٨٣٣ – ١٨٩٧ ز**



لە شاری هامبۆرگی ئەڵمانیا لە خێزانێکی دەست تەنك و هەژار لەدایك بووە, لە شەش ساڵیدا پیانۆ فێربووە. لە دە ساڵیدا چووەتە لای مدار کردووە بە مۆسیقا. لەگەڵ شۆمانی مامۆستای و هاورێدا ماوەیەك ژیاوە, حەزی لە ژنەکەی شۆمانی کردووە, بەلام لەبەر ئەوەی لێی گەورەتر بووە شووی پێ نەکردووە. کارێکی ناوداری ئەم هونەرمەندە (کۆنسرتۆ پیانۆی ژمارە یەك)ە.

**١١- چایکۆڤسکی (پیوتەر) ١٨٤٠ – ١٨٩٣ ز**



لە شاری (ڤیتکیتك)ی روسیا لەدایك بووە و لە دە ساڵیدا رۆیشتووەتە زانکۆوە (بەشی یاسا) و لە نۆزدە ساڵیدا تەواوی کردووە, لە ساڵی ١٨٦٥ دا چووەتە کنسەر ڤاتواری پەتروسبورگ و تەواوی کردووە و بووە بە مامۆستای کنسەرڤاتواری مۆسکۆ. لە ساڵی ١٨٦٨ ز دا پۆلێك هونەرمەندی فرانسە رۆیشتوون بۆ مۆسکۆ بۆ پێش کەش کردنی ئۆپەرای (ناتیللو) لە مۆسکۆ, ئەویش حەز لە ژنی یەکێکیان دەکات و ڤالسێکی بۆ دادەنێت. لە ساڵی ١٨٧٢ دا نورتور تومان, سیمفۆنیای ژمارە ٢ و (٣) دادەنێت. بەردو پاریس دەچێت و لەوێدا چوارچێوەی (دەریاچەی قوول) دادەنێت. ناوبانگی چایکۆڤسکی بوو بەهۆی ئەوەی ژنێکی (نادر دافن ماك) ناوی دەوڵەمەند دەستی بگرێت و بیپارێزێت و لەناو کۆمەڵی هونەرمەندان دا دەریخات.. ئەوەش بزانە ئەم دۆستییە هەر بە نامە بووە و قەت یەکتریان نەدیوە.

لە ساڵی ١٨٧٦ ز دا رۆژێك کچێکی بیست ساڵان دەچێتە ماڵی چایکۆفسکییەوە پێی دەڵێ دەمێکە عاشقی بووە و دەیەوێ شووی پێبکات, ئەویش بێ ئەم لا و ئەولا مارەی کردووە, بەلام دوای یەك مانگ لێك جیابوونەتەوە.

**١٢- خاچاتۆریان (ئارام)**



لە ساڵی ١٩٠٤ ز لە شاری تفلیسی روسیادا لەدایك بووە و رۆڵەی خێزانێکی ئەرمەنیی کتێب فرۆشی هەژار بوو. لە ساڵی ١٩٢٢ دا چووەتە شاری مۆسکۆ و لە قوتابخانەی مۆسیقا خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٩٢٤ ز دا کنسرتۆیەکی بۆ پیانۆ دروست کرد و لە ساڵانی شەڕی دووەم دا (بالێت گایانە)ی دروست کردووە, زۆربەی کارەکانی (خاچا) گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی ئەرمەنییە.

١٣- شوبەرت ( فرانتس ) ١٧٩٧ – ١٨٢٨



لە نزیك شاری ڤیەنا لە نەمسادا لەدایك بووە, كوڕی مامۆستایەكی هەژار و دەست نەڕۆیشتوو بوو, پێنج ساڵ لە قوتابخانەی "كنوبك" دەرسی مۆسیقای خوێندووە. لەو قوتابخانەیەدا كە باوكی مامۆستا بووە دامەزراوە و هەمیشە هەر هەژار بووە. ڕۆژان ناهەنگی ساز كردووە و شەوانیش لەگەڵ دۆستانیدا لە ڕابواردن دابووە و ئەوەی نەدەزانی كە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەرهەمەكانی ئاوا جیهان گیر و ناودار دەبن. زۆربەی دانراوەكانی دەربارەی دڵداری بووە ئەگەر چی قەت دڵداریشی نەكردووە تا زیندوو بوو هیچ كەس ڕێزی نە خۆی و نە هونەرەكەی نەدەگرت.

١٤- شوپان ( فردریك ) ١٨١٠ – ١٨٤٠ ز



لە نزیكی شاری وارشۆ لە پۆڵەندە لە دایك بووە, باوكی فرانسەیی بووە لە پۆڵەندە دا ژیاوە. لەبەردەم قەیسەری ڕووسیادا پیانۆی لیداوە و ئەنگوستیلەی خۆی پێ بەخشیوە. لەگەڵ (لیست)ی هونەرمەندا دۆست بووە و حەز لە جۆرج ساندی نووسەر دەكات بەڵام بەیەك ناگەن.

١٥- شۆمان ( رۆبەرت ) ١٨١٠ – ١٨٥٦ ز



كوڕی كتێب فرۆشێكی خەڵكی ئەڵمانیا بوو, دوای مردنی باوكی لە ساڵی ١٧٢٨دا چووەتە زانكۆ لە شاری لایبزیك. عاشقی ژنێك بووە بەناوی كلارا و مارەی كردووە, دەیویست لە ڕشتەی پیانۆدا بگاتە لوتكە بەڵام پەنجەكانی نەخۆش كەوتن.. ئەگەر چی باوەڕنامەی دكتۆرای فەلسەفی وەرگرتبوو بەڵام هەر خەریكی مۆسیقا بوو, تا ساڵی ١٨٤٩ لە سی پارچە مۆسیقای نایاب زیاتری داناوە كە "دیمەنیجەنگەل" شاتەڵەكەیانە. كلاراش لە تەواوی كۆنسێرتەكانی شۆمان دا پیانۆی لیداوە.

لە شاری دوسڵدوف لە ساڵی ١٨٥٠ دا سیمفۆنێی (ڕێنان) و نورتورەكانی "جۆل سزار" و "هێرمان" و "درتە"ی داناوە, لە دوا ژیانی دا كەم كەم نەخۆشیی دەمار كاری لی دەكات تا شەوێك لە ساڵی ١٨٥٤دا دەیەوێ خۆی بخاتە ڕووباری (ڕاین)ەوە, بەڵام ڕزگاری دەكەن.. ئیتر تووشی شێتی و بێ دەبێت, لە ئاكام دا لە شێتخانە دەمرێت.



١٦- لیست "فرانز" ١٨١١ – ١٨٨٦ ز

كوڕی كابرایێكی پۆڵەندیی خزمەكانی شازادەیك بووە شازادەكە دەینێرێ بۆ شاری پەتروسبورگ تا فێری مۆسیقا بێت. دوای ئەمەش چووەتە ڤیەنا بۆ فێربوونی پیانۆ.. دەعوەت كراوە بۆ بریتانیا بۆ ئاهەنگی مۆسیقا و پیانۆلێدان لە

بەردەم مەلیك جۆرجی چوارەم دا.

لیست عاشقی ژنێکی ناسراو دەبێت بەناوی (داگۆ) کە مێردەکەی بەجێ دەهێڵێت و لەگەڵ لیست دا دە ساڵ پێکەوە ژیان و سێ منداڵیان بوو یەکێکیان کچ بوو کە لە دواییدا بووە ژنی (ڤاگنەر).

### ١٧ مۆتسارت "ولفگانگ" ١٧٥٧ ١٧٩١ ز



لە شاری سالزبورگ لە نەمسادا لە دایك بووە، کوڕی کابرایێکی مۆسیقا زان بووە. لە منداڵییەوە بەهرەی مۆسیقا و ئاواز دانانی لێ دیاری داوە. یەکەمین بەرهەمی (چوار سونات بۆ کلاوسن) بووە. لە گەشتێك دا چووە بۆ بەریتانیا لەگەڵ کچە بچووکەکەی (باخ) دا بەناوی کریستیان ئاشنا بووە، یەکەمین ئۆپەرایەکی لە شاری ڤیەنا ساز کردووە بەناوی (کچە سادەکە) کە تەمەنی دوانزدە ساڵان بووە. پاشان سیمفۆنیی ٣١ بەناوی (پاریس) ناوبانگی بڵاوکردوەتەوە، ساڵی ١٧٧٩ بە ساڵی ناوبانگی ئەم هونەرمەندە دەژمێردرێت، یەکەمین ئۆپەرای گەورەی بەناوی (ئەیدومینە) داناوە. لە ساڵی ١٧٧٩ دا ژنی هێنا. ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی رەنگینی مۆتسارتە:

١. زتیك شیپل
٢. دزی لە سەرایدا
٣ ژن هێنانی فیگارۆ
٤ پراگ
٥ جادوو

لەتەمەنی ٣٥ ساڵیدا مردووە، خەڵکێکی زۆر هاتووە بۆ بەرێ کردنی تەرمەکەی، بەڵام بارانێکی زۆر باریوە گەڕاونەتەوە، جا کەس نازانێت لە کوێ دا نێژراوە.

### ١٨- ڤاگنەر "ریچارد" ١٨١٣ – ١٨٨٣ ز



لە شاری لایپزك لە دایك بووە و باوکی پێش هاتنە دنیای ئەو بە گرانەتا مردووە، بووە بە رابەری ئۆرکستری ماگدبورگ و لەگەڵ کچێکی گۆرانی بێژدا بەناوی (مینا بلان) رێك دەکەوێت و مارەی دەکا. لەبەر رووداو و کارەساتی ئەو وەختە ئەڵمانیا بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە شاری زووریخ و لەوێ لەگەڵ ناسراوان دا دەبێ بە دۆست و تێکەڵییان دەبێت. دوای سیانزدە ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا و عاشقی (کوزیما)ی کچی لیست دەبێت، کچە دوای تەلاق وەرگرتن – وەکو دایکی – شوو بە ڤاگنەر دەکات. ڤاگنەر دەچێتە شاری (بایرووت) و لەو شارەدا تیاترێك بە پارەی خۆی دروست دەکات و دوای چوار ساڵ ئەم تیاترە تەواو دەبێت و لە رۆژی کردنەوەیدا شاکارێکی خۆی بەناوی حەلقەی نیبلونگ پێش کەش دەکرێت. ئەمانەش ناوی چەند شاکارێکی ئەم هونەرمەندەن:

١- ئەفسانەی زیگفرید ٢- پاسیفال

## بەرهەمە ناودارەکانی مۆسیقای ئۆپەرا

| ناوی ئۆپەرا | ناوی دانەرەکەی |
| --- | --- |
| ئارفیو | مونتوردی |
| تاج لەسەرنانی پویە | مونتوردی |
| ئەلسیست | لولی |
| دیدوڤانیاس | پریسل |
| خزمەکاری کەیبانوو | پرکولزی |
| هیپۆلیت و ڤاریسی | رامۆ |
| جۆل سیزار | هاندل |
| ڤازیی خەڵەتاوە | گلوك |
| رولاند | پیچینی |
| شووکردنی نهێنی | چیما روزا |
| ژن هێنانی ڤیگارۆ | مۆتسارت |
| دۆن جوان | مۆتسارت |
| ڤیدیللو | بتهۆڤن |
| ویلهلم ئەتل | رۆسینی |
| کچی هەنگ | دی تستی |
| فرایشوتس | ویبەر |
| تانهویزەر | ڤاگنەر |
| لوهنگرین | ڤاگنەر |
| حەلقەی نیبلونگ | ڤاگنەر |
| ڤاوست | گۆنۆ |
| کارمن | بیزە |
| مانکن لیسکۆ | ماسنە |
| سامسۆن و دەلیلە | ماسنە |
| ریکو لئو | وردی |
| عایدە | وردی |
| ئۆجین ئونگین | چایکۆڤسکی |
| خانمی پێك | چایکۆڤسکی |
| ماکبەث | ئەرنست بلوخ |
| دۆن کیشۆت | ریچارد شتراوس |
| سێ نارنجی خۆشەویست | پروکفیف |

## سیمفۆنییە ناودارەکانی جیهان

| | | |
|---|---|---|
| | | هایدن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٨٣ | پەلەور | هایدن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٩٢ | ئۆکسفورد | هایدن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٩٤ | لەپڕ | هایدن |
| سیمفۆنیی ژمارە ١٠١ | ساعەت | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣١ | پاریس | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣٥ | هاخنر | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣٦ | لینز | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣٨ | براگ | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣٩ | سیمل ماجور | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٤٠ | سل مینور | مۆتسارت |
| سیمفۆنیی ژمارە ٤١ | جوبیتەر | بیتهۆڤن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣ | ئەرونیکا | بیتهۆڤن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٥ | سیمنیور | بیتهۆڤن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٦ | پاستڕال | بیتهۆڤن |
| سیمفۆنیی ژمارە ٩ | کرال | مەندلسون |
| سیمفۆنیی ژمارە ٣ | سکاتلندی | مەندلسون |
| سیمفۆنیی ژمارە ٤ | ئیتالی | ریشارد شتراوس |
| سیمفۆنیی ژمارە ٥ | دۆن کیشۆت | برلیوز |
| سیمفۆنیی ژمارە ٥ | فانتاسنیك | فرانزلیست |
| سیمفۆنیی فاوست | - | فرانزلیست |
| سیمفۆنیی شۆرشگێڕانە | - | بروکنەر |
| سیمفۆنیی ژمارە ٤ | رۆمانتێك | برۆکنەر |
| سیمفۆنیی ژمارە ٧ | می ماجۆر | براهمس |
| سیمفۆنیی ژمارە ١ لە | "ئوت مینور" | براهمس |
| سیمفۆنیی ژمارە ٢ لە | "رێ ماجور" | براهمس |
| سیمفۆنیی ژمارە ٤ لە | "می مینور" | لالو |
| سیمفۆنیی ئیسپانیۆل | - | سیزار فرانك |
| سیمفۆنیی لەرمینیور | - | کورساکۆف |
| سیمفۆنیی عەنتەر | - | سکریابین |
| سیمفۆنیی ژمارە ٤ | "چالاکی" | سکریابین |
| سیمفۆنیی ژمارە ٥ | پرۆمیثوس | ستراڤینسکی |
| سیمفۆنیی (پروم) | - | شۆستاکۆڤیچ |
| سیمفۆنیی ژمارە ٧ | لنین گراد | |

## مۆسیقای جاز

ئەم شێوە مۆسیقایە لە سەرەتاوە لە ساڵی ١٩١٢ لە ناوچەی نۆرلیانی ئەمریکادا پەیدابووە کە کەوتوەتە خوارووی وڵات .. زوو بە زوو دوای شەڕی یەکەمی جیهان بە ئەمریکا و ئەوروپادا بڵاو بوەتەوە. ئەم جۆرە مۆسیقایە مۆسیقای قوڵە رەشە زۆر لێ کراوەکان بووە.

دەربارەی وشەی (جاز) دوو بیروڕا هەیە، یەکەم ئەوەیە کە بە نامای هەست جووڵێنەر دێت. رایەکەی دووەم ئەوەیە کە ئەم ناوی لە ناوی چەند هونەرمەندێکی ئەم جۆرە هونەرەوە وەرگیراوە وەکو: جس، جاسبو، چارلز کە ئەم هونەرمەندانە لە ساڵی ١٨١٢دا یەکەمین ئۆرکستری ئەم جۆرە هونەرەیان داناوە.

## جۆرەکانی جاز:

١- بلووز *Bloos*

ئەم جۆرە لە ساڵی ١٨٧٠ دا دەستی پێکردووە، ئەمەش لە وشەیەکەوە وەرگیراوە بە مانای (غەمگین) دێت هەڵبەتە ئەو ناوەش وە نەبێت غەمگینیی ئاهەنگی بلووز بێت بەڵکو لەبەر نارەوایی کۆمەڵایەتی و چینایەتیی گەلی ئەمریکا بووە. هەروەکو ناوازی عەتابەی لای خوارووی وڵاتی خۆمان و پێش ساڵی ١٩٥٨ کە چۆن دەربەگایەتی جوتیاری وڵاتی لە سێبەردا دەچەوسایەوە.

٢- جاز کلاسیک

لە سێ قوتابخانەی بنەرەتی پێك هاتووە کە ئەمانەن:

أ – قوتابخانەی نیو ئۆرلیانی.

ب – قوتابخانەی دیکسیلەند.

ج – شیکاگۆ ستیل.

ناوی کلاسیك وەنەبێت لەبەر برینی قۆناغ بێت بەڵکو هەر لەبەر جیاوازیی قوتابخانەکەیە.

٣- سوئیتك:

ئەم هونەرە هەمیشە شێوەی گۆڕیوە لە ساڵی ١٩٢٩دا هونەرمەندێك بەناوی "پۆل وایت مـن" ناوبانگی دەرکرد و بوو بە پاشای جاز و بوو بە خاوەنی ئەم شێوە جازە.

٤- کول جاز *Coal Jazz*

لە ساڵی ١٩٥٠ دا سپییەکانیش بە لاسایی رەشەکان لەم هونەرەدا خۆیان ماندووکرد و شێوەیێکی تایبەتییان پێك هێنا و رەگەکەی زۆرتر لە مۆسیقای ئەوروپایی دەچێت.

٥- پرۆگسیو جاز *Progressive Jazz*

شێوەیێکی نوێی جازە.

٦- ئیست کاست جاز *East Coast Jazz*

ئەم جۆرە جاز بە شێوەی نیویۆرك بەناوبانگە و دانەرانی ئەم شێوە جاز ئەمانەن:

أ – کلیفۆرد

ب – بڕۆن

ج- سیلور

٧- وێست کاست جاز West Coast Jazz
به شێوەی کالیفۆرنیا بەناوبانگە.

٨- سول Soul
واتە هەل هەڵەی غەم بە تەعبیری مۆسیقازانەکانی جاز.

## ناودارانی مۆسیقای جاز

١- ئارمسترانگ "لویس" Armstrong
لە ساڵی ١٩٠٠ دا لە نیو ئۆرلیانی ئەمریکا لەدایک بووە گۆرانی بێژ و ترومپێت ژەنە و لە مێژووی هونەری مۆسیقای جازدا بەناوبانگترین کەسە.

٢- کید ئاری Kid Ory
لە ساڵی ١٨٨٦ دا لەدایک بووە.

٣- رۆی ئالدریج Roy Eldridge
لە ساڵی ١٩١١ دا لە دایک بووە.

٤- دویک ئەلینگتۆن Duke Ellington
لە ساڵی ١٨٩٩ لە دایک بووە.

٥- کینگ ئۆلیڤەر (١٨٨٥ – ١٩٢٨) King Oliver

٦- کریس باربر (١٩٣٠ - ) C. Barber.

٧- کۆنت باسی (١٩٠٤ - ) Count Basie

٨- رەی براون (١٩٢٦ - ) Ray Brown.

٩- ساندی براون (١٩٢٩ - ) Sandy Brown

١٠- بیگ بیل برونزی (١٨٩٣ – ١٩٥٨) Big Bil Broonzy

١١- سیدنی بشت (١٨٩٧ – ١٩٥٩) S. Bechet

١٢- جیمی بلانتن (١٩٢١ – ١٩٤٢) Jimmy Blanton

١٣- بیکس بیدەر بەك (١٩٠٢ – ١٩٣١) Bix Beider Becke

١٤- بارنی بیگارد (١٩٠٤ - ) B. Bigard

١٥- میلدر بەیلی (١٩٠٧ – ١٩٥١) Milder Bailey

١٦- چارلی پارکەر (١٩٢٠ – ١٩٥٥) C. Parker

١٧- بەد پاول (١٩٢٤ - ) Bud Powel

## میعماری ناسراو

١- پەیکەری فیرعۆنێك كە ئێستا لە مۆزەخانەی قاهیرەدا دانراوە, دەڵێن دەستکردی پیاوێکی ئاینی ئەو سەردەمە بووە.
٢- پەیکەری فیرعۆنێکی دی کە لە میصر دۆزراوەتەوە ئێستا لە مۆزەخانەی بەرلین دا دانراوە.
٣- پەیکەری "ئەبولهەول" کە بەرزیی دەموچاوی (٥) مەترە و تەنیا لووتی ١,٧٠ مەتر و درێژیی گوێیەکی ١,٢٧ مەترە.
٤- پەیکەرە زەلامەکە مەمنوون بەرزیی (١٨) مەترە کە پاسەوانی دەرگای پەرستگای ئامنفیسی دووهەمە.
٥- پەیکەری فیرعۆن ئامنفیسی سێیەم بە شێوەی دانیشتن کە بە پاڵی کەژێکەوە قورساییەکەی ٤٠٠ تەنە.
٦- لوکسور (الأقصر) بەرزیی پایە (کۆڵەکە) کانی ١٦ مەترە تەلاری دەربارەی ئامنفیس بووە لە میصری کۆن دا.
٧- پەیکەری ئەخناتوون کە لە مۆزەخانەی قاهیرە دایە.
٨- پەرستگای کارناك لە میصر.
٩- پەرستگای گەورە (ئەبوسومبل) کە چوار پەیکەری رامسیس لە بەرد تاشراون بە بڵندیی ٢٠ مەتر.
١٠- پەیکەری رامسیس لە مەمفیس دا بە بەرزیی ١٢ مەتر.
١١- پەیکەری شاژنە نەفرتیتی لە میصر.
١٢- سەری ئافرەتێك کە لە قوڕی سووردەوەکرا و دروست کراوە ئێستا لە مۆزەخانەی فاتیکان دایە.
١٣- پەرستگای جۆپیتەر لە دورگەی سیسیل.
١٤- پەرستگای "پوزیدون" کە پەرستگایەکی کۆنی یۆنانە.
١٥- پەیکەری نیوە لەشی (بریکلس) لە مۆزەخانەی بریتانیا.
١٦- مەیدانی گرەوی ئەسپ غاردان بەناوی (کلیزە)وە کە لە شاری ئەثینا دایە و تەواوی لەبەرد دروست کراوە.
١٧- کتێبخانەی گەورەی ئەسکەندەرییە کە ٢٠٠ هەزار کتێبە تێدا بووە.
١٨- پەرستگای ئاپۆلۆن لە بەندەری ئەزمیری تورکیای ئەمڕۆدا کە بە فرمانی ئەسکەندەر دروست کراوە و بەرزیی ئەو دوو مستوونە بەردینەی کە ماوەتەوە گەورەیی و شکۆی ئەو پەرستگایە دەردەخات.
١٩- پەیکەری زەلامی (بوودا) لە ئەفغانستان.
٢٠- پەیکەری بوودا بە بەرزیی ٣٥ مەتر.
٢١- پەرستگای مهابوود لە هیندستان
٢٢- پەیکەری دوو دڵدار لە دورگەی سیلان.
٢٣- گۆڕستانی بوودا لە هیندستان.
٢٤- دیواری گەورە و درێژی وڵاتی چین کە لە ساڵی ٢٩٤ پ. ز دا بە درێژایی ١٨٧٢ کیلۆمەتر دروست کراوە.
٢٥- پن دوگار کە رۆمانییەکان لە وڵاتی فرەنسەدا دروستیان کردووە.
٢٦- تیاتری "مارسیلۆس" لە رۆما کە دیسان لە سەدەی (١٧) تازە کراوەتەوە.
٢٧- پەیکەرێکی برونزی کە لە ئیتالیا دایە, بیروڕا لەسەر ئەوەیە کە پەیکەری هیرکلیۆسی قەیسەری رۆمایە یان (ڤالانتین) ە.
٢٨- پارچەیەك لە پەیکەری "سپتیم سور" کە لە چاڵەکانی تەلاری سەنت ئانژ دا دۆزراوەتەوە.
٢٩- پەیکەری نیوەلەشی ئادرین لە نزیکی گۆڕەکەیدا دۆزراوەتەوە.

٣٠ کۆڵەکە بەردینەکانی پەرستگای جۆپیتەر کە تێکڕا شەش پایە و نازانرێت کام شای میصر دروستی کردووە و بە چ شێوەیەك دا تاشراوە.
٣١ پەیەکەری "بوودا" لە وڵاتی چین دا بە بەرزیی ١٥ مەتر و بە شێوەی کاری یۆنانییەکان تاشراوە.
٣٢- سەری پەیکەری کنستانتین لە رۆما.
٣٣- مەیدانی تەماشای ئەستەنبوڵ.
٣٤ پەیکەری تیۆدۆر و خێزانەکەی لە لۆجی تایبەتی خۆیدا.



٣٥- مزگەوتی ئەیا سۆفیا کە ستوونی بەردینی زۆر تێدایە و دەستکردی سەردەمی (ژوستینین)ی ئیمپراتۆری رۆمی رۆژهەڵات بووە.
٣٦- میحرابی "هەریوچی" کە لە ساڵی ٧٣٠ ز لە ژاپۆن دا بەسەر کۆڵەگەی رەنگ سووردوە دروست کراوە, بەرزیی کۆڵەکە هەرە گەورەکەی (٥٠) مەترە.
٣٧ بوودای گەورە: ئەم پەیکەرە لە ژاپۆن دایە و لە ساڵانی ٧٤٢ – ٧٤٩ز دا دروست کراوە, تەنیا درێژیی گوێی پەیکەرەکە سێ مەترە. دروست کردنی ئەم پەیکەرە ٤٣٧ تەن برونزی تێ چووە و ئاوزێڕ کردنیشی ١٤٤ کیلۆ زێڕ.
٣٨- پەرستگای بهووانسوار, لەساڵی ١٠٠٠ی زایین دا دروست کراوە, نیشانەی میعماری چین و بیزانسی پێوە دیارە.
٣٩ پەرستگای بەردینی هاها لیپورام لە هیندستان لەسەدەی حەوتەمی زایین دا دروست کراوە.
٤٠ لێژی رووباری کونگ لە هیندستان کەسنگە بەردێکە (میل) بە بەرزیی ٩ مەتر و بە درێژیی ٢٠ مەتر کە زۆر نەخش و نیگاری لێ هەڵ کەنراوە.
٤١- نزیکەی (٢٨) پەرستگای لە ئەشکەوتەکانی حەیدەرئابادی هیندستان دا هەڵ کەندراوە.
٤٢- جێگای پەرستنی شیرا لە ئالوورا.
٤٣- پەرستگای (بوریودو) لە جاوە بە بەرزیی ٢١ مەتر.
٤٤ پەرستگای فەرزەکانی ئاین (مناسك) لە هیندستان.
٤٥- پەیکەری ئاسنی شیواو پاروانی.
٤٦ پەرستگای کزاوا لە هیندستان
٤٧ پردی لوکنو لە وڵاتی چین نزیکی پەکین.
٤٨- پەرستگای ئاسمان لە چین.
٤٩- بنکەی دالاییەکان لە کەژی سووردا لە تیبەت بە درێژیی ٣٠٠ مەتر و بەرزیی ٥٠ مەتر.
٥٠- هەرەمی گەورەی پلەدار لە مەکسیك.
٥١- گەرەکی خواکان لە مەکسیك و هەرەمی هەتاو.
٥٢- دیواری پەرستگای مەتیلا لە مەکسیك.
٥٣- ئەلماچین یان هەرەمی زووردار لە مەکسیك.
٥٤- مزگەوتی عومەر (رض) لە قودس.
٥٥- کەعبەی شەریف لە حیجاز.

٥٦- نوێژخانەی سانت کاپرین.
٥٧- بەردی تەراشییەکانی کڵێسای ئارپنیرا لە تفلیس.
٥٨- پەرستگای سانت پانتلمۆن لە یۆنان.
٥٩- نوێژ خانەی سانت میشیل لە فرانسە "ڕێباز و شێوەی ئاواکاریی کووتیک".
٦٠- پەرستگای سەرکەژی (کاسن) لە ئیتالیا.
٦١- پەرستگای ئالکوباسا لە ئیسپانیا.
٦٢- پەرستگای پێچکەداری خوای هەتاو لە هیندستان.
٦٣- پەیکەری گەورەی کراتمالا بە بەرزیی ١٨ مەتر کە بە شاکاری بەرد تاشینی هیندستان دادەنرێت.
٦٤- پلەکانی قەلای لوژولاسدا لە ئیسپانیا, ئەویش بە شاکارێکی میعماری بەردین لە قەڵەم دەدرێت.
٦٥- کۆشکی (خەزرا) لە ئیسپانیا.
٦٦- کۆشکی فلکشتاین لە ئەڵمانیا.
٦٧- دوو قولله لە سیانزدە قوللەکانی سان ژیمانۆ لە تۆسکانیی ئیتالیا.
٦٨- دیواری سەر و قووللەی ملینتا لە یۆگۆسلاڤیا.
٦٩- کڵێسای کوتانس لە فرانسە.
٧٠- کڵێسای منوستەر لە ئەڵمانیا.
٧١- هەرەمی گەورەی کاستیلو لە مەکسیک.
٧٢- پەرستگای شەڕکەران لە مەکسیک.
٧٣- پەرستگایەك بەناوی کۆشکی ئیمپراتۆر لە مەکسیک.
٧٤- کۆشکە (حەمرا) لە ئیسپانیا کە ١٢٨ کۆڵەکەی مەرمەڕی سپیی هەیە و تێکڕا ٤٣١٢ کۆڵەکەی تێدایە.
٧٥- قوللەی (کلاوفەرەنگی) یان بورجی لار لە ئیتالیا کە٢٩٤ پلەی هەیە.
٧٦- کۆشکی شامپور لە فرانسە.
٧٧- کۆشکی کابراروڵا لە ئیتالیا ئێستا بنکەی هاوینەی سەرکۆماری ئیتالیایە.
٧٨- کڵێسای ئاساسیۆن لە کرملین لە شاری مۆسکۆدا.
٧٩- کڵێسای سان پۆڵ لەشاری لەندەن.
٨٠- نوێژخانەی سان لۆرنزۆ لە ئیسپانیا.
٨١- کۆشکی هایدلبورگ لە ئەڵمانیا.
٨٢- کۆشکی ریونان چی لە کیوتووی ژاپۆن.
٨٣- ساترونیا لە هیندستان.
٨٤- تاج محەل.
٨٥- گول گومەد گۆڕی عادیل شای هیند لە بیجابوور.
٨٦- هەوا محەل لە هیندستان (ڕوانگەی ئاسمانی).
٨٧- فاتیور سیکری؛ مزگەوتێکە لە هیندستان لەلایەن ئەکبەرشاوە دروست کراوە.
٨٨- پەیکەری بوودا لە تایلەند بە دانیشتوویی.
٨٩- مزگەوتی ئەل ئەزهەر لە قاهیرە.
٩٠- پەرستگای گەورەی بوودا لە بانکۆك و ڕازاندنەوەی دیوی ناوەوەی ئەم پەرستگایە شاکارێکی بۆ گشت مرۆڤان.
٩١- دەوازەی "مەنسوری حەللاج" لە مەڕاکیش.
٩٢- کۆشکی ئیلاخی پاشاکانی سوید لە ١٦٦١ ز دروست کراوە.

٩٣- کۆشکی پاشایەتیی شونبرون لە ڤیەنای نەمسا کە لە ساڵی ١٧٥٠دا دروست کراوە.

٩٤- کۆشکی پاشایەتیی مەدرید لە ئیسپانیا.

٩٥- پەرستگای پاشا لە نەمسا بەسەر رووباری دانووبەوە.

٩٦- بینای وێست منیستەر لە لەندەن کە جێگای پەرلەمانی بریتانیایە و بە گشتی پانزدە هەزار ژووی هەیە.

٩٧- کۆشکی پاشایەتیی "ویندستوور" کە لە سەردەمی جۆرجی چوارەم دا دەستی پێ کراوە و لە سەردەمی شاژن ڤیکتۆریادا تەواو بووە.

٩٨- کۆشکی بلوور یەکێکە لە شاکاردکانی میعماریی جیهان کەوتودتە شاری لەندەنی وڵاتی بریتانیاوە.

٩٩- کۆشکی بۆشا وانشتین لە ناوچەی بایاری ئەڵمانیادا لە سەردەمی پاشایەتیی لونی دووەمی پاشای (بایر)دا دروست کراوە.

١٠٠- کۆشکی ترۆکادیرۆ لە ساڵی ١٨٧٨ ز دروست کراوە لەلایەن میعمارێکەوە بەناوی (داود).

١٠١- کڵێسای ساگراد فامیلیا لە شاری پارسلونی ئیسپانیا کە لە ساڵی ١٨٨٤ دا دروست کراوە.

١٠٢- پردی بروٚکلین، لە ساڵی ١٨٦٩دا لە شاری نیویۆرك دروست کراوە، بە درێژایی ١٨٣٦ مەتر و پایە بەردینەکانی ٩٠ مەترە.

١٠٣- قوللەی ئیڤل، بەرزییەکەی ٣٠٠ مەترە و لە شاری پاریسە ئیڤلی ئەندازیار دروستی کردووە.



پەیکەری ئازادی



پەیکەری بەردینی ماچ   -رۆدان-

## هونەرمەندانی ناسراوی مۆسیقای ئیسلام

١- ئیبن سینا:

ئەبو عەلیی سینا پزیشك و فەیلەسووفی گەورەی ئیسلام, لەبەر ئەوەی مۆسیقا ئەوسا بەشێك بوو لە فەلسەفە بۆیە لە کتێبی "شفا" دا زۆری دەربارەی مۆسیقا نووسیوە. لەم رووەشەوە لە فارابی و ئیسحاقی مووسڵی سوودی وەرگرتووە و بە پێی چوار یاسا لە مۆسیقا دواوە:

١- تردید (دووبارە کردنەوە).
٢- التمزیج و التشقیق (تیکەڵاویی و جیاکردنەوە).
٣- الترکیب والابدال (لێکدان و لەجێ دانان).
٤- التوصیل (گەیاندن).

٢- صەفیەدین ئەل ئەرمەوی:

مۆسیقا زانی سەردەمی موستەعصیمی عەباسیدا لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە, دەربارەی مۆسیقا کتێبێکی بەناوبانگی هەیە ناوی "الأدوار" ئەم هونەرمەندە ئاوازی بەشێوەی ژمارە و پیت نووسیوەتەوە.

٣- زریاب:

ئەبولحەسەن کوری عەلیی ناسراو بە زریاب یەکێك بووە لە قوتابیانی ئیسحاقە مووسڵی, دوای تەواوکردنی دەرسی مۆسیقا لەلای مامۆستاکەیەوە بەرەو ئەندەلوس دەکەوێتە رێ و لە دەرباری عەبدولرەحمانی دووەمی خەلیفەی ئەمەوییەکانی ئەندەلوس دا جێگە و رێزێکی زۆر بەدی دەهێنێت. زریاب ژێیەکی بۆ ئامرازی عوود زیادکردووە کە پێش ئەو هەرسێ ژێی هەبووە, کتێبێکیشی نووسیوە بەناوی "الشجرة الطبوع" دەربارەی مۆسیقا.

٤- مەنصور ئەل زلزال:

ژن برای مامۆستا ئیبراهیمی مووسڵی بووە و لەلای ئەو مۆسیقا فێربووە. ئەم هونەرمەندە ئەوەندە عوودی (بە ئاوازی مامۆستا ئیبراهیمەوە) شیرین لێ داوە دەربارەی عەباسییانی هێناوەتە جۆش هەر خۆیشی مامۆستای عوودی ئیسحاق بووە.



منصور زلزال



... ئەل ئەرمەوی

٥- **عەبدولقادر مەراغی:**

لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاوە و لە مۆسیقازانیدا دەستێکی باڵای بووە و ئەم کتێبانەشی دەربارەی مۆسیقا نووسیوە:

١- الزوائد والفوائد.

٢- مقاصد الألحان.

٣- زبدة الأدوار.

٦- **فاڕابی:**

ئەبو نەصری فاڕابی فەیلەسووفێکی گەورەی ئیسلامە و بە مامۆستای دووەم بەناوبانگ بووە جگە لە فەلسەفە لە دنیای مۆسیقادا زۆر بە توانا بووە لەم بابەتەوە کتێبێکی نووسیوە بەناوی (كتاب الموسيقى الكبير) ئەم کتێبە تاکو ئێستا بە نرخترین کتێبە مۆسیقایە لە ڕۆژهەڵات دا.

٧- **ئیبراهیم ئەلمووسلی (١٢٥ – ١٨٨ ك):**

باوکی لە شاری کووفە ژیاوە و لەوێش ژنی هێناوە و ئیبراهیم بەرهەمی ئەم ژن و مێردەیە. بە منداڵی باوکی مردووە کە گەورە بووە بۆ فێربوونی هونەری مۆسیقا چووەتە شاری مووسڵ، دوای تەواوکردنی دەرسی مۆسیقا لە مووسڵ بۆ فێربوون شار بە شار دەگەڕێ تا دەگەڕێتەوە بەغداد و لە دەربارەی خەلیفەکانی عەباسی: مەهدی و هاروونە ڕەشید دا ڕێز و جێگایەکی دیاری بەدەست دەکەوێت و بە نەخۆشی کۆڵنج دەمرێت.

٨- **ئیسحاق الموسلی (١٥٠ – ٢٣٦ ك):**

کوڕی ئیبراهیم بووە و مۆسیقا لە باوکی فێربووە خەریکی خوێندن بووە هەتاوەکو دەربارەی زانیاریەکانی یۆنانیش ئاگادار بووە، سەرباری مۆسیقای ڕۆم و یۆنانیەکان. دوای مردنی باوکی جێگای باوکی گرتەوە لە دەربارەی هاروونەڕەشید دا. لە کۆتایی تەمەنی دا بە کوێری مردووە.



ئیسحاق ئەلموسلی — عبدالقادر مراغی

٩- **یەعقووب ئەل کیندی:**

ئەبوو یووسف یەعقووبی کیندی لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا لە بەصرە لە دایك بووە و لە ساڵی ٢٦٠ دا مردووە. سەرەتا لە بەصرە فێری مۆسیقا بووە، پاشان چووەتە (بەغداد) و لە دەزگای خەلافەتی عەباسیەکان دا دامەزراوە لە سەردەمی خەلیفە (متەوەکیل)دا. کتێبێکی نووسیوە هەوڵیداوە بیروڕای تایبەتی خۆی روون بکاتەوە.

١٠- **طووەیس (١١- ٩٢ ك):**

بە (ئەبو عەبدولنەعیم) بەناوبانگ بووە و وەکو فەرهەنگێکی زیندوو وا بووە دەربارەی شاری مەدینە، هەروەها ناو ناو دەفی جوان لێدەدا. طووەیس لە رۆژی مردنی پێغەمبەر (ص) دا لە دایك بووە، لە رۆژی مردنی ئەبوو بەکردا (رض) لە شیر براوەتەوە و لە رۆژی کوشتنی عومەردا (رض) بلووغ بووە و لە رۆژی کوشتنی عوثمان (رض) ژنی هێناوە و لە رۆژی کوشتنی عەلی (کرم) دا بووە بە خاوەن کوڕێك تا رۆژگاری مەروانی کوڕی حەکەم ژیاوە.

# میعمارە ناسراوەکانی جیهان

١- ئاپولۆ دوروسی دیمەشقی
لە سەدەی یەکەم و دووەمی زایین دا ژیاوە, واتا لە سەردەمی رۆمانەکان دا.

٢- ئارنولفودو کامبیو *Arnold di Cambio*
لە سەدە سیانزدەهەم دا ژیاوە و پەیکەر تاشێکی ناودار و میعمارێکی ناسراوی ئەو سەردەمە بووە.

٣- ئەلبەرتی ( پاتێستا ) *Alberi. B* (١٤٠٤ – ١٤٧٤ز)
میعمار و مۆسیقازانێکی خەڵکی ئیتالیا بووە.

٤- ئانتیموس ترالسی *Anthemius of Tralles*
لە سەدەی شەشەمی زایین دا ژیاوە و خەڵکی یۆنان بووە, هەروەها یەکێکی لەو میعمارانەی کڵێسای ئەیا سۆفیای لە ئەستەنبول دروست کردووە.

٥- ئاروین دی شتینباخ *Erwin de Steinbach* (١٢٤٤- ١٣١٨ ز)
ئەو میعمارەیە کە کڵێسای (ستراسبورگ)ی دروست کردووە.

٦- سپراندیو "جاك هانری" *Sperandieu .J. H* (١٨٢٩ – ١٨٧٤ ز)
خەڵکی وڵاتی فەرانسە بووە کڵێسای نۆتردامی لە پاریس و کۆشکی لنگ شانی لە شاری مارسیدا دروست کردووە.

٧- سکۆپاس *Scopas* (٤٦٠ ی پێش زایین)
میعماری و پەیکەرتاشێکی خەڵکی یۆنان بووە. ئەو دەستکردانەی لە کەناری دەریای (ئەناتۆلی ژووروو)دا هەیە ئەم هونەرمەندە ئەنجامی داون.

٨- ئیڤل (گۆستاڤ) *Eiffel . G* (١٨٣٢ – ١٩٢٣ ز)
ئەندازیارێکی خەڵکی فەرانسەیە و ڤوللەی ئیڤلی لە پاریس دروست کردووە.

٩- ئایگتینوس *Igtinus*
لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین دا ژیاوە.
خەڵکی یۆنانە و پەرستگای (پارتنون) لەلایەن ئەم میعمارەوە دروست کراوە.

١٠- برامانتە *Bramante*
میعماری ە نیگارکێشی چاك زانیوە, خەڵکی ئیتالیا بووە کۆشکی "کانچلر" ئەو دروستی کردووە.

١١- برویر "مارسل" *Breuer* (١٩٠٢ – ١٩٥٧ ز)

خەڵكی مەجەرە، شێوەی كارەكانی زۆرتر ڕێبازی كۆبیسمی تێدا دیارە، بینای (بیژن كۆرف) لەلایەن ئەم هونەرمەندەوە دروست كراوە.

١٢- برۆس "سالمون دو" Brosse (١٥٦٥ – ١٦٢٦ ز)

خەڵكی فرانسەیە كۆشكی لوكزامبورگ و كۆشكی راوی لویس لەلایەن ئەم میعمارەوە دروست كراوە.

١٣- برونللێسكی (فیلیپو) Brunelleschi

پەیكەرتاش بووە جگە لەوەی میعمارێكی وردەكاریش بووە گوومەتی كڵێسای (فلۆرانس) لەلایەن ئەم هونەرمەندە ئیتالیایییەوە كراوە.

١٤- بەری (سێرچارلس) Barry. Ch (١٧٩٥ – ١٨٦٠ ز)

كۆشكی ویستمنەستەر لە شاری لەندەن لەلایەن ئەم كەسەوە دروست كراوە.

١٥- بلۆندل (نیكۆلا) Blondel. N ١٦١٧ – ١٦٨٦ز

تاقی سەركەوتنی سانی دنی شاری پاریس لەلایەن ئەم میعمارەوە دروست كراوە.

١٦- بولفینچ (چارلز) Bulfinch (١٧٦٣ – ١٨٤٤ ز)

خەڵكی ئەمریكا بووە لە شاری (بۆستن)دا زۆر كۆشك و كاری ئەنجام داوە.

١٧- پالا لادی (ئەندرا) Palladio. A

جێ گری میكائیل ئەنجلۆ و برامانتە بووە و خەڵكی ئیتالیا بووە و زۆر كاری میعماری ئەنجام داوە، كڵێسای (سان پیر) یەكێكە لە كارەكانی.

١٨- رامی:

میعمارێكی عەرەب بووە لە ساڵی ١٤٩٨ كڵێسای "كنشتی" لە (سەرقسطە) لەلایەن ئەم هونەرمەندەوە دروست كراوە.

١٩- رایت "فرانك لوید" Wright. F. L (١٨٦٩ – ١٩٥٩ ز)

خەڵكی ئەمریكایە و (خانووی تاڤگە) یەكێكە لە كارەكانی ئەم میعمارە.

٢٠- ورن "سێركریستوفر" Wren . C (١٦٣٢ – ١٧٢٣ ز)

كە شاری لەندەن سووتا سەرلەنوێ دروست كردن و نوێ كردنەوەی لەلایەن ئەم میعمارەوە دارێژراوە.

كارە ناودارەكانیئەمانەن:

١- مالبرو هاوس.

٢- تیمپل بار.

٢١- رینی (جۆن) Rennie. J (١٧٦١ – ١٨٢١ ز)

خەڵكی بریتانیا بووە كارە ناودارەكانی ئەمانەن:

١. بیناى واترلو.
٢- پردى لەندەن.

٢٢- روهە (میزوان دو)
لە ساڵی ١٨٨٦ ز دا لە ئەڵمانیا لە دایك بووە، ئەندازیارێکی میعماری ناودار و دەست ڕەنگین بووە
ئەمانەش کارە ناسراوەکانی ئەم میعمارەن:
١. بیناى نەتەوە یەکگرتووەکان لە شاری نیویۆرك.
٢- مۆزەخانەى هونەرە تازەکان.
٣- فیلیپ جانسۆن.

٢٣- ساری نن (ئایرو) *Saarinen. E*
لە ساڵی ١٩١٥ ز دا لە ئەمریکا لە دایك بووە، بیناى کارخانەى (جەنەراڵ مۆتۆرز)ى دروست کردووە.

٢٤- سنان (٨٩٥ – ٩٨٦ ك)
یەکێکە لەو میعمارە بە دەسەڵاتانەى سەردەمی عوسمانی، لەکاتی فەرمانڕەوایی سوڵتان سەلیم و سوڵتان سلێمانی یەکەم دا کارە دیارەکانی ئەم میعمارە لە تورکیا دا ئەمانەن:
١- مزگەوتی سلێمانیە.
٢- مزگەوتی شازادە.
٣- مزگەوتی سەلیمیە.

٢٥- لسکۆت "پیر" *Lescot. P* (١٥١٥ – ١٥٧٨ ز)
لە شاری پاریس لەدایك بووە و ڕواڵەتی دەرەوەى مۆزەخانەى لۆڤەر لەلایەن ئەم میعمارەوە ئەنجام دراوە.

٢٦- لیمۆنت "پیر" *Lemuet. P*
لە پاریس لە وڵاتی فەرەنسەدا هاتوەتە دنیاوە، کاری ناوداری ئەم میعمارە "واڵ دو کراس"ە.

٢٧- لوکورپۆزێە *Lecorbusir. E.* (١٨٨٧ – ١٩٦٤ ز)
خەڵکی وڵاتی سویسرایە، ئەمانەش هەندێك کاری بەناوبانگێتی:
١- وەزارەتی دروست کردنی کارەبا لە سۆڤیەت دا.
٢ وەزارەتی تەندورستی و ڕۆشنبیری لە برازیل دا.
٣- خانووى پەنا هاوەرەکانی سپاى ڕزگاری.
٤ ساختمانی سویت لە مۆسکۆ.

# پەیکەرتاشە ناسراوەکانی جیهان

١- ئاگاسیاس *Agasias*

لە سەدەی یەکەمی پێش زایین دا ژیاوە، یەکێک لە کارە هونەرییەکانی وا لە مۆزەخانەی ئەثینادایە.

٢- ئا. ئوتۆخیدس *Eutchides* (سەدەی چوارەمی پ. ز)

خەڵکی یۆنانە و پەیکەری "ئیقبال" لەلایەن ئەم هونەرمەندەوە دروست کراوە.

٣- ئادلینگ *Edelin* (١٦٤٩ – ١٧٠٧ ز)

لە شاری ئانورس لە دایك بووە، لەلایەنی لویسی چواردەهەمەوە دەعوەت کراوە بۆ فەرانسە و رێزی زۆر لێ گیراوە.



٤- شوانتالرا *Schwanthaler* (١٨٠٢ – ١٨٤٨ ز)

لە شاری مۆنیخی ئەڵمانیا لە دایك بووە و زۆر دەستکردی لێ بەجێ ماوە.

٥- ئودن *Houdon* (١٧٤١ – ١٨٢٨ ز)

خەڵکی فرانسەیە و پەیکەرتاشێکی ناسراوە و نیگاریکێشی تابلۆی (روخساری کاترین)ە.

٦- بارتۆلد *Barthold. F. A* (١٨٣٤ – ١٩٠٤ ز)

فردریك ئۆگشت بارتۆلد خەڵکی فرانسەیە، ئەمەش ناوی چەند پەیکەرێکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەیە؛

١- شێری بلفۆر.

٢- پەیکەری ئازادیی شاری نیویۆرك.

٣- جیهانی ئەمڕۆ.

٧- بارلاخ "ئەرنست" *Barlach* (١٨٧٠ – ١٩٣٨ ز)

پەیکەرتاش و نووسەرێکی ئەڵمانیایە. ئەمەش ناوی چەند کاری پەیکەرسازی ئەم هونەرمەندەن:

١- تۆڵەستێن.

٢- خەیاڵ کەر.



٨- باری *Bary. A. L* (١٧٩٦ – ١٨٧٥ ز)

ئەنتوان لویس باری خەڵکی فرانسایە، کارەکانی دەربارەی دڕندان بووە ئەمەش چەند پەیکەرێکی ئەون؛

١- شێر و مار.

٢- نیزە ومینیاتور.

٣- شێری وەرکەتوو و فیلی ئەفریقیا.

٩- بافیە "ئوژن" Baffier. E

خەڵکی فەرەنسایە و لە ساڵی ١٨٥١ز دا لە دایك بووە ئەمەش چەند پەیکەرێکی ناسراوی ئەون:

١- شارلۆت کورداری.

٢- لویسی نۆیەم.

١٠- برانکوزی "کونستانتین" Brancusi. C

خەڵکی رۆمانیایە بەڵام لە فەرەنسە دا ژیاوە و دەرسی خوێندووە ئەمەش ناوی چەند پەیکەرێکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەیە:

١- ماچ. ٢- خواوەندی خەوتوو. ٣- پەلەوەرێك لە ئاسمان دا.

١١- بەرنینی (جیان لۆرنزۆ): Bernini. G. L.

خەڵکی ئیتالیایە، ئەمەش ناوی چەند پەیکەرێکی ئەم هونەرمەندەن:

١- رەواقی کڵێسای سان پییر لە شاری رۆما.

٢- بیرکردنەوەی سانت ترز.

١٢- بورودل "ئەمیل ئەنتوان" Bourdelle. E. A

خەڵکی وڵاتی فەرەنسەیە و پەیکەرتاشێکی وردەکاری ئەمەش ناوی شاکارێکی ئەوە:

١- هەرکولی کەمان گر.

١٣- پالمەر "ئاراستوس دو" Palmer. E. D

لە ساڵی ١٨١٧ز دا لە ئەمریکا لە دایك بووە، ناوی کارە ناودارەکانی ئەمانەن:

١- کچێکی گەنجی هیندی. ٢- ئەسیری بەرەبەیان. ٣- هەڵ فڕینی روح.

١٤- پراکزتیل Praxitell

لە ساڵی ٣٦٠ی پێش زاین دا لە یۆنان دا ژیاوە ئەمەش ناوی چەند شاکارێکی ئەم هونەرمەندەیە کە تا ئێستا ماوەتەوە:

١- سەری ئەفرۆدیت. ٢- ئاپۆلۆن. ٣- پەیکەری ڤینۆس.

١٥- پیزانۆ "نیکۆلا" Pisano. N

خاوەنی شێوەیێکی تایبەتی خۆی بووە لە هونەری پەیکەرتاشی دا. ئەمانەش ناوی چەند کارێکی بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەن:

١- مینبەری کڵێسای پیزا. ٢- مینبەری کڵێسای سینا. ٣- حەوز و ناوەبرژەی پرووجا.

١٦- تۆرڤالسن (ئەلبرت برێل) Thorvaldsen (١٧٧٠ - ١٨٢٤ ز)

خەڵکی وڵاتی دانیمارکە بە داهێنەری نەخشی بەرجەستەی دیکۆرسازی دانراوە، شیرلوسون کارێکی ناسراوی ئەم پەیکەرتاشەیە.



١٧- چلینی "بن و نیتو" Cellini. B (١٥٠٠ – ١٥٧٢ ز)

فەرەنساوییە، ئەمەش ناوی چەند کاری بەناوبانگی ئەم هونەرمەندەیە:

١- عیسا.
٢- جۆبیتەر.
٣- پرسیوس.



١٨- دالو (جۆل) Dalou. J. (١٨٣٨ – ١٩٠٢ ز)

خەڵکی وڵاتی فەرەنسەیە و پەیڕەوی قوتابخانەی (ناتورالیسم) بووە سەرکەوتنی کۆماری دەستکردی ئەم پەیکەرتاشەیە.

١٩- روبیا "لوکادلا"

لەسەدەی پانزدەی زایین دا لە ئیتالیا دا ژیاوە، کارە ناودارەکانی ئەم هونەرمەندە ئەمانەن:

١- تاج لەسەرنانی مریەمی عەذرا.
٢- مریەم و کوڕەکەی.
٣- بینینی ئەلیزابث لەلایەن خەڵکەوە.



٢٠- رۆدن "ئەگوست" Rodin. A. (١٨٤٠ – ١٩١٧ ز)

ئەم هونەرمەندە فرانساییە لەسەرەتاوە کەس هیچ نرخێکیان بۆ بەرهەمەکانی دانەنا و شێوەی کارەکانی گەلێك سادە و بێ ئارایش بووە و گوێی نەداوەتە ناسکیی لەش و پەیکەر، بەڵکی بە ئاڵۆزیی ماسولکەکانی لەش دا ویستوویەتی بیروڕای پەیکەرەکە لە روخساریا دیاربکات، ئەمەش ناوی چەند کاری ئەم هونەرمەندە بلیمەتەن:

١- بیرکەرەوە.
٢- پاسەوانی سان پیرو.
٣- برژوازییەکانی کالە.
٤- ماچ.

٥- دەروازەی دۆزەخ.
٦- هۆگۆ.
مۆزەخانەی تایبەتی ئەم هورنەمەندە لە شاری پاریس بە سامانێکی نەتەوایەتیی میللەتی فرانسە دەژمێردرێت.

٢١- **ریشیر (جیرمەن)** *Richler. G.* (١٩٠٤ – ١٩٥٩ ز)
خەڵکی فرانسەیە و خاوەنی پەیکەری (ئادەم)ە.

٢٢- **زارسیلو**
لە سەدەی هەژدەهەم دا لە فرانسا لە دایك بووە و پەیرەوی هونەرمەندێك پێش خۆی نەکردووە، بەڵکو شێوەییێکی تایبەتی خۆی هەبووە لە پەیکەرتاشین دا.

٢٣- **جولین "پیر"** (١٧٣١ – ١٨٠٤ ز)
پەیکەری (لاپینوز) لەلایەن ئەم هونەرمەندەوە دروست کراوە خەڵکی فرانسە بووە.

٢٤- **شادۆ** *Schadow. Z. R*
زونۆ ریدلفۆ شادۆ پەیکەرتاشێکی ناسراوی ئەڵمانیا و کوڕە گەورەی یۆهان گوترفیدە، لە شاری رۆما لە دایك بووە ئەمەش ناوی چەند شاکارێکی ئەم هونەرمەندەیە:
١- سوقرات لای تئودوتا.
٢- ئەلەکترو واریت.
٣- نەخشی بەرجەستەی رووداوی هەڵچوون.
٤- کچێك خەریکە سۆڵەکانی چاك دەکات.

٢٥- **شادۆ "یوهان گۆتفرید"** *Shadow* (١٧٦٤ – ١٨٥٠ ز)
خەڵکی ئەڵمانیایە و لە بەرلین لە دایك بووە، ئەمەش چەند پەیکەرێکی ئەم هونەرمەندەیە:
١- فردریکی دووهەم.
٢- پەیکەری بلۆخەر لە روستۆك.
٣- لۆتەر لە ویتمربورگ.
٤- دوکمیرلاند لە لەندەن.
چەند کتێبێکیشی دەربارەی هونەری پەیکەرتاشی نووسیوە.

٢٦- **شارە**
پەیکەرسازی وڵاتی یۆنان و قوتابیی لیزیب بووە، پەیکەری (رۆدس) ئەو کردوویەتی.

٢٧- **ڤالگیر** *Falguiere. A* (١٨٣١ – ١٩٠٠ ز)
خەڵکی خوارووی فرانسەیە و بیناسك و خەیاڵ فراوان بووە ئەمەش چەند شاکارێکی ئەم پەیکەرتاشەیە:
١- سەرکەوتووی شەڕی کەڵەشێر.
٢- سەماکەرە.

٣- ژنە تاوسەکان.
٤- سان ونسان دوبل.

٢٨- فرمێه "ئامانوئیل" Fermiet (١٨٢٤ – ١٩١٠ ز)

خەڵکی فرانسەیە و میعمارێکی نـاودار و نیگارکێش و پەیکەرتاشێکی بەناوبانگ بووە، ئەمەش نـاوی چەند پەیکەرێکی ئەم هونەرمەندەن:

١- جان دارك. ٢- لونی. ٣- ئۆرلیان.

٢٩- فیدیاس

لە کاتێك دا شەڕی مارتۆن روویدا فیدیاس دە ساڵان بوو، ئەم بلیمەتە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین دا لە یۆنان دا ژیاوە و لەلای (ئاژلایدوس) و (ئۆژیاس) پەیکەر سازی فێربووە، لە ساڵی ٤٥٠ی پێش زایین دا پەیکەرێکی ناسراوی بۆ شاری ئەثینا دروست کردووە. (پەرستگای پارانتون) و (پەیکەری زەیوس) دەستکردی ئەم هونەرمەنـدەن ئەگەر چی هەر خەریکی کارکردن بووە بێ وەستان، ئەمانەش چەند شاکارێکی ئەم هونەرمەندەن:

١- پەیکەرە بچووکەکانی سەرکەوتن. ٢- پەیکەری ئاپۆلۆن. ٣- ئارتمیس و نیوبە.

لەدوایی ژیانیا تووشی گرفتاری هات، ئەختێك زێڕ و عاجیان لادانابوو بۆ دروست کردنی پەیکەر بەڵام زێڕەکان لەناوچوو بوون هەروەها گومانی بێ ئاینیی ئەو سەردەمەشیان لێ دەکرد، پاشان خرایە بەندیخانەوە و بیروڕا زۆرە دەربارەی ئاکامی ئـەم بلیمەتـە گوایـە لـە بەندیخانـەدا مـردووە، یـان لـە سـاڵی ٤٣٢ پ. ز دا خنکێنراوە.

٣٠- لیوکارس

پەیکەرتاشێکی یۆنـانیی سـەردەمی ئەسکەندەر بـووە و پەیکـەری ئەسکەندەر و فیلیب و ئیزوکـراتس دروست کردووە.

٣١- لیمۆت (فردریك) Lemot (١٧٧٣ – ١٨٢٧ ز)

خەڵکی شاری لیۆنی فرانسەیە و پەیکەری هانریی چوارەمی دروست کردووە.

٣٢- مارینی "مارنیو" Marini. M

خـەڵکی ئیتالیایـە و (ئەسـپ و سـوار) دەسـتکردی ئـەم هونەرمەندیە.



٣٣- هنری مور

لە ساڵی ١٨٩٨ز دا لە بریتانیا لە دایك بووە، (دایك و منداڵ) و (خێزان) دوو شاکاری ئەم هونەرمەندەن.

## ناوی سەما و جۆرەکانی سەما لە جیهان دا

١- ئاگۆن *Agon*

جۆرێکە لە سەمای بالێت کە دوانزدە کەس دەی کات.

٢- ئاگرێت *Aigrett*

جۆرێکە لە بالێت.

٣- بالماسکە *Balmasque*

وشەیێکی فرەنسەیییە کە لە دوو واژە پێك هاتووە, (بال) واتە سەما, (ماسکە) واتا رووپۆش (دەمامك), جۆرێکە لە سەمای تێکڕایی کە سەماکەران دەموچاوی خۆیان بە رووپۆشێك دادەپۆشن بۆ ئەوەی نەناسرێن جارجارێك رووپۆشەکانیان نیگاری دەم و چاوی درندەی تێدا کێشراوە یان لەسەر سەروگوێلاکی چوار پێ دارێژراوە.

٤- بالە *Ballet*

ئەم جۆرە سەمایە سەمایەکی تێکڕاییە, بەشێك لە ژیانی میللەتەکان دیاردەکات کە لە کۆنەوە هەبووە.. لە هیندستان دا تاکو ئێستا ئەو سەمایانەی کە پێش هەزاران ساڵ و لە ئەفسانەکانیاندا هەبووە هەر پارێزگاری لێ دەکەن. بەڵام سەماکانی یۆنانی کۆن نەماون و نەگەرچی زۆر نەخشی بەرجەستە هەیە چۆنیەتی ئەو سەمایانە وە دەردەخات. پاشاکانی سەدەکانی ناوەڕاستیش لە ئەوروپادا زۆر سەمایان لا گرنگ بووە, لویسی چواردەهەم گەلێك جوان سەمای کردووە و لە ساڵی ٦٦١ دا خانوویێکی فێربوونی سەمای دروست کرد.

بالە لە راستیدا باسی رابردوو دەکا بە جووڵانەوەی ناسك و لەسەرخۆ, هەروەها لەگەڵ سەمادا جیاوازی هەیە لەوەدا کە سەما ناکامیێکی فیزیۆلۆژیکە و روحی کەس لە ماوەیێکی کەم دا کەسایەتیی خۆی لەبیر دەکا و خۆی دەداتە دەست هەستێکی تێکڕایی لەگەڵ مۆسیقادا.. بەڵام بالە لە راستیدا جۆری مۆسیقا ئەم شێوە سەمایەی پێك هێناوە و لە سەدەی پانزدەهەم دا لە ئیتالیادا پێك هاتووە.

٥- بورە *Bourree*

سەمایەکی توند و خێرایە بە جووڵانەوەی چوار لە سەر چوار.

٦- بۆلێرۆ

جۆرێکە لە سەماکانی (رومبا) و لە سەماکانی میللەتی ئیسپانیایە دوو کەس پێکەوە لە باوەشی یەك دا لەسەر ئاوازێکی ئارام دا ئەنجامی دەدەن, زۆرتر ئەو ئاوازانە چاوگەکانی ئەفریقیایە.

٧- بەهارات ناتیام

یەکێکە لە سەما کۆنەکانی هیندستان زۆرتر لە ناوچەی تامیل دا لە سەرەتاوە ئەم سەمایە تەنیا ژنانی پەرستگاکانی خوارووی هیندستان دەیا کرد.. لە راستیدا خۆی سەمایەکی ئاینییە.

٨- پاوان *Pavan*

سەمایەکی سەدەکانی ناوەڕاستە.

٩- پولکا

سەمایەکی بازنەییە لەگەڵ لێدانی ٢/٤ لە وڵاتی پۆڵەندەدا برەوی هەبووە، دەڵێن کچێك دای هێناوە.

١٠- پنیزە

جۆرێکە لە سەما کە ئسلامەکان لە کۆن لە ئیسپانیادا بلاویان کردوەتەوە.

١١- تارانتلا

سەمایەکی خۆماڵیی ئیتالیایە.

١٢- تامپورن *Tambourin*

سەمایەکی لادێییانەی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا بووە.

١٣- تانگۆ *Tango*

سەمایەکی بە ویقاری ئیسپانیاییە لە دوادوای سەدەی نۆزدەدا بڵاوبووەتەوە. لە ساڵی ١٩٢٠ دا ئەم سەما ڕۆمانتیکییە لە دنیادا ناوبانگی دەرکرد خەڵکی زۆری حەز لێ دەکەن و سەمایەکی ڕێك و نارام و لەسەرخۆیە.

١٤- تویست

سەمایەکی نوێیە بە مۆسیقایێکی توند و خێراوە دەکرێت.

١٥- چاچا

جۆرە سەمایەکی تازەیە کە لەسەر ریتمی مۆسیقای توند و خێرا دەکرێت.

١٦- چۆپی

سەمایەکی تێکراییە لەلایەن زۆربەی میللەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەکرێت.

١٧- رۆك ئەن رۆل

جۆرێکە لە سەما فەرەنگەکانی، لەم چەند ساڵی دواییەدا ناوبانگی دەرکردووە، وشەی رۆك ئەند رۆل بە واتا خۆبادان و لەراندنەوە دێت.

١٨- رومبا *Rumba*

یەکێکە لە سەماکانی وڵاتی ئەمریکا و بە چوار شێوە دەگوترێت:

ا – بولێرۆ

ب – شان مۆزیك

ج – گوارجا
د – رومبای راستەقینە

١٩- رومبای راستەقینە
سەمایەکی ولاتی ئەمریکایە بە دوو قۆڵی دەکرێت, لەبەر ئەوەی مۆسیقاکە تون و خێرایە سەماکەران دەبێت چالاک و چابک بن.

٢٠- سامبا
سەمایەکە لە خۆپێشان دانەکانی شەقامانەوە گەیشتوەتە یاریگا و یانەکان, خێراییەکەی بە ٤/٢ دانراوە و لە وڵاتی برازیلەوە بڵاوبوەتەوە.

٢١- سەمای سۆفیان
جۆرێکە لە سەمای سۆفییەکان لەگەڵ هەندێك ویرد و ستایش دا دەکرێت لەسەر ریتمێکی رێك و تایبەتی.

٢٢- سویتگ
سەمای ئازادیی پێ دەگوترێت, سەمایەکی میللەتی ئەمریکایە سەرەتا هەر لاوان دەیان کرد ئێستا تێکڕایە.

٢٣- کاتاکالی
سەمایەکی ئایینی هیندستانە, تێکەڵ بە شێوەیێکی شانۆگەرییە, ئەم سەمایە لە خوارووی هیندستان دا زۆر باوی هەیە.

٢٤- کاتهك
سەمایەکی کلاسیکیی وڵاتی هیندستانی بەشی سەرەوەی لەگەڵ گۆرانیدا دەبێت بە تایبەتی لە پەرستگایان دا.

٢٥- کارول – کورانت – گاوت – گایارت
ئەم چوار سەمایە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا لە ئەوروپا دەکران.

٢٦- مامبۆ
سەمایەکی شێتانەیە بەڵام خۆش و ریتمدارە کە لە رومباوە وەرگیراوە, ئەم سەمایە لە ئەمریکاوە دەرکەوتووە.

٢٧- میاکواو دوری
سەمایەکی وڵاتی ژاپۆنە کە ٣٢ کچۆڵەی جوانکیلە دەیگێڕن.

**٢٨- ڤالس**

ئەم سەمایە لە سەدەی هەژدەدا برەوی پەیدا کردووە، دەڵێن لە وڵاتی نەمسا و سویسرادا – یەکەم جار – دەرکەوتووە، ئێستاش بە دوو جۆرە ڤالس ناسراوە ڤالسی کۆن و ڤالسی ئەمریکا.









# بەشی هونەرە جوانەکان
# شانۆیی نووسە ناسراوەکانی جیهان

## ١- ئابووت "جلبرت" (١٨١١ – ١٨٤٦ ز)

لە شاری لەندەن لەدایك بووە و لە ساڵی ١٨٣٥دا ژنێکی هێناوە بەناوی "مێری ئان کلۆسپ". ئەم نووسەرە زۆربەی نووسینەکانی شێوەی گاڵتە و پێکەنینی تێدایە واتا "کۆمیك"ە.

بەرهەمە ناسراوەکانی ئەمانەن:

١. زەنگوڵەکان.
٢. درامای جنۆکەی پەری.
٣. هیندییە ڕاکردووەکان.

## ٢- ئەزبۆرن "جان" *J. osborne*

لە ساڵی ١٩٢٩ لە بریتانیادا لە دایك بووە، دوای خوێندن تەواوکردن، لە تەماشاخانەدا کاری کردووە، لە زۆر شاریش دا لەسەر ئەم پیشە بەردەوام بووە. ئەمانەش ناوی چەند شانۆیەکی ئەم نووسەرەن:

١. شەیتانی لە پێستی ئەودایە.
٢. نووسین لەسەر گۆڕی جۆرج دیلن.
٣. لووثەر.
٤. خوێنی بامێرگ.

## ٣- ئالبی "ئەدوارد" *E. Albee*

بە یەکێك لە شانۆیی نووسەرچاکەکانی ئەمریکا دەژمێردرێت – دوای یۆجین ئۆنیل -. ئەم نووسەرە لە ساڵی ١٩٢٨ز لە دایك بووە. ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی بەناوبانگی ئەم نووسەرەیە:

١. کێ لە فیرجینیا ولف دەترسێت؟
٢. خەیاڵی ئەمریکایی.



## ٤- ئاریستۆفان *Aristophanes*

شانۆیی نووسێکی کۆنی یۆنانە، لە ساڵی ٤٥٠ پ. ز لە یۆنان دا ژیاوە، شێوەی نووسینەکانی گاڵتەجارییە تەنانەت گاڵتەی بە بیروڕا فەلسەفییەکانی سوقراتی کردووە. بەناوبانگترین چیرۆکی شانۆیی ئەم نووسەرە "هەورەکان"ە.

## ٥- ئاشیل: *Achilles*

بە یەکەمین تراژیدی نووسی مێژوو دەژمێردرێت. لە ساڵی ٥٢٥ی پێش زایین لە یۆنان دا لە دایك بووە حەفتا ساڵ ژیاوە، بە بنەڕەت دەچێتەوە سەر بنەماڵەیێکی ناسراوی شازادە. لە شەڕەکانی ماراتو و سالامین دا بەشداریی کردووە. بەسەریەکەوە نەوەت تراژیدی نووسیوە بەڵام لە هەمووان بەناوبانگتر "پرۆمیتۆس لە کۆت دا" شاکارێکی لە بیرنەچووە.

٦- ئۆنیل (١٨٨٨ – ١٩٥٣ ز)



یۆجین گلادستۆن ئۆنیـل لـه شاری برۆدوایی ئـهمریکا هاتۆتـه دنیـاوه بـاوکی هونـهرمهندێکی شانۆیی بووه و لهبهر شانۆیی "مۆنت کۆنت کرستۆ" ههمیشه لـه شارهکان دا له سهفهر بووه. یۆجینی منداڵیش لهم سهفهرانهدا لهگهڵ باوك و دایکی له گهشت دا بووه. له تهمهنی حهوت ساڵی د خراوهته قوتابخانهی ئاینی بهڵام لهبهر رهوشتی توند و خووی زبری ئهو جۆره قوتابخانانه ئهم هونهرمهنده له منداڵییهوه خوویێکی زبر و توندی گرتووه. له ساڵی ١٩٠٦ دا چووهته زانکۆوه بهڵام له زانکۆ دهرکراوه چونکه له کۆبوونهوهیهك دا بوتڵه بیرهیێکی هاویشتووه.

چوو لهبنکهیهکی بازرگانیدا کاری کرد، کهوته دوای زێـر دۆزینـهوه بـهڵام سهرنهکهوت. زۆر کاری تریشی تاقی کردهوه ههر سهرنهکهوت تا له ساڵی ١٩١٢ دا بووه به رۆژنامهنووس له رۆژنامهی (نیولهندهن تهلگراف)دا، تووشی نهخۆشیی سیل بووه.

بهناوبانگترین چیرۆکی شانۆییهکانی ئۆنیل ئهمانهن:

١- له رێگای کاردیف.
٢- تینوویهتی.
٣- له ناوچهی شهڕاویدا.
٤- گهشتی دوور و درێژ له وڵات دا.
٥- مانگی دورگهکانی کاریبی.
٦- ئای بیابان.
٧- رۆژه تهواو نهبووهکان.
٨- ئهلهکترا تازیه باره.
٩- کۆلکن.
١٠- براون خوای گهوره.
١١- ههوهسی ژێرداری نارومن.
١٢- مهیموونی کولکن.
١٣- تێ پهڕبوونی رۆژ له شهودا.
١٤- جۆنزی ئیمپراتۆر.

٧- ئیپسن "هێزیك یۆهان" (١٨٢٨ – ١٩٠٦ ز)



کوڕی بازرگانێکی خهڵکی سوێد و دایکی ئهڵمانی بووه, له شانزده ساڵیدا باوکی تێ دهشکێت و ههرچی ههیه و نییه لهناو دهچێت, ئهویش دهکهوێته دنیای ههژارییهوه. شاری خۆی بهجێ دههێلی و دهچێته شاری "بیرگن", لهم شارهدا له شانۆیهك دا کار پهیدا دهکات,پاشان دهگوێزێتهوه شاری (ئوسلۆ). زۆر حهزی لهنوسینی چیرۆکی شانۆیی بووه, لهم رووهوه کهم کهم ناوبانگی پهیدا کردووه. ئهمهش ناوی چهند شانۆییهکی ناسراوی ئهم نووسهرهن:

١- کاتی لینا.
٢- پرگونت.
٣- کاتێك ئێمهی مردوو رادهپهڕین.
٤- تارماییهکان.

٥- دوژمنی گەل.
٦- ئوستادی ئاواکاری.
٧- ماڵی بووکڵە.

٨- بریشت "برتۆلت" Bretollt Breeht (١٨٩٨ – ١٩٦٦)



لە شاری ئەکسبورگی ئەڵمانیا لە دایك بووە، لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا دوای تەقەلاییکی زۆر دژی شەڕ هەڵگیرسێن دنیای بەجێ هێشتووە. دژی نازیسم بووە، لە ساڵی ١٩٣٣دا ئەڵمانیای بەجێ هێشتووە لە ئەمریکا دانیشتووە. پاش کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی گەڕاوەتەوە ئەڵمانیای رۆژهەلات. ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی ناوداری ئەم شانۆیی نووسە گەورەن:

١- لە جەنگەڵی شارەکان دا.
٢- ژیانی گالیلۆ.
٣- ژنی دڵ چاکی شاری سچوان.
٤- مرۆڤ مرۆڤە.
٥- دایە ئازا و منداڵەکانی.

٩- پریستلی (Priestly (J . B

لە ساڵی ١٨٩٤ ز لە دایك بووە، ئەمەش ناوی چەند بەرهەمی ئەم نووسەرەن:



١- ئاخری بەهەشت.
٢- لە تاریکیی نەزانین دا.
٣- ڕوو خۆش.
٤- پێش ئێستا لێرە بووم.
٥- لە ماڵ دا چۆنن ؟
٦- خەڵکی سەرگەردان.
٧- دێنە شارەوە.
٨- نیشتمان سبەینێیە.

١٠- دۆرنمات (فردریك)

لە ساڵی ١٩٢١ز دا لە شاری بێرنی پایتەختی سویسرا لە دایك بووە، باپیری شاعیرێکی ناوداری وڵاتی خۆی بووە. لایەنگری قوتابخانەی "ئەکسپرسیونیسم" بووە لە دراما نووسین دا. ئەمەش ناوی چەند شاکارێکی ئەم نووسەرەن:

١- کوێر.
٢- رۆمۆلوسی گەورە.

٣- ژن هێنانی پیاوی مسەسیپی.
٤- فریشتەیەك كە دەڕواتە بابلەوە.
٥- فرانكی پێنجەم.
٦- ئۆپرای بانكێكی تایبەتی.
٧- هەركول و تەویلەی ئوجیاسی.
٨- شكات لە سێبەری كەر.



١١- شەكسپیر "ویلیام" *W. Shakespear* (١٥٦٤ – ١٦١٦ ز)

لە شاری ستراتفۆردی بریتانیادا لە خێزانێكی ناوەندی دا هاتۆتە دنیاوە. باوكی ئاژەڵی بەخێو كردووە و بە بەرهەم و فرۆشتنی ئاژەڵ رۆژگاری بردوەتە سەر. لە دێیەكەی خۆیان دا قوتابخانەی سەرەتایی تەواو كردووە و زمانی لاتینی و یۆنانی تا ئەندازەیەك بەو منداڵییەوە فێربووە. لە ساڵی ١٥٧٧دا باوكی تێشكاوە و هەرچی هەبووە لە ناوچووە و پەنای بردوەتە بەر مەی خواردنەوە. شەكسپیریش بەدوا كار و كاسبیدا بۆی دەرچووە. زۆر كاری تاقە كردوەتەوە وەكو قەسابی، كرێكاری چاپخانە و عەرزوحاڵ نووسین. لە ساڵی ١٥٨٢ دا ژنی هێناوە و بووە بە خاوەنی چەند منداڵ و لە شاری لەندەن داگیرساوەتەوە و بووە بە ئاكتەر و شانۆیی نووس. لە ساڵی ١٥٩٢ دا لەم مەیدانە ناوبانگی دەركرد، هەتا بوو بە هونەرپیشەی دەربارەی شا. شەكسپیر بە دامەزرێنەری شانۆگەریی وڵاتی بریتانیا دادەنرێت. زۆربەی كەرەستەكانی شانۆیی ئەكسپیر لە مێژووی كۆنی (رۆمان) و لە كتێبی (بلورتاخ) وەرگیراوە. شێوەی نووسینیشی بە شێوەی كلاسیسم ناسراوە. ئەمەش چەند شانۆییەكەی ئەم نووسەر و شاعیرە ئەمردیە:

١- ئەتیللۆ "عطیل".
٢- هەملێت.
٣- یۆلیۆس قەیسەر.
٤- رۆمیۆ و جولێت.
٥- گەرداو.
٦- بازرگانی ڤینیسیا.
٧- مەلیك لیر.
٨- خەونی نیوەشەوێكی هاوین.
٩- رام كردنی پڵنگەمێ.
١٠- هەرچۆنێ حەزی لێ دەكەیت.



١٢- جۆرج بەرنادشۆ *G. B. Show* ١٨٥٦ – ١٩٥٠ ز

لە شاری دبلنی ئیرلەندە لە دایك بووە، لە پانزدە ساڵیدا بووە بە شاگردە دەلاڵێك. پاشان چووەتە لەندەن نۆ ساڵ لەوێدا گوم ناو بووە، بەلام خەریكی خوێندنەوە و رۆژنامەنووسی و لێكۆڵینەوە و هەڵبەست و فەلسەفە بووە. لە ساڵی ١٨٩٣ دا ناوبانگی پەیدا كردووە و لە ساڵی ١٩٢٥ دا

خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە. ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی ناسراوی ئەم نووسەرەن:

١. کار و کاسبیی وارن خانم.
٢. مرۆڤی سەر مرۆڤ.
٣. هیچ وەختێك نەی دەگوت.
٤. ژاندارك.
٥. سەربازی قاوەیی.
٦. پیگما لیۆن.
٧. قەیسەر و کلیۆپاترا.
٨. ماجوور و باربرا.
٩. پیاو و چەك.

## ١٣- شیللەر "فردریك"

لە ساڵی ١٧٥٩ دا لە شاری مارباخی ناوچەی وتنبورگی ئەڵمانیا لە دایك بووە. لە منداڵییەوە حەزی لە نووسین کردووە. پەیڕەوی شێوەی کلاسیسم بووە لە نووسین دا. ناوی چەند بەرهەمێکی ئەم نووسەرە:

١. ڕێ گرەکان.
٢. پیلانی فیسکۆ.
٣. کچەکەی ئورلیان.
٤. ماری ستیوارت.

## ١٤- کامۆ "ئەلبێر"



ساڵی ١٩١٣ز لە شارێکی جەزایردا لە دایك بووە. باوکی جووتیار بووە و کوژراوە. لە ماوەی داگیرکردنی فەرەنسە لەلایەن ئەڵمانکانەوە لە شەڕی دووەمی گەورەدا هەمیشە دژی ئەڵمان لە تەقەلادا بووە. دوای بەزینی ئەڵمان و دەدەرنانیان لە فەرەنسە ڕۆژنامەیێکی دەرکردووە بەناوی "نیرد". پاداشتی (کرتیك)ی لەبەر چیرۆکی "تاعون" وەرگرت. لە ساڵی ١٩٥٧ یش دا پاداشتی نۆبلی وەرگرت. ئەمانەش چەند بەرهەمێکی ناسراوی ئەم نووسەرە فەرەنساییەن:

١. شۆرشی ئەستوورییەکان.
٢. کالیگۆلا.
٣. فەرمانڕەوایی سەربازی.
٤. دروست کارن.
٥. نوێژ بۆ راهیبەیەك.

١٥- گۆتە "یۆهان ولفگانگ فۆن" *Goethe*



لە ساڵی ١٧٤٩ لە شاری فرانکفۆرت لە دایك بووە. رۆڵەی خێزانێکی ناسراوی دەوڵەمەند بووە. سەرەتا خەریکی خوێندنی یاسا و پزیشکی بوو و گەشتوگوزارێکی زۆری کرد. بە باوکی ئەدەبیاتی ئەڵمانیا ناونراوە. دۆستی گەلێك ناسراوانی دنیا بووە. هەتا وەکو چەند جارێکیش ناپلیۆنی دیوە لەساڵی ١٨٣٢دا مردووە.

ئەمانەش ناوی چەند بەرهەمێکی ناسراوی ئەون:

١- فاوست.

٢- رەنج و ئازاری ڤێرنەر.

٣- ئاگنت.

٤- ئیفی ژینی و دیوانی رۆژهەلاتی.

١٦- گیبسن "ویلیام"

لە ١٩١٤ لە شاری نیویۆرك لە دایك بووە. خۆی و ژنی و دوو منداڵی لە ناوچەی ماسا چۆست دا دەژین. زۆر کاری ئەنجام داوە وەکو کارکردن لە دەزگای پروپاگەندە، پیانۆلێدان ئاکتەریی لە شانۆدا. ئەمەش چەند بەرهەمێکی ئەم نووسەرەن.

١- هاوارێك لە ئەکتەرەکانەوە.

٢- کرێکاری جادوباز.

١٧- مۆلێر "جان پاپست" *Moliere* (١٦٢٢ - ١٦٧٣ ز)



لە شاری پاریس لە دایك بووە، لە گەنجیدا ئاکتەری شانۆ بووە. زۆر هەژار بووە، بەلام لە دواییدا لویسی چواردەهەم رێزی لێ گرتووە و یارمەتی داوە. بە کۆمیدیا بەناوبانگە و زۆربەی بەرهەمەکانی لەگەڵ فەلسەفەی ئەخلاقیدا تێکەڵە. ئەمەش ناوی هەندێکیانە:

١- مەکتەبی ژنان.

٢- دۆن جوان.

٣- سروشتی عیشق.

٤- خەڵك راونەر.

٥- رەزیل.

٦- ریا کار.

٧- نەخۆشی خەیاڵ.

١٧- میللەر "ئەرثور" *Miller*

لە ساڵی ١٩١٥ لە شاری نیویۆرك بووە، زانکۆی مەشیگانی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٣٧دا پاداشتی هارب وود، هەر لەو ساڵەش دا پاداشتی (میشیگان)ی پێ براوە. شێوەی کاری بە شێوەیێکی تئورییێکی نوێ ناسراوە، کە ئەم رێبازە نووسینە لە دنیای شانۆگەریدا ئێستاش لایەنگرانی زۆری هەیە. لە ساڵی ١٩٤٩داگرەوی

(پۆلیتزەر)ی بردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٥٨دا ئەستێرەی هونەرپیشەی جوانکیلەی هالی وودی مارەکرد کە خواڵی خۆش بوو مارێلین مۆنرۆیە.

ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی ئەم نووسەرەن،

١. پیاوێك کە بە تەواوی خۆش بەخت بوو.
٢. چاو هەڵ خستنێك لە پرد.
٣. بیرەوەری لە دووشەنبە.
٤. مردنی دێوەرەیەك.

## ١٨- وایلد "ئۆسکار" *O. Wilde*

لە ساڵی ١٨٥٤ ز لە ئیرلەندە لە دایك بووە، ڕۆڵەی دایك و باوکێکی ئەدەب دۆست بووە. یەکەمین پارچە هەڵبەستێك کە دایناوە دەربارەی مردنی خوشکە جوانە مەرگەکەی بووە. لەساڵی ١٨٨٢دا چووتە شاری پاریس و لە کۆمەڵی ناسراوانی ئەم شارەدا دەرکەوتووە و هەر لە پاریسیش لە ساڵی ١٩٠٠ دا مردووە.



ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی ئەم نووسەرەیە،

١. شازادەی بەختیار.
٢. نیگاری دۆریان گری.
٣. سالۆمی.
٤. تاوانی لۆرد ئارتۆ.
٥. ژنی گوێ پێ نەدراو.
٦. گرنگیی ئەرنست.
٧. مێردی پەسندکراو.

## ١٩- ویلیامز "تێنیسی" *Williams*

لە ساڵی ١٩١٦ لە شاری کلومبیای ئەمریکا لە دایك بووە خێزانەکەی ناسراو نەبووە. زانکۆی تەواو کردووە، زۆربەی نووسینەکانی چیرۆکی شانۆیین. ئەمەش ناوی چەند بەرهەمێکی ناسراوی ئەم نووسەرەیە:

١- ئوتوبوسێك بەناوی هەوەس.
٢- پشیلەی سەر چینکۆیەکی گەرم.
٣- لەپڕ هاوین تێ پەڕی.
٤- دەروراني ئاوڕدانەوە.
٥- خاڵی گوڵ.
٦- شەوی ئەیگوانا.

# ئەم زاراوانەی لە سینەمادا بەکاردەهێنرێن

١- ئەکشن Action
وانە نیش، کار. بەلام لە سینەمادا واتا هۆی ڕوودانی ڕووداوێك.

٢- ئەکتەر Actor
واتە هونەرمەکاری پیاو.

٣- ئەکترێس Actrice
هونەرکاری ژن.

٤- ئارتیست Artiste
بە هونەرمەندی رۆلی یەکەمی فیلم دەگوترێ.

٥- ئێکسترا Extra
بە رەش و بۆری سینەما واتا (سیایی لەشکر) دەلێن.

٦- پلاتوو Plateau
بە بەشێك یان گۆشەییکی ستۆدیۆ دەلێن.

٧- پرۆژەکتۆوور Projecteur
واتا دوور هاوێژ.

٨- پانتو مایم Panto Mime
بە ڕوو (دەم و چاو) دەرخستنی، نێش و ئازار، شادی و کەنین، هاوار و هەر هەستێك.

٩- تەکنی کالور:
شێوەیێکی تایبەتیی رەنگ تێکەلیی فیلم دروست کردنە.

١٠- تروو کاژ Troucage
فێلی سینەمایی.

١١- دایرەکتەر Director
دەرهێنەر . موخریج.

١٢- د کوپاژ De Coupage
هەلّ بژاردنی کادیری هونـەری و گۆشـەی بینین، چۆنیەتیی زەرەبین و دووربینی فیلم و چۆنیەتیی جوولانەوە و جێ گۆڕینی هونەرەکاران.

١٣- زومینگ Zooming
جوولانەوەی دووربینی فیلم بەخێراییەکی زۆرەوە بۆ وێنەگرتن.

١٤- ستۆدیۆ Studio
جێگای دەرهێنانی فیلم.

١٥- سیناریۆ Seenario
شانۆییەکە کە دەرهێنەر فیلمی لەسەر دەردەهێنێت.

١٦- سینە کلوب Cine Club

ئەو جێگەیەیە وا پەیڕەوانی فیلمە هونەرییەکانن هەر لەوێش دا سەیری دەکەن وەکو سینەمایێکی بچووک.

## ڕێبازەکانی سینەما

١- سینەما سکۆپ:

زەرەبینێکە لەلایەن (هانری کریسین)ی پرۆفیسۆرێکی فرانسەییەوە لە ساڵی ١٩٢٧دا دروستکراوە بەڵام سوودی لێ وەرنەگیرا و لەبیر چووبووەوە تا ساڵی ١٩٥٢ بەڕێوەبەری گشتیی کۆمپانیای "فۆکسی سەدەی بیستەم"ی سینەمایی ئەو زەرەبینەی بەکارهێنا، یەکەمین فیلمیش لەسەر ئەم شێوەیە دروست کرا فیلمی (کەوا) بوو کە فیلمێکی مێژوویی بوو.

هەر ئەم زەرەبینە بوو بو هۆی دۆزینەوەی زۆر شێوەی دیی فیلم دروست کردن کە ئێمە ناچینە ناو کرۆکی چۆنیەتیی دروست کردنیان چونکە پڕە لە وردەکاریی هونەریی دوور و درێژ و ئاڵۆز.. بەڵکو بەتەنیا ناوی جۆرەکانیان دەهێنین:

١- سینەمای سکۆپ ٥٥ ملیمەتری.
٢- سوپەر تەکنی ڕاما.
٣- توتال سکۆب.
٤- سوپەر سکۆب.
٥- سینە پانورامیک.
٦- کامیرا سکۆب.
٧- تەکنی راما.
٨- ویستا راما.
٩- وارنەر سکۆب.
١٠- ریگال سکۆب.
١١- پانا ڤیژن.
١٢- ویستا ڤیژن.
١٣- تادائو.
١٤- ام جی کامێرا.
١٥- مکنا سکۆب.
١٦- فۆکس گراندا سکرین.
١٧- ریلایف.
١٨- داینا میش.
١٩- سیرکوراما.
٢٠- سی چاو ئەنداز.
٢١- ١٦ ملیمەتری.
٢٢- تەکنی سکۆب.
٢٣- دیمنش ١٥٠.
٢٤- سینە راما.

٢٥- وايد سكرين.

# مەهرەجان یان ڤیستڤالە گرنگەکانی سینەمای جیهان

**ڤیستیڤال واتا جەژن**

وشەی ڤیستیڤال واتا جەژن لە سالی ١٩٢٢ لەسەدەی فەرمانڕەوایی مۆسۆلینیی ئیتالیادا بۆ یەکەمین جار کۆبوونەوییکی هونەری سینەمایی لە شاری ڤینیسیا پێك هات. دوای شەڕی دووەمی جیهانیش ڤیستیڤالێکی گەورە لە شاری (کان)ی فرانسەدا رێك خرا.. ئەم ڤیستیڤالە گەورەترین کۆبوونەوەی سینەماییە و لەلایەن دنیای هونەرییەوە رێزی لێ دەگیرێ و بڕیارەکان دەربارەی ئەو فیلمانەی کە لەوێ پیشان دەدرێن جێگەی پەسندیی هەموو لایەکە.

ئەمەش ناوی چەند مەهرەجان یان ڤیستڤالی ناسراوی دنیایە:

١- ڤیستیڤالی کان: لە فرانسەدا ئەنجام دەدرێت.
٢- ڤیستیڤالی سینەمای ڤینیسیا: لە ئیتالیادا دەکرێت.
٣- ڤیستیڤالی کارلۆفیڤاری: سالی جارێك لە چیکۆسلۆڤاکیادا ئەنجام دەدرێت.
٤- ڤیستیڤالی ئەدینبورگ: لە وڵاتی بریتانیادا دەبێت و تایبەتییە بە فیلمی کورت.
٥- ڤیستیڤالی لوکارنو: لە سویسرادا دەبێت.
٦- ڤیستیڤالی بەرلین: لە ئەڵمانیادا دەبێت.
٧- ڤیستڤالی ماردل پلاتا: لە وڵاتی ئەرجەنتین دا دەبێت.
٨- ڤیستیڤالی سان سپاستیال: لە ئیسپانیادا رێك دەخرێت.
٩- ڤیستیڤالی برۆکسل: لە بەلجیکادا رێك دەخرێت.
١٠- ڤیستیڤالی تور: لە فرانسەدا دەگێردرێت.
١١- ڤیستیڤالی ئانیب: ئەویش لە فرانسەدا دەبێت.
١٢- ڤیستیڤالی بەرگامو: هەموو سالێك لە مانگی ئەیلوولدا لە ئیتالیا رێك دەخرێت.
١٣- ڤیستیڤالی سان فرانسیسکۆ: لە کالیفۆرنیای ئەمریکادا رێك دەخرێت.
١٤- ڤیستیڤالی مۆنتریال: لەوڵاتی کەنەدەدا دەبێت.

## خەڵاتی ئۆسکار

ئەم خەڵاتە لەلایەن ئەکادیمی زانیاری و دروست کردنی سینەماوە لە ساڵی ١٩٢٧دا بە هونەرمەندانی سینەما دراوە. لەپێش دا ناوی ئۆسکار نەبوو بەڵکو هەر پەیکەرێکی فلزی ئاو زێرکراو بوو لەلایەن گیبونەری هونەرمەندەوە دارێژرابوو.. بەڵام بە رێکەوت ناوی ئۆسکار بەسەردا برا ئەمەش بەو جۆرە بوو؛
ئافرەتێکی سکرتێری ئەکادیمیای سینەما کە پەیکەرەکە دەبینێت لەبەر خۆیەوە دەڵێ "مام ئۆسکارم کەوتەوە بیر" هەر لەو ژوورەش دا رۆژنامەنووسێك گوێی لەو قسەیە دەبێت سبەینێ ناوی "ئۆسکار" لە رۆژنامەکەی خۆیدا چاپ دەکات و ئیتر ناوەکە بڵاوبووەوە.

پەیکەرەکەش درێژایی دە ئینجە و سەنگی حەوت پاوەندە و لە برونز دروست کراوە و بە زێڕ رووکەش کراوە، نرخی بازاڕی تەنیا ١٠٠ دۆلارە بەڵام نرخی مەعنەوی گەورە و جیهان گیرە.
هەموو ساڵێك (٣٦) دانە لەو پەیکەرە بەسەر ٣٦ هونەرمەندی لێهاتوودا دابەش دەکرێت. ئەمەش ناوی ئەو فیلمانەیە کە پاداشتی ئۆسکاریان پێ براوە لەگەڵ دەرهێنەر و ئەکتەر و ئەکترێس دا هەر لە ساڵی ١٩٢٧ەوە تا ساڵی ١٩٦٦؛

١٩٢٧ – ١٩٢٨ ز

چاکترین فیلم؛ باڵەکان، کارگەی پارامونت.
ئەکتەر؛ ئەمیل یانینکس لە فیلمی جادەی پڕ بەرەکەتدا.
ئەکترێس؛ جانێت گینۆر لە فیلمی ئاسمانی حەوتەم دا.
دەرهێنەرك فرانك بورزاخ – ئاسمانی حەوتەم.

١٩٢٨ – ١٩٢٩ ز

چاکترین فیلم؛ ئەوای برۆدوای، میترو گولدین مایەر.
ئەکتەر؛ وارنەر پاکستەر - ئەریزۆنای کۆن.
ئەکترێس؛ مێری پیکفورد – علم باز.
دەرهێنەر؛ فرانك لوید – رووباری ماندوو.

١٩٢٩ – ١٩٣٠ ز

چاکترین فیلم؛ لە جەبهەی رۆژاوا دا هیچی تازە نییە، یۆنیڤرسال.
ئەکتەر؛ جۆرج ئارلس – دیزراییلی.
ئەکترێس؛ نرما شەیرر – تەڵاق دراو.
دەرهێنەر؛ لونی مایلستون – لە جەبهەی رۆژاوا دا هیچی تازە نییە.

١٩٣٠ – ١٩٣١ز

چاکترین فیلم؛ سیمارون، O-K-R رادیۆ.
ئەکتەر؛ لیونیل پاریمور – لە فیلمی روحی ئازاد.
ئەکترێس؛ مێری درسلەر – مین ومیل.
دەرهێنەر؛ نەورمەن توروك – لە فیلمی فت کراو.

۱۹۳۱ – ۱۹۳۲ ز

چاکترین فیلم: گراند هیل، میترو گولدین مایەر.
ئەکتەر: فردریك مارچ – دکتور جیکل و مستەر هاید.
ئەکترێس: هێلن هایس – گوناحی مادلیل کلودە.
دەرهێنەر: فرانك بورزاخ – کچی ئاوارە.

۱۹۳۲ – ۱۹۳۳ ز

چاکترین فیلم: ئەسپ تاودانی بە شکۆ – فۆکسی سەدەی بیستەم.
ئەکتەر: چارلس لافاتون – ژیانی تایبەتی هەنری شەشەم.
ئەکترێس: کاترین هیپۆرن – بەرەبەیانی بەختیاری.
دەرهێنەر: ئەسپ تاودانی بەشکۆ.

۱۹۳٤ – ۱۹۳٥ ز

چاکترین فیلم: رووداوی شەوێك، کۆلۆمبیا.
ئەکتەر: کلارك گیبل: رووداوی شەوێك.
ئەکترێس: کلۆدت گلبرت، رووداوی شەوێك.
دەرهێنەر: فرانك کابیرا، رووداوی شەوێك.

۱۹۳٥ – ۱۹۳٦ ز

لەم ساڵەدا ئەکتەر و ئەکترێسی دووەمیش خرایە لیستەی خەڵات وەرگرتنەوە
چاکترین فیلم: زیگفیلدی گەورە – میترۆ گۆلدین مایەر.
ئەکتەر: پل مۆنی – ژیانی لویس باستیر.
ئەکترێس: لونیز راینەر – زیگفیلدی گەورە.
ئەکتەری دووەم: والتەر بەرنان – بێ و بیگرە.
ئەکترێس دووەم: کیل سوندرگارد – ئەنتۆنی ئەدرز.
دەرهێنەر: فران کابرا – کاك (دریدز) دەچێتە شار.

۱۹۳٦ – ۱۹۳۷ ز

چاکترین فیلم: سەرگوزشتەی ئەمیل زۆرلا – برایانی ڤاگنەر.
ئەکتەر: سپنسەر ترێسی – کاتینە نازاکان.
ئەکترێس: لونیز راینەر – خاکی چاك.
ئەکتەری دووەم: جوزێف چیلدکراف – سەرگوزشتەی ئەمیل زۆلا.
ئەکترێسی دووەم: ئەلیس برادی – شیکاگۆی کۆن.
دەرهێنەر: لیومك گری – راستەقینەی ترسێنەر.

١٩٢٧ — ١٩٢٨ ز

چاکترین فیلم: ناتوانی لەگەڵ خۆت دا بیبەی — کۆلۆمبیا.

ئەکتەر: سپنسەر ترێسی — شاری کوێران.

ئەکترێس: بەت دویس — جزبل.

ئەکتەری دووەم: والتەر بەرنان — کەنتاکی.

ئەکترێسی دووەم: ڤی بشیتەر — جزبل.

دەرهێنەر: فرانك کابرا — ناتوانی لەگەڵ خۆت دا بیبەی.

١٩٢٨ — ١٩٣٩ ز

چاکترین فیلم: بابردوو — میترۆ گۆڵدین مایەر.

ئەکتەرك روبەرت دونات — خوا حافیزی کاك چیس.

ئەکترێس: فیونان لی — بابردوو.

ئەکتەری دووەم: تۆماس میچل — عەرەبانە.

ئەکترێسی دووەم: هانی ماکدانیل — بابردوو.

دەرهێنەر: فکتور فیلیمنگ — بابردوو.

١٩٣٩ — ١٩٤٠ ز

چاکترین فیلم: ربیکا — یۆنایتد ئارتێست.

ئەکتەر: جێمس ستوارت — لە فیلمی رووداوی فیلادلفیا.

ئەکترێس: جینجر راجز — لە فیلمی کیتی فۆیل.

ئەکتەری دووەم: والتەر بێرنان — لە فیلمی خەڵکی رۆژاوا.

ئەکترێسی دووەم: جین دارول — لە فیلمی هێشووە توورەیی.

دەرهێنەر: جان فۆرد — لە فیلمی هێشووە توورەیی.

١٩٤١ — ١٩٤٢ ز

چاکترین فیلم: چەندێك دۆڵی من سەوز بوو — فۆکسی سەدەی بیستەم.

ئەکتەر: کاری کوپەر — عەریف یۆرك.

ئەکترێس: جان فونتین — گومان.

ئەکتەری دووەم: دۆناڵد گریسپ — چەندێك دۆڵی من سەوز بوو.

ئەکترێسی دووەم: مێری ئاستور — درۆی گەورە.

دەرهێنەر: جان فۆرد — چەندێك دۆڵی من سەوز بوو.

١٩٤٢ — ١٩٤٣ ز

چاکترین فیلم: مادام مینیور — میترۆ گۆڵدین مایەر.

ئەکتەر: جێمس کاگنی — یانکی دودڵ دندی.

ئەکترێس: گرێرگارسن: مادام مینیور.

ئەکتەری دووەم: وان هیفلن — جانی نیگەر.

ئەکترێسی دووەم: ترازارایت — مادام مینیور.

دەرهێنەر: ویلیام وایلەر — مادام مینیور.

۱۹٤۳ – ۱۹٤٤ ز

چاکترین فیلم: به ڕێگەی خۆم دا دەڕۆم – پارامۆنت.

ئەکتەر: بنیك کرازبی – بەڕێگەی خۆم دا دەڕۆم.

ئەکتریس: ئینگرید بیرگمان – چرای غاز.

ئەکتەریدووەم: باری فیتز جرالد – به ڕێگەی خۆم دا دەڕۆم.

ئەکترێسی دووەم: ئەتل باریمور – تەنیا دڵێکی بێ کەس.

دەرهێنەر: لیویك کری – بەڕێگەی خۆم دا دەڕۆم.

۱۹٤٤ – ۱۹٤٥ ز

چاکترین فیلم: هەیتی لەدەست چوو – پارامۆنت.

ئەکتەر: ری میلان - هەیتی لەدەست چوو.

ئەکترێس: جۆن کرافورد، میل درد پرس.

ئەکتەری دووەم: جێمس دون – دارێك له بروکلین دا سەوز دەبێت.

ئەکتەری دووەم: ئان ریو – مەخمەلی نەتەوە.

دەرهێنەر: بیلی وایلدر - هەینیی لەدەست چوو.

۱۹٤٥ – ۱۹٤٦ ز

چاکترین فیلم: چاکترین ساڵانی ژیانی ئێمە O-K-R رادیۆ.

ئەکتەر: فردریك مارج – چاکترین ساڵانی ژیانی ئێمە.

ئەکترێس: ئەلیو یادو هایلند – هەر کەسێك بەشێك.

ئەکتەری دووەم: هارۆلد راسل – چاکترین ساڵانی ژیانی ئێمە.

ئەکترێسی دووەم: ئان پاکستەر – تیژیی چەقۆ.

دەرهێنەر: ویلیام – چاکترین ساڵانی ژیانی ئێمە.

۱۹٤٦ – ۱۹٤۷ ز

چاکترین فیلم: پەیمانی به ئابڕوو – فۆکسی سەدەی دووەم.

ئەکتەر: دۆناڵد کلمن – ژیانی دوو بەرابەر.

ئەکترێس: لرنا یانك – کچە جووتیار.

ئەکتەری دووەم: ئەدمۆند – کۆڵانی ژمارە ۲۳.

ئەکترێسی دووەم: سلست هۆڵم – پەیمانی به ئابڕوو.

دەرهێنەر: ئیلیا کازان – پەیمانی به ئابڕوو.

۱۹٤۷ – ۱۹٤۸ ز

چاکترین فیلم: ئەرتور رانك – هاملیت

ئەکتەر: لارۆس ئۆلیڤەر – هاملیت.

ئەکترێس: جین وایمن – جانی بلیندا.

ئەکتەری دووەم: والتەر هستون – سامانەکانی سیرامادرا.

ئەکترێسی دووەم: کلر تور – کی لارکۆ.

دەرهێنەر: جان هستون – سامانەکانی سیرامادرا.

١٩٤٨ – ١٩٤٩ ز
چاکترین فیلم: تەواوی خزمەتکارەکانی شا – کۆلۆمبیا.
ئەکتەر: برۆدریك کرافۆرد – میرات بەر.
ئەکترێس: ئەلیوبا دو هایلند – میرات بەر.
ئەکتەری دووەم: دین جاکر – دە سەعات فڕین.
ئەکترێسی دووەم: مارسیدسی مالك کمبریج – تەواوی خزمەتکارەکانی شا.
دەرهێنەر: جوزێف مانکێ ویتس – نامەیەك بۆ سێ ژن.

١٩٤٩ – ١٩٥٠ ز
چاکترین فیلم: هەمووی دەربارەی ئێوە – فۆکسی سەدەی بیستەم.
ئەکتەر: خۆزە فیرر – سیرانۆدی برچراك.
ئەکترێس: جودی هالیدی – مندالی دوێنێ.
ئەکتەری دووەم: جۆرج ساندز – هەمووی دەرباری ئێوە.
ئەکترێسی دووەم: ژوزفین هال – لاهاروی.
دەرهێنەر: جوزێف مانکێ ویتس – هەموو دەربارەی ئێوە.

١٩٥٠ – ١٩٥١ ز
چاکترین فیلم: ئەمریکاییەك لە پاریس دا – میترۆگۆلدین مایەر.
ئەکتەر : هەمفری بوگارك – شاژنی ئەفریقیا.
ئەکترێس: فیوریان لی – ئوتوبوسێك بەناوی هەوەس.
ئەکتەری دووەم: کاوڵ مالدن - ئوتوبوسێك بەناوی هەوەس.
ئەکترێسی دووەم: کیم هانتەر - ئوتوبوسێك بەناوی هەوەس.
دەرهێنەر: جۆرج ستیونس – جێگەیەك لە مانگەشەودا.

١٩٥١ – ١٩٥٢ ز
چاکترین فیلم: گەورەترین پیشان دانی رووی زەوی – پارامۆنت.
ئەکتەر: کاری کوپەر – رووداوی نیوەڕۆ.
ئەکترێس: شیرلی پێرت – شیبای بچکۆلە بگەڕێەوە.
ئەکتەری دووەم: ئەنتۆنی کوین – هەربژی ژباتا.
ئەکترێسی دووەم: گلۆریا گراهام – جوانی بەد ڕەوشت.
دەرهێنەر: جان فۆرد – پیاوی ئارام.

١٩٥٢ – ١٩٥٣ ز
چاکترین فیلم: لێرەوە تا هەتا هەتا – کۆلۆمبیا.
ئەکتەر: ولیام هۆلدن – بەندی ژمارە (١٧).
ئەکترێس: ئودری هیپۆرن – شەوێك لە رۆما.
ئەکتەری دووەم: فرانك سیناترا – لێرەوە تا هەتا هەتا.
ئەکترێسی دووەم: دوناریدی – لێرەوە تا هەتا هەتا.
دەرهێنەر: فردزینمان: لێرەوە تا هەتا هەتا.

۱۹۵۳ — ۱۹۵٤ ز

چاکترین فیلم: دەرباركێش — کۆلۆمبیا.

ئەکتەر: مارلین براندو — دەرباركێش.

ئەکترێس: گریس کلی — کچە لادێیی.

ئەکتەری دووەم: ئەدمۆند ئوبراین — شازادەی پێ پەتی.

ئەکترێسی دووەم: ئومری سنت — دەرباركێش.

دەرهێنەر: ئیلیا کازان.

۱۹۵٤ — ۱۹۵۵ ز

چاکترین فیلم: مارتی — یونایتید ئارتیست.

ئەکتەر: ئەرنست بورگانن — مارتی.

ئەکترێس: ئانا مانیانی — خاڵی گوول.

ئەکتەری دووەم: جاك لیمون — کاك رابرتز.

ئەکترێسی دووەم: جوان فلیت — رۆژهەڵاتی عەدن.

دەرهێنەر: دلبرت مان — مارتی.

۱۹۵۵ — ۱۹۵٦ ز

چاکترین فیلم: هەشت رۆژ دەوری دنیا — یونایتد ئارتێست.

ئەکتەر: یۆل براینەر — من و سوڵتان.

ئەکترێس: ئنگرید برگمان — ئەناستازیا.

ئەکتەری دووەم: ئەنتۆنی کوین — شەهوەتی ژیان.

ئەکترێسی دووەم: دورثي مالون — نووسینی بەربا.

دەرهێنەر: جۆرج ستیونس — غوول.

۱۹۵٦ — ۱۹۵۷ ز

چاکترین فیلم: پردێك بەسەر رووباری کوای — کۆلۆمبیا.

ئەکتەر: ئەلەك گینس — پردێك بەسەر رووباری کوای.

ئەکترێس: جوان ودوارد — سێ روخساری ئێوە.

ئەکتەری دووەم: ردبا تونر — سایۆنارا.

ئەکترێسی دووەم: موشی یومکی — سایۆنارا.

دەرهێنەر: دیڤیدلین — پردێك بەسەر رووباری کوای.

۱۹۵۷ — ۱۹۵۸ ز

چاکترین فیلم: ژیژی — میترۆ گۆڵدین مایەر.

ئەکتەر: دیڤید نیون — مێز جیاکانی.

ئەکترێس: سوزان هیوارد — دەمەوێت زیندوو بم.

ئەکتەری دووەم: بیرل ئایوز — وڵاتی گەورە.

ئەکترێسی دووەم: وندی هیلەر — مێزە جیاکان.

دەرهێنەر: وینسنت مینلی — ژیژی.

١٩٥٨ – ١٩٥٩ ز

چاکترین فیلم: بن هور – میترۆ گۆڵدین مایەر.

ئەکتەر: جارلستون هستون – بن هور.

ئەکترێس: سینول سنیوە – ژوورێك لە نهۆمی سەرەوە.

ئەکتەری دووەم: هیو گریفس – بن هور.

ئەکترێسی دووەم: شیلی وینتەر – نووسینەکانی ئان فرانك.

دەرهێنەر: ویلیام وایلەر – بن هور.

١٩٥٩ – ١٩٦٠ ز

چاکترین فیلم: ئاپارتمان – یونایتد ئارتێست.

ئەکتەر: برت لانکستەر - ئەلمەر گنتری.

ئەکترێس: ئەلیزابێت تایلور – باترفێلد ٨.

ئەکتەری دووەم: پیتەر یوستینف – سپارتاکۆس.

ئەکترێسی دووەم: شێرلی جۆنز – ئەلمەرگنتری.

دەرهێنەر: بیلی وایلدەر – ئاپارتمان.

١٩٦٠ – ١٩٦١ ز

چاکترین فیلم: چیرۆکی وێست ساید – یونایتد ئارتێست.

ئەکتەر: ماکسملیان شێل – دادگای نورمبورگ.

ئەکترێس: سۆفیا لۆرین – دوو ژن.

ئەکتەری دووەم: جۆرج جاکرین – چیرۆکی وێست ساید.

ئەکترێسی دووەم: ریتا مونورە – چیرۆکی وێست ساید.

دەرهێنەر: رابرت وایزوجروم – چیرۆکی وێست ساید.

١٩٦١ – ١٩٦٢ ز

چاکترین فیلم: لۆرەنسی عەرەب – کۆلۆمبیا.

ئەکتەر: گریگۆری بێك – کوشتنی پەلەوری لاسایی کەر.

ئەکترێس: ئانی پانکرافت – بەرچۆساز.

ئەکتەری دووەم: ئەدیکلی – باڵندەی شیرینی جوانی.

ئەکترێسی دووەم: پاتی دوگ – بەر چۆساز.

دەرهێنەر: دیڤید – لۆرەنسی عەرەب.

١٩٦٢ – ١٩٦٣ ز

چاکترین فیلم: تام جۆنز – یونایتد ئارتێست.

ئەکتەر: سدنی پواتێ – زەمبەقی کشتوکاڵ.

ئەکترێس: پاتریشیا نیل – هاد.

ئەکتەری دووەم: ملوین داگلاس هاد.

ئەکترێسی دووەم: مارگارت راتفورد – هوتێلی گەلان.

دەرهێنەر: تۆنی ریشاردسون – تۆم جۆنز.

۱۹٦۳ – ۱۹٦٤ ز

چاکترین فیلم: خانمی جوانکیلەی من – براکانی وارنەر.
ئەکتەر: رۆک هودسن – خانمی جوانکیلەی من.
ئەکترێس: جولی ئەندروس – مێری پاپینز.
ئەکتەری دووەم: پیتر یوستینۆف – تۆپکانی.
ئەکترێسی دووەم: لیلا گدروا – زۆرباری یۆنان.
دەرهێنەر: جۆرج کیوگر – خانمی جوانکیلەی من.

۱۹٦٤ – ۱۹٦٥ ز

چاکترین فیلم: ئاوایی مۆسیقا – فۆکسی سەدەی بیستەم.
ئەکتەر: لی مارفین کیت بالو.
ئەکترێس: جولی کریستن – محبوبە.
ئەکتەری دووەم: مارتین بالزام – هەزار گاڵتە جار.
ئەکترێسی دووەم: شیلی وینتەر – لەکەیەکی شین.
دەرهێنەر: رابرت وایز – ئاوایی مۆسیقا.

۱۹٦٥ – ۱۹٦٦ ز

چاکترین فیلم: پیاوێک بۆ هەموو وەرزێک – بریتانیا.
ئەکتەر: بل سکافیلد – پیاوێک بۆ هەموو وەرزێک.
ئەکترێس: ئەلیزابیت تایلور – کێ لە فیرجینیا ولف دەترسێت؟
ئەکتەری دووەم: والتر ماتیو – پسکتی شانسی.
ئەکترێسی دووەم: سندی دنیس – کێ لە فرجینیا ولف دەترسێت؟
دەرهێنەر: [illegible] – پیاوێک بۆ هەموو وەرزێک.

## درێژەی خەڵاتەکانی ساڵانی دواتر لە بەرگەکانی تردا هاتووە

## ناوی چەند فیلمی هەڵبژاردەی مێژووی سینەما

| ناوی فیلم | کارگە | ساڵ | دەرهێنەر | ئەکتەر | ئەکتریس |
|---|---|---|---|---|---|
| ١- ئوکستری رازاوەی ئەلکاندەر | فۆکس | ١٩٣٦ | هێنری کینگ | تایرۆن پاوەر | ئەلیس فی |
| ٢- زەنگوڵەکانی سان ماری | رادیۆ R.K.O | ١٩٤٥ | لیومك گری | ریتشارد دیکس | ئینگرید بێرگمان |
| ٣- سیمارون | رادیۆ R.K.O | ١٩٣١ | ویسلی راگلز | جان پاریمور | گریتا گاربو |
| ٤- گران هتل | گۆڵدین مایەر | ١٩٣٢ | ئەدمۆند گلدینگ | فکتور فلمینگ | |
| ٥- بایردوو | گۆڵدین مایەر | ١٩٣٩ | دیڤید ئۆسلزنیك | کلارك گیبل | |
| | | | | برت لانکستەر | |
| ٦ لێرەوە هەتا هەتا | کۆلۆمبیا | ١٩٥٣ | فردزینمان | | |
| ٧- هاملێت | ئۆتورانك | ١٩٤٨ | لۆرانس ئۆلیڤی | لۆرانس ئۆلیڤی | جین سیمونز |
| ٨- کیلۆپاترا | فۆکس | | | ریتشارد برتون | ئەلیزابێت تایلۆر |
| ٩ یولیۆس قەیسەر | گۆڵدین مایەر | ١٩٥٣ | جۆزێف مانکە | مارلۆن براندۆ | |
| ١٠ زرێ پۆشی پۆتمکین | سۆڤیەت | ١٩٢٥ | سێرگی میخائیلو | | |
| ١١- دایك | سۆڤیەت | ١٩٢٦ | ڤیج | | |
| • کەشتی ئەتلانتا | فرانسە | ١٩٤٣ | دافژنکو | | |
| ١٣- بن هور | گۆڵدین مایەر | ١٩٥٩ | ژان ویکو | چارلستون | |
| | | | ویلیام وایلەر | هستون | |
| ١٤ سپارتاکوس | یونفرساڵ | ١٩٦١ | ستانلی کوبریك | کریك دوگلاس | |
| ١٥- کڵاوی پووش | | | | | |
| خورمای ئیتاڵی | فرانسە | ١٩٢٨ | مارسیل کارنە | | |
| ١٦- رووداو | ئیتالیا | ١٩٦٣ | میکل ئە نجلو | | |
| ١٧- پردێ بەسەر | کۆلۆمبیا | ١٩٥٧ | دیڤید لین | ولیام هۆلدن | |
| رووباری کوای | | | | | |
| ١٨- سەرگێژە | پارامونت | ١٩٥٨ | هیتشکۆك | جیمس ستوارپ | |
| ١٩ دوا پیاو | ئەڵمانیا | ١٩٢٤ | فردریکۆ مۆرناو | | |
| ٢٠- بیابانی گەرم | ئیتالیا | ١٩٦٤ | میکل ئە نجلو | | مونیکاو بتی |
| ٢١- بلیار باز | فۆکس | ١٩٦١ | رابرت راسن | جاکی کلیسون | |
| | | | | پل نیومەن | |
| ٢٢- ئەگرندیسمان | بریتانیا | ١٩٦٦ | میکل ئە نجلو | دیڤید همبتکر | وانیسارد گریو |
| ٢٣- بەدبەختییەکانی ژاندارك | دانیمارك | ١٩٢٨ | کارل تیودۆرا | | |
| • ...سومون | یابان | ١٩٥٠ | کروزاوا | | |
| ٢٥- ٨,٥ | ئیتالیا | ١٩٥٨ | فیدریکو | ماچلو | |
| | | | فیلینی | ماسترۆیای | |
| ٢٦ ئازادی بۆ ئێمە | فرانسە | ١٩٤٢ | رنەکلر | | |
| ٢٧- مایەرلینگ | ئیرۆفیلمز | | ئەناتول لیتواك | شارل بوایە | |

# شاکارە بەناوبانگەکانی شانۆ

| ناوی شانۆیی | ناوی نووسەرەکەی |
|---|---|
| ژنە گۆرانی بێژی سەر بێ تووك | ئۆجین یۆنسکۆ |
| ئەوەی وتی نا ئەوەی وتی با | برتۆلت بریشت |
| ئەدواردی دووەم | کریستۆفەر مارلۆ |
| ئاگامەمنوون | ئەشیلۆس |
| هەروردەکانی | ئەریستۆفان |
| ئۆپەرای سێ پووڵ | برتۆلت بریشت |
| ئاتیلوو (عطیل) | شەکسبیر |
| ئوستادی میعمار | ئیپسن |
| سۆنەی وەحشی | ئیپسن |
| ئالسست | ئوری پیر |
| ئاندرۆماك | ئوری پیر |
| ئەلەکترا | سۆفۆکل |
| ئەنتیگۆنا | سۆفۆکل |
| ئۆدیب شەهریار | سۆفۆکل |
| ئۆتۆبۆسێك بەناوی هەوەس | تینسی ولیامز |
| ئیفی ژنی | گۆتە |
| جیمز ئەلدریج | ولایەتی چل و نۆهەم |
| ئای ئەبیایان | یۆجین ئۆنیل |
| ئەسیر | پلۆتۆس |
| ئاخری بەهەشت | پریستلی |
| ژن هێنانی پیاوی میسەسیپی | فردریك دۆرینمات |
| ئەمە نووسرا | فریدریك دۆرینمات |
| ئۆپەرای بانکێکی تایبەتی | فریدریك دۆرینمات |
| ئامغی تریون | پلۆتۆس |
| ئەوای تەپل لە دڵی شەودا | برتۆلت بریشت |
| ئولولاریا | پلۆتۆس |
| ئانا کریستی | یۆجین ئۆنیل |
| ئەلەکترا تەعزیەبارە | یۆجین ئۆنیل |
| ئەو جێگەی وا دیاری کراوە | یۆجین ئۆنیل |
| ئەلسید | کۆرنی |
| بالکون | جان جینە |
| بێوەژنی زانکۆ | ئەدر جۆرج |
| باخی دڕندەی شووشەیی | تنیسی ولیامز |
| ئاگاداری بەهار | فرانك ودکیند |
| لە دەردوە لە دەم دەرا | ولفگانگ ودکنگ |
| مرۆڤ و سەردووی مرۆڤ | بەرنادشۆ |
| مرۆڤ مرۆڤە | برتۆلت بریشت |
| مەیموونە تووك درێژەکان | یۆجین ئۆنیل |
| دێنە شاردوە | پریسلی |
| براون خوای گەورە | یۆجین ئۆنیل |
| بە توورِەییەوە ئاورِێك | جان ئازبرین |
| پیرەمێرد | ماکسیم گۆرگی |
| باڵندەی شین | مۆریس میترلنگ |

پیگمالیون
پایەکانی کۆمەڵ
باوك
باڵدارێکی بچووکی سپی
پیتەر و دەندی
پەنجەرە
تینویەتی
تەواوی کوڕەکانم
تۆفان (گەرداو)
بازرگانی ڤینیسیا
تەیموور لنگ
پیلانی فیسکو
هاوینی چەسپاو
یۆلیۆس قەیسەر
ژنە جادووەکانی سالم
جۆنزی ئیمپراتۆر
شەڕی حەوت سوڵتان
دوور دیارێك لە پرد
کێ لە ڤیرجینیا ولف دەترسێت
لەسەرخۆ
حکوومەتی سەربازی
خوێنی بامێرگەکان
خاڵی گوڵ
خەڵوەتگا
ڕەزیل
ڕووداوی دەروێشی
لە ماڵا چۆنن ؟
درۆزن
دوکانی قاوە فرۆشی
دۆن جوان
لەناوچەیەکی شەڕدا
دوژمنی میللەت
دکتۆر ناستوس
دۆن کارلۆس
لە کۆمەڵە شارەکان دا
کچی پلیاس
دەورانی چاو برکێ
دنیای پال سنکی
دوژمنی تایبەتی
دروست کاری
داوێن پیسی پاك
ڕێ گران
ڕۆژانی بێ کۆتایی
ڕۆمیۆ و جولێت
خەونی نیوەشەوێکی هاوین
روسولوسی گەورە

بەرنادشۆ
ئیپسن
ستریند بورگ
سێر جێمس مایتو
سێر جێمس مایتو
فردریك دۆرینمات
یۆجین ئۆنیل
ئارثور میلەر
شکسبیر
شکسبیر
کریستۆفەر مارلۆ
فردریك شیللەر
تینسی ولیامز
شکسپیر
ئارثور میلەر
یۆجین ئۆنیل
ئەشیلۆس
ئارثور میلەر
ئەدوارد ئەلبی
ئارثور میلەر
ئەلبێر کامۆ
جان ئاربۆن
تنیسی ولیامز
سارتەر
مۆلێیر
ئارثور میلەر
بریستلی
کارلۆ گولدونی
کارلۆ گولدونی
مۆلێیر
یۆجین ئۆنیل
ئیپسن
کریستۆفەر مارلۆ
شیللەر
برتۆلت بریشت
ئوری پید
تینسی ولیامز
جان ئازبن
جان ئازبن
ئەلبێر کامۆ
سارتەر
شیللەر
یۆجین ئۆنیل
شکسپیر
شکسپیر

| | |
|---|---|
| | فردریك دۆرینمات |
| خەیاڵەکانی سیمۆن ماشار | برتولت بریشت |
| زیندوویی | هانری تراوبا |
| ژنی بێ نرخ | ئۆسکار وایلد |
| ژنی نیکدل سچون | بریشت |
| زێرینی پرچ | پریستلی |
| ژنانی عیلم باز | مۆلێر |
| ژنەکانی تراخیس | سۆفۆکل |
| ژنانی تەرواده | سارتەر |
| ژیانی گالیلۆ | بریشت |
| ژاندارك | برناردشۆ |
| سالۆمی | وایلد |
| گەشتی دوور و درێژ بۆ وەتەن | یۆجین ئۆنیل |
| قەیسەر و کیلۆپاترا | بەرناردشۆ |
| پەتاتەی سوورەکراو لەگەڵ هەمووشت دا | ئەرنولد ویسکر |
| تێپەڕینی رۆژ لە شەودا | ئۆنیل |
| مێردی پەسەند | ئۆسکار وایلد |
| شکۆنتلا | کالیداسا |
| شەوی ئیکوانا | تنیسی ویلیامز |
| شۆڕشی ئەستووریەکان | تنیسی ویلیامز |
| شەیتان و خوا | سارتەر |
| شەیتانێك لەناو پێستکدا | جان ئازبەرن |
| کورسیەکان | ئۆجین یۆنسکۆ |
| دڵداران | کارلۆ گولدونی |
| داد پەروەران | ئەلبێر کامۆ |
| خۆر ئاوابوونی دوا رۆژی پایزییەکان | دۆرنمات |
| شکۆ و تیاچوونی شاری مانا گۆنی | بریشت |
| فرانسیسکا | فرانك ود کیند |
| فاوست | گۆتە |
| فریشتەیەك دەڕوات بۆ بابل | دۆرنمات |
| قوربانی | تاگوور |
| پێش ئەمە لێرە بووم | پریستلی |
| کورنیلوس | پریستلی |
| کارمن | پرۆسپە مرێمە |
| کار و کاسبی وارن خانم | بەرناردشۆ |
| گۆشەگیرەکانی ئالتونا | سارتەر |
| کەرکەدەن | ئۆجین یۆنکسۆ |
| پشیلەیەك بەسەر چینکۆیەکی گەرمەوە | تنیسی ویلیامز |
| گەنجی پڕ مەترسی | پریستلی |
| بارمتە | برندن بهن |
| مەلیك لیر | شکسپیر |
| لوتەر | جان ئازبرن |
| لالو کاندیرا | کارلۆ گولدونی |
| خەڵکی سەرگەردان | پریستلی |
| بینینی پیرەژنێك | دوورنمات |
| قوتابخانەی ژیان | مۆلێر |

| | |
|---|---|
| مانگە شەوی دورگەی کاریبی | نۆنیل |
| ماجور باربارا | برناردشۆ |
| تەم | نۆنیل |
| مردووە بێ کفن و گۆڕەکان | سارتەر |
| مێش | سارتەر |
| پیاوێك کە بە تەواوی خۆش بەخت بوو | ئارثومیلەر |
| مەکبەث | شکسپیر |
| نووسین لەسەر گۆڕی جۆرج دیلن | جان ئازبەرن |
| شاژنی هیندی | دایدن |
| نوێژ بۆ راهیبەیەك | ئەلبێر کامۆ |
| زەنگوڵەکان | زیلبرت ئابوت |
| هونەرپیشە | جان ئازبەرن |
| لەپڕ هاوین تێ پەڕیوە | ویلیامز |
| نیکرا سۆف | سارتەر |
| وڵات سبەینێیە | پریستلی |
| کاتێك ئێمەی مردوو رادەپەڕین | ئیپسن |
| ویلهلم تل | شیللەر |
| وەسیەت نامە | جێمز مایتو |
| هەر کول و تەویلەی ئۆجیاس | دۆرنمات |
| تەواوی گێلەکان | جۆرج چاپمەن |
| هەوەس لە ژێر داری ئاروەن دا | یۆجین ئۆنیل |
| هاملیت | شکسپیر |
| هیندیە راکەرەکان | ژیلبرت ئابووت |
| هیپولیت | ئوری پید |
| هیلین | ئوری پید |
| سەر زمانی هەنگوینی | شیلا دلینی |
| ڕووداوێکی پێ کەنین | کارلو گولدونی |

## چەند زاراوەیەك
## کە لە شانۆییدا بەکاردەهێنرێن

١- ئاکتەر: هونەر پیشەی پیاو لە تیاترو سینەمادا.
٢- ئاکسیون: ناوەڕۆکی نووسراوەکە.
٣- ئامفی تیاتر: جێگەی دانیشتنی تەماشەکەران کە زۆربەی بە شێوەیێکی نیوە بازنە بەڕیز لە پشتی یەکەوە کورسی دانراوە.
٤- بنکەی شادمانی: ئەو جێگەیە کە چەند لاسایی کەرێك جۆرێکی تایبەتی شانۆی خۆماڵی ئەنجام دەدەن بە جووڵانەوەی سەیر سەیر تا خەڵکەکە بە پێکەنین بهێنن.
٥- پێش پەردە: شانۆییەکی کورتە چەند ئاکتەرێك ئەنجامی دەدەن زۆرتر لەگەڵ هەڵبەست و گۆرانی و مۆسیقادا پێش کەش دەکرێ.
٦- تیاتر: تەماشا خانە. شانۆ.
٧- تانتوسیم: شانۆییەکە گفتوگۆ هەر بە جووڵانەوە و دەموچاو و لەگەڵ مۆسیقادا ئەنجام دەدرێت.
٨- تراجیدی: جۆرێکە لە شانۆیی کە پاڵەوان یان چەند پاڵەوانێکی تێدا دەمرێت.. واتە سەر نەکەوتن و مەرگی قارەمان.
٩- دراما: پێشان دانی داستانێکە کە دەیەوێت باسی ڕووداوەکانی ناجۆر و نالەباری ژیان پێشان بدات.

١٠- دیالۆگ: وتو ویژ و لێد دوان.
١١- ڕۆڵ: شێوەی کاری ئەکتەر.
١٢- ریتم: توند و خێرایی یان خاوی و لەسەر خۆ قسەکردن و ڕووداوی شانۆیی.
١٣- ژست: هونەری ئاکتەر.

ئاکتەر بە سێ شێوە هونەری خۆی دەردەخات
١- قسە کردن
٢- می میك واتە جووڵانەوە و حاڵەتی دەموچاو.
٣- جووڵانەوەی لەش.

١٤- سن: جێگەی یاریی شانۆیی.
١٥- کۆمیدی: شانۆیی پێکەنین.
١٦- کومیك: ئاکتەرێك کە هەمیشە ڕۆڵی پێکەنین بگێڕێ.
١٧- گریم: روخسار و گۆڕین بە ڕەنگ و ئارایش و شتی دی.
١٨- گویمور: ئەو کەسەی وا روخساری ئاکتەرەکان دەگۆڕێت و ئارایشت دەکات.
١٩- لۆژ: جێگای تایبەتی لە تەماشاخانەدا.
٢٠- میلودرام: درامایێکی تێکەڵ بە گۆشەی شادی بەخش.
٢١- منودرام: درامایێك تەنیا یەك کەس ئەنجامی دەدات.



یوهان فۆرد



سوفیا لۆرێن



جۆنز جۆنیفێر



چارلی چاپلین



ئێلیزابێت



هێنری فۆندا



ئالفرێد هیچکۆك



ئانتۆنی کوئین



رۆبێرتۆ رۆسۆلینی



مەك كارتی



رۆبێرت میتشام

زانیاریی مرۆڤ سنووری بۆ نییە، وا بەرەو ئەستێران ملمان ناوە هەر رۆژێك نیشانەیەکی کەشی
تەکنەلۆجیای مرۆڤ بەرەو هەلە لە پەلامار دایە، ئێستاش بۆ باشتر کردنی ژیان و حەسانەوە و زیندە بە چاڵ
کردنی غەم و تەمی تێکڕایی لەناو گەلانی سەرتاسەری گێتیدا نەوەستاوە و لە تەقەلا دایە.
ئەمڕۆ ئیمەی مریف دیواری دەنگمان هاڕیوە بە یەك دا بە خێرایی و چەسپانی لە جوولانەوە داین و
هەر ساتێك ئەم خێراییە زۆرتر و تیژتر دەکەین، جاد دەرکەوتووە بناغەی زیندوویی جوولانەوەیە و
وەستان و سیسی واتە مردن و لەناوچوون، واتە شۆرکردن بۆ هێرشی جندرمەکانی کەمتەرخەمی و نەخۆشی
و لە ئاکامدا بە فیڕۆ ژیان؛

ئەوڕۆ جوولانەوەی وەرزش راستەقینەیەکە پێویستی بە ڕوون کردنەوە نییە، ئەگەر هەتاو چاوگەی
ژیان بێت جوولانەوە و وەرزش گەشانەوەی ئەو چاوگەیە، جا با هەموومان نرخ و ڕێزی وەرزش بگرین،
چونکە بێ گومان لەپیریدا پاداشتمان دەداتەوە و قۆلی چەوساوەی ژێر هێزی رۆژگار و ساڵانمان دەگرێت و
دەڵێت: چاوت لێیە جۆنم بۆت؟

ساڵانی رابردوو وەرزش پیشەیەك بووە بۆ ژیان، بۆ ناو ناویش بۆ دەسەڵات و پارە و زێڕ، بەڵام ئەگەر
تێکڕایی بنوارینە چونیەتی وەرزش لە دنیای ئەمڕۆدا گرنگی و مەزنی هەروەها بە پێویست زانی وەرزش لە
رواڵەتی تەواوی چینەکانی گەلان دا دەردەکەوێت.

نەتەوە یەکگرتووەکان بەو هەموو توانایەوە تێ ئەکۆشێت ئەگەر بۆ جارێکیش بێت بەرەی رۆژهەڵات و
رۆژاوا یان چەپ و راست پێکەوە لەگەڵ یەکدی بڵێن ئا.. یان.. نا ! بەڵام رێکخراوی یارییەکانی ئۆلەمپیك
هەر چوار ساڵ جارێك چاکترین گەنجانی دنیا لە گۆڕەپانەکانی وەرزش دا کۆدەکاتەوە، دوور لە بیروڕای
رامیاری، یان رەگەز پەرستی تێکڕا بە کۆتاییدا یەك دەم پێکەوە هاوار دەکەن بژی ژیان ! بژی ئاشتی !

کام رێکخراوی جیهان ئەم توانایەی هەیە؟ چ کۆنفرانسێکی جیهان ئاوها بەسەرکەوتووە؟ کەواتە ئەو
گەلانەی وا لە تەقەلادان بۆ پەرەسەندنی وەرزش لە وڵاتەکەیان دا وا دەکۆشن منداڵ و گەنج و پیر بەرەو
وەرزش ببەن ئەندێشەیەکی پووچ و بێ کەڵك نییە.

من لەم بەشەدا دەکۆشم باسی ئەو جۆرە وەرزشانە بکەم کە رێکخراوی ئۆلەمپیك دانی پێدا ناوە وەکو
بە یارییەکی جیهانی و تێکڕایی ئاسیویەتی وەکو وەرزشەکانی قارەمانی، بەرامبەرکێ زستانی، وەرزشی ناو
ئاو، ناو هۆڵ، میکانیکی، دیدوانی "کشافە" جیهان گەشتی و سواری.

هەروەها وەرزشی وا هەیە بەڵام هێشتا شێوەیێکی تێکڕایی بە خۆی نەگرتووە و لەلایەن رێکخراوی
(ئۆلەمپیك)ەوە جاری دانی پێدانەنراوە وەکو وەرزشی زۆرخانە، سامۆ لە وڵاتی ژاپۆن دا، مشت لەگەڵ
بەکارهێنانی پێ، چەند جۆرێکی شیر بازی. بۆیە من تێ دەکۆشم چۆنیەتیی زەواری وەرزشە ناسراوەکانی
ئۆلەمپیك لە ساڵی ١٩٤٢ ز تا ١٩٦٣ کەم و زۆر بۆ خوێنەوارانی ئازیز رۆشن بکەمەوە.

## ١- یارییەکانی هەڕا و گۆڕەپان *Track and field*

ئەم جۆرە وەرزشە چەند چەشنێکە پێکەوە سەرەتا لە سەردەمی یۆنانییەکانەوە کراون و ساڵانی ساڵیش
لە داو و دەزگای دەسەڵاتی رۆمانەکانیش دا ئەنجام دراون، تا لە ساڵی ١٨٩٦ دیسانەوە زیندوو کرایەوە و لەگەڵ
ئەختێك گۆڕین دا.

<u>١- چەشنەکانی هەڕا و گۆڕەپانی پیاوان</u>

<u>هەراکان</u>

١٠٠ مەتر

٢٠٠ مەتر
٤٠٠ مەتر
٨٠٠ مەتر
١٥٠٠ مەتر
٥٠٠٠ مەتر
١٠٠٠٠ مەتر
هەڕای (ماراثون)یش ٤٢ کیلۆمەتر و سەد و نەوەت و پێنج مەترە




**هەراکان لەگەڵ کۆسپ دا**

١١٠ مەتر

٤٠٠ مەتر

٣٠٠٠ مەتر

**جۆرەکانی هاویشتن**

- هاوێشتنی قورسایی
- هاوێشتنی دیسك (ساپ)
- هاوێشتنی ڕم
- هاوێشتنی چەکوش (مارتو)

**چەشنەکانی بازدان**

١- بازی درێژ "یەك بازی"

٢- بازی بەرزی "بەرزە باز"

٣- سێ بازی

٤- چەڵاکەباز (باز بە حەیزەرانەوە)

پیادە ڕۆیشتن:

٢٠٠٠٠ مەتر

٥٠٠٠٠ مەتر




**٢- چەشنەکانی هەرا و گۆڕەپانی ئافرەتان**

١٠٠ مەتر

٢٠٠ مەتر

٤٠٠ مەتر

٨٠٠ مەتر

**- هەرا لەگەڵ کۆسپ دا:**

٨٠ مەتر

٤٠٠ مەتر و تێکەڵ

**- بازدان**

یەك بازی

بەرزە بازی



- **هاویشتن:**
- هاوێشتنی قەرسایی
- هاوێشتنی ڕم

- هاوێشتنی دیسك

## ٢- یارییەکانی ناو ئاو

١- مەلە
٢- باز بۆ ناو ئاو
٣- کاشۆبانێی ئاو "پۆلۆی ئاو"



- بۆ پیاوان:

١- مەلەی سنگ – مەلە باسکەی ڕوو بەڕوو "کرال"
١٠٠ مەتر Free Style
٢- مەلەی سنگ – مەلەی باسکەی ڕوو بە ڕوو "کرال"
٤٠٠ مەتر
٣- مەلەی سنگ – مەلە باسکەی ڕوو بە ڕوو "کرال"
١٥٠٠ مەتر
٤- مەلە بۆقە ٢٠٠ مەتر *Breast Stralre*
٥- مەلەی پەپوولە ٢٠٠ مەتری *Bulter fly stralre*
٦- پشتە مەلە ٢٠٠ مەتری *Back stralre*
٧- مەلەی ٤٠٠ مەتری چوار کەسی، هەر مەلەوانێك ١٠٠ مەتر.
٨- مەلەی ٢٠٠ مەتری ئازاد کە چوار مەلەوان هەر یەکی ٢٠٠ مەتر مەلە دەکەن کە تێکڕا ٨٠٠ مەتر دەبڕن.

مەلەی ژنان:

١- ١٠٠ مەتری ئازاد *Free Style*
٢- ٤٠٠ مەتری ئازاد *Free Style*
٣- ١٠٠ مەتری پشتە مەلە *Back stralre*
٤- ٢٠٠ مەتری بۆقە مەلە *Breast Stralre*
٥- مەلەی ٤٠٠ مەتری چوار کەسی کە هەر مەلەوانێك ١٠٠ مەتر دەبڕێت.

## ٣- بازدان بۆ ناو ئاو

بازدەر کاتێك دەبێت بە یەکەم و قارەمان کە زۆرترین خاڵ کۆبکاتەوە لە دە بازدان دا بۆ پیاوان. لە بەرزایی دە مەتر و پێنج مەتردوە؛ شەش بازیان بەپێی مەرج و چوار بازیان مەلەوان لە چۆنیەتیی جووڵانەوە و بازدان دا سەربەست دەبێت. ئەمەش ئاو و چۆنیەتی جووڵانەوەی چەند جۆرە بازدانی مەلەوانەکانە:

١- جووڵانەوەی ڕوو بە ئاو و سووڕ خواردن لە پێشەوە.
٢- جووڵانەوە پیشت بە ئاو سووڕ خواردن لە پشتەوە.
٣- جوڵانەوە ڕوو بە ئاو و سووڕ خواردن لە پشتەوە.
٤- بازدان لەگەڵ لوول خواردن دا.

## ٤- کاشۆیانێی ناو ناو (واترپۆلۆ) Water Polo

ئەم وەرزشە کە لەناو ناودا دەکرێت بۆ یەکەمین جار لە وڵاتی بریتانیادا لە ساڵی ١٨٧٠ ز دا بڕەوی پەیدا کرد و بوو بە یاریەکی ئۆلەمپیك. ئەم یاریە دوو تیپ هەر تیپەی ٧ کەس و لە ناوی قووڵی و درێژی و پانی دیاری کراودا دەیکەن. ماوەی یاریەکەی ٢٠ دەقیقەیە و کراوە بە دوو بەشەوە.



هەڵە گرتنەکانی ئەم یاریە ئەمانەیە:

١- بە مشت لە تۆپ دان.

٢- داری گۆڵ گرتن.

٣- ناو کردن بە دەموچاوی یاریکەردا.

٤- گرتنی تۆپ بە هەردوو دەست.

٥- خۆخستن بەسەر یاریکەری مەلەوان دا.

٦- کات بە فیرۆ دان.

## ٥- قورسایی هەڵگرتن:

ئەم یاریە بە پێی قەڵافەت و گەپی و کەڵەگەتی یاریکەر حەوت بەشە:



١- کەڵەشێر لەش *Bantam Weight* ٥٤ کگم.

٢- پەڕە لەش *Feather Weight* ٦٠ کگم.

٣- سووکە لەش *Light Weight* ٦٧,٥ کگم.

٤- ناوە لەش *Middle Weight* ٧٥ کگم.

٥- سووکە قورس *Light Heavy Weight* ٨٢,٥ کگم.

٦- ناوە قورس *Middce Heavy Weight* ٩٠ کگم.

٧- هەرە قورس *Heavy Weight* لە ٩٠ بەرەوژوور.

## ٦- زۆران:

ئەمەش کەونترین وەرزشی مرۆڤە و لەگەڵیدا خولقاوە. لە سەرەتاوە نەکو هەر مرۆڤ بە تەنیا بەڵکو هەموو گیانلەبەرێك ئەم زۆرانەیان کردووە.. تاوەکو ئەمرۆش خەڵکێکی زۆر لە ناو میللەتان دا و لە کوردستانیش دا حەزیان لە شەڕە کەڵەشێر و شەڕە بەران و شەڕەگا و شەڕە کەوە، شەرت گرەویشیان لەسەر دادەنێن. زۆران بازی بەپێی سەنگی لەشی یاریکەران بە هەشت بەش دانراوە.



١- سەنگی مێش *Fly Weight* ٥٢ کگم.

٢- سەنگی کەڵەشێر *Bantam Weight* ٥٧ کگم.

٣- پەڕەلەش *Feather Weight* ٦٣ کگم.

٤- سووکە لەش *Light Weight* ٧٠ کگم.

٥- نیوە لەش *Welter Weight* ٧٨ کگم.

٦- ناوە لەش *Middle Weight* ٨٧ کگم.

٧- سووکە قورس ٩٧ کگم *Light Heavy Weight* ٩٧ کگم.

٨- هەرە قورس *Heavy Weight* لە ٩٧ کگم بەسەرەوە.

زۆران بازی دوو جۆری هەیە کە بۆ هەر یەکێکیان ڕێگا و یاسای تایبەتییان داناوە ئەوانیش زۆرانیی ئازاد و زۆرانیی فەرەنگی، جیاوازیشیان لەوە دایە کە لە زۆران بازیی فەرەنگی دا زۆرانباز مافی پێ گرتنی بەرامبەرەکەی نییە، واتە زۆرەملێ تەنیا لە کەمەرو بە بانە.

## ٧- تۆپی پێ" فوتبال"

یاریی تۆپی پێ بە جوانترین و ناسراوترین یاریی جیهانی ئەمڕۆ ناسراوە. گەورە پیاوانی دنیا بۆ تەماشاکردنی یاریی تۆپی پێی تیپی هەڵبژاردەی خۆیان، لەناو تێکرای خەڵك دا ستادەکان دا دادەنیشن و بە دەنگی بەرز هانی تیپی دڵخوازی خۆیان دەدەن.

ئەگەر چی یارییەکی وەرزشی تێکڕای میللەتانە بەڵام لە ڕاستیدا وەکو جووڵانەوەیکی ئابووری لێ هاتووە. ئەوەتا زۆر لە یانەکانی ئەم وەرزشە لە ئەورووپا و ئەمریکای لاتین بە ملیۆنان دۆلار یاریکەر دەکڕن و دەفرۆشن. بۆ تەماشای یارییەکیش هەزاران کەس کۆ دەبنەوە. ساڵی ١٩٠٨ یاریی فوتبال خرایە ناو یارییەکانی ئۆلەمپیکەوە.

ئەمەش هەندێ بنکە و مەرجی ئەم یارییەیە:

١- زەویی یاری ٩٠ × ١٢٠ مەترە.
٢- تۆپی پێ تیرەی ٦٨ سم و سەنگی ٣٩٦ گرامە.
٣- تێکڕا پانزدە کەس یاری دەکەن لە هەر تیپێك دا، یەکێکیان گۆڵچییە و دەیەکانی تریش هەریەکە ناوێکی هەیە.
٤- دەبێت پێڵاوی تایبەتی و وا لە پێ بکەن کە ئاسنی تێدا نەبێت و گۆرەوی پووزەوانەی تایبەتی و دەرپێ و کراسێکی کورتی ڕەنگێکی تایبەتی لەبەر بکەن. ژمارەی یاریکەر بە پشتییەوە دیار و ئاشکرا بێت.
٥- ماوەی یاری نەوەت دەقیقەیە، کراوەتە دوو بەشی ٤٥ دەقیقەیی لەنێوان هەر بەشێك و بەشێك دا ٥ تا ١٠ دەقیقە وچان هەیە.
٦- هەر تیپێك هەوڵ دەدا تۆپەکە بخاتە ناو گۆڵی تیپەکەی ترەوە و نابێ دەست بەکاربرێت.
٧- چوارچێوەی گۆڵ ٢،٤٤ م بەرزی و ٧،٣٢ م درێژییەتی کە لەدوا هێڵی ئەم سەر و ئەو سەری هەردوو لای گۆڕەپانەکەوە داندراون.

ئەو زاراوانەی لە یاریی تۆپی پێدا بەکاردێن:

١- کیك ئەف: *Kick Off* یەکەم شەق لە تۆپ دان لە سەرەتای یارییەوە.
٢- فوڵ بەك: *Full Back* یاریکەری بەرگری (دفاع).
٣- فوڵ بارد *Full Bard* هێرش بەر (مهاجم).
٤- گۆڵ کیپەر *Goal Keeper* گۆڵ چی (گۆڵ پارێز).
٥- فری کیك *Free Kick* لێدانی ئازاد (الضربة الحرة).
٦- کۆنەر کیك *Corner kick* تۆپ لێدان لە قورنەوە بۆ سەر گۆڵ.
٧- پەناڵتی *Panalty* تۆپ لێدان لە نزیك گۆڵەوە بە دووریی ١١ مەتر بۆ ناو گۆڵ کە تەنیا گۆڵچیی تێدا دەبێت.
٨- گۆڵ کیك *Gool kick* تۆپ لێدانی گۆڵچی.
٩- پاس *Pass* تۆپ دانی یاریکەران بە یەکتری.
١٠- شووت *Shot*.

## ٨- یاریی مست (بۆکس)

پێش ئەوەی وەرزشی بۆکسێن بە پێی مەرجێکی تایبەتی لە وەرزشەکانی ئولەمپیک دا هەڵبژێردرێت، تا ئەندازەیەك وەرزشێکی دڕ و خوێناوی بووە و زۆر لە وەرزشکاران بە هۆیە دەمرن. جاران زۆرانی و مست بازی پێکەوە دەکران، بەتایبەتی لە گۆڕەپانێکی تایبەتکدا چەند کوێلەیەکیان بەردەدا گیانی یەکتری و جار جاریش تا مردن بوو. بەڵام دوای بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی ئەم وەرزشە قەدەغە کرا و رەوا نەبینرا، تا ساڵی ١٧٠٠ کە دیسان وەرزشی مست بازی لە بریتانیا دا برەوی پەیداکردەوە و پەرەی سەند.

ئەم وەرزشە لە یارییەکانی ئۆلەمپیك دا بە پێی مەرجی تایبەتی بۆ تازەکاران وەرگیراوە، مست لێدەرە وەرزش پیشەکان مافە بەشداربوونیان نکیە.

١- ئەم یارییە لە سێ سووردا ئەنجام دەدرێت، هەر سوورێك ٣ دەقیقە درێژە دەکێشێت و لە نێوان هەر سوورێك دا یەك دەقیقە وچان دەدرێت.

٢- ناك ئاوت *Knock out*
واتە مست لێدەر ئەگەر گێژکرا و خۆی بە چالاکی لەسەر پێ رابگرێت یان بکەوێتە زەوی تا ژمارەی دەی بۆ دەژمێرن و هەڵ نەستێتەوە.

هەڵەکانی یاری بۆکسین ئەمانەن:

١- مست لە کەمەر بەرەو خواردن.
٢- لێدان بە دەستی کراو.
٣- مست لە پشت مل دان.
٤- مست لە بن دەست یا سەر گورجیلە دان.
٥- لێدان لە یاریکەری کەوتوو قەدەغەیە.

هەر تیپێك لە دە مست لێ دەرنابێت زۆرتر بێت. دابەش کردنی یاریکەریش کراوەتە دە بەشەوە:



١- قورسایی یەکەم تا ٥١ کیلۆگرام.
٢- قورسایی دووەم تا ٥٤ کیلۆگرام.
٣- قورسایی سێیەم تا ٥٧ کیلۆگرام.
٤- قورسایی چوارەم تا ٦٠ کیلۆگرام.
٥- قورسایی پێنجەم تا ٦٣،٥ کیلۆگرام.
٦- قورسایی شەشەم تا ٦٧ کیلۆگرام.
٧- قورسایی حەوتەم تا ٧١ کیلۆگرام.
٨- قورسایی هەشتەم تا ٧٥ کیلۆگرام.
٩- قورسایی نۆیەم تا ٨١ کیلۆگرام.
١٠- قورسایی دەیەم تا ٨١ کیلۆگرام بەسەرەوە.

## ٩- یاریی تۆپی تۆڕ (ڤاڵیباڵ)

ئەم یارییە لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا سەربازەکانی ئەمریکا لە ئاسیا و ئەورووپادا رەواجیان پێ دا و بڵاویان کردەوە، بە شێوەیەکی وا بڵاو بووەوە کە لە ئەمریکاییەکان باشتر پێش کەوتن.

١- زەویی یارییەکەی بە ئەندازەی ١٨ × ٩ مەترە.

٢. تیرەی تۆپی ڤالیباڵ ٦٥ سم سەنگی ٢٥٠ گرامە.
٣. تۆڕی یاری ٩،٥ م درێژ و یەك مەتر پانە.
٤. تۆڕی یاریی پیاوان لە زەوییەوە تا سەری تۆڕەکە ٢،٤٣ مەترە و ئی ژنانیش ٢،٢٤ مەتر.
٥. هەر تیپێك لە شەش یاریکەر پێك هاتووە.

## ١٠- یاریی سەوەتە (بسکتباڵ)

ئەم یارییە لە بنەڕەت دا یارییەکی ئەمریکاییە، ئەگەر یەکێك لە مەرجەکانی ئەم یارییە نەزانێت چێژی لێ وەرناگرێت و هەمیشە مەرجەکانی ئەم یارییە لە گۆڕان دایە:

١. دوو تیپ یاری دەکەن هەر تیپەی پێنج کەسە.
٢. ئەندازەی زەویی ئەم یارییە ٢٦ × ١٤ مەترە.
٣. بازنەیەك بە تیرەی ٦٠ سم لە ناوەڕاستی زەوییەکەدا دەکێشرێت کە بازنەکەی دی کەی لە دەوردایە بە تیرەی ١،٨ مەتر.



٤. ئەو تەختەیەی کەمەی سەوەتەکەی پێوەیە بە ئەندازەی ١،٨٠ × ١،٢٠ مەتر.
٥. لە زەوییەوە تا بەشی خوارەوەی تەختەکە بەرزییەکەی ٢،٧٥ مەترە.
٦. تیرەی تۆپی سەوەتە ٧٥ سم و قورسایی ٦٠٠ گرامە.
٧. یاری دوو گێمە، هەر گێمێك ٢٠ دەقیقەیە.

## ١١- جۆدۆ

ئەم وەرزشە لە راستیدا هونەری خۆپاراستنە لە دوژمن لە هێرشی لەناکاوی دوژمن. چاوگەی جۆدۆ لە وڵاتی ژاپۆنەوە هەڵ قوڵاوە، بەتایبەتی دوای تەواوبوونی شەڕی دووەمی جیهان ئەم وەرزشە لە ئەمریکا و ئەوروپادا گەلێك برەوی پەیدا کرد.. ئێستا لە چوار قورسایی دا لە یارییەکانی ئۆلەمپیك دا دەکرێت.



### یارییەکانی ئۆلەمپیك

تا ئێستا هیچ کەس بە تەواوی نازانێت یارییەکانی ئۆلەمپیك کەی و چۆن پێك هاتوون. تەنیا لە رووی هەندێك لە نووسراوە گڵینە و نەخشە بەرجەستەکانەوە نەبێت کە لە سەردەمی یۆنانییەکانەوە بەجێ ماوە جووڵانەوەی وەرزشی هەروەها پاڵەوان بازییان تێدا ئاشکرایە. بەڵام ئەمە گومانی تێدا نییە کە یۆنانییە کۆنەکان بۆ سەرنج راکێشانی خوا

میتۆلۆژیەکانیان هەموو کارێکیان ئەنجام دەدا و لەوە دەچێت وەرزشەکانی ئۆلەمپیکیش تا رادەیەکی جگە لە وەرزش، رەوشتێکی ئاینی بووبێت. لە هەمان کاتیش دا لە باوەڕێک دا بوون کە لەش و ئەندامی بێ هێز لاواز سەرنجی خواکان راناکێشێت و توانای بەربەرەکانێی دوژمنانی خۆیان و وڵاتەکەیان نیە جیا پەروەردەکردنی لەشێکی بەهێز و توانا پێویستیەکی نیشتمانی و ئاینی بووە.

سەیر لەوە دایە لە رۆژانی یاری کردنی ئۆلەمپیک دا شەڕ و شۆر رادەگیرا و ناکۆکی رادەوەستا تا دوای تەواوبوونی یاریەکان.

ژیاندنەوەی یاریەکانی ئۆلەمپیک لە ساڵی ١٨٩٦ ز دەستی پێ کردەوە و کەم کەم پەرەی سەند تا بوو بە جووڵانەوەیێکی وەرزشی جیهان گیری تێکڕای میللەتان.

ئەمەش ریزی یاریەکانی ئۆلەمپیکی کە لە ساڵی (١٨٩٦)ەوە تا ساڵی ١٩٦٨ کراون:

| ساڵ | شار | بەشداریی چەند میللەت | ژمارەی وەرزشکار |
|---|---|---|---|
| ١٨٩٦ | ئەثینا | ١٣ میللەت | ٢٨٥ |
| ١٩٠٠ | پاریس | ٢٠ | ١٠٦٦ |
| ١٩٠٤ | سان لوئی | ١٠ | ٥٣٣ |
| ١٩٠٨ | لەندەن | ٢١ | ٢٠٧٩ |
| ١٩١٢ | ستۆکهۆڵم | ٢٧ | ٢٥٣٩ |
| ١٩٢٠ | ئانورس | ٢٩ | ٢٦٩١ |
| ١٩٢٤ | پاریس | ٤٤ | ٣٠٩٢ |
| ١٩٢٨ | ئەمستردام | ٤٦ | ٣٠١٥ |
| ١٩٣٢ | لۆس ئەنجلس | ٣٨ | ١٤٠٨ |
| ١٩٣٦ | بەرلین | ٤٩ | ٤٠٥٩ |
| ١٩٤٨ | لەندەن | ٥٩ | ٤٤٦٨ |
| ١٩٥٢ | هەلسنکی | ٩٦ | ٥٨٦٧ |
| ١٩٥٦ | ملبۆرن | ٦٧ | ٣٥٥٩ |
| ١٩٦٠ | رۆما | ٨٤ | ٥٣٩٦ |
| ١٩٦٤ | تۆکیۆ | ٩٤ | ٥٧١١ |

# ئافرەتانی بەناوبانگی مێژوو

١- **ئادامس "جین" Adams (١٨٦٥ – ١٩٣٥ ز)**

ئافرەتێکی ناسراوی مرۆڤ دۆستی ئەمریکاییە، لە ساڵی ١٩٣١ دا خەڵاتی ئاشتیی (نۆبل)ی پێ دراوە بە بۆنەی رەفتار و کرداری پڕ لە مرۆڤایەتی دەربارەی مرۆڤە لی قەوماوەکان.

٢- **ئاسترید (١٩٠٥ – ١٩٣٥ز)**

کچە شازادەییێکی ولاتی سوێدە، شووی بە پاشای بەلجیکا کرد، لەبەر رەفتاری ناسک و پەسندی خۆی لەگەڵ چینەکانی میللەت دا گەلێك لەلای میللەتی بەلجیکا خۆشەویست بووە. لە رووداوێك دا مردووە.

٣- **ئارتمیزی دووەم (٣٥٣ی پێش زایین)**

شاژن هالیکارناس مەزارێکی بۆ موزۆلوسی مێردی دروست کرد کە یەکێکە لە حەوت شتە دەگمەنەکانی جیهان.

٤- **ئاگوپین (لە ساڵی ٣٣ی پ. ز دا مردووە)**

شازادەیەکی رۆمی بووە و کچەزای ئەگوست، شووی بە (جەرمانیکۆس) کردووە نۆ منداڵی لێی بووە کە دوانیان زۆر ناسراون:

١- کالیگۆلا

٢- ئاگریپین

بەفەرمانی تیبریۆس دووخراوەتەوە بۆ دورگەی پاندا.

٥- **ئامینە**

کچی عەبدولطەلیب و پووری پێغەمبەری خوا محمد (ص).

٦- **ئامینە**

کچی ئەبو سوفیان بووە ژنی پێغەمبەری خوا محمد (ص).

٧- **ئامینە**

کچی وەهەب، ژنی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولطەلیب و دایکی محمد پێغەمبەری خوا (ص) بوو، کاتێك پێغەمبەر نۆ ساڵان بووە ئامینە لە دنیا دەرچووە.

٨- **ئامیتیس**

شازادەیەکی ماد و کچەزای کەیەکسار پاشای مادەکان بووە، شووی بە (بەختولنەصری) پاشای بابل کردووە.

٩- ئاپیكاریس Epictete

ژنێك بووه له سەردەمی نیرۆن دا, دژی نیرۆن تێكۆشاوە, ویستوویەتی نیرۆن بكوژێت پێی زانراوه و گیراوە, بەلام ناوی هاودەستەكانی نەوتووه و خۆی كوشتووە.

١٠- ئاپینەی Epinay ( ١٧٢٦ – ١٧٨٣ ز )

ژنێكی ناوداری گەلی فرانسەیە و یاریدەری راستەقینەی ژان ژاك رۆسۆ بووه.

١١- ئادكسی Eudoxie

له سالی ٤٠٤ی زایین دا مردووە, شاژنی رۆمی رۆژهەلات و تینووی هێز و دەسەلات بووه.

١٢- ئادكسی Eudoxie ( ١٦٦٩ – ١٧٣١ ز )

شاژنی ولاتی روسیا و ژنی پەتروسی گەوره بووه.

١٣- ئادیث

ناوی ژنەكەی لووط پێغەمبەره گوایە بووە بە پەیكەرێك لە خۆی.

١٤- ئارهارد ( ئەمیلیا ) Earhart

یەكەمین ئافرەتێكە كە له فرۆكەیەك دا لەگەل پیاوان دا ئۆقیانووسی ئەتلەسیان بڕی.

١٥- ئەسماء ( ذات النطاقین )

له سالی ٧٣ ی كۆچی دا مردووە, كچی ئەبو بەكر (رض) و ژنی زبێری كوڕی عەووام و دایكی عەبدوللای كوڕی زبێره ژنێكی گەلێك ناودار و پەسەندی مێژووی ئیسلام بووه.

١٦- ئەسماء

كچی نوعمان كوڕی ئەبی جون ئەلكیندییە, ئافرەتێكی ناسراوی میللەتی عەرەب و شازادەی كینده بووه.

١٧- ئەسماء

كچی یەزیدی كوڕی سەكەن ئەلسەهلی و یەكێكە بە نزیكەكانی پێغەمبەری خوا (ص).

١٨- ئەسماء ئەلعامرییە

له بنەمالەی (بەنی عامر) و شاعیرێكی بە توانا و ناوداری سەردەمی ئەندەلووس بووه.

١٩- ئیمامە

ئافرەتێكی ئاعیری سەردەمی پێغەمبەری خودا (ص) بووه.

٢٠- ئوم ئەلبەنین

كچی عەبدولعەزیزی كوڕی مەروان و خوشكی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز و ژنی وەلیدی كوڕی عەبدولەلیك كوڕی مەروان بوو.. ژنێكی ناوداری سەردەمی ئەمەوییەكانە.

**٢١- پارتون (کلارا) ١٨٢١ – ١٩١٢ ز**

دانەری ڕێکخراوی (سەلیبی سوور)ە لە ئەمریکادا.. لە شەڕەکانی ناوخۆدا توانی ناوی زۆر لە کوژراوەکان بدۆزێتەوە و لەسەر گۆڕەکانیان ناویان بنوسێت.. لە دواییدا بوو بە سەرۆکی ڕێکخراوی سەلیبی سووری ئەمریکا.

**٢٢- جەمالونیسا**

لە ساڵی ٦٤٠ی کۆچیدا لە بەغدا مردووە، (جمال النساء) ئافرەتێکی قسەڕەوانی زانا و بەناوبانگی سەدەی حەوتەمی کۆچییە.

**٢٣- حەبی**

ئافرەتێکی شاعیری دەربارەی سوڵتانی عوسمانی بووە، زۆر بە دەسەڵات و هاودەمی سوڵتان سەلیمی دووەم بووە.



**٢٤- حەپسە خانی نەقیب**

کچی شێخ مارق نەقیبە ساڵی ١٩٠٥ لە سلێمانی لە دایك بووە ژنی شێخ قادری برای شێخ مەحموودی نەمر بوو. خانمێکی بە دەسەڵات و زیرەك و چاکە خواز بووە، هەمیشە یارمەتیی هەژاران و داماوانی داوە. لە ساڵی ١٩٥٣ دا کۆچی دوایی کردووە و لە سەیوان نێژراوە.

**٢٥- خەنسا**

شاعیرێکی ژنی سەردەمی ئیسلام و پێش ئیسلامە لە نیوە دورگەی عەرەب دا بە شیعری شیوەن بەناوبانگە.

**٢٦- خانزاد**

میر ژنێکی کوردی میرنشینی سۆران بووە لە حەریر، پاش سلێمان بەگی برای کاروباری میرنشینەکەی گرتوتە دەست و ئافرەتێکی کارامە و ئازا بووە.

**٢٧- ژاتولخاڵ**

ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی دەربای هاروونە رەشید و ناوی "خەنەت" بووە لەبەر ئەوەی خاڵێکی جوان بەسەر لێویەوە بوو وا ناونراوە.

**٢٨- راحێل**

ژنی حەزرەتی یەعقووب و دایکی حەزرەتی یووسف پێغەمبەر بووە.

**٢٩- زیبولنساء (بەگم) ١٠٨٤ – ١١١٣ ك**

کچی پاشایەکی هیندستان و خۆش نووس و شاعیر و نووسەرێکی ناوداربووە و تا مردن شووی نەکردووە، گۆڕەکەی لە شاری دەلهی دایە.

٢٠- زەینەب

کچی حەزرەتی عەلییە, لە رووداوی خوێنێتی کەربەلادا لەگەڵ حسێنی برای دا بوو. ئافرەتێکی قسەزان بووە.

٢١- زولێخا

ژنی عەزیزی میصری و دڵداری حەزرەتی یووسف بووە.

٢٢- زەنووبیا

شاژنی شاری تەدمور بووە پێش ئیسلام و دژ بە رۆمانی داگیرکەر بووە.

٢٣- جوزفین ١٧٦٣ – ١٨١٤ ز

شووی بە ناپلیۆن کرد و لە ساڵی ١٨٠٤ز دا بووە بە ئیمپراتۆری وڵاتی فرانسە.

٢٤- سوکەینە

لە ساڵی ١١٧ ك دا مردووە, ژنێکی زۆر جوان و رەزا شیرین و کچی حەزرەتی حسێن بووە, ماڵەکەی پانەی شاعیرانی سەردەمی خۆی بووە وەکو فەرەزدەق و جەریر. شووی بە میصعەبی کوڕی زبێر کرد, دوای کوشتنی میصعەب شووی بە عەبدوڵلای کوڕی حەزرەتی عوثمان کرد, دوای مردنی عەبدوڵلاش شووی بە زەیدی کوڕی حەزرەتی عومەر کرد بەڵام لەسەر داوای سلێمانی کوڕی عەبدولەلیك زەید تەڵاقی دا.

٢٥- سەمیرامیس

شاژنی ئاشوور گوایە (حدائق المعلقة) بۆ ئەم شاژنە دروست کراوە.

٢٦- عاتیکە

کچی عەبدولطەلیب ویەکێك بووە لە ژنە شاعیرەکانی هۆزی قوڕەیش.

٢٧- عادیلە خانم

ژنی وەسمان پاشای جاف بووە و دایکی شاعیرانی وەك خوا لێ خۆش بوو طاهیر بەگ و ئەحمەد موختار جافە.

٢٨- فاطیمە

کچە پێغەمبەری خوا (ص) و ژنی حەزرەتی عەلی و دایکی حەسەن و حسێنە, شەش مانگ دوای کۆچی پێغەمبەری خوا مردووە.

٢٩- قەدەم خێر



ئافرەتێکی شۆڕشگێری کورد بووە لە هۆزی زەند, دژ بە دەسەڵاتی قاجارەکان بەشەڕ هاتووە هەتا وەکو نامەشی بۆ شێخ مەحموودی نەمر نووسیوە لە ئاکام دا تووشی سیل هاتووە و مردووە.

٤٠- کاترینی دووەم (١٧٢٩ – ١٧٩٦ ز) شاژنێکی هوشیار و زیرەك و بە دەسەڵات و ناودار بوو بە کاترینی گەورە، مێردەکەی لەسەر تەخت لابرد و خۆی بوو بە شا و لە سەردەمی ئەودا رووسیا دەسەڵاتێکی زۆری پەیدا کرد و ئەم شاژنە زۆریشی حەز لە رابواردن کردووە و لەم رووەوە بە پێی هەوەسی دڵی خۆی جووڵاوەتەوە.

٤١- مەستوورە ماە شەرەف خانمی کچی ئەبولحەسەن بەگ و لە شازادەکانی ئەردەلانە، ساڵی ١٢٢٤ ك بۆتە ژنی خوسرەو خانی والی سنە، ژنێکی شاعیر و نووسەر بووە بە کوردی و بە فارسی.

## شاژنە ناودارەکانی مێژوو

| ناو | سەدە | وڵات |
|---|---|---|
| مەلیکە ئان | ١٧ ز | بریتانیا |
| ئەلیزابێتی یەکەم | ١٦ | بریتانیا |
| ئەلیزابێتی دووەم | ٢٠ | بریتانیا |
| ئۆژنی | ١٩ | فرانسە |
| ئیزابیللا | ١٦ | ئیسپانیا |
| بودیکا | ١ | بریتانیا |
| تیودۆرا | ٦ | رۆمانی کۆن |
| جین گری | ١٦ | بریتانیا |
| زەنوبیا | ٣ | تەدمور |
| جولیانا | ٢٠ | هۆڵەندە |
| سەمیرامیس | ٢٠ پ. ز | بابل |
| کاترینی گەورە | ١٨ | روسیا |
| کلیۆپاترا | ١ پ. ز | میصر |
| ماری ئەنتوانێت | ١٨ | فرانسا |
| ماری ستوارت | ١٦ | بریتانیا |
| ماری لویز | ١٨ | نەمسا |
| مسالینا | ١ پ. ز | رۆمانی کۆن |
| نفرتیتی | ١٣ پ. ز | میصر |
| نورجیهان | ١٥ | هیندستان |
| ڤکتۆریا | ١٩ | بریتانیا |
| ویلهل مینا | ٢٠ | هۆڵەندە |

## دڵدارە ناودارەکانی مێژوو

ئەدواردی هەشتەم: مادام سیمپسون
١- ئەلوار: هلونیز
٢- ئەمیر ئەرسەلان: فەرۆخ لیقا
٣- بێژەن: مەنیجە
٤- پۆل:رویر ژینی
٥- تریستان: ئایزوت
٦- جەمیل: بثەینە
٧- داود: بتسامە
٨- رابیعە :بەکتاش
٩- رۆمیۆ: جولێت
١٠- سامسۆن: دەلیلە
١١- سلێمان: بەلقیس
١٢- شرین: فەرهاد
١٣- طاهیر: طاهیرە
١٤- قەیس: لوبنا
١٥- کلاراویك: رۆبەرت شۆمان
١٦- کیلۆپاترە: ئەنتۆنیۆ
١٧- لێدی هاملتۆن: لۆرد نیلسۆن
١٨- لەیلا: مەجنوون (قەیس)
١٩- مارگریت: تاوزەند
٢٠- مۆسۆلینی: کلارا پیتاچی
٢١- ناپلیۆن: جۆزفین
٢٢- نەفرتیتی: ئەخناتوون
٢٣- وامیق: عەذرا
٢٤- ودلی دێوانە: شەم
٢٥- ویس: رامین
٢٦- هەنری هەشتەم: ئان پۆلین
٢٧- هیلین: پاریس
٢٨- مەم: زین
٢٩- هیتلەر: ئیڤا براون
٣٠- یووسف: زولێخا

# میوه و سەوزە

ناوی لیمۆ:
بۆ ئەم نەخۆشییانە باشە:
کەم خوێنی، سۆزەنەك، نەخۆشیی شەکر، نەخۆشییەکانی جەرگ





ئیسپێناخ:
بۆ دەرد و ئازاری جومگەکان چاکە، یارمەتییەکە بۆ ئەوانی تووشی سیل هاتوون. بۆ ئەم نەخۆشییانە بە کەلکە:
راچڵەکین، بۆنی دەم، نەخۆشیی دڵ.

ئەناناس:
میوەیێکە دژی شەهر باشە

هەنجیری تازە:
بۆ نەخۆشیی سی و توورەیی

ترێ:
بۆ کەم خوێنی چاکە، خوێن نەرم دەکاتەوە و بۆ باداریش چاکە.

پاقلە:
دەرد ئارام دەکاتە ، بۆ نەخۆشیی رەوانی چاکە.

پرتەقاڵ:
میوەیەکە سك کار پێ دەکات. بۆ قەڵەو نەبوون باشە دەمار (ئەعصاب) ئارام دەکاتەوە.

پستە (فستەق):
بستەی نەگەیشتوو بۆ رەوانی باشە و گەیشتووش بۆ بەهێزی.

پیاز:
دژی میکرۆبە و بۆ هەزم کردنی خواردن باشە.

دنەی گوڵە بەرۆژە:
بۆ کۆکە، گەری و دەمار باشە.

توور:
بۆ گیری (قەبزی) باشە.

تەرە تیزە:
بۆ نەخۆشییەکانی پێست و شەکر باشە.

توو:
بۆ نەخۆشیی سینگ باشە.

خورما:
توانا بەخشە ڤیتامینی A, B, C ی تێدایە.

خەیار:
بۆ نەخۆشییەکانی جەرگ باشە و ئاوەکەشی پێست نەرم دەکەتاوە.
دارچینی:
دەمار بەهێز دەکات و بۆ نەخۆشیی شەکر و ئەسیدی خوێن باشە.
زەردەلوو:
دژی کەم خوێنی و قەڵەوییە.
زەیتوون:
دژی نەخۆشییەکانی جەرگ و شەکرە.
سماق:
ژەهری ناو خوێن لەناو دەبات.
سێو:
دڵ بەهێز دەکا، مێشک هۆشیار دەکات، بۆ گەدە باشە.
پەتاتە:
بۆ دڵ و مێشک باشە.
سیر:
میکرۆب کوژە، بۆ ئەم نەخۆشییانە چاکە:
ڕەوانی، برنشیت، پەستانی خوێن، تاعوون، گریبا، ڕۆماتیسم، ئەقرەس، نەخۆشییەکانی پێست، نەخۆشیی دڵ.
بەڕوو:
دژی سەفرایە.
شێلم:
بۆ چاو باشە دژی میکرۆبە.
نیسک:
دژی کەم خوێنییە.
کاهوو (خاس):
بۆ گەدە باشە
کەلەرم:
بۆ چاو، بۆ خەوتن باشە و دژی کەم خوێنی و سیلە.
گوێز:
بۆ منداڵدانی ئافرەت زۆر چاکە، هەروەها بۆ خوراندنی لەش.
تەماتە:
دژی ترشەڵۆکیی گەدەیە، بۆ باداری چاکە.
لۆبیا:
میز و شیر زۆر دەکات.
نارنج:
بۆ دەمار باشە.
شووتی:
فێنک کەرەوەیە، دژی سەفرایە.
گێزەر:
پێست نەرم دەکاتەوە، بۆ نەخۆشیی گورچیلە و دڵ و چاو باشە.

# زانیاری لەملاولا

١. دەزانیت سێ فەمانڕەوای ئیسلام بە (فاتح) ناودارن چونکە هەر یەکێکیان توانیویتی وڵاتێکی گرنگ بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە:



أ - قوتەیبەی کوڕی موسلیم - فاتحی چین.

ب - محەممەدی فاتح - سوڵتانی عوثماني کە قوستەنتەنییەی گرت.

ج - موسا کوڕی نوصەیر - ڕۆژاوای عەرەبی، واتە سەرووی ئەفریقیای داگیرکرد.

٢. ئەبووبەکری صدیق (رض) فەرموویەتی:

بەدوای مەرگ دا بڕۆ بێ گومان ژیانت پێ دەدات.

٣. دەزانیت حەزرەتی عیسا سڵاوی خوای لێ بێت بە زمانی ئارامی قسەی کردووە؟



٤. لە زۆر نووسراوان دا یا لە قسەی خەڵکی دا باسی جێگایەك کراوە بە ناوی واق واق، بەڵام تاکو ئێستا بەباشی نەزانراوە کەوتوتە چ گۆشەیەکی جیهانەوە، ئەگەر چی وازانراوە کە کەوتووەتە دورگەی مەدەگاشکەردوە هەروەها چین یان ژاپۆنە.

٥. بۆچی شاری دیمەشق ئەو ناوەی هەیە؟

(دمشقوا) بە عەرەبی واتی زووکەن. خێرا بن. دەڵێن گوایە شاری دیمەشق لەلایەن جیروزی کوڕی سەعد کوڕی عاد کوڕی سام حەزرەتی نووحەوە دروست کراوە.



کاتاماندوو

٦. ناوی شاری قاهیرە فوسطاط بووە. فوسطاط بووە. فوسطاط واتا چی؟ فوسطاط وشەیەکی عەرەبیی مانا دەوار و ڕەشماڵ. بۆیە ناوانراوە چونکە عەمری کوڕی عاص بە لەشکری ئیسلامەوە لە شوێنی ئێستای قاهیرەدا ڕەشماڵی هەڵ داوە.

٧- کاتاماندوو مانای چییە؟

کاتاماندوو: جێکانای "کاتا" کە لە بنەڕەتدا ناوی خوایەکی ئەفسانەیی هیندستانە کە گوایە بەرزاییەکانی چیاکانی هیمالایەدا دەژێت.

٨-عیراق مانای چییە؟

أ - عیراق واتە کەنار ئاو، چونکە خاکی عیراق دیجلە و فراتی تێدایە.

ب - خەڵکی حیجاز هەر وڵاتێك لە ئاو و دەریاوە نزیك بێت پێیان گوتووە عیراق.

ج - وتراوە عیراق لەبەر زۆریی دار و درەختی خورما و کشتوکاڵ.

٩. دەزانیت پێش ئاینی ئیسلامی پیرۆز وڵاتی ئێران پەیڕەوی ئاینی زەردەشت بوون.

١٠. دەزانیت لە ئاڵای وڵاتانی:
پاکستان، توونس، مالیزیا، تورکیا، جەزائیر هەموویان مانگ و ئەستێرەیەکی پێنج گۆشەیی تێدایە.

١١. ناوی وڵاتی ژاپۆن *Japan* لە وشەیەکی چینییەوە وەرگیراوە *Jim Pen kuo* واتە ئەو وڵاتەی کە رۆژ لێیەوە هەڵدێت.. بەڵام گەلی ژاپۆنی ناوی وڵاتەکەی خۆیان بە نیپتۆن *Nipton* دەهێنن هەروەکو گەلی عەرەب دەڵێن (میصر) بەڵام لای زۆر میللەتان بە *Egypt* ناسراوە.

١٢. بەرزترین گرکان (بورکان) کەوتوەتە ئەمریکای خوارووەوە لە وڵاتی ئەکوادۆر دا کە ٥٩٠٠ مەتر بەرزە، گرکانی (مونالو) ٤٥٠٠ مەتر بەرزە، هەروەها گرکانی فیزۆف ١١٨٦ مەتر بەرزە.

١٣. کۆنفوشیۆسی فەیلەسووفی بەناوبانگی چین وتویەتی:
"هەڵ گیرساندنی مومێك زۆر لە نارەزایی چاکترە بەرامبەر بە تاریکی".

١٤- بە وڵاتی ئەرجەنتین وتراوە وڵاتی زیوین چونکە کە ئیسپانەکان داگیریان کرد، خەڵکی ئەو وڵاتە کەلوپەلی زیوینیان لەبەردابوو.

١٥. دەزانیت هێزی راکێشەی هەتاو بیست و هەشت جار لە هێزی راکێشێنەری زەوی زۆرترە.

١٦. وەکو زانراوە فرمێسکی چاو سوێرە بەڵام ئایا دەزانیت کە فرمێسکی گریان لە فرمێسکی خۆشی و پێکەنین سوێرترە؟

١٧. گۆمی تیتی کاکا کەوتوەتە بەینی وڵاتی پیرۆ و بۆلیفیادا بەرزترین گۆمە لە رێکی دەریاوە لە جیهان دا.

١٨. لە کۆن دا بە وڵاتی هۆڵەندیان ئەوت "باتافیا" چونکە هۆزێکی تێدا دەژیا بە باتافیا ناسرابوون. دوای ئەوەی هۆڵەندییەکان ئەندەنۆسیایان داگیر کرد شارێکیان تێدا دروست کرد بەناوی باتافیا بەڵام دوای سەربەخۆیی میللەتی ئەندەنۆسیا گۆڕا و کرا بە جاکارتا.



١٩- دەزانیت یەکەمین چاڵە ئەوت لە ساڵی ١٨٥٩دا لە پنسلفانیا هەڵ کەنرداوە لەلایەن کۆلۆنیل (دیریك)دوە؟

٢٠. یەکەمین فیلمی عەرەبی "لەیلا" بووە.

٢١- خێرایی تیشك ١٨٦ هەزار میلە لەیەك چرکەدا، خۆر ٩٣ ملیۆن میل لە زەوییەوە دوور، کەواتە تیشکی خۆر بەماوەی هەشت دەقیقە دەگاتە زەوی.

٢٢. وشەی (ئەسترلینی) لەچییەوە هاتووە؟
ئەو ناوە لە ناوی کۆمپانیایەکی ئەڵمانییەوە وەرگیراوە بەناوی ئەسترلینج *Easterling* ئەم کۆمپانیایە کاروباری ئابووری و پووڵ و پارەی ئەنجام دا لقێکیان لە وڵاتی بریتانیادا هەبووە. لەبەر ئەوەش زۆربەی کار

و کاسبیی ئەم کۆمپانییە بەپێی پارەی زێـر بـووە، بازرگانـەکان هەمیشە تـێ کۆشاون سـەروکاریان لەگەڵی دا بێ، جا ئەم وشەیە لەناو گەلی ئینگلیزدا بڵاوبووەوە بەسەر پارەکەشیان دا دابڕا.

٢٣. لە ئاینی یـەهوودی دا شـەموان دەست لـەکار هـەڵ دەگرن مەسیحی ڕۆژی یـەك شـەمە و موسڵمان ڕۆژی هەینی وا جومعە. ئایا دەزانیت بۆچی ئیسلام ڕۆژی جومعەی هەڵبژاردووە؟
چونکە لە ڕۆژی هەینی دا حەزرەتی ئادەم دروست کراوە لە ڕۆژی هەینیدا خراوەتەوە بەهەشتەوە و لەڕۆژی هەینیدا مردووە.

٢٤. دەزانیت کە لە شەڕی مونتەی نێوان موسڵمان و کافران دا لە سەردەمی پێغەمبەردا سەرکردەی موسڵمانان زەیدی کوڕی حاریثە کوژراوە، خالیدی کوڕی وەلید، لە گەرمەی شەڕدا جێی گۆتوومەتەوە و بەسـەر کافران دا سەرکەوتوون، بۆیە پێغەمبەری خوا لەو ڕۆژەدا ناوی نا شمشێری هەڵکێشراوی خوا".

٢٥ـ دەزانیت ئـەلیازە و ئۆدیسە جوانترین چاوگەی ئەفسانەیی و مێژوویی یۆنانە و لەلایەن هۆمیرۆسەوە بە هۆنراوە گوتراوە.

٢٦. سەلیبی سوور و نوێ مانگی سوور ڕێکخراوێکی جیهانیی مرۆڤایەتییـە لـە پێناوی مـرۆڤ و ڕووداوە نالـەبارەکان دا کـە بەسـەر مـرۆڤ دا دێت کاردەکات. خاوەنی پێشنیاری دروست کردنی ئەم ڕێکخراوەیە کابرایێکی خـەڵکی سویسرا بوو بە ناوی هەنری دوونان کە مووچەخۆرێکی بچووکی یەکێك لە بنکەکانی سویسرا. بـووە کاتێـك لـە سـەڕی (سۆلفیرینو)دا ئـەو هـەموو برینـداره بـێ چاودێری دەبینێت دەکەوێتـە بـیروڕای دروسـت کردنـی ڕێکخـراوی سـەلیبی سووردەوە.

کەشتی ڤکتۆریا

٢٧ـ کەشتیی (ڤیکتۆریـا) یەکێکـە لـەو چـوار کەشتییەی کە ماجەلان ویستی دەوری دنیایان پێ بداتـەوە، سێ دانـە لـەو کەشتیانە نوقـوم بـوون و ماجـەلانیش کـوژرا بـەڵام ڤیکتۆریـا توانی بگاتەوە وڵاتی پرتەغال.

٢٨. بۆچی دوگمە بەسەر قۆڵی چاکەتەوە دادەنرێت؟
ڕووسیا ئەوسا لە چاو ئـەوروپا دا تـا ئەندازەیـەك دوا کـەوتوو بـوو، یـەکێك لـە قەیسەرەکانی ڕووسـیا ویـستی سپایەکی مۆدێرن و پاك و پوختـە پێکەوە بنێ لەبەر ئـەوەی زستانان سـەربازەکان لووتیـان بـە مەچـەکیان دەسڕی، بەسەر هەر قۆڵێکەوە سێ دوگمەی مسی پێوەدووری، جا ئیتر لەوەوە داکەوت.

٢٩. ئەبراهام لینکۆلن و تویەتی:
"دەتوانیت هەموو کەس بۆ تاوێك هەڵ خەڵەتێنی, یان هەندێك خەڵك بۆ هەمیشە. بەڵام هەرگیز ناتوانی هەموو خەڵك بۆ هەمیشە هەڵ خەڵتێنی".

٣٠. هەمالایا بە زمانی سان سکریتی واتە جێگەی بەفر یا خانووی بەفر.

٣١. ئەوە بزانە کە بەرناردشۆ هیچ کۆلیج و زانکۆیەکی تەواو نەکردووم, تەنانەت قوتابخانەی سەرەتاییش !

٣٢. پێغەمبەری خوا دەفەرموێت :
حەزم دەکرد لە پێناوی خوادا بکوژرێم و زیندوو بکرێمەوە دیسان بکوژرێم و زیندوو بکرێمەوە دیسان بکوژرێم و دیاسن زیندوو بکرێمەوە دیسان بکوژرێم.

٣٣. دەزانی بۆ لەبەردەبەیان دا میوە لێ دەکەنەوە بۆ فرۆشتن چونکە بە رۆژ ناوی ناو میوە تا ئەندازەیەك دەبێ بە هەڵم بەڵام بەشەوان ئەم بەهەڵم بوونە ڕادەوەستێت بۆیە لەبەردەبەیان دا دەی ڕنن تا ئاودار بێت.


سەنحاریب

٣٤. ئەگەر تۆ لە زەوی دا و کەسێکی ی کە لە مەریخ دا پێکەوە لە رۆژێك دا لەدایك بووبن دوای سێ ساڵ ئەو تەمەنی دەبێ بە ١٥ ساڵ و تۆش سێ ساڵ جونکە ساڵ لە مەریخ دا ٧٣٠ رۆژە.

٣٥. سەنحاریب کوری سەرجۆن بەهێزترین پاشای ئاشوورییەکان بووە شاری بابلی بیسەر یەك دا هەرووژان دو کۆشك وتەلاری زۆری لە نەینەوا دا دروست کردووە.

٣٦ـ وەکو ئاشکرایە ئەبو بەکری صدیق یەکەمین خەلیفەی موسڵمانە. بەڵام ئایا دەزانیت کە سوڵتان عەبدولەجیدی کوری عەبدولعەزیز دوا سوڵتانی عوثمانی کە لەلایەن ئەتاتورکەوە دەرکراوە دوا خەلیفەی ئیسلام بووە؟



٣٧. ئەندازەگیریی نێوان زەوی و ئەستێرەکان بە تیشکەساڵ دیاری دەکرێت, جا نزیك ترین ئەستێرە کە گڕدارە و بڵێسەی هەیە لە زەوییەوە (هەتاو)ە.. وەکو ئەستێرە کە کەرۆکەکانی وەکو عەتارید و زوحەل سارد نییە.

٣٨. فیرعونەکانی میصر لەبەر گۆڕەکانیان دا کێلی چوار سووچە یان چەند سووچەیان بە درێژیی ( ٢-٤٠) مەتر لە بەردی گرانیی سوور دروست دەکرد, ئەو کێلانەیان بە نەخش و نیگاری هەڵ کۆڵراو و باسی قارەمانێتیی ئەو مردووە دەرازاندەوە. ئێستا لەو کێلانە لە شاری قاهیرە, لەندەن, نیویۆرك و پاریس دا دەبینرێن.

٣٩. رووباری ئەمازۆن پانترین رووباری دنیایە کاتێك دەرژێتە ناو دەریاوە پانییەکەی ٣٥٠٠٠ مەتر بەلام تێکڕا پانی ئەم رووبارە لە چاوگەوە لە ٥٠٠٠ مەتر کەمتر نییە.
٤٠. دەزانیت جگە لە شاری قاهیرە پایتەختی میصر زۆر شاری دیکە لە دنیادا هەیە ناویان قاهیرە بێت . لەمانە ١٣ شار لە ئەمریکا و ٢ لە کەنەدا و (٢) لە ئیتالیا و شارێکیش لە فەرەنسەدا.

٤١. بۆچی بە ئەمازۆن وتراوە ئەمازۆن ؟
لە ئەفسانەکانی یۆنان دا هاتووە کە ولاتێك هەبووە هەر ژن کاربەدەست و فەرمانڕەوا بوون و پیاویان نەبووە. ئافرەتانی ئەو ولاتەش گەلێك شەڕکەر و ئازا و چاو نەترس بوون و شەڕی زۆریشیان لەگەڵ یۆنانییەکان دا کردووە و ئەمانە بە ژنانی ئامەزۆن بەناوبانگ بوون. کاتێکیش کە ئیسپانەکان بەرەو دۆلی رووباری ئامەزۆن رۆیشتوون لە ئەمریکای لاتین دا خەلکی ئەو دۆلە شەڕیان لەگەڵ دا کردوون و لەناو شەرکەران دا ژنی زۆری تێدا بووە.. بۆیە ناویان ناون (ئامازۆن)ەکان.

٤٢. لە عیراق دا قسەیەك هەیە دەڵێ گدوای کاول بوونی بەصرە؟" ئەمە لە کەیەوە وتراوە؟
لەسالی ٨٧٠دا شۆڕشێکی خوێناوی لەلایەن زنجەکانەوە دژ بە خەلیفەی عەباسی "ئەلموعتەمید" ڕووی دا و شاری بەصرە کاول کرا. دوای چوادە سالْ "مووەفەق"ی برای خەلیفە توانی شارەکە لە جنگیان دەربهێنێت بەلام دوای چی ؟ دوای کاول بوونی. ئیتر لەو سەردەمەوە ئەم قسەیە گوتراوە.

٤٣. درێژترین هێڵی ئاسنی شەمەندەفەر لەنێوان دوو شار یان دوو ولات دا بێ ئەوەی شەمەندەفەر بگۆڕێت هێڵی ئاسنی نێوان شاری مۆسکۆ و پەکینە.

٤٤. دورگەکانی (هاوای) پێش ئەوەی بەم ناوە بناسرێت بە دورگەکانی (ساندویچ) نادەبرا چونکە وەکو ساندویچ کەوتوونەتە نێوان قارەی ئەمریکا و ئاسیاوە.. ئەمانەش هەشت دورگەن. دورگەی هاوای و هەنالولو گەورەتینانە.

٤٥. قارەی ئەوروپا پڕخەلك ترین قارەیە لە گوێرەی رووبەری زەویدا , جا دەزانێت کە میرنسینی مۆناکۆ پڕخەلك ترین ولاتی ئەوروپایە ؟

٤٦. خەلیفەیەك لە خەلیفەکانی سەردەمی عەباسی بەناوی ئیبراهیمی کوڕی مەهدی لە مێژوودا بە خەلیفەی گۆرانی بێژ و هونەر دۆست و مۆسیقازان بەناوبانگە ئەم حەز کردنەی لە هونەر و گۆرانییە بووەتە بەدبەختی، سالێك خەلافەتی کردووە زۆر کارەساتی بەسەردا هاتووە. لەبەر ئەوەش کە دایکی قول بووە و خەلیفەی رەش بەناو باو بووە. لەدوا دوای ژیانیدا وازی لە گۆرانی و مۆسیقا هێناوە و پەنای بردوەتە بەر خوا.

٤٧. لە رۆرژی ١٩٦٩/٧/١٦ دا مرۆڤ بەرە و ئاسمان و مانگ کەوتە رێ. بەلام دوای چوار رۆژ گەیشتە مانگ واتە لە رۆژی ١٩٦٠/٧/٢٠دا.

٤٨. لایەنگرانی ئافرەت وتوویانە:
١- من کە وەهام هۆی ژنەکەمە. "بسمارك"

٢- ئەی ئافرەت تۆ فەرمانڕەوایت و پیاویش وڵاتەکەتە. "لامارتین"
٣- ئافرت گیانلەبەرێکە لەنێوان پەری و مرۆڤ دا.



٤٩ـ تا ئێستا دەرکەوتووە گەورەترین گیانلەبەر لەبەر زەوی لە سەرەتاوە تاکو ئێستا نەهەنگە، نەهەنگی شین کە ١٥٠ تەن قورسە. دیناسۆر ٥٠ تەن قورسە، ماموٚث هەر هەندێ فیلێکی گەورەیە.

٥٠ـ پەیکەری ئازادی کە لە بەندەری نیویۆرک دانـدراوە لەلایـەن میللـەتی فەرانسەوە بە دیاری بۆ میللەتی ئەمریکا هەناردراوە. ئەم پەیکەرە ژنێکی گڕ بەدەستە بەرزیی ٤٦ مەترە و ئەم پەیکەرە بووە بە دروشمی میللی و نەتەوایەتی میللەتی ئەمریکا.

٥١ـ وا دەگێڕنەوە کە فەرمانەکانی قەرەقوش زۆر سەیر و توند و تیژ بووە. ئەمە فەرمانڕەوایێکە لە وڵاتی میسردا حاکم بووە، بەڵام وشەی قەرەقوش واتە (قەلەرەش)ە.


قەرەقوش

٥٢ـ لەیلا ناوێکی ناسک و نەرمونیانی عەرەبییە لە ئافرەتان دەنرێت. ئەم ناوەش مانای سەرەتایی سەرخۆشی و خوماریيە، هەروەها ناوێکە لە ناوەکانی مەی.

٥٣ـ دەربارەی ئافرەتان وتوویانە:

أ- ئافرەتی ناشیرین دەموچاوی خۆی لە ئاوێنەدا دەبینێت، ئافرەتی جوانکیلە و شۆخ و شەنگیش لە گلێنەی چاوی خەڵکیدا. "بەرناردشۆ"

ب - پیاو لەژیان دا هەمیشە لە تێکۆشان دایە بۆ پووڵ و پارە تا دوو دەستی بخاتە ژێر پێی ئەو ئافرەتەوە کە گیرۆدەی عشقی کردووە. "مارك توین"

٥٤ـ ئەوەی کە روون بوەتەوە مێش حەز لە هەندێك رەنگ ناکات، ئەم رەنگانەش شین، زەرد، سوور ، سپی و سەوزن.

٥٥ـ روون بووەتەوە هەندێك جانەوەر بە پێی غەریزە تارادەیەك پابەندی پێك هێنانی خێزانن بە نموونە شێر دوو شێرەمێ رادەگرێ، ئەو دوو شێرەمێیە پێکەوە بە یارمەتی یەکتر بەچکە شێرەکان بەخێو دەکەن.

٥٦ـ روون بووەتەوە کە گەرمای هەتاو بە پێی تێپەڕ بوونی ساڵ و زەمان لە کەمی دەدات و قورسایی هەتاویش هەر ساڵێك ١٥٠ ملیۆن تەن کەم دەبێتەوە سەرچاوە زانیارییەکان دەریان خستووە کە لەماوەی ١٠٠٠ ملیۆن ساڵی رابردووەوە تاکو ئێستا نیو لە سەدا قورساییەکان کەم بووەتەوە. "ئەگەر وابێت دوای تێپەڕبوونی ١٠٠ ملیۆن ساڵی دی هەتاو دەکوژێتەوە".



٥٧. ئەتلەس مانای چییە؟
وشەیەکی یۆنانییە، کەوا لە ئەفسانەی یۆنانی دا هاتووە یەکێك لە خواکانی یۆنان زەویی گرتووەتە سەر قەڵاندۆشانییەوە ناوی ئەتلەس بووە.

٥٨. عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر یەکێك بوو لە ناسراوانی عەرەب ڕێگەی دەکەوێتە ڕەشماڵێك، خانە خۆییەکە ژنێکی هەژار و کەم دەست بوو، دوای ماوەیەك ڕوو دەکاتە عەبدوڵلای دەڵێ:
تەنیا ئەم مریشکەم هەبوو زۆر خۆشم دەویست پەیمانم لەگەڵ خۆم دا بەستبوو کە لە چاکترین جێگادا بینێژم .. بۆیە ورگی تۆم هەڵبژارد. ئەویش فەرمانی دا ٥٠٠ درهەمی بدەنێ.

٥٩. زاراوەی چەپی یان ڕاستی لە کوێوە هاتووە؟
ئەم وشەیە دوای شۆڕشی ١٧٨٩ لە فەرەنسە پەیدا بووە. کە ئەندامەکانی پەرلەمان ئەوانەی (توندڕو) بوون لە دەستەی چەپی سەرۆکی پەرلەمانەوە دادەنیشتن و ئەوانی تر لە دەستە ڕاستەوە، بۆیە لەوساوە تا ئەمڕۆ لە سیاسەت دا زاراوەی دەستە چەپ یان چەپ ڕۆ و دەستە ڕاست یان ڕاست ڕۆ داکەوتووە.

٦٠. زۆربەی گیانلەبەران مێنگینە بەچکە بەخێو دەکات یان هێلکە هەڵ دەگرێت. بەڵام ئەسپی دەریا (ستراند) کە درێژییەکەی (١٣) سم و سەری لە سەری ئەسپ دەچێت ئەم سروشتەی نییە، بەڵکو مێیەی ئەم گیانلەبەرە بەسەر سکی نێرەکەوە هێلکە دەکات، چل ڕۆژ ئەو هێلکانە بەسەر سکییەوە دەمێنێتەوە، تا دوای چل ڕۆژەکە خۆی لە بەرد هەڵ دەسوێت، هێلکەکان دەشکێنێت و نزیکەی ٢٠٠ بەچکە دەردەچێت.

٦١. دەزانیت موعتەصم بیللای خەلیفەی عەباسی هەشتەمین کوڕی هاروونی ڕەشیدە و هەشتەمین خەلیفەی عەباسی و هەشت برا و هەشت منداڵی بوە لەگەڵ هەشت کچ دا، هەشت ساڵ و هەشت مانگ و هەشت ڕۆژ خەلیفە بوو.

٦٢. لە وینستۆن چەرچلیان پرسی ئەرێ سیاسەت یانی چی؟
گوتی: بزانی کەی قسە بکەی و کەی بێ دەنگ بیت و کەی هێرش ببەی و کەی بگەڕێیتەوە. بەڵام لە هەموو کاتێك دا سوود لە مێشك و بیرت وەربگریت.

٦٣. سەیری ئەم قەڵاتەکە چۆن پێك هاتووە؟

٨ = ٨ + ٩ × ٠
٨٨ = ٧ + ٩ × ٩
٨٨٨ = ٦ + ٩ × ٩٨
٨٨٨٨ = ٥ + ٩ × ٩٨٧
٨٨٨٨٨ = ٤ + ٩ × ٩٨٧٦
٨٨٨٨٨٨ = ٣ + ٩ × ٩٨٧٦٥
٨٨٨٨٨٨٨ = ٢ + ٩ × ٩٨٧٦٥٤
٨٨٨٨٨٨٨٨ = ١ + ٩ × ٩٨٧٦٥٤٣
٨٨٨٨٨٨٨٨٨ = ٠ + ٩ × ٩٨٧٦٥٤٣٢
٨٨٨٨٨٨٨٨٨٨ = ١ − ٩ + ٩ × ٩٨٧٦٥٤٣٢١




٦٤ـ بیلالی حەبەشی وەکو زانراوە بانگدەری پێغەمبەر (ص) بووە دوای کۆچی پێغەمبەر لە دنیا, جگە لە جارێك ئەویش لەسەر داخوایی حەزرەتی عومەر دەنا هەرگیز بانگی نەدا.

٦٥ـ پێغەمبەری خوا لە تەمنی ٦٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە, ئەوەش بزانە حەزرەتی ئەبو بەکر و عومەر و عەلی هەر سێکیان لە شەست و سێ ساڵان دا مردوون.

٦٦ـ دەزانیت حەزرەتی عەلی بە یەکەمین خۆبەخت کەر دەژمێردرێت لە ئاینی ئیسلام دا, چونکە لە جێگەکەی پێغەمبەری خوادا خەوت کاتێك کافران بڕیاری کوشتنی محمد (ص)یان دا. یەکەمین شەهیدیش لە ئاینی ئیسلام دا کە لە شەڕدا کوژرا بێت عوبێدەی کوڕی حارثی کوڕی عەبدولموطەلیب بوو کە لەلایەن عوتبەی کوڕی رەبیعەوە لە شەڕی بەدردا بریندار کرا و بەوبرینەوە مرد.

٦٧ـ وەکو زانراوە دوای هەر کۆست کەوتنێك یان ئازیز مردنێك چل رۆژ تەعزیە دەگێرێت بۆ ریز گرتنی مردووەکە. بەڵام لە راستیدا ئەم چل رۆژە لە سەردەمی فیرعۆنەکانەوە ماوەتەوە گەیشتووەتە زۆربەی میللەتانی جیهان. ئەویش لەبەر ئەوەیە کە مۆمیا کردنی لەشی مردوو لەو سەردەمەدا چل رۆژی دەخایاند تا بەرنامەی مۆمیا کردنی لەشەکە تەواو نەبووبێ خێزانی ئەومردووە هەر لە گەرمەی تەعزیە باریدا بوون.

٦٨ـ زۆر لە میللەتانی جیهان شەپقە لەسەر دەکەن و کاتێك هاورێیەك دەبینن یان بڕۆنە ماڵی دراوسییەکیانەوە کڵاوەکەیان لەسەر لادەبەن کە نیشانەی رێزگرتنی ئەو هاورێیەیە یان ئەو ماڵەیە. بنچینەی ئەم رەوشتەش لە کۆنەوە ماوەتەوە, وەکو زانراوە جاران شەڕکەران کڵاوی ئاسنیان لە سەردەنا, ئەو کڵاوەشیان لەسەر لانەدەبرد تا لە جێگایەکی بێ مەترسیدا نەبێت, جا ئێستا کڵاو بۆ رێز و قەدر زانی لەسەر لادەبرێت و هەر لەو کاتیش دا بۆ پتەوی پێوەندیی نێوان دۆستان.

٦٩ـ دەزانیت پلەی گەرمای مانگ بە رۆژ ١٥٠ پلەی سەدییە و بە شەویش ١٢٠ پلەی ژێری سفرە, واتا جیاوازیی لەنێوان گەرمای شەو و رۆژدا لەسەر مانگ ٢٧٠ پلەی سەدییە.

٧٠ـ وەکو روون بووەتەوە لە کارەسات و رووداوی ئۆتۆمبیل دا پڕمەترسی ترین جێگە کورسییەکەی بن دەستی (لیخوڕ)ە. بۆیە پشتوێن بەستن گەلێك پێویستە بە تایبەتی بۆ ئەوەی لە تەك لێ خوڕدا دادەنیشێت.



٧١ـ وا بڵاوە کەوا ئەبو نواس هاودەمی هاروون رەشید بووە بەلام لە راستیدا وەکو زانراوە ئەبو نواس لە شەقام نەبێت هەرگیز هاروونە رەشیدی نەدیوە. بەڵکو شاعیر و هاودەم و پێکەنین هاوەری هاروونە رەشید کەسێك بووە بە ناوی "کوڕی ئەبی مریەمی مەدەنی".

٧٢. (مته‌وه‌كیل)ی خه‌لیفه‌ی عه‌باسی پێكه‌نین هاوڕێكی هه‌بوو به‌ناوی "عباده" شه‌وێكی ساردی زستان فه‌رمان ده‌دا - بۆ گاڵته - بخرێته ناو گۆمێكی ئاوی سارده‌وه. پاشان وه‌كو په‌له‌وه‌رێكی ئاوه‌ڕووت كرا و ده‌ی هێنه به‌رده‌ستی خه‌لیفه و خه‌لیفه پێی ده‌ڵێ:

- ها عباده له چی دای؟
- قوربان له‌و دنیا گه‌ڕامه‌وه !
- واثیقی برامت نه‌دی؟
- قوربان ڕێ گوزه‌رم نه‌كه‌وته جه‌هه‌نه‌م.

٧٣. ئه‌نیشتاین له‌لایه‌ن چه‌ند ئافره‌تێكه‌وه ده‌عوه‌ت ده‌كرێت یه‌كێكیان داوای ڕوون كردنه‌وه‌ی "نظریه‌ی نسبی" لێ ده‌كات. ئه‌ویش ده‌ڵێ ڕۆژێك پیاوێكی كوێرم دیت گوتم من حه‌ز له ماسی ده‌كه‌م.

گوتی: ماسی چییه؟

گوتم: وه‌كو ئاوێكی سپییه.

گوتی : ده‌زانم ئاو چییه به‌ڵام ڕه‌نگی سپی چییه؟

گوتم: وه‌كو په‌ڕی قازێكی سپییه.

گوتی: دزانم په‌ڕ چییه به‌ڵام قاز چۆنه ؟

گوتم: په‌له‌وه‌رێكه گه‌ردنی درێژه و پێچ پێچه.

گوتی: ده‌زانم گه‌ردن چییه و به‌ڵام درێژ و پێچا و پێچ چییه و چۆنه.

گوتم: ده‌ستم برد و بازوویم گرت و جووڵاندمه‌وه و گوتم .. ئا .. وها !

گوتی: ئێستا زانیم ماسی چییه.

ئنجا ڕووی كرده ئافره‌ته‌كه‌وه و گوتی: هێشتا هه‌ر حه‌ز ده‌كه‌ی (نظریه‌ی نسبی)ت بۆ ڕوون بكه‌مه‌وه؟

٧٤. هه‌ندێك له ژنانی وڵاتی بریتانیا ڕێك ده‌كه‌ون و ده‌چنه لای سه‌ر نووسه‌ری ڕۆژنامه‌یێكی به هێز و به توانای شاری له‌نده‌ن كه یارمه‌تی بیروڕای هاوتایی ژن و پیاو بدات كابرای سه‌رنووسه‌ر ڕووده‌كاته ژنه‌كان وده‌ڵێت:

باشه له شه‌ڕدا ئێوه چیتان پی ده‌كرێت و چی ده‌كه‌ن؟

له وه‌ڵام دا ده‌ڵێن: ئێمه‌ش وه‌كو تۆ، كه خه‌ڵكی هان ده‌ده‌ی بۆ گه‌رمه‌ی شه‌ڕ و له پشتی مێزه‌كه‌ته‌وه دانیشتوویت هه‌روا ده‌كه‌ین كه تۆ و بابه‌تی تۆ ده‌یكه‌ن !

٧٥. ده‌زانی بۆ چی وڵاتی (كه‌نه‌دا) ناونراوه كه‌نه‌دا ؟

كاتێك قاره‌ی ئه‌مریكا دۆزرایه‌وه. پرته‌غالییه‌كان كه به‌ره‌و قووڵایی ئه‌مریكای سه‌رده‌وه ده‌ڕۆیشتن دانیشتوانی ئه‌و سه‌ر زه‌وییه هاواریان ده‌كرد:

"كندا، كندا" واته هیچمان نییه.

جا ئه‌و ناوه به‌سه‌ر ئه‌و وڵاته‌دا بڕا.

٧٦. شاعیرێك ده‌ڕوات بۆ لای (فاڵ گیر)ێك بۆ ئه‌وه‌ی له به‌ختی بنوڕێ: فاڵ گیر پێی ده‌ڵێت ده‌ڵێ: ساڵێك ئازاری هه‌ژاری ده‌چێژیت.

شاعیر به په‌رۆشه‌وه ده‌ڵێت: ئه‌ی دوای ئه‌و ساڵه , ده‌ڵێت: دوای ساڵه‌كه له‌گه‌ڵ هه‌ژاری و نه‌بوون دا ڕادێیت !

٧٧. دەزانیت یەکەمین سەرکردەیەك کە یەکەمین جار لە وڵاتی ئیسپانیادا دابەزی ناوی (طەریف) بوو، هەر سەرکەوتنی ئەویش بوو تارقی کوڕی زیادی هان دا پەلاماری ئیسپانیا بدات.

٧٨. ئەگەر مرۆڤ لە پەنجەرەی ئۆتۆمبیلەکەوە لە رۆیشتن دا سەر بهێنێتە دەرەوە بێ گومان چاوی دەست دەکات بە ئاو کردن. بەڵام باڵداران بۆیە لە کاتی فڕین دا چاویان ئاو ناکات چونکە پەردەیەکی ناسك بەسەر گلێنەیی چاویان دا دەکێشرێت.. لە چاوی راست دا لە راستەوە بۆ لای دەنووك و لە چاوی چەپ دا لە چەپەوە بۆ لای دەنووك.

٧٩. تا ئێستا قورسترین عەلەشیش لە شاری لەندەن دا بەرچاو کەوتووە لە ساڵی ١٩٧١ دا کە قورسایی ٦٥ رەتڵ و چوار هۆقە بوو.

٨٠. دەبێت ئەوە بزانیت هەر کاتێك بەدەم کچێکی شۆخ و جوانکیلە و نازەنینەوە پێ کەنیت ئەگەر وای بۆ چوو کە یەکێکی لە خزمانی ئەوی و نات ناسێتەوە .. بزانە پیربوویت و دەبێت خۆت بناسیت و هێندە خۆت لە هەڵەتی گەورەتر لە توانات نەدەی !

٨١. سەڵاوی سەربازی لە چییەوە هاتووە؟
کاتێك سەرکردەیێکی سوپای دەریاوانیی ئینگلیز بەسەر هێزی دەریاوانیی ئیسپانیادا سەردەکەوێت و لە ساڵی ١٥٨٨ لە شەڕی ئەرمادادا داوای لە شاژن کرد کە بۆ خۆی بێت بە دەستی خۆی پاداشتی ئەفسەرەکان بدات. جا ئەو سەرکردە زۆرتر بۆ کاسەلێسی فەرمانی بە ئەفسەرەکانی دا: (کاتێك شاژن دێت دەبێت دەستی راستتان بەسەر چاوتان دا بنێن تا جوانی و شۆخ و شەنگیی شاژن چاوتان کوێر نەکات). لەو کاتەوە ئەمە داهاتووە و کەم کەم بووە بە سەڵاو بە دەستی راست.

٨٢. هەژارێکی داما و لە دەرگای ماڵە دەوڵەمەندێکی پیسکە دەدات بۆ یارمەتی. کابرای هەژار گوێی لێ دەبێ کە پیسکەکە هاوار دەکات:
"هۆ موبارەك بە قەنبەر بڵێ کە بە جەوهەر بڵێ ئەویش بە یاقووت بڵێ کە بەو هەژارە راگەیەنن خوا بی داتێ !"
کابرای هەژاریش هەردوو دەستی بەرزدەکاتەوە و دەکاتە ئاسمان و دەڵێ:
خوایە بە جوبرائیل بڵێ کە بە ئسرافیل بڵێت، ئەویش بە میکائیل راگەیەنێت کە بە ئیزرائیل بڵێ روحی ئەم پیسکە نامەردە دەربهێنێت.

٨٣. أ - یەکەمین پزیشکی ددان لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین دا لە میصردا بووە بەناوی (هیرۆدت).
ب - درێژترین پیشە (ئێسك)ی لەشی مرۆڤ ئێسکی ڕانە کە دەکاتە ٢٧٪ی درێژیی ئەو کەسە.
ج - بچووکترین ئێسکی لەشی مرۆڤ پارچە ئێسکێکە لەناو گوێ دایە کە ٢,٦ ملیمەترە.
٨٤. دەزانیت ناوی وڵاتی ئەثیوپیا "حەبەشە" بە یۆنانیی کۆن واتە روواڵەتی برژاو !

بەر سوقرات ئەو فەیلەسووفە بەناوبانگی مێژووی یۆنان لە کاروباری ژیانی تایبەتیی خۆیدا گەلێک - کلۆڵ بوو بە دەست ژنەکەیەوە چونکە ژنێکی دەم شڕ و زمان درێژ و جوێن فرۆش بوو. سوقرات لە ترسی دەمی شڕی و زمان درێژیی ژنەکەی پێش ئەوەی هەتاو لەگەڵ بێتە دەرێ ئەو لە ماڵ دەردەچوو. جا لێیان پرسی ئەم هەموو کاتە دوور لە ماڵ و ژن و منداڵ لەک کوێ بەسەر دەبەیت؟

لە وەڵام وتوویەتی: لە قوژبنی پەرستگایێکی بچکۆڵەی ئەثینادا لێی دادەنیشم و بیر دەکەمەوە. ئەگەر بێ تاقەت بووم دەڕۆم بۆ حەمامێکی گشتیی ناو شار خۆم دەشۆم و لەدواییدا دەچمە ناو خەڵکەوە قسەیان لەگەڵ دەکەم و گوێیان لێ دەگرم. گوتیان باشە بۆ چی تۆیان بە زانای زاناکانی یۆنان هەڵبژاردووە ؟

لە وەڵام دا وتی دەستی بە ریشە پانە درێژەکەی دا هێنا؛ لەبەر ئەوەی تەنیا پیاوێکم بۆم دەرکەوتووە کە هیچ نازانم هیچی هیچ !

٨٦. زۆر دەبیستریت بە کابرایەك دەڵێن هێندە دەوڵەمەندە دەڵێی گەنجی قاروونی هەیە. ئەم قاروونە کێیە؟ لیدیا وڵاتێکی ئیغریقی بووە پێش زایین بە ٦٠٠ ساڵ کەوتوەتە نێوان وڵاتی فارسەکان و یۆنانەوە. دوای پاشای ئەم وڵاتە ناوی قاروون بووە کە گەلێك گەنجینە و زێڕ و دام و دەزگا و دەسەڵاتی هەبووە و لە ساڵی ٥٤٦ی پێش زایین دا لەلایەن کۆرشەوە داگیر کراوە.

٨٧. دەزانیت رووبەری ئەو زەویو زارەی کراوەتە کشتوکاڵ لە جیهان دا ٩٪ی زەویی جیهانە کە باقی بێ کشتوکاڵ ماوەتەوە.

٨٨. وەکو زانراوە حوشترمر (نەعامە) گەورەترین باڵندەی رووی زەوییە. بەرزییەکەی هەشت پێیە و زۆر ترسنۆکە. وا بەناوبانگە سەری خۆی لە ناو لم دا دەشارێتەوە بۆ ئەوەی نەی بینن. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە وانییە. بەڵکو مێنگینەی نەعام کاتێك بەسەر هێلکەوە و کڕ دەکەوێت، بۆ ئەوەی ماندوویەتیی ملە درێژەکەی دەرکات سەروگەردنی لەسەر زەوی رادەکێشێت تەنیا بۆ حەسانەوە.

٨٩. سەربازێك باسی چۆنیەتیی وەرگرتنی (نیشان)ی خۆی دەکرد چۆن بە قارەمان زانراوە بێ ئەوەی هیچ کارێکی وا بکات.

گوتی: من لە ریزی یەکەمی سەربازەکان دا وەستا بووم کاتێك فەرماندە وتی: سەربازێکم دەوێت خۆی بەخت بکات بۆ کارێك بێ گومان تێدا دەمرێت ! ئەوەی خۆی بەخت دەکات هەنگاوێك بێتە پێشەوە !! هەر قسە تەواو کرد هەموو سەربازەکان هەنگاوێك چوونە دواوە. کاتێکم زانی بەتەنیا ماومەتەوە بێ ئەوەی جووڵەم کردبێت. ئەوەندەی پێ نەچوو ئەو داوایە هەڵ پێچرا منیش نیشانی قارەمانیم وەرگرت !


شەڕی جاران

٩٠. جاران شەڕ بریتی بوو لە هێرش بردنە سەر شار و دەوری شار گرتن و پەلاماری دیواری شار دان.

دەزانیت ئابلووقە دانی شاری صوور لەساڵی ٥٧٢ی پێش زایین دا لەلایەن نەبوخوذ نەصرەوە بە

درێژترین ماوه زانراوه  که ١٣ ساڵ درێژەی کێشاوە.

٩١. میللەتە زیندووە شەڕکەرەکان چۆن لە فابریقەکان دا چەك و تەقەمەنی دروست دەکەن و خۆیان بۆ شەڕ ئامادەدەکەن زۆرتر لە قوتابخانەکان دا بۆ شەڕی ڕاستەقینە خۆیان ئامادە دەکەن. "برتراند راسل"

٩٢. داری زەیتوون دارێکی پیرۆزە هەتاوەکو لە قورئانی پیرۆزدا باسی کراوە. چۆنیەتیی زەیتوونی دنیا بەم شێوەیە:
ئیسپانیا ٣٤٪
ئیتالیا ٣٠٪
یۆنان ١٢٪
پرتەغال ٨٪
توونس ٦٪
تورکیا ٤٪

٩٣. چاکە بزانیت یەکەمین پوولی پۆستە لە وڵاتی بریتانیادا لە سەردەمی شاژن ڤیکتۆریادا بووە و وێنەی ئەویشی لەسەر بووە.

٩٤. بەرزترین دار لە دنیادا دارێکە بەناوی "سیکوبا سمیر فیرنس" لە کالیفۆرنیای ئەمریکادا کە ١١٧ مەتر بەرزە.

٩٥. لە ساڵی ١٩١٦ دا بێ شەرم ترین پەیمان لە نێوان دوو هێزی خوێن خواری ئیمپریالیستی جیهان دا کە ئینگلیز و فرانسە بوو بەسترا بۆ دابەش کردنی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەم جۆرە:

- سووریا و لوبنان بۆ فرانسا.
- عیراق و ئەردون بۆ بریتانیا.
- فەلەستین لەژێر یاسایەکی تایبەتیی دەوڵەتان دا بێت.
- بەم جۆرە بی شەرمانە لە پەیمانی سایکس و پیکۆدا بڕیاری بی شێل کردنی داخوازیی میللەتانی ئازاری خوازیان داوە. بەڵام لە ئاکام دا گران بۆیان تەواو بوو.

٩٦. ئەوسا ئافرەتی وەها پەسند دەکرا:
١ – پرچی رەش
برۆی رەش
برژانگی رەش
گلێنەی رەش
٢ - پێستی سپی
سپێنەی چاو، سپی
ددانی سپی
پا و پووزی سپی
٣ - زمانی سوور

دوو لێوی سوور
ڕوومەتی سوور
پووکی سوور
٤ - سەری خڕ
گەردنی خڕ
باسکی خڕ
پاژنەی خڕ
٥ - پشتی درێژ
بازووی درێژ
ڕانی درێژ
پەنجەی درێژ
٦ - ڕوخساری کراوە
سنگی پان
سمتی پان
چاوی گەورە
٧ - برۆی باریک
لێوی باریک
پەنجەی باریک
لووتی باریک
٨ - گوێی بچووک
مەمکی بچووک
دەستی بچووک
پێی بچووک
٩ - چوارشت بۆنی خۆش بێت:
هەناسە
عەردق
دەم
لووت

٩٧. ئەو کەسەی تالانی ماڵم دەکات لام گرنگ نییە، چونکە سامان دێت و دەڕوا.. ئەمڕۆ هی مینە و سبەینێ هی یەکێکی دی کە. بەڵام ئەوەی ئابڕووم دەبات لە ڕاستیدا هیچم بۆ ناهێڵێتەوە .
(شەکسپیر)

٩٨. گەورەترین کۆشک لە وڵاتی ئیسپانیا دایە کە لە سەرەوەی ڕۆژاوای شاری مەدریدەو ساڵی ١٥٦٢ فلیبی دووەم دروستی کرد.
٢٠٠٠ ژووری تێدایە
٢٠٠٠ دەرگا
٦٠٠٠ پەنجەرە

ئێستاش بووە بە گۆڕستانی پاشاکانی ئیسپانیا.

٩٩. ا- بەدبەختی ئەوە نییە کە مرۆڤ کوێربێت دنیای رۆشن نەبینێت. بەڵکو کڵۆڵی ئەوەیە مرۆڤ نەتوانێت دەردی کوێری بگرێتە خۆی و دانی پێدانا کە کوێرە.

(ملتوون)

شاعیرێکی گەورەی ئینگلیزە کە بێ چاو بوو

ب - ژیان لەوە کورت ترە کە ئەم هەڵان کاوێژ بکەم خەڵکی بەرامبەرم کردوویەتی و گیانی کینە لەناو خەڵک دا بچێنم.

(برتراند راسل)

ج - من هەمیشە لەگەڵ کات دا لە شەڕدام و چونکە لەوە کورت ترە کە ماوەم بدات ئەوەی دەمەوێت بیکەم و لەوەش درێژترە بێ کار لێی بوەستمەوە.

(شەکسپیر)


وڵاتی چین

١٠٠. وڵاتی چین یەکەمین وڵاتێکە کە:

١- بارووتی بەکارهێناوە.
٢- ئاکتەری شانۆیی رەواجی پەیدا کردووە.
٣- رۆژنامەی رۆژانەی دەرهێناوە
٤- پارەی کاغەزی دروست کردووە.
٥- بوصلەی دروست کردووە.

فەرەنسەش یەکەم وڵاتە ژنی بۆ کارکردن لە پۆستە خانەدا دامەزراندووە.

- لە سوێد دا یەکەم جار شێوەی بانک داری رەواجی پەیدا کردووە، لەلایەن کەسێکەوە بەناوی "بلمستروك".

١٠١. بزانە کە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی $O.K$ لەکوێوە هاتووە نییە و بەکاریان نەهێناوە بەڵام لە وڵاتی ئەمریکادا ئەم وشەیە دروست کراوە و ماناکەی "باشە. موافقم". لە گەڵتام" ە.

* کاتێك مارتن ڤان بودیم خۆی هەڵبژارد بۆ سەرۆك کۆماری وڵاتی ئەمریکا رستەیەکیان بۆ پروپاگەندە بەکارهێنا بەم شێوەیە بوو: کوڕی ئۆڵد کندرهوك هەڵبژێرە. چونکە مارك بودیم خەڵکی شارێکی دەوروبەری نیویۆرك بووە بەناوی ئۆڵد کندرهوك کە کورتەی ئەو رستەی سەرەوە کراوە بە $O. K$ ئیتر ئۆکەی کەوتوتە سەر زمانی گشت خەڵك بە مانای (موافق) و (باشە).


بەعەجەمی رووناکەی وڵاتی چین

١٠٢-١. سوقرات چەند برادەرێکی بۆ نان خواردن دەعوەت دەکات دیارە سفرە بە خواردنی جۆرا و جۆر نەرازابووەوە بۆیە یەکێك لە میوانەکان رووی تێ دەکا و دەڵێت: چاکتر وا نەبوو زۆرتر رێزی میوانەکانت بگرێت؟

سوقرات لەم وەڵام دا وتی:

ئەگەر میوانەکانم ژیر بن، بەسەر سفرەکەوە ئەوەندە هەیە کە بەشیان بکات، ئەگەر ژیریش نەبن ئەوەشی کە بەسەر سفرەکەیەوە بەسەریانەوە زیادە.

٢. دەوڵەمەندێکی شاری لەندەن دەچێتە ماڵی برناردشۆ کاتێك دەڕواتە ژوور سەیر دەکا بەناردشۆ تەنیایە و لەگەڵ خۆیدا دا قسە دەکات ئەویش دەڵێت؟

- ئەوە چییە لەگەڵ خۆت دا قسە دەکەیت؟

بەرناردشۆ دەڵێ: ئەمە رەوشتێکە لە منداڵییەوە خووم پێ گرتووە کە دەبێت هەر لەگەڵ مرۆڤی زیرەك دا قسە بکەم.

١٠٣- لە ساڵی ١٩٦٠ دا بەراوردێك دەربارەی رۆژنامەکانی جیهان بڵاو کرایەوە، دەرکەوت هەر رۆژێك ٨٠٠٠ رۆژنامەی رۆژانە لەدنیادا دەردەچێت و ٢٩٠ ملیۆن دانەی لێ دەنێردرێتەوە بازاڕەوە. لە یەکێتی سۆڤیەت دا رۆژانە ٦٠٩٤٧٠٠٠ دانە رۆژنامە چاپ دەکرێت.

١٠٤. دەزانیت تەنها گیانلەبەرێك کە دەتوانێت گوێی بە لووتی بخورێنێت فیلە و بەس.

١٠٥. ئەفسەرێك دەڕوات بۆ پشکنینی سەربازان، سەیر دەکا دوو سەرباز یەکێکیان نامە دەخوێنێتەوە ئەوەی تریان دەستی ناوەتەوە سەر هەردوو گوێی ئەو سەربازەی کە نامەکە دەخوێنێتەوە.

ئەفسەرەکە سەری سوور دەمێنێ ئەڵێت:

- بۆم روون بکەنەوە ئەمە یانی چی؟


احمد سوکارنو

سەربازی خوێنەوار دەڵێت: ئەم نامەیە لە دەزگیرانی ئەم برادەرەمەوە هاتووە ئەویش خوێندەواری نییە تا نامەی بخوێنێتەوە، جا من بۆی دەخوێنمەوە ئەویش دەستی ناوە بەسەر هەر دوو گوێم دا تا لە گوێم لێ نەبێت چی لە نامەکەدا نووسراوە.

١٠٦. ئەوە بزانە کە:

١. مارتن لۆثەر کینك، دکتۆرای لە فەلسەفەدا هەبووە.

٢. ئەحمەد سوکارنۆ دکتۆرای لە هەندەسەدا هەبووە.

٣. کاسترۆ دکتۆرای لە یاسادا هەیە.

١٠٧. نیگارە بەناوبانگەکەی لیۆناردۆ دافنشی کە بۆ مۆنالیزا کێشاوە ناوێکی دی کەشی هەیە ئەویش (ژۆکۆند)ە جا خراپ نییە بزانیت مونالیزا ناوی ئافرەتەکەیەوە و ژۆکۆند ناوبانگ و نازناوی مێردییەتی تابلۆکەش هەر دوو ناوی بۆ بەکار دەهێنن.

١٠٨- ئەگەر گیروگرفتێکی پزیشکی تووشی نەبێت و نەخۆش نەبێت هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێت قورساییەکەی٣ و ٥/١ کیلۆگرامە، بەڵام ئەگەر دایکەکە نەخۆشی شەکری هەبێت منداڵەکەی قەڵەوتر دەبێت و دەگاتە دەوری پێنج کیلۆگرام.

١٠٩. ژنێکی خەڵکی وڵاتی سۆڤیەت کە لەساڵی ١٨٧٠ مردووە هەمووی (٦٩) منداڵی بووە.

١١٠. ئەوە بزانە کە خێرایی زەوی بە دەوری هەتاودا ٦٦٦٠٠ میلە لە سەعاتێک دا.

١١١. وشەی دکتۆر وشەیێکی لاتینییە بە مانا مامۆستا یان ئەندازیار، زانکۆی پۆلۆنیا لە ئیتالیادا یەکەمین زانکۆ بووە دکتۆرای بە قوتابخانەیەکی داوە.

١١٢. لە دنیادا ٢٦٩٨ زمان هەیە کە قسەی پێ دەکرێت:
٤٢٤ زمان لە قارەی ئەمریکادا.
٤٨ زمان لە ئەوروپادا.
١٥٣ زمان لە ئاسیادا.
١١٨ زمان لە ئەفریقادا.
١١٧ زمان لە ئوستڕالیادا.


تونێل

١١٣. "تونێل" لە ژێر زەویدا یان دەریا چیادا هەڵ دەکەنرێت جا لە دنیادا چەند تونیلێکی درێژ و ناسراو هەیە، بەڵام تاکو ئێستا درێژترین تونێل ئەوەیە کە لە ژاپۆن دا لە نێوان دوو دورگەدایە درێژییەکەی ٣٣,٦٦ میلە.
تونێلی نیویۆرک ١,٧٣ میلە.
تونێلی سیفرن ٤,٣٦ میلە.
تونێلی کامون ٦,١ میلە.
وەکو زانراوە پرۆژەی گەیاندنی بریتانیا بە فەرانساش بە هۆی تونێلی ژێر دەریا و لە عاستی تەنگەبەری (مانش)دا بە دەستەوەیە.

١١٤. وەکو زانراوە ئەڵماس گەلێک بەنرخ و گرانە، بەڵام یاقووتی سووری پاکژ لە ئەڵماس و زمردیش گرانترە کە لە وڵاتانی بورما و تایلاند و ئوستڕالیادا دەری دەهێنن.

١١٥. ڕەوشتی چەند میللەتێک لە ژن هێنان دا:
١- لە سۆماڵ زاوا لە شاییدا لێدانێکی باش لە بووک دەدا.
٢- لە دورگەی گرینلاند زاوا بە قژ بووک ڕادەکێشێت تا ماڵی خۆیان.
٣- لە دورگەی (کوک) بووک بەسەر پشتی گەنجانی دێ یان شاردا تا جێگای شایی ڕێگا دەبرێت.
٤- لە بورما لەناو شاییەکەدا پیاوێکی پیر بە بەرچاوی خەڵکەوە گوێی بووک کون دەکات.
٥- هۆزێکی سەردتایی کە لە دورگەی ئۆقیانووسی هێمن دا دەژین، بووک و زاوایان دەچنە لای دەم سپیی دێ یان شار سەریان لێک دەدا بەو مانایە کە ئیتر بوون بە ژن و مێرد.

١١٦. دەزانیت زۆربەی گیانلەبەران کە دەیانەوێت هەڵسەنەوە لە پێش دا هەردوو دەستیان بەکار دەهێنن. واتە پێی پێشەوەیان وەکو ئەسپ و کار ئێستر و زۆر چوار پێی دی، بەڵام حوشترەکە دەیەوێت هەڵێت لەسەر دوو پێی دواوە هەڵ دەستێتەوە.

١١٧. وڵاتە عەرەبەکان لە چ ساڵێک دا بوون بە ئەندامی جامیعەی دەوڵەتانی عەرەب ؟
- عیراق، سوریاو ئەردون، سعودییە، میصر و لوبنان لە ساڵی ١٩٤٥دا (پێکەوە).
- یەمەن ساڵی ١٩٤٥.
- لیبیا ساڵی ١٩٥٣.
- سوودان ساڵی ١٩٥٦.
- توونس و مەغریب ساڵی ١٩٥٨.
- جەزائیر ساڵی ١٩٦٣.
- کوومیت ساڵی ١٩٦١.
- یەمەنی دیموکراتی ساڵی ١٩٦٧.
- عومان ساڵی ١٩٧١.
- میرنشینە یەکگرتووەکان ساڵی ١٩٧٢.
- مۆریتانیا ساڵی ١٩٧٣.

١١٨. پیاوی ژیر ئەوەیە پێش ئەوەی قسەی بکات بیری لێ بکاتەوە کە دەبێ چی بڵێت و گوێگری کییەوە لە کوێ و کەی قسەکە دەکات.

(ئامیرۆسن)

١١٩. برکلیس وەکو زانراوە ٥٠٠ ساڵ پێش زایین ژیاوەو فەرماندە و وتە رەوان و قسە زانێکی ناسراوی یۆنانی کۆنەو مانەوەی یادی زۆرتر لەبەر قسەکانێتی، لەبەر وتە لەبیر نەچۆوەکانێتی لە وتەیێکی دا کە لە سەرەتای شەڕی بلبونیزەوە وتەیەکی دەڵێت:
یاسای وڵاتی ئێمە لەسەر بیروڕایەکی دیموکراسی بەڕێوە دەچێت، کاربەدەستانی دەوڵەت بە پێی لێ هاتن و زیرەکییان هەڵبژێردراون لەلایەن میللەتەوە، میللەتی یۆنانیش لەناو یەک دا بەرابەر و یەک ناهەنگن لەبەردەم یاسادا و دوور لە بۆنەی ناسراویی بنەماڵە و چینایەتی. برکلیس لە ٥٠٠ی پێش زایین لە دایک بووە و لە ساڵی ٤٢٩ی پێش زایین دا مردووە.

١٢٠. خۆشە بزانیت:
ناپلیۆن بۆناپارت بە منداڵی کۆڵان بە کۆڵان هەردەم کتێبە بەسەر شانەوە بووە بۆ فرۆشتن، هەروەها خۆشە بزانیت ئیبراهیم لنکۆلن سەردەمێک مەیخانەی هەبووە و لەگەڵ شەریکێک دا مەی فرۆشی کردووە.

١٢١. مۆز بەوە بەناوبانگە کە باوک کوژە و خواردنی فەیلەسووفانە چونکە کە پی گەیشت دەبێت درەختەکەی لابیت تا چووزەیەکی تر سەرهەڵدا و گەش بکات. زاناکانی هیندستانیش هەمیشە خەریکی مۆز خواردن بوون بۆیە دەڵێن خواردنی فەیلەسووفانە.

١٢٢ـ تیموستکلیس خاوەن دەسەڵات و هێز و توانای سەردەمی ئیغریقەکان رووی کردە کورە بچکۆلەکەی و وتی:
کورم دەزانیت تۆ بە هێزترین گیانلەبەری ئیغریقیت ؟
کورە منداڵەکەش وتی: بابا چۆن؟
وتی: کورم، خەڵکی ئەثینا فەرمانڕەوایی وڵاتی ئیغریقین منیش فەرمانڕەوایی ئەثینام و دایکت فەرمانڕەوای منە تۆش فەرمانڕەوایی دایکتی !

١٢٣ـ ئەرستۆ دەی گوت:
مەرگ و ژیان وەکو یەك وان.
یەکێك وتی: جا ئەگەر وەك یەك بۆچی خۆت ناکوژیت؟
وتی: من وتم وەك یەك وان .. نەك یەکێکیان لەوی تریان چاکترە.

١٢٤ـ ئەمانە بلیمەت بوون و تەمەنیان لە چل ساڵ کەمتر بوو.
- نیوتن زۆر بیروڕای زانیاری دۆزییەوە و تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بووە.
- کیتس شاعیری بەناوبانگ لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی دا مردووە.
- شیللی لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا مردووە.
- لۆثەر لە ٢٥ ساڵیدا ناوبانگی دەرکردووە.
- فیکتۆر هۆگۆ دەربارەی نووسین سێ پاداشتی وەرگرتووە و هێشتا تەمەنی نەگەیشتوەتە بیست ساڵی.
- گۆتە زۆر شانۆیی نووسیوە و تەمەنی دوانزدە ساڵان بووە.

١٢٥ـ ئەم بلیمەتانە لە پیریدا بەناوبانگ بوون:
- هۆمیرۆس ئۆدیسەی لە پیریدا دارشت و تەواوی کردووە.
- دانیال دیفۆ چیرۆکی رۆبنسون کرۆزۆی لە شەست ساڵیدا نووسیوە.
- ئەفلاتون شاکارەکانی بە ماوەیەکی کەم پێش مەرگی نووسیوە، کە لە ٨١ ساڵیدا مردووە.
- (جاحیظ) و (شدیاق) زۆر لە نووسینەکانیان لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا نووسیوە.

١٢٦ـ گەورەترین دانەی مرواری ناوی (لاوتسی)یە خاوەنەکەی ناوی (کوب)ە خەڵکی ئەمریکایە، ئەم دانە مرواریە قورساییەکەی (٤) رەتڵ و یەك ئۆقیەیە، لە ساڵی ١٩٣٤ لە وڵاتی فلیپین دا دۆزراوەتەوە، ئێستا نرخی لە ١٥ ملیۆن دۆلار زیاترە.

١٢٧ـ دەزانیت قورسایی زەوی بە تەن دەکات (٦) و بیست و یەك سفریش لەلای راستییەوە بێت.. ئایا دەتوانیت ئەم ژمارەیە بخوێنیتەوە ؟

١٢٨ـ لوید جۆرجی سەرەك وەزیرانی بریتانیا بە ئۆتۆمبیل تەنها، بە دێهاتی دوور دەست دا دەگەڕێ، ئۆتۆمبیلەکەی بانزینی تێدا نامێنێت و شەوی بەسەردا دێت و منەی ئەوەی دەکا جێگایەك بۆ نووستنی ئەو شەوە پەیدا بکات. دەڕوا و لە دوورەوە کۆشکێکی زەلام دەبینێت.. بەرەو ئەوێ دەچێ و لە زەنگی کۆشکەکە دەدا دەڵێ.. ئۆتۆمبیلەکەم بانزینی نەماوە، دەمەوێت ئەم شەو جێم بکەنەوە.

کابراش دەڵێ: ئێرە ئەماڵە و نە هوتێل. بەڵکو ئێرە شێتخانەیە.
لوید لە وەڵام دا دەڵێت: هەرچی هەیە. قەیناکە و دەمەوی بم ناسیت. من لوید جۆرجم سەرەك وەزیری پێشوو کابراش دەڵێ: فەرموو قوربان و فەرموو. پێنج کەسمان هەیە دەڵێت من لوید جۆرجم با ببێ بە شەش!!

١٢٩. یەکەمین منارەی مزگەوت لە وڵاتانی ئیسلام دا لە مزگەوتی (ئەمەوی)ی شاری دیمەشق بووە و بە شێوەیێکی چوار سووچی و لەبەر دروست کراوە.

١٣٠. تەسبیح چۆن داهات؟
هەژار و دەست نەرۆیشتووەکان چوون بۆ لای پێغەمبەر (ص) و دەردی دڵ دەڵێن کە ئایینی ئیسلام جیاوازی کردووە لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند دا، چونکە ئەوان سەرباری ئەوەی ئێمە نوێژەدەکەن دەتوانن زەکاتیش بدەن.. بەڵام خۆ ئێمە ناتوانین زەکات بدەین!
پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ئێوە لەباتی زەکات دوای نوێژ سی و سێ جار زیکری خوا بکەن پاداشەکەی بە ئەندازەی زەکاتە.
هەژارەکان تەزبێحیان هەڵگرت و دوای نوێژ زیکری خوایان پێ دەکرد.. دەوڵەمەنەکانیش چاویان لەوان کرد ئەوانیش دوای نوێژ کردن و سی و سێ جار زیکری خوایان دەکرد. هەژارەکان دووبارە چوونەتە لای پێغەمبەری خوا (ص) وتیان: وا دەوڵەمەندەکانیش زیکری خوا دەکەن.
پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە بەهرەیەکە خوا بە بە مرۆڤی دەدا، ئەگەر بیکەیتە شەست و شەش یان نەوەت و نۆ بێگومان خێری زۆرترە. جا دانەیەکی تەزبیح لەو ژمارانەوە داهاتووە وا پێغەمبەری خوا فەرموویەتی.

١٣١. سەیری رێکەوت بکە لەنێوان ناپلیۆن بۆناپارت و محەممەد عەلی پاشای میسردا:
- ناپلیۆن لە ساڵی ١٧٦٩ لەدایک بووە، محەممەد عەلی پاشاش هەر لەو ساڵەدا لە دایك بووە.
- ناپلیۆن لە شارێك دا بەسەر دەریای سپیی ناوەڕاستەوە لەدایك بووە محەممەد عەلی پاش هەروەها بەڵام لە وڵاتی ئەڵبانیادا.
- ناپلیۆن لە بنەماڵەیێکی هەژار و دەست نەرۆیشتوو بەخێوکراوە هەروەها محەممەد عەلی پاشاش.
- ناپلیۆن دوو جار ژنی هێناوە، ژنی یەکەمی ناپلیۆن (جۆزەفین) بێوەژن بوو، محەممەد عەلی پاشاش دوو ژنی هێناوە، ژنی یەکەمی ئەمینە خانم بێوەژن بووە.



- یەکێك لە ژنەکانی ناپلیۆن منداڵی نەدەبوو کە جۆزەفین بوو، ماه دەوانی ژنی محەممەد عەلی پاشاش منداڵی نەدەبوو.
- ناپلیۆن لە ساڵی ١٧٨٦ ئینگلیزەکانی لە شاری ئەسکەندەرییە دەرکرد، محەممەد عەلی پاشاش لە ساڵی ١٨٠٧ ئینگلیزەکان لە ئەسکەندەرییە وەدەرنا.
- ناپلیۆن لۆکە چاندنی لە وڵاتی خۆیدا رەواج پێدا، محەممەد عەلی پاشاش تۆوی لۆکەی لە سیلانەوە هێنا بۆ وڵاتی میسر.
- ناپلیۆن یەکەمین بانکی لە فەرەنسەدا پێك هێنا محەممەد عەلی پاشاش یەکەمین بانکی لە میسردا دروست کرد.
- ناپلیۆن کۆیلەی ئازاد کرد، محەممەد عەلیش هەروەها.
- ناپلیۆن بە زۆر لایان برد لە پاشایەتی. کوڕەکەش بوو بە پاشا،

محەممەد عەلیش خۆی لە پاشایەتی وازی هێنا و کوڕەکەی بوو بە پاشا.
دەڵێن ناپلیۆن تووشی نەخۆشیی سیلی گەدە هاتووە و بەو دەردە مردووە. محەممەد عەلی پاشاش بە نەخۆشیی سیل مردووە.


شەڕەکانی محمد عەلی پاشای مصر

١٣٢ـ دکتۆر لازارۆس لۆدڤیك زامینهۆف چوار زمانی زیندووی دنیای دەزانی جگە لە زۆر زاراوەی چەند زمانێکی تر ئەم گەنجە رووسە کاتێك لە قوتابخانەی ناوەندیدا بووە کەوتوەتە بیروڕای پێك هێنانی زمانێکی جیهانی بۆ تەواوی گەلان.
لە ساڵی ١٨٨٧ تەمەنی ئەم گەنجە رووسە ٢٨ ساڵی زۆرتر نەبووە کە یەکەمین کتێبی لەم رووەوە بڵاو کردوەتەوە. بەناوی ئەسپرانتۆ *Espranto* , ئەم زۆر گران نییە بریتیە لە ١٦ رەوش بە ئاسانی مرۆڤ فێری دەبێت و سەردەمێك خەڵکێکی زۆر دەی ویست ئەم زمانە فێر بێت. بەڵام لەم دواییدا ئەو بارەی ئەما و بەرەو لەبیرچوونەوە دەڕوات.

١٣٣. ئەبولەهەب ناوی عەبدولعوززای کوڕی عەبدولموطەلیب, مامی پێغەمبەرە و باوکی عوتبە و عوتێیبە بووە کە هەردووکیان زاوای پێغەمبەر بوون و دوو کچی پێغەمبەر "روقەییە و ئوم کەلثووم" ژنی ئەو دوو کوڕەی ئەبولەهەب بوون. بەپێی قسەی ئەبولەهەب و ژنەکەی، هەردوو کچەکانی پێغەمبەریان تەلاق داوە و حەزرەتی عوثمان روقەییە مارەکرد کە لە گەرمای شەڕی بەدردا کرد, دوای مردنی ئەو ئوم کەلثوومیشی مارە کرد.

١٣٤. هەندێك لە شارە کۆنەکان چەند ناوێکیان هەیە وەکو:
بەغداد - پایتەختی رەشید.
مەککە - ئوم ئەلقورا.
مەوصل - ئوم ئەلرەبیعەین.
دیمەشق - ئەلفەیحاء.
حەلەب - ئەلشەهباء.


چەکداری فەرەنگ
چەکداری ئیسلام

١٣٥ـ شاری قودس ماوەی ٨٨ ساڵی رەبەق ژێر دەستەی فەڕەنگەکان بووە صەلاحەدینی ئەیووبی لە ساڵی ١١٨٧ دا دوای شەڕی (حطین) شاری قودسی ئازاد کرد.

١٣٦. شەڕی " ذات الصواري" بە یەکەمین شەڕی دەریایی ئیسلامەکان دەژمێردرێت. ئەم شەڕە لە سەردەمی حەزرەتی عوسمان دا ڕووی داوە لەنێوان ئیسلام و بێزەنتییەکان دا کاتێک (معاویە) والیی شام بوو لە ساڵی ٦٥٥ی زایین دا بە سەرکردایەتیی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەرح و هێزی دوژمن بەسەرکردایەتیی کوڕی هیرەقلی پاشای بیزانتە بووە.


شەڕی عین جالوت

١٣٧. شەڕی (عێن جالووت) بە شەڕێکی مێژوویی دەژمێردرێت لە مێژووی ئسلام دا، چونکە یەکەمین بەرگریی هێرشی مەغۆلە لەلایەن ئسلامەوە. ئەم شەڕە لە سەردەمی سوڵتان (قەطەز)دا بە سەرکردایەتیی (ظاهیر بیبەرس)کرا. سوپای مەغۆلان شکان و زۆریشیان لێ بە دیل گیرا.

١٣٨. شەڕی (مەرج دابق) لە ساڵی ١٥١٦ لەنێوان مەمالیك و سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوثمانیدا ڕووی دا، لە ئەنجامی شەڕەکەدا وڵاتی شام خرایە ژێر دەسەڵاتی عوثمانییەکانەوە. مەرج دابق گوندێکە لە سەرەوەی وڵاتی سووریا و شەڕەکەش بەناوی ئەو گوندەوە ناونرا.

١٣٩. بەعیشوە زوڵفی لادا لەسەر عوزار و زاری
دوگمەی کراس ترازا، بزووت هەوای بەهاری
کە شەو بەیانی بەردا گوڵ و وەنەوشە باری
سەودای بە عاشقان دا باغی گوڵ و هەناری
دنیا لە ئینتیزاری، شیرین تەشی دەڕێسێ
شۆڕسواری شاعیران و بلەوری هەست و هەڵبەس و ریتم


وەفایی

مەنعی مەکەن وفایی کە خاوی دڵ بڵاوە
سەرێکە مەستی نازی دڵێکە بۆی نەماوە
بەدوای دڵ دڵی خۆی بەدوای زوڵفی داوە
دڵم حەقی بەدەستەوە فتوای سەرمی داوە
کە ئەم غەزاڵە چاوە شیرین تەشی دەڕێسێ

خواوەندی ناخ و نەوا و وردەکاری ناو شاعیرانی کورد خوالێ خۆش بوو حاجی میرزا عەبدولڕەحیمی وەفایی. ئەم زاتە لە ساڵی ١٨٤٤ دا لە شاری سابڵاخ لەدایك بووە لە ڕێگەی حەج دا ساڵی ١٩٠٢ لە بیابانی عەرەبستان دا کۆچیدوایی کردووە. پیرەمێردی ئەمر دەڵێ بە دەستی خۆم ناشتوومە.

١٤٠. وەکو زانراوە ئەبوعەباسی سەفاح یەکەمین خەلیفەی بەرەبابی عەباسییەکانە و ئەبو جەعفەر مەنصوور دووەمین خەلیفە بووە، لە کاتێك دا ئەبو جەعفەر برا گەورەی ئەبو عەباس بووە.

١٤١. دورگەکانی (قەمەر) کەوتوونەتە ئۆقیانووسە هیندەوە نزیگ دورگەی (زنجبار)، ئەم وڵاتە تا ساڵی ١٩٧٥ ژێر دەستەی ئیمپریالیستی فڕانسە بوو و بەبێ شەڕ و هەرا سەربەخۆیی وەرگرت. ئەم وڵاتە بە کشتوکاڵ گوڵ و گوڵکاری دەژین.



١٤٢. دەزانی تەواوی بەرهەمەکانی (عومەر خەییام) هەموو بە عەرەبی نووسراون جگە لە چوارینەکانی نەبێت کە بە فارسی دایناون. خەییام لە ساڵی ١١٥٣ ز دا مردووە.

١٤٣. دەزانی دەسەڵاتی ئیسلام ئەم دورگانەی گرتووە:
١- دورگەی قیبرص لە سەردەمی حەزرەتی عوثمان دا.
٢- دورگەی کۆرسیکا لە ساڵی ٨٠٩ ز دا.
٣- دورگەی سەردینیا لە ساڵی ٨١٠ ز دا.
٤- دورگەی کریت لە ساڵی ٨٢٥ ز دا.
٥- دورگەی سەقەلیە لە ساڵی ٨٢٧ ز دا.
٦- دورگەی ماڵتە لە ساڵی ٨٧٠ ز دا.

١٤٤. ئەبولعەلای میعەڕڕی بە منداڵی تووشی نەخۆشیی ئاوڵە هاتووە و کوێر بووە ئەو کاتەی تەمەنی چوار ساڵان بووە.
- تاها حسێن هەر بە منداڵی چاوی تووشی نەخۆشی بووە و کوێر بووە.
- بەششاری کوڕی بورد هەر بە کوێری هاتۆتە دنیاوە.
ئەم سی کەسە هەرسێکیان ناوداری دنیای ئەدەبیاتی عەرەبن.

١٤٥. وا دیارە (تەماتە) پێش هەموو شوێنێك لە وڵاتی ئیتالیادا ناسراوە و بە زمانی ئیتالیایی واتە (سێوی زێڕ)و دیارە کاتێك زەرد بووە ئەشیان دەخوارد و لایان وابوو رووەکێکی ژەهراوییە.

١٤٦. ئەوە بزانە کە:
- مرواری لە دەریادا دەردەهێنن و گیانلەبەرێکی ئاوی دروستی دەکات.
- مەرجان لە قوولاییەکانی دەریادا بە چنگ دەکەوێت.
- ئەڵماس کاربۆنی ڕچاوە (مەییوە) بە ملیۆنان ساڵ بەردی کەهرەمانیش کە زۆرتر بۆتە تەزبێح بەکاری دەهێنن هەندێك درەختی سنۆبەر دروستی دەکات و لەژێر زەوییەوە دەری دەهێنن، ئەمەش لە ناوچە ساردەکان دا بە تێپەڕبوونی ملیۆنان ساڵ پێك هاتووە. ئەم بەردە جوانە لە قەراغی دەریای باڵتیکەوە زۆرتر دەست دەکەوێت.

١٤٧. (خاویار) یەکێکە لە گرانترین خواردنەکانی دنیا، ئەویش هێلکەی جۆرە ماسییەکە ناوی "ستۆرجیون"ە *Sturgeon* ئەم جۆرە ماسییە نزیکەی ٢٠٠ ساڵ دەژی و زۆرتر لە دەریای خەزەر دەریای ڕەش دا ئەو زەڵی

دەكەن. درێژی ئەو ماسییانە لە هەشت پێوە هەیە هەتا پانزدە پێ. شاری ستراخانی وڵاتی سۆڤیەت لەناو ئەم جۆرە ماسییەوە وەرگیراوە. وە لە شاری ستراخان دا خاویار زۆرە.

١٤٨. کرمێك هەیە لەناو کورد دا بە کرمی هەزار پێ ناسراوە. ئەم کرمە چل پێی هەیە و دوو شاخ و دوو کلك و بەس.



١٤٩. یەك تەن نەوت دەکاتە حەوت بەرمیل. ئەگەر کەشتییەك نەوت بەر حەفتا هەزار بەرمیل نەوتی لێ بنرێت دەکاتە دە هەزار تەن نەوت.

١٥٠. مەلا جزیری (١٤٠٧ - ١٤٨١) شاعیرێکی گەورەی کوردە. دیوانەکەی لە ساڵی ١٩٠٤ دا چاپ کراوە. دوودانەی ماوەتەوە یەکێکیان لە شاری بەرلین و ئەوی دیکەیان لە شاری بەغدایە.



کڵیسەکەی تەرمی ئەسکەندەر

١٥١. دەڵێن ئەسکەندەری ماکەدۆنی بۆیە فەرمانی داوە کە سەربازەکانی نابێ ریش بهێڵنەوە تا لە شەڕدا دوژمن ریشیان نەگرن.

١٥٢. شێخ مەحموودی حەفید:
مەحموود کوڕی حاجی شێخ سەعیدی کوڕی سەیید محەممەدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخە لە ساڵی ١٨٨٢ دا لە (سلێمانی) لە گەڕەکی ئاسکان لەدایك بووە. دایکیشی ناوی ئامینە بووە.
ژیانی ئەم زاتە بریتیی بووە لە تێ کۆشان گەرم لە پێناوی گەلەکەیدا و بەرپەرەکانێی زۆر و ستەمی بێگانە تا دوا هەناسەی. شێخی نەمر زۆربەی سەرەك هۆز و تیرەکانی بەبێ یەك و دوو بە گوێیان کردووە لە بەرهەڵستییەکانیدا دژ بە زۆر و ناڕەوایی.
شێخی لەبیرنەچوو لە ساڵی ١٩٥٦ دا کۆچی دوایی کرد.



١٥٣. ئایا دەزانیت ؟
ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٤ی ئۆکتۆبەر ساڵی ١٩٤٥ دا دامەزراوە.

١٥٤. بچووکترین دەوڵەتی دنیا دەوڵەتی سان مارینۆیە. هەروەها بە کۆنترین کۆماری مێژووی تازەی جیهانیش دەژمێردرێت. بەهەر چوار لادیدا لەناو وڵاتی ئیتالیا دایەو رووبەرەکەی ٢٥ میلی چوار گۆشەیە. ژمارەی دانیشتوانی پانزدە هەزار کەسە. کار و کاسبیی ئەو پانزدە هەزار کەسە زۆرتر لەسەر گەشتوگوزاری بێگانەکان و هەندی دەستکرد و پوولی پۆستە دروست کردنە.

١٥٥. ئەوە بزانە کە کیلۆپاترا دوو جار شووی کردووە، یەکەم جار شووی کردووە بە بەتلیمۆسی برای خۆی دووەم بە ئەنتۆنیۆی سەرداری رۆمانی بەڵام یۆلیۆس قەیسەر کە خەریك بوو مارەی دەکرد کوژرا. کیلۆپاترا دوای ئەوەی کە زانی ئەنتۆنیۆ لە شەڕدا بەزی و ئۆکتافیۆس وا خەریکە دەگاتە دەرگای میصر خۆیدا بەدەمی مارێکی ژەهراوییەوە و خۆی کوشت.

١٥٦. بزانە کە:

١- لینین نازناوی ڤلادیمیر ئیلیچ ئولیانۆفەر و لینین ناوی رووبارێکەلە رووسیادا.

٢- پێش ئاینی پیرۆزی ئیسلام خەڵکی بۆ حەج ژن و پیاو رووت و قووت بە دەوری کەعبەدادەسووڕانەوە.

٣- رووباری سەیحون و جەیحوون کەوتوونەتە ئەفغانستانەوە؟

٤- هەتاو لە زستان دا لە زەوییەوە نزیکترە تا هاوین، بەڵام لەبەر ئەوەی تیشکەکەی لە زستان دا لارە جا بۆیە بە زستان ساردە و هاوین گەرم.

٥- خێرایی سوڕخواردنی زەوی بە دەوری خۆیدا لە دەقیقەیەك ١٧ میلە و لە کاتێك دا بە دەوری هەتاودا ١٩ میل لە (چرکە)یەك دا دەبڕێت.

٦- وڵاتانی ئەسکەندەناڤ بریتین لە : سوێد، نەرویج، دانیمارك

٧ پڵنگ نێچیرێك کە ڕاو دەکات بە رۆژ ناوی خوات بەڵکو بۆ شەو هەڵی دەگرێت. دەش توانێت گایەك بە سێ شەو بخوات.

بۆ ئاگاداری: پڵنگەمێ بەچکەکانی لە باوکیان دەشارێتەوە تا نەیان خوات. تەمەنی پڵنگ دەگاتە پانزدە ساڵ.

٨- زۆربەی حەشەرات و مێش و مێش هەنگ ناتوانن دەنگ ببیستن.

٩- سەنگی زمانی ئەهەنگی شین ٢٫١ تەنە ورگی نیو تەنە، قورسایی دڵی ١/٣ ی تەنێکە.

١٠- پەیکەری ڤینۆسی خوارنی جوانی لە مۆزەخانەی لۆڤەردا لە پاریس دانراوە، هەردوو دەستی لە شانەوە نییە.

١١- بزانە کە لە سەرەتاوە تووتن لە وڵاتی ئەمریکاوە دەرچووە و بە جیهان دا بلاو بوەتەوە.

١٢- ئەوە بزانە کە:

برنج سەعاتێکی دەوێ تا گەدە هەزمی بکات.

گۆشتی مریشك دوو سەعات و نیو، هێلکە سێ سەعات.



١٥٧. ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ – ١٧٠٦) لە شاری بایەزید لە دایك بووە، دانەری چیرۆکی ئەمر مەم و زینە کە بە شاکارێکی ئەدەبی هەرە بەرزدا دادەنرێت.

١٥٨ـ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە یەکێك بووە لە خەلیفەکانی سەردەمی ئەمەوییەکان هێندە راست کردار و رەوشت پەسند بوو ناونراوە خەلیفەی راشدی پێنجەم (وەکو زانراوە راشدین چوار خەلیفە بوون)، دەرمان خوارد کراوە و مردووە.

١٥٩. لە ساڵی ٦٣٤دا شەڕی ئەجنادین لەنێوان سوپای ئیسلام و رۆم دا لەنێوان غەززە و قودس دا رووی داوە، موسڵمانەکان بەسەر کردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص شەرشیان کرد.

١٦٠. ئەبوجەهل لە شەڕی بەدردا کوژراوە، پێغەمبەری خوا ناوی نابوو فیرعۆنی ئەتەوەی خۆی.

١٦١. سێ کوڕی هاروونە ڕەشید بەدوای یەک دا بوونە خەلیفە:
١. ئەمین ٨١٣ ز
٢. مەئموون ٨٣٣ ز
٣. موعتەصەم ٨٤١ ز
وەکو زانراوە هاروونە ڕەشید دوای براکەی کە ناوی (هادی) بوو کراوە بە خەلیفە، دەڵێن (خەیزوران)ی دایکیان هادی دەرمان خوارد کردووە.

١٦٢. هەموو ساڵێک مار کاژ فڕێ دەدا.، چونکە زۆر زوو گەورە دەبێت و کاژەکەی بە بەرییەوە تەسک دەبێت بۆیە هەموو ساڵێک کاژێک فڕێ دەدات.


پشیلەی نرسلو





١٦٣. بووک لە گواستنەوەدا تارای بەسەردا دەدەن. ئەم ڕەوشتە لە ئیغریقییەکانەوە ماوەتەوە، تا لە ڕوحە ناپاکەکان بووکی جوانکیلە بپارێزرێت.

١٦٤. بێ کەڵک و تەمەڵ ترین پۆلی مێشە هەنگ نێرینەکانیەتی ئەمانە هیچ کارێک ناکەن جگە لە جووت بوون لەگەڵ شاژن دا.

١٦٥. زەوی لە ڕۆژاواوە سووڕ دەخوات بۆ ڕۆژهەڵات. جا ئەگەر لە پاریسەوە بگەڕێیتەوە بەغدا بە فڕۆکە زووتر دەگەیت لەوەی کە لە بەغداوە بۆ پاریس بچیت.

١٦٦. وەکو زانراوە مێشەسی (حوبارە) باڵدارێکی گەلێک گەورە بە ئەندازەی مریشکێک دەبێت، جارجارێک هێلانەکەی خۆی لێ گوم دەبێت و لەسەر هێلکەی باڵدارێکی تر هەڵ دەنیشێت.

١٦٧ـ دەزانیت دروشمی حزبی دیموکراتیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نێرەکەرە و دروشمی حزبی کۆماریش فیلە.

١٦٨. کاتێک سەگێک پشیلەیەک بەگیر دەهێنێت دەبینرێت پشیلەکە خۆی فش دەکاتەوە و مووەکانی بەرز دەبنەوە تا خۆی لەوە زلتر و بە تواناتر پیشان بدات، بەڵام ئەوە هەزاران ساڵە ئەو خۆگیف کردنەوەیە بەلای سەگەوە بای فلسێکە، کەچی پشیلەش هەر بەردەوامە لەو بەندوباوەدا.

١٦٩. ژیان مانایەکی نییە لەگەڵ نائومێدیدا

نائومیدیش بێ مانایە لەگەڵ ژیان دا

(مصطفي كامیل)

١٧٠. ئەگەر قورسایی مرۆڤ لەسەر زەویدا ٦٠ کیلۆگرام بێت, لە مانگ دا قورسایی یەکە دە کیلۆگرامە.

١٧١. نیرۆن شاری رۆمای سووتاند تا دووبارە دروستی بکاتەوە بە شەقامی پان و پۆرتر و خانووی جوانترەوە سەیر ئەوەیە پێش ئەوەی ئاگرەکە بنێتەوە چادرێکی زۆری بۆ ماڵ سووتاوان هەڵدابوو.

١٧٢. بە هەردوو وڵاتی ئیسپانیا و پرتەغال دەگوترێ "ئیبەریا".

١٧٣ـ تەواوی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بە (بسم الله) دەست پێ دەکات جگە لە سوورەتی (التوبە). و سوورەتی (النمل)یش تەنیا سوورەتێکە دووجار (بسم الله)ی تێدایە.

١٧٤. کەعب کوڕی زوهێر یەکێکە لە شاعیرانی (موعەللەقاتی سەبعە) پێش موسڵمان بوونی بە شیعر هەجووی پێغەمبەر (ص)ی کردبوو بەڵام دوای موسڵمان بوونی هەڵبەستی بەناوبانگی "بانت سعاد"ی وتووە.

١٧٥. چوار کوڕی عەبدولەلیکی کوڕی مەروان دوای خۆی کران بە خەلیفە:
وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك خەلیفەی شەشەمی ئەمەوی. سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك خەلیفەی حەوتەم. یەزیدی کوڕی عەبدولەلیك خەلیفەی نۆیەم. هیشام کوڕی عەبدولەلیك خەلیفەی دەهەم.
سەیر لەوە دایە ئەم چوار برا خەلیفەیە چوار خوشکیان مارە کردووە و هەر چواریان کچی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەزرەتی عوثمان بوون.


گۆری صەلاحەددینی ئەیووبی لە دیمەشق دا

١٧٦. ئیبن بەطووطە:
بیست و هەشت ساڵ لە گەشت دا بووە ١٢٠,٠٠٠ کیلۆمەتری بڕیوە.

١٧٧- شاری ئەستەنبول ئەوسا پێ گوتراوە:
بیزەنتیە، قوستەنتەنییە، ئەستانە.

١٧٨. دەزانی گۆڕی صەلاحەددینی ئەیوبی لە شاری دیمەشق دایە و گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید لە شاری حیمص وڵاتی سووریادایە.


شاری کوفە

١٧٩. شاری کووفە بە دووەمین پایتەختی ئیسلام داندراوە کە

لەلایەن سەعد کوڕی ئەبی وەقاسەوە دروست کراوە و پایتەختی خەلیفەی چوارەم بووە شاری دیمەشقیش بە پایتەختی سێیەم داندراوە.

۱۸۰. دەزانی مێشوولە زۆرتر بە مرۆڤی پێست سپییەوە دەدات تا پێست ڕەش یان زەرد.

۱۸۱. خڕۆکە سوورەکانی لەشی مرۆڤ لە وردی و بچووکیدا بە چاو نابینرێن لە هەر سانتیمەتر سێجایەکی لەش دا پێنج ملیۆن و نیو دانەی تێدایە کە کاریان دابەش کردنی ئۆکسجین و خواردەمەنییە بۆ لەش. بەڵام خڕۆکە سپییەکان کاریان پاراستنی لەشە لە نەخۆشی لەهەر سانتیمەترێك سێجادا سێ هەزاری تێدایە.
بۆ ئاگاداری: نەخۆشیی بەناوبانگی سەدەی بیستەم ئایدز Aides لە نزیك بوونەوەی پیاو لەگەڵ پیاودا و لە بەکارهێنانی دەزگای شەرەنقە یەکتر لە کاتی هێرۆنین کێشان دا تووشی مرۆڤ دەبێت و تاکو ئێستاش دەرمانی بۆ نەدۆزراوەتەوە و دەبێتە هۆی مەرگی نەخۆشەکە چونکە خڕۆکەی سپی لەلەش دا دەمرێت و هیچ جۆرە توانای بەربەرەکانی نامێنێت لە لەش دا.. لە ئاکام دا دەبێتە هۆی مردن.

۱۸۲. لێدانی دڵی مشك لە دەقیقەیەك دا ۲۵۰ - ۳۰۰ جارە, لە کاتێك دا فیل بەو زل و زەلامییەوە دڵی لە دەقیقەیەك دا تەنیا ۲۵ جار لیێ دەدات. هەروەها دڵی منداڵیش لە دڵی گەورە زۆرتر لێ دەدات. "خۆ بە زل و زەلامی نییە برا !".

۱۸۳. دەزانی: لە هیندستان دا ٥٠ ملیۆن موسڵمان هەیە و لە تورکیادا ۳۲ ملیۆن و لە نێجیریەدا ٤٢ ملیۆن.

۱۸٤. دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی عوسمانی و هاتنە سەرکاری ئەتا تورك لە وڵاتی تورکیادا نووسین بە پیتی عەرەبی قەدەغە کرا و پیتی لاتینی لە باتی عەرەبی بەکارهات.

۱۸٥. زمانی مرۆڤ هەر بەشێکی تامێك لێك دەداتەوەو بنی زمان و سەرەتای قورگی مرۆڤ تامی تاڵی لێك دەداتەوە, چەپ و ڕاستی زمان تامی شیرینی و سوێری لێك دەدەنەوە, بن دەستی زمان تامی ترشی و ناوەڕاستی زمان هیچ جۆرە هەستێکی نییە بۆ تام لێك دانەوە.

۱۸٦. وەکو زانراوە کاتی ئیش کردن لە هاوین دا لەگەڵ زستان دا دەگۆڕێت. وڵاتی ئەڵمانیا یەکەمین وڵاتێك بووە, ئەم گۆڕینەی داهیناوە.


شازن شەجەرەتولدور

۱۸۷. مرۆڤ کە تووشی نەخۆشیی تاعوون دەبێت پێستی ڕەش هەڵ دەگەڕێت, جا بۆیە پێ گوتراوە مەرگی ڕەش.

۱۸۸. شاژنە (شەجەرەتولدور) ژنی مەلیك ئەلصالح نەجمەدین ئەیوب بووە, لە گەرمەی شەڕی مەلیك لەگەڵ خاچییەکان دا مەلیك مردووە و شەجەرەتولدور جێگەی گرتوتەوە شەڕ هەر بەردەوام بووە لە ئاکام دا بەسەر دوژمن دا سەرکەوتووە.

١٨٩- شاری ئەنبار یەکەمین پایتەختی دەسەڵاتی عەباسییەکان بووە لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوعەباسی سەفاح دا.

١٩٠- یۆلیۆس قەیسەر (١٠١ - ٤٤ پ. ز)
یۆلیۆس قەیسەر پێیدەگوترا دیکتاتۆر نك بە مانای وشەی دیکتاتۆری ئەمڕۆ, بەڵکو ئەوسا وەکو چۆن دەگوترا ئیمپراتۆر, شا, بەو جۆرەش لە ڕۆمادا ناوی دکتاتۆر باوبوو. بەڵام دوای کوشتنی یۆلیۆس قەیسەر ناوی ئیمپراتۆر بردوی پەیدا کرد.. یەکێك لەم ئیمپراتۆرانەی نیرۆن بوو کە هەم دایکی خۆی کوشت و هەم ژنەکەی و شاری ڕۆماشی سووتاند و کردییە خۆڵەمێش.


بیابان

١٩١- وڵاتی ئەلبانیا پایتەختەکە ناوی (تیرانا) بە ڕژێمی وڵاتەکە کۆمۆنیستییە ٦٠٪ی خەڵکی وڵاتەکە موسڵمانن.

١٩٢- پان و پۆرترین بیابانی جیهان لە سەرووی ئەفریقادایە کە رووبەرەکەی هەشت ملیۆن و نیو کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.


قەیسەر

١٩٣- دەزانی:
زومرووود رەنگی سەوزە.
پیرۆزە رەنگە شینە.
یاقووت رەنگی شینە یان سوورە, جارجاریش زەردە و لە پیرۆزە و زومرووود گرانترە.

١٩٤- وڵاتی (بەحرەین) چڕترین وڵاتی عەرەبە, چونکە لە هەر کیلۆمەترێکی چوار گۆشەدا ٣٧٦ کەس دانیشتووە.

١٩٥- نەخۆشیی هاری لە گورگەوە بڵاو دەبێتەوە و ڕێوی چەقەڵ و سەگ و پشیلە تووشی دەبن و لەوانیشەوە بۆ مرۆڤ یان یەکسەر لە گورگەوە بۆ مرۆڤ بڵاودەبێتەوە.

١٩٦- مێ بازی سەدەکانی ناوەڕاستی بەناوبانگ ناوی (دۆن جوان) و خەڵکی وڵاتی ئیسپانیا بووە.

١٩٧- وڵاتی فیلیپین ماوەی ٤٨ ساڵ ژێر دەستەی ئیمپریالیستی ئەمریکا بوو, ٣٧ ملیۆن کەسی تێدا دەژیت و نزیکەی ملیۆنێك و نیویان موسڵمانن.

١٩٨- پەیکەری "ئەبولهەول" یەکێك لە پاشاکانی کۆنی میصر دروستی کردووە ناوی (خەفرەع) بووە, کەڕووی خۆی و لەشی شێرە و روو لە هەتاوە کەنیشانی ستایشە بۆ خۆر.
١٩٩- وا بەناوبانگە لویسی چواردەهەم پاشای وڵاتی فرانسە وتوویەتی : "دەوڵەت یانی من, من یانی دەوڵەت" لویسی پانزدەهەم و توویەتی : "من کە هەم خوای دەکرد دوای من دنیا وێران دەبوو" ئەوە بوو لویسی

شانزدەهەم بەر شەپۆلی شۆرشی خوێناویی میللەتی فرانسە کەوت لەگەڵ ماری ئەنتوانێتی شاژن دا هەردووکیان لە گەردنیان درا.

۲۰۰. زانیوتە؛ یەکیەتی سۆڤیەت لە (۱۵) کۆماری پێك هاتووە؟

۲۰۱. فیل ماوەی ۲۲ مانگ تا ۲۵ مانگ درێژە دەکێشێت تا بەچکەی ببێت واتە ماوەی ئاوس بوونی ئەوەند دەکێشێت. نەهەنگی دەریاش شانزە مانگی پێ دەچێت.

۲۰۲. (رومێل) کە سەرکردەیەکی بەناوبانگی رایشی سێیەم بوو لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی دی کەدا ویستیان دام و دەزگای هیتلەر راپێچن و لەناوی ببەن بەڵام پێیان زانرا و رۆمیلیان بە دەستی خۆی دەرمان خوارد کرد.

۲۰۳. گا و مانگا لە ولاتی هیندستان دا ریزێکی تایبەتی لیج دەگیرێت و زێرەکەش نایبنییە. جا بە پێی ژمارە ۲۰۰ ملیۆن گا و مانگا لە هیندستان دا هەیە.

۲۰٤. لە ساڵی ۱۸۲۳ شاری خەرتووم لەلایەن محەممەد عەلی پاشاوە دروست کرا.

۲۰۵. فیل حەفتا سال دەژیت.
حوشتر بیست و پێنج ساڵ.
ئەسپ سی و پێنج ساڵ.
مەیموون سی ساڵ.
داڵ سەد ساڵ.







۲۰٦- ئێسکی لەشی مرۆڤ قورسایی ۱۵٪ی قورسایی تێکرای لەشی مرۆڤە, لە کاتێك دا گۆشتی لەش ٤۰٪ی قورسایی لەشە.

۲۰۷. زۆر لە وڵاتانی پیشەسازی خاوەن کەشتیگەلی بازرگانیین و لەدەریاکانی جیهان دا دەسوورێنەوە.
جا ئەمەش ژمارەی کەشتییەکانیانە:

١- ژاپۆن ٢١٠,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.
٢- یەکیەتی سۆڤیەت ٢٣,١٤٠,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.
٣- لیبەریا ٢,١٣٩,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.
٤- بریتانیا ١,٦٢٧,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.
٥- یۆنان ١,٥٥٠,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.
٦- نەرویج ١,١٨٦,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.
٧- ئەمریکا ١,١٦٠,٠٠٠ کەشتیی بازرگانی.

٢٠٨- منداڵ لە سەرەتاوە (٣٠٥) دانە پیشە (ئێسک) لە لەشیدا هەیە و لەگەڵ گەورەبوون دا زۆر لەو ئێسکانە لەگەڵ یەك دا دەگیرسێنەوە. پیاو تەنیا ٢٠٦ دانە و پارچە پیشی لە لەشیدا هەیە.

٢٠٩- وڵاتی جەزائیر بە دووەمین وڵات دادەنرێت لە بەرهەم هێنانی تەپەدۆر (فلین)دا. یەکەمین وڵات لەم رووەوە پرتەغالە، دوای ئەوان مەغریبە، چوارەم ئیسپانیایە و پێنجەم فرانسە و شەشەم توونسە.


شیتای توندوتیژ

٢١٠- ١- بەرهەمی قاوە لە وڵاتی بەرازیل دا ساڵانە ٢٧ ملیۆن فەردەیە.
٢- کۆلۆمبیا ١٠ ملیۆن فەردە.
٣- ساحیل عاج ٤ ملیۆن فەردە.
٤- ئەندەنووسیا ٣,٨ ملیۆن فەردە.
٥- مەکسیك ٣,٦ ملیۆن فەردە.

٢١١- سەرگۆی پەنجەی مرۆڤ گەلێك ناسك و هەست کەرە لە کاتێك دا ناوی گەدە (مەعیدە)ی مرۆڤ هیچ جۆرە هەستییەکی (لمس) نییە.

٢١٢- شاژنە زەنووبیا لە ساڵی ٢٧٧ ز لە رۆمادا لە دیلێتیدا مردووە بەلام شاژنە (شەجرەتولدور) شاژنی میسر بە قاپقاپ کوژراوە.


شاژن زەنوبیا

٢١٣- دوو ناسراوی مەیدانی عیشق و دڵداری ناویان قەیس بووە، یەکێکیان شێتی لەیلا ناوی قەیس کوڕی ئەل ملەووەح بوو. ئەوی دی قەیسی لوبنا ناوی قەیس کوڕی ذەریح بوو. هەردووکیشیان لە تیرەی بەنی عوذرەن.

٢١٤- خێراترین گیانلەبەرێك درندەیەکە بەناوی "شیتا" کە جۆرێکە لە خێزانی پڵنگ و خێرایی لە سەعاتێك دا ٧٠ کیلۆمەترە.

٢١٥- ناوی شیرین لە پلەی سفری گەرمادا دەیبەستێ (دەرچێت) لە کاتێك دا سوێر لە پلەی دوو ژێری سفردا دەرچێت.

٢١٦- یۆرانیۆم مادەیەکی گران باییە و لە جیهان دا کەم و نایابە. تاکو ئێستا ئەوەی روون بۆتەوە:
١- کەنەدا ١٥٠ هەزار تۆنی هەیە.
٢- ئەمریکا ١٤٠ هەزار تۆن.
٣- باشووری ئەفریقیا ٢٥ هەزار تۆنە.

٢١٧- هەر هەموو ئاوی شیرینی سەر زەوی دەکات ٣٪ی ئاوی دنیا، واتە ٩٧٪ی ئاوی دنیا سوێرە. ئەم ٣٪ ئاوە شیرینەش ٧٥٪ کەژی بەفرینی سەر زەوی و ٢٥٪یشی ئاوی رووبار و کانی و زۆم و گۆمە شیرینەکانی دنیایە.


سالم

٢١٨- ئەسپێ نەخۆشیی گرانەتا دەگوێزێتەوە و خەڵکی تووش دەکا، بەڵام مێشوولەی ئەنوفلیس لەرز و تا (مەلاریا).

٢١٩- لەگەڵ دڵ شەرتە سالم گەر نەجاتم بێ لە تارانا،
بەهەشت گەر بێتە مولکی رەی بە ئێران دا گوزەرناکەم
سالم (١٨٠٥ – ١٨٧٣) ناوی عەبدولڕەحمان بەگی صاحیب قرانە و لە سلێمانی لە دایک بووە. شاعیرێکی کوردی بەتوانا و وردەکارە.

٢٢٠- ئەگەر هاتوو بە سواریی فڕۆکەیێکی "نفاثة" لە شاری بەغداوە بەرەو شاری لەندەن، نیویۆرک، هۆنگ کۆنگ و بۆمبای بە خێرایی ٧٠٠ میل لە سەعاتێک دا بە ئاسمانەوە بیت شەوت بەسەردا نایەت و سبەینێ لە رۆژدا دەگەڕێیتەوە بەغدا چونکە سووڕ خواردنی زەوی بە دەوری خۆیدا بە خێرایی ٧٠٠ میلە لە سەعاتێک دا. (لە شاری لەندەنەوە سواری فڕۆکە بووم رۆژی سێ شەمەبوو بەرەو نیویۆرک کەوتینی رێ، سبەینە گەیشتمە شاری نیویۆرک هەر سێ شەمەبوو و بە ئاسمانیشەوە شەوم نەدی – خ – نووسەر -).

٢٢١- کاتێك مرۆڤ هەواڵێکی خۆش دەبیسێت گەلێك خۆش حاڵ دەبێت و جووڵانەوەی زۆر دەبێت. هەواڵی ناخۆشیش دەبێتە هۆی بێ دەنگی و بێ جووڵانەوە و غەم خواری. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ پارچە گۆشتێك کە بەسەر گورچیلەوەیە کە مادەیەك بەرهەم دەهێنێ پێی دەڵێن "ئەدرنالین" کە دەبێتە هۆی بەربڵاو رەگەکانی ناو لەش و جووڵانەوەی زۆرتری خوێن و لە ئاکام دا زۆربوونی توانای مرۆڤ. بەڵام لە کاتی غەم خواردن دا ئەدرنالین هیچ جۆرە جووڵانەوەیێکی نابێت.


لووتی کەروێشك

٢٢٢- ئەگەر بڕوانیتە لووتی کەروێشك دەبینیت هەر لە جووڵانەوەدایە. بۆ ئاگاداری، تەواوی چەك و تفەنگ و شمشێری ئەم گیانلەبەرە بەستەزمانە هەر ئەو جووڵانەوەی لووتەیە. بەوەدا هەست بە (بۆن) دەکات و بەو جووڵانەوەدا خواردن دەدۆزێتەوە.

٢٢٣- دەزانی بە جوولەکە دەڵێن (عبرانی)؟
چونکە لە رووباری فورات پەڕینەتەوە بەرەو دەشتی شام.

٢٢٤- سارووخ:
کاتێك سارووخێك بەرەو مانگ یان ئاسمانی دوور بتەقێتەوە دەبێت لە رۆژاواوە بەرەو رۆژهەلات بتەقێتەوە تا لەگەڵ سوورِ خواردنی زەوی دا بە یەك لادا بن و ئەبێتە هۆی سوانێکی زۆرتر لەگەڵ هەوا و هێزەکانی دی کەدا کاتێك دەیەوێت لە ماوەی راکێشانی زەوی دەرچێت, وە لە گەڕانەوەش دا هەروەها کە دەگاتە چێوەی (محیطی) توانای راکێشانی زەوی دەبێت لە رۆژاواوە بەرەو رۆژهەلات خۆی لەو تاوانەیە بخشێنێت.

٢٢٥- شاری بەغدا لە ساڵی ١٢٥٨ز لەلایەن خوێن رێژی مێژووەوە هۆلاکۆ خان کاول کراوە و دوای سەد و سی و چوار ساڵ لەلایەن تەیموور لەنگەوە دیسان وێران کراوەتەوە. هەردووکیان لە نەتەوەی مەغۆل بوون.


تیموورلەنگ


هۆلاکۆ


سیبویهی

٢٢٦- زۆر بیستراوە کە فلانە کەس "نە ئەسلی هەیە و نە فەسڵ"
لە راستیدا ئەم دوو وشەیە دیارە بە ئەندازەی یەك گرنگ بوون و شان بە شانی یەك. ئەسڵ واتە بنەچەك, بنەرەت, بنەماڵە. فەسڵیش مانای زمان و زانیین و وتوویژ و مەنتیق دێ.

٢٢٧- زۆر وڵات هەیە پایتەختەکانیان بە گوێرەی شارەکانی تریان بچووکترن. ئەمەش چەند نموونەیەك:
١- سویسرا: (بێرن) پایتەختە و ١٨٠ هەزار کەسی تێدا دەژیت, بەڵام زۆریخ ٤٥٠ هەزار کەسی تێدا دەژیت و پایتەختیش نییە.
٢- چین: (پەکین) پایتەختە, کەچی شاری شەنگەهای لەو گەورەترە.
٣- ئوستڕالیا: (کانبێرا) پایتەختە و ٢٠٠ هەزار کەسی تێدا دەژیت, شاری (سەدنی) سێ ملیۆن کەسی تێدایە.
٤- هیندستان: (دەلهی) پایتەختە و چوار ملیۆن کەسی تێدا دەژیت و شاری کلکەتا هەشت ملیۆن کەسی تێدایە.
٥- ئەڵمانیای رۆژاوا: (بۆن) پایتەختە و شاری بەرلینی رۆژاوا دوو ملیۆن و دوو سەد و پەنجا هەزار کەسی تێدا دەژیت.
٦- برازیل: (برازیلیا) پایتەحتە و شاری ریۆدۆجانیرۆ پێنج ملیۆن کەسی تێدا دەژیت.

٢٢٨- وەکو زانراوە ئەسکەندەری ماکادۆنی یەکێك بووە لە گەورەترین جیهان گیرەکانی مێژوو بە ماکادۆنی بەناوبانگ بووە چونکە باوکی شای ماکادۆنیا بووە لە ولاتی یۆنان دا, ئەگەر چی ئێستا لە نەخشەی سیاسی دا ماکادۆنیا دەڵەتێکی تایبەتی نییە و سەر زەوییەك کە ماکادۆنای ناو بێت ئەمرۆ بەسەر وڵاتانی یۆنان, بولگاریا و یۆغسلاڤیادا دابەش کراوە.

٢٢٩. دوو دەریا هەیە بە ناوی دەریای سپی یەکەمیان کەوتوتە سەری قارەی ئەوروپاوە بۆیە پێی دەڵێن سپی چونکە دوانزدە مانگەی خوا ڕچاوە و سپی دەچێتەوە. دووەمیان دەریای سپیی ناوەڕاستە کە کەوتووتە نێوان سێ قارە و بۆیە پێی دەگوترێ سپی چونکە هەوردەکانی سەر ئەم دەریایە هێندە سپییە دەڵێی لۆکەیە.

٢٣٠. سیبەوەیهی زانای ناسراوی ڕێزمانی عەرەبی لە شاری بەصرەدا لە دایك بووەو لەبەر ئەوەی رووی سوور و سپی بووە دایکی ناوی ناوە "سیبەوەیهی" واتە بۆنی سێو ئیتر بەو ناوەشەوە شۆرەتی پەیدا کرد.




٢٣١. هەر گیانلەبەرێك سەری جیا بکەیتەو لە لەشی بێ گومان دەمرێت، کرمی زەوی نەبێت هەر کوێ لە لەشی ببڕیت پاش ماوەیەك دەبێتەوە بە کرمێکی تەواو چونکە هەر بەشێکی لە لەشی کرم ئەوەی هەیە دیسان ئەوزەڵ بکاتەوە.

٢٣٢ـ وەکو زانراوە دەوڵەتی ئەمریکا تاکو ئێستا چەن ناوچەیێکی بە پارە کڕیوە و داویەتییە دەمی وڵاتەکەیەوە وەکو:

١. ناوچەی ئالاسکا لە وڵاتی رووسیا کڕی بە حەوت ملیۆن و نیو دۆلار لە ساڵی ١٨٦٧.

٢. ناوچەی لویزیانای لە فڕانسە کڕی بە پانزدە ملیۆن دۆلار.

٣. دورگەی مانهاتنی لە هیندییە سوورەکان کڕی بە بایی (٢٤) ملیۆن دۆلار پارچە و ملوانکە. هەر بەم جۆرە چەند ناوچەیەکی دە کەیان سەندووە وەکو فلۆریدا, ئەریزۆنا, نیومەکسیکۆ, کالیفۆرنیاو نیڤادا و کلۆرادۆ.

٢٣٣. لە بیرنەکەیت کە کۆنترین زمانێك کە بە پیت نووسراوبێت زمانی چینییەکان کە لە ٤٤٠٠ی پێش زایین دەنووسرا, بەڵام زمانی سەردەمی فیرعۆنەکان بە شێوەی رەمزی هیرۆگلۆفی وێنە دەکێشرا نەکوو پیت.

٢٣٤ـ سەمیرئەمیس شاژنی سەردەمی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان بووە, دوای مردنی مێردەکەی شووی بە سەرکردەیێکی سوپای ئاشوور کردووە بەناوی نینۆس.

ناوی سەمیرامیس واتە (کۆتر)

٢٣٥. زۆر لە ناوداران گۆشتیان نەخواردووە وەکو:

ئەبولعەلای میعەڕی، بەرناردشۆ، ڤۆلتێر، تۆلستۆی، نیوتن



ڤۆلتێر



نیوتن



تۆلستۆی



بەرنادشۆ

٢٣٦. دۆن کیشۆت قارەمانی چیرۆکی داستان نووسی ئیسپانیایی (مایکل سێرڤانتیس) بووە. ئەم چیرۆکە باسی هەندێك لە رەوشتی سەدەکانی ناوەڕاست دەکات کە چۆن بەدوای قارەمانێتییەکی پڕوپووچ و پڕ فیشال و خۆ بە زل زانینی هیچ تیا بەسەر نەبوو.

٢٣٧. بزانە کە (ئەبیقرات) ناسراوە بە باوکی پزیشکی و هیرۆدۆتس ناسراوە بە باوکی مێژوو.

٢٣٨. عەنتەری کوڕی شەداد یەکێکە لە شاعیرانی (موعەللەقەی سەبعە) و شەڕکەرێکی ئازا و بەتوانا بووە. دوای ئەوەی پیر دەبێت لە شەڕێك دا لەسەر ئەسپەکەی دەکەوێتە خوارەوە و ئەسپەکە ڕادەکا . ئەویش پەنادەباتە ئەشکەوتێك، شەڕکەرێك بەدوای دا دەڕوات و لە ترسا کوشتی چونکە لەوە ترسا دیلی بکات و بی کوژێت.



٢٣٩. لە ساڵی ٣٠ پ. ز ئەنتۆنیۆ و کیلۆ پاترا لە مانگی ئاب دا خۆیان کوشتووە. هەر لە مانگی مارت دا ئیسلام لە شەڕی یەرمووك دا بەسەر ڕۆمەکان دا لە ساڵی ٦٣٦ی زایین دا سەرکەوتووە .. هەر لە مانگی مارت دا لە ساڵی ١٩٤٥ ز یەکەمین بۆمبای ئەتۆمیان بەسەر هیرۆشیمادا تەقاندووە.

٢٤٠. یەك دان مێش هەنگ بۆ ئەوەی بە تەنیایی بتوانێت کیلۆیەك هەنگوین دروست بکات دەبێت ٢٤٠ هەزار کیلۆمەتر ببڕێت، (٤٨) هەزار جار لە پوورە بێتە دەرەوە و هەر جارێك (٥) کیلۆمەتر ڕێ بکات. واتە بە ئەندازەی شەش ئەوەندەی دەوری زەوی ببڕێت تا بە تەنیا یەك کیلۆ هەنگوین دروست دەکات..

٢٤١. لە ولاتی عەرەبەکان دا ئەم وڵاتانە یەکەمن:

- عیراق لە زۆریی خورما.
- توونس لە زۆریی زەیتوون.
- سوودان لە زۆریی شرێس "سەمغ"
- سۆماڵ لە زۆریی مۆز
- جەزائیر لە زۆریی تەپەدۆر (فلیین).
- میصر لە زۆریی لۆکە.

٢٤٢ـ وڵاتی بۆلیڤیا بەناوی (سیمۆن بۆلیڤار)دوە ناونراوە، ناوبراو یەکێکە لە رابەرە ئازادی خوازەکانی ئەمریکای خواردوە.

٢٤٣. ئەوە بزانە کە:

١- شاری بەصرە لە ساڵی ١٦ای کۆچیدا لە زەمانی حەزرەتی عومەر دروست کراوە.
٢- شاری کووفە لە ساڵی ١٨ای کۆچی دا لە زەمانی حەزرەتی عومەر دروست کراوە.
٣- شاری فوستاط لە ساڵی ٦٤٢ ز لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا دروست کراوە.
٤- شاری قەیرەوان لە ساڵی ٦٦٦ی ز دا عوقبەی کوڕی نافع روست کراوە.
٥- واسیط لە ساڵی ٦٩٤ ز دا حەججاج کوری یوسف دروستی کردووە.
٦- شاری بەغدا لە ساڵی ٧٥٤ ز دا لەلایەن ئەبوجەعفەری مەنصووری خەلیفەی عەباسییەوە دروست کراوە.


دەروازەی ئەوسای شاری بەغدا


شاری بەغدا

# سکرتێرەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان



ئۆ تانت



پێتروس غالی



داگ هامێر شوڵد



کورت وادهایم



خاویەر پریزێد کوئیار

٢٤٤- بزانە کە ئەندازەی مێشکی پیاوێك دوو بەرامبەری مێشکی مەیموونێکە، جارجاریش سێ بەرامبەرە.

٢٤٥- شاری (قودس) ئەسکەندەری ماکەدۆنی لە ساڵی ٣٣٢ی پێش زایین داگیری کردووە و لە دوای ئەو بەتلیسەکان و سلوقییەکان داگیریان کردووە لە ساڵی ٦٣ی پێش زایین دا بەمبیوس وێرانی کردووە و هێرۆدۆسی گەورەی سەردەمی دەسەڵاتی رۆمانی دیسانەوە دروستی کردوەتەوە.

٢٤٦- ئەوە بزانە کە:

١- جوولەکە لە ١٩٦٩/٨/٢١ مزگەوتی (ئەقصا)یان سووتاندووە.
٢- گۆڕی صەلاحەددینی ئەیووبی لە مزگەوتی ئەمەوی دایە لە دیمەشق.
٣- نۆکەندی سوێس لە ساڵی ١٨٦٩ز دا کراوەتەوە.
٤- وڵاتی ئەندەنۆسیا تێکڕا ٣٠٠٠ دورگەیە.
٥- ئیبراهیم خانی دەلو شۆڕشگێڕی ناوچەی کفری دژ بە دەسەڵاتی ئینگلیز لە ساڵی ١٨٧٤ز لە دایك بووە.
٦- سیر زۆر سوودی هەیە بۆ نەهێشتنی چەوریی خوێن و هاندەرێکی چاکە بۆ جووڵانەوەی خوێن و بۆ نەهێشتنی" پەستانی خوێن" ویتەوبوونی دەمار و ڕەگەکان، جا مەوەستە سیر بخۆ. "ئەگەر چی لە ئەوروپادا کردوویانە بە گولاج و بۆنیشی نایە".
٧- قەرەقووش وەزیر بووە لە سەردەمی صەلاحەددینی ئەیوبی دا و ناویشی "بهاء الدين الأسدي" بووە.
٨- ئەتا تورك ناوی مصطەفا کەمال بووە، ئەم نازناوەش مانای باوکی تورکەکانە.
٩- تەواق مالاوایی بە دەوری کەعبەدا پێویستە لەسەر هەر حاجییەك .. ئەگەر ژنێك لە بێ نوێژیدا بێت تەواق ماڵاوایی پێویست نییە.
١٠- کۆمپانیای "نۆکەندی سوێس" شاری ئیسماعیلیەی دروست کردوە.

٢٥٠ هەزار کرێکاری میسری لە هەل کەندنی جۆگەکەدا ئیشی کردووە.
١٢٠,٠٠٠ کرێکاری میسری لە هەڵ کەندنەکەدا مردووە، کارەکاش دە ساڵی درێژە کێشا تا تەواو بوو.

٢٤٧- ئەبولحەسەن بەنی صەدر بە یەکەمین سەرکۆماری ئیسلامی دەژمێردرێت دوای هەرووژانی شا، لە نووسینێك دا دەگێرێتەوە دەڵێت: خومەینی رۆژی هەر نەبێت دەبێ یەك سەعات سەیری فیلمی منداڵانەی کارتۆن بکات بەتایبەتی کارتۆنی پشیلە و مشکەکە *Tom and jery* ئەگەر رۆژێك کارتۆن نەبینێت کەس ناوێرێت توخنی کەوێت، وڕکەکانی کە دەی گرێت لە ڕکی منداڵێکی لاساری بێنەکەوتوو قورستر و ناپەسەندترە.

٢٤٨- زۆرترین ئەندازەی زێڕ لە کۆگایەك دا انراوە دەپارێزێت لە قەلای "فورت نۆکس" ی ناوچەی کەنتاکیی ئەمریکا دایە، کە لەژێر زەوی دایە و بایی دە ملیار دۆلارە.
تاکو ئێستاش گەنجینەیەکی هونەریی ئالتوونی کە دۆزرابێتەوە پەیکەرە زێڕەکە تووت عەنخ ئاموونە کە درێژیی شەش مەتر و قورسایی ٤٥٠ رەتڵە.

٢٤٩- ناوی زانستانەی حوشتر (کامیلۆس درومیداریۆس)ە براژنگی حوشتر پڕو درێژ و تا لە تۆزی ناو بیابان بیپارێزێت. هەروەها هەردوو کونە لووتیشی وەکو قەڵشتێکی دڕا و وایە تا هەڵ کردنی باو تۆزدا بە ئاسانی بیان بەستێت.

٢٥٠- کاتێك ناوی ناو بانێوی حەمام بەرەڵلا دەکرێت و دەڕواتە خوارەوە دەبینرێت بە دەوری گونجەکەدا بەلای چەپ دا سوڕ دەخوات و دەڕواتە خوارەوە، بەڵام ئەوە بزانە کە لە خوارەوەی هێڵی ئیستیوادا بە پێچەوانەیەو واتە ئەو سووڕ خواردنە لە راستەوە بۆ چەپە، چونکە سووڕ واردنی ناو بە پێی سوورش خواردنی زەوییە.

٢٥١- بۆیە ولاتی شام (سووریا، لوبنان، فەلەستین و ئەردون) ناونراوە شام چونکە سامی کوڕی نووح ئەو ولاتەی پێخۆش بووە و تێیدا گیرساوەتەوە.

٢٥٢- دورگەکانی کەناری "Canary" کەوتوونەتە رۆژاوای ئەفریقیاوە و لە کەناری ئەفریقیاوە ٦٠ کم دوورە، ناو و هەوایەکی خۆش و دیمەنێکی دەریایی و سەوزەلانییەکەی هەمیشە بەهاری هەیە "نووسەر خۆی دیویەتی".
ناوی کەناری لە بنەڕەت دا ناوێکی لاتینییە و لە پێش دا بە Canaria ناسراوە کە بە لاتیی "سەگ" دەگەیەنێ چونکە سەگی زۆر تێدا بووە. لە ساڵی ١٤٧٦ز دا ئیسپانەکان داگیریان کرد و تاکو ئێستاش هەر بە دەستیانەوەیە. نزیکەی یەك ملیۆن کەسی تێدا دەژیت.



٢٥٣- (بەتریق) پەلەوەرێکە لە قوتبی خواروی زەویدا دەژی و تەنیا یەك هێلکە دەکات، هێلکەکەش لەنێوانی هەردوو پێیدا هەڵ دەگرێت بی ئەوەی بیخاتە زەوی و بکشێت بەسەر بەفردا.. بۆ ماوەی حەوت هەشت حەفتە دەبێت بە جووجەڵە.


زیوەر

٢٥٤- زیوەر (١٨٧٥ – ١٩٤٨) ناوی عەبدوڵلا کوڕی محەممەدی کوڕی مەلا رەسووڵە، لە گەڕەکی کانی ئاسکانی شاری سلێمانی لەدایك بووە و شاعیرێکی نیشتمان پەروەرە.

٢٥٥- مەڕوانی کوڕی محەممەد دوا خەلیفەی ئەمەوییەکان بە (مەروانی کەر) بەناوبانگە چونکە لە سەردەمی ئەم خەلیفەیەدا شۆرش و هەرا و شەڕێکی زۆر ناوخۆیی پەیدا بووە. لە شەڕێك کە دەگەڕایەوە،نارەقەی وشك نەدەبووەوە بەرەو لایەکی دی بۆ دامرکاندنەوەی هەرایەك دەکەوتە رێ. جا لەبەر سەبوورییەکەی ناونراوە مەروانی کەر، لە ساڵ ١٣٢ی کۆچی دا لە میصر کوژرا و دەسەڵاتی ئەمەوییەکان لە ئاسیا و ئەفریقیادا بە ئێجگاری پێچرایەوە.



٢٥٦- تیمساح درندەیەکە خوێن ڕێژە شکێنەری وشکاوییە دەم و کاژێرەی کەلێك بەهێزە و لەوە دەچێت زۆریش شانازی بە ددانەکانییەوە بکات، بۆیە بەلایەوە زۆر گرنگە کە پاك و خاوێن بن. جا هەموو ڕۆژێك ماوەیەك دەم دەکاتەوە تا مەلێك هەیە بەناوی *Ziczac* زیکزاك دەڕواتە بەینی ددانەکانییەوە هەرچی گۆشتێك بەدەوری ددانەکانییەوە مابێتەوە پاکی دەکاتەوە و بۆ خۆی دەیخوات. ئەم پەیمانە لەنێوان تیمساح و مەلی زیکزاك دا بەستراوە، ئەو ددانەکانی پاك بکرێتەوە و دەم بەیەك دا نەنێ و زیکزاکیش لە وردەلە گۆشت تێر بێت.

٢٥٧- وەکو بیستوومانە ناوی زەم زەم زۆر بە نموونە دەهێننەوە بۆ ناوێکیشیرین و گەوارا بەلام لە ڕاستیدا ناویزەم زەم جۆرە تالییەکی تێدایە بەو شێوە شیرین نییە وەك ناوی دەرچووە.

٢٥٨- وەکو زانراوە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی کۆمپانیایەکی ئیمپراتۆیالیستی بووە لە سالی ١٧٧٣از دا پەرلەمانی بریتانیا بڕیاریدا کە کڕین و فرۆشتنی چایی لە ولاتی ئەمریکادا تەنیا بۆ ئەم کۆمپانیایە تەرخان بکرێت ئەم بڕیار بوو بە سەرەتای شۆرشی ئازادی خوازیی میللەتی ئەمریکا دژ بە ئیمپرالیستی بریتانیا کە ولاتی ئەمریکای داگیر کردبوو.. شەڕی سەربەخۆیی لە ئەمریکادا لە ڕووداوی چایەوە دەستی پێکردووە.

٢٥٩- لە سالی ١١٨٨ ز باجێك خرایە سەر میللەتی بریتانیا بەناوی باجی سەلاحەددین، ئەم باجە بۆ کڕینیچەك و تفاقی شەڕی سێیەمی سەلیبی بوو.

٢٦٠- دورگەی سیلان کەوتوتە خواروی ولاتی هیندستانەوەدو ئەو دورگەیە ڕۆژانی یەك شەموان ڕۆژی وچانیانە، دە ملیۆن کەس لایەنگری ئاینی هیندۆسە و یەك ملیۆنیش موسلمان.

سەرکۆماری ئەم دورگەیە لە پێش دا بوودایی بووە و بووەتە مەسیحی، کە کوژرا ژنەکەی بەناوی (باندرانایکا) کە نازناوی مێردەکەی بوو جێگەی گرتەوە.

٢٦١- دەگوترێت (هیندی چینی).. ئەم ناوەخۆ یەك ولات نییە بەلکو سێ ولاتە.

١- ڤێتنام: کە پایتەختەکەی هانۆیە.

٢- لاووس: کە ماوەی ٦٣ سال ژێر دەستەی فڕانسە بوو.

٣- کەمبۆدیا: کەنزیکەی سەد سال (١٨٦٣ — ١٩٦٣) ژێر دەستەی فڕانسە بوو.



٢٦٢- ئەحمەدی خانی: (١٦٥٠ - ١٧٠٦)

سەروەری شاعیرانی کورد و سەرداری خامە بە دەستان، نووسەری چیرۆکی هۆنراوەی مەم و زینی نەمر، هەرگیز لەبیر خوێنەوارانی کورد ناچێتەوە.

دەفەرموێت:

دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد

بێ مەعریفەتن، بی ئەسل و بنیاد

ئەنواعی میلەل خودان کتێبن

کرمانج تەنێ د بێ حسێبن

* * *

مەم شەمع دکر ژ بۆ خۆ دەمساز

کەی هەمسەر و هەمنشین و هەمراز

هەرچەند بسووهتنی وەکی من

ئەمما نە بە گوهتنی وەکی من



٢٦٣- کەرکەدەن گیانلەبەرێکی ناشیرین و ناهاڵە، هەندێکیان دوو شاخی هەیە و هەندێکیشی یەك شاخی هەیە، بە گشتی پێنج جۆرن دوانیان لە ئەفریقیا دایە بە کەرکەدەنی رەش و کەرکەدەنی سپی کە لەو سێ جۆرەکەی دی کە زەلام ترن و خێراییان لە سێ کیلۆمەتر لە سەعاتێك دا کەمتر نییە. جا بە خێراییەوە و بەو شاخە تیژەوە لە هەرچی بکەون لەتی دەکەن. جۆرەکانی ئاسیا بچووکترن و لە سۆمەترەدا دەژین.

٢٦٤- وڵاتی ئەمریکا بە ساختمانی گەلێك بەرز و بڵند ناسراوە ئەمانە بەرزترین ساختمانەکانی جیهانن:

١- قوللەی (سیرز روبوك) لە شاری شیکاگۆ بەرزیی ٥٤٩,٨ مەترە.

٢- بینای ئەمپایەر ستێت لە شاری نیویۆرك بە ئاریەلەکانی سەرەوەی ٤٤٨,٦ مەتر بڵندە.

٣- بنکەی بازرگانی لە شاری نیویۆرك، بێ ئاریەل ٤١١,٤ مەتر بەرزە.

٢٦٥- لویسی چواردەهەم پاشای فەرانسە چونکە کەچەڵ بووە (باورووکە) یان پرچی چنراوی لەسەر کردووە. جا ئەمە لە ئەوروپادا بووە بە رەوشت. هەروەها کچەکانی لویسی سیانزدەهەم لەبەر ئەوەی پاو و پووزین جوان نەبووە کراسی درێژیان لەبەر کردووە و بەو شێوەیە کراسی درێژ داهاتووە.

٢٦٦- کاتێك کاربەدەستان هەست بە مەترسی بکەن، بۆ ئەوەی لغاویان لە دەست دەرنەچێت بۆ ماوەیەك هاتۆچۆ یاساغ دەکەن. ئەم رەوشتەش لەسەرەتاوە زیادی کوڕی باوکی دای هێناو بۆ یەکەم جار لەشاری بەصرەدا بەکاری هێناوە. دەڵێن گوایە زیای کوڕی ئەبو سفیان بووە.

٢٦٧- ئەگەر چی کتێبێك هەیە بەناوی میتافیزیکی ئەرستۆ بەڵام ئەرستۆ هەرگیز وشەی میتافیزیکی نە لە وتارەکانی دا و نە لە نووسراوەکانیدا بەکارنەهێناوە، بەڵکی ئەو وشەیە لەمەوە داکەوتووە کە لە کتێبخانەدا بە پێی پێڕەوێك بە ریز کتێب دادەنرێت جائەو کتێبەش دوای کتێبی سروشت لە کتێبخانەدا دانرا بوو.

٢٦٨- بەشیر موشیر (١٨٩٣- ١٩٦٣)ز


ماموستا بەشیر موشیر

مامۆستا بەشیر موشیر رێز و حوورمەتی بەسەر هەموو کوردێکی خوێنەوارەوە هەیە وە وایش بووە، ئەم مرۆڤە کوردێکی چاك، بیروڕایەکی پاك دەربارەی ئەوەی کە بۆی هەبووە بە گەلی کوردەوە.

دۆستێکم گێڕایەوە کە مامۆستا بەشیر موشیری ئەناسیوە لە سەرەتای شەستەکان دا سەرباز بووە و رۆیشتوە داوای داستانی (خورشید و خاوەر)ی لێ کردووە، ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێت:

لاچۆ مردووت مرێ ! خەڵك خەریکە ئەگاتە مانگ تۆیش بە دوای خورشید و خاوەردا ئەمرییت ؟

هەستە برۆ !

٢٦٩- لە ساڵی ١٩١١ شاری دەلهی کرا بە پایتەختی هیندستان، پێش ئەم ساڵی شاری کلکەتا پایتەخت بووە.

٢٧٠- جاڵجاڵۆکە، نێرەکانیان خانوو ناچنن، تەنیا مێگینەکانیان تەونەکەی ماڵ دەکەن، دوای ئەوەی لەگەڵ نێرەکان دا جووت بوون نێرەکان دەکوژن. جا بۆیە ناونراون (رەشە بێوەژن).

٢٧١- تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەش قولایی قارەی ئەفریقیا بۆ پێش قەرەوڵانی ئیستیعمار نەناسراو بووە، بەناوبانگترین کەسێك ویستوویەتی بگاتە ناوەڕاستی قارەی رەشەوە دێڤید لیڤنگ ستۆن *Liveng-Iston* بووە.

٢٧٢- زۆر میللەتی رووی زەوی هەیە تاکو ئێستاش هەندێك گیانلەبەر دەپەرستن. وەکو هیندۆسەکان کە مانگا دەپەرستن. فیرعۆنەکانی میصر زۆریان پشیلە و سەگ و مەیموونیان دەپەرست. ئەگەر مەیموونی خێزانێك بمردایە بۆ نیشانەی پرسە و شیوەن هەردوو برۆیان دەتاشی، ئەگەر سەگەکەیان بتۆپیبایە تەواوی خێزانەکە هەرچی موو بەسەر لەشیانەوە هەبووە تاشیویانە.

٢٧٣- هونەری کاریکاتۆر بەشێکی ناسراوی دنیای هونەر و رشتەکارییە، ئەمرۆ وا جێگەی خۆی کردوەتەوە، هەر چوارخەتی ئەخشاوی ئەم هونەرە سادە و لە هەمان کات دا پڕ زیرەکییە بە ئەندازەی نووسراوێکی ٢٠ لاپەڕەییە لە هەموو رووپەکەوە. بۆیە ناونراوە کاریکاتۆر چونکە ئەندازەی نووسراوێکی ٢٠ لاپەڕەییە لە هەموو رووپەکەوە. بۆیە ناونراوەکاریکاتۆر چونکە داهێنەری ئەم جۆرە رسمە هونەرمەندێکی ئیتالیایی بەناوی (کاراکتی) بووە.



٢٧٤- شێخ رەزای تالەبانی (١٨٢٨ - ١٩١٠)، ئەم شاعیرە بلیمەتە شێوەیێکی تایبەتی خۆی هەبووە لە هەلبەست وتن دا، شۆخ سروشتی، گورج وەلامی، زیرەکییەکی پڕ لە وردەکاری لە هەلبەست و هەلسان ورەوشتی دا هەبووە. بە کوردی، فارسی، عەرەبیو تورکی و زۆر شیعری (مولەممەعی) هەیە. زۆربەی هەلبەستەکانی پێداهاتنە هەم هەجوو هەم وەسف دەربارەی مودیری قزلجە فەرموویەتی:

میرم ئایا چلۆنە عیللەتەکەت؟
باز بە خارشتە بن گونت عەجەبا !؟
ئیحتیاجت بنووسەو عەیبی چییە ؟
مەحرەمی رازی تۆم بەعەهدی سەبا.
دەربارەی مەدحی عەشیرەتی جاف دەفەرموێت:
وابێ غەم و هەیجا دەچنە عەرسەیی هەیجا
تۆ ئاچییە سەر دۆشەکی بووکێ لە زەفافا

٢٧٥- شاری ڤینیسیا شارێکی زۆر جوان و رازاوە بووە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، هەروەها بنکەی جوولانەوەی بازرگانی و دەسەلات بووە، وەکو پردێك بووە لەنێوان میللەتانی ئەوروپا و شەڕی سەلیبیدا، عەرەب پێی دەلێن "البندقیە" لەوە دەچێت ئەم ناوەیان لە وشەی (دۆقییەی جوان)ەوە وەرگرتبێت: (بۆ نۆ دوچا) و لە ئاکام بووە بە (البندقیە).

٢٧٦- گەرما پێوەی فەهرەنهایت بۆیە بەم ناوەوە ناونراوە چونکە زانایەك دۆزیوەتی ناوی (جبرل دانیال فهرانهایت) بوو، (١٦٨٦ - ١٧٣٦ ز) و خەلکی ئەلمانیا بووە. پلەی رچان لەم ئامرازەدا ٣٢ پلەیە پلەی کولاندن ٢١٢ پلەیە.

٢٧٧- بە شەڕی پارتیزانی دەگوترێت "شەڕی عصابات"یان شەڕی گۆریلا، ئەو وشەیەش لە زمانی ئیسپانییەوە وەرگیراوە *Gure* واتە شەڕ و *Lia* واتە بچووك کەواتە بەسەریەکەوە مانای شەڕی بچکۆلەیە.

٢٧٨- ناوی ئەفلاتوون واتە ئاوشان پان. ئەم فەیلەسووفە لە بنەمالەیێکی ناسراوی سەردەمی خۆی بووە و هەشتا سال ژیاوە ناوی ئەرستوکلیس ئەرستون بووە نزیکەی ٥٦ کتێبی نووسیوە. لە کتێبی (فیدو)دا دەربارەی وشەکانی مامۆستاکەی کە سوقرات بووە زۆر شتی شی کردوەتەوە. بۆ ئاگاداری: لەو رۆژەی لەدایك بووە لەو رۆژەش دا مردووە.

٢٧٩- له ساڵی ١٢٩٠ ز ئەدواردی یەکەم شای وڵاتی بریتانیا فەرمانێکی دا بەدەرکردنی هەرچی جوولەکەی ناو وڵاتی بریتانیا هەیەو فەرمانەکەشی جێبەجێ کرا، چونکە جوولەکەکان شێوەی سوود وەرگرتنیان گەیشتوەتە هەل هەلە دوای ٤٠٠ ساڵ ئۆلیڤەر کرموێل جوولەکەکانی گەڕاندەوە بۆ بریتانیا.

٢٨٠- تیودۆر هەرتزل سەهیۆنیستی ناسراو لەگەڵ سوڵتانی عوثمانیدا هەوڵی دا بۆ بەدەست هێنانی جێگیر بوون لە فەلەستین، هەتا وەکو ئامادەبوو تەواوی قەرزەکانی دەوڵەتی عوثمانی ببژێرێت بە مەرجێك فەرمانی جێ گیربوونیان لە فەلەستین بۆ بدا.. بەڵام سوڵتان نەیکرد. جا دەوڵەتی بریتانیا بڕیاری دا یەکێك لە وڵاتە ژێر دەستەکانی دا لە ناوەڕاستی ئەفریقیادا - کە ئۆگەندە بێت - زەوییەکی پان و پۆڕیان بخاتە ژێر دەستەوە بەڵام سەرکردەکانی سەهیۆنییەت بەوە رازی نەبوون.

٢٨١- زۆربەی میللەتی هیندستان لایەنگری ئاینی هیندۆسین و لە ٨٥٪ی کەمتر نابن و ١٢٪ی میللەتی هیندستان موسڵمانن کە دەکاتە ٦٠ ملیۆن کەس، بەڵام ئاینی بوودائی و مەسیحی زۆر کەم پەیڕەوانیان هەیە لە هیندستان دا.

٢٨٢- دەزانی بەردی چەرخ، گیراوەی ئاسن و مادەیەکە بەناوی سیریوم *Cerium* و ئەم مادەیەش ل وڵاتانی برازیل و ئەمریکادا بە چنگ دەکەوێت و لە ساڵی ١٨٧٥ز دۆزراوەتەوە و بەکارهێنراوە.

٢٨٣- بزانە .. کە:

١- خێرایی دەنگ بەسەر دەریاوە ١٢٠٠ کیلۆمەترە لە سەعاتێك دا. بەڵام لە جێگەی بەرز یان لە ئاسمان دا ١٠٠٠ کیلۆمەترە لە سەعاتێك دا.

٢- پاشای بەلجیکا ناوی بودوانە لە ساڵی ١٩٥١ز بووە بە پاشا پاشای وڵاتی سوێد ناوی کارل گۆستافە لە ساڵی ١٩٧٣ ز بووە بە پاشا.

٣- رۆزفلت سەرکۆماری ئەمریکا لە ساڵی ١٩٤٥ بە نەخۆشیی باداری مردووە.

٤- سێ کوڕی هاروونە رەشید بوون بە خەلیفە: ئەمین، مەئموونو موعتەصەم.. بەڵام چوار کوڕی مەلیك عەبدولعەزیز ئال سعوود بوون بە شا بە دوای یەك دا، سعوود ، فەیصەل، خالید و فەهد.

٥- بیلالی حەبەشی کۆیلەی نومەییەی کوڕی خەلەف بووە حەزرەتی ئەبوو بەکر بە حەوت مثقال زێڕ کڕیویەتی و ئازادی کردووە. دایکی بیلال ناوی حەمامە بووە واتا کۆتر و قوله رەشێکی حەبەشی بووە.



٢٨٤- بابا طاهري عوريان (٩٣٥ - ١٠١٠)ز

قەلەندەر و هەردە و سارا پێو شەیدای عیشقی ئەزەلی دێوانەی بیروباوەڕی راستەقینەی حەق. خوا پەرستی شەو نەخەوتووی هەنووز نەکەر، هاوڕازی جریوەی ئەستارە بێ دەنگەکانی ئاسمان.

بابا طاهیر شاعیرێکی سەدەی سێیەمی کۆچیی ئەتەوەی کورد و هاودەوری ئەبوو عەلی سینایە. ئەم شاعیرە بەناوبانگە سۆفی رەوشتە هەڵبەستەکانی بەسەندی هەمووان بووە. ئەم زاتە لە شاری هەمەدان دا مردووە و تەواوی هەڵبەستە چوارینەکانی بە لەهجەی لوڕی وتووە:

دڵێ دیرەم و عیشق گێج وێجە
موژە بەرهەم زەنەم خوونا بە رێجە
دڵێ عاشق بە سانی چووپ تەر بی
سەرێ سوجە سەرێ خوونا بە رێجە

٢٨٥- بزانه كه:

١- له سالّی دووی كۆچیدا موسڵمانەكان جەژنی رەمەزانیان تەدارەك دیوە.

٢- شاری بەغدا به (دار السلام) بەناوبانگە، پایتەختی تەنزانیاش ناوی دار و سەلامە.

٣- زنجیرە كەژی برانیس كەوتوەتە بەینی ولاتی فرانسا و نیسپانیاوە.

٤- شەڕی یەكەمی جیهانی كە له سالّ ١٩١٤ ز دەستی پی كرد لە سەعات ١١ ی رۆژی پانزدەی مانگیانزدەی سالّی ١٩١٨ تەواو بو.

٥- نیمپریالیستی فرانسه له سالّی ١٨٨٣ تا سالّی ١٩٥٦ دەستی بەسەر ولاّتی توونس دا گرتبوو.

٦- خێرایی شێر له سەعاتێك دا ٨٠ كیلۆمەتره و خێرایی ئەسپ ٧٠ كیلۆمەتره.

٧- دەزانیت لە سەرەتای رژێمی خوومەینییەوە تا مێژووی ١٩٧٩/٣/٢٥ پەنجا و هەشت هەزار كەس له میللەتانی ئێران لەلایەن خوێن رێژەكانی دام و دەزگای مەلا پێ نەكەوتووەكانی خوومەینییەوە له قەناره دراون یان لەژێر دار و زنجیر و تێ هەڵدان دا كوژراون؟

٨- گۆلدا مائیرله سالّی ١٨٨٦ ز له ولاّتی رووسیادا له دایك بووه، له سالّی ١٩٢١ ز هاتوەته فەلەستین و یەكێك بووه له سەهیۆنیستە ناسراوەكان. له تەمەنی ٧٢ سالّیدا بووه به سەرەك وەزیری رژێمی سەهیۆنیستی له فەلەستین.

٩- هەشت پەل:

گیانلەبەرێكی دەریاییه هەشت پەلی هەیه پەلێكی حەوت مەتر درێژ دەبێت و كاتێك هەست به مەترسی بكات مادەیەكی رەنگی وەكو مەرەكەب فڕێ دەداته دەرێ تا نەبینرێت به پەلو پۆكەی خواردەمەنی دەگرێت و تا ئەندازەیەكیش نێچیرەكەی بی هۆش دەكات ئەو كاته دەیخوات.

١٠- له ولاّتی نیسپانیادا تاقمێك شازاده به (خوێن شین) دەناسران لەبەر ئەوەی ژن و ژن خوازییان لەگەلّ هیچ رەگەزێكی دی كەدا نەدەكرد و لەژێر پێستی سپیان دا رەگە شینەكانیان دیاربوو.

١١- (قرم) كەوتوەته كەناری دەریای رەشەوە، له سێلاوە دەریا گەمارۆی داوه.

شەڕی قرم له سالّه ١٨٥٣ز دا رووی له گەرمەی شەڕی دووەمی جیهانیدا ستالین و چەرچل و رۆزفلت له قرم دا كۆبوونەوه.

١٢- بزانه كه فرۆكەی بۆینگی ئەم ئەندازانه هەیه و هەر یەكێكیان ژمارەیەكی تایبەتییان هەیه و بەڕیز له یەكتر گەورەترن:

١- بۆینگ ٧٤٧

٢- بۆینگ ٧٠٧

٣- بۆینگ ٧٢٧

٤- بۆینگ ٧٢٣

٢٨٦- دەزانیت باینجان له ولاّتی هیندستانەوه به دنیادا بلاّو بوەتەوه.



٢٨٧- نالی : (١٧٩٧ – ١٨٥٥ ز)

شەمعی شەبستانی ولاّتی شارەزوور و هۆزی جاف، ئەستارەی بەرەبەیانی ئاسمانی ئەدەب و هونەری هەڵبەست، خاوەندی وردەكاری و ناسكی و هەست و لاواندنەوه، باده به دەستی دنیای هەڵبەست و هەست، شەیدای تەواوی كەمەن كێشی (حەبیبه)، زانای تەواو عەیاری گەوهەر خولقێن، جێگای شانازی هەر كورد زمانێك.. نالی ئەمر ناوی خدر كوڕی ئەحمەدی شاوەیسه له تیرەی میكائیلی هۆزی جافه و له دێی (خاك و خۆڵ)ی شارەزوور لەدایك بووه:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور
حەبیبەی نالی سەرچاوەی ریتمی نالە نالی نالییە، هەر کە دەستی داوەتە خامە ئەو هەستە پڕ جۆش و خرۆشە وەکو زامێکی دەم کراوە هاتوەتە سۆو نالییش ئارامی لێ براوە و شکاتی نا ئومێدی و دەردی دڵی بردوەتە لای پێ نووس و سکاڵای خۆی لاکردووە:
دەستم لە گەردنی خۆت هەڵ مەگرە، ئەی حەبیبە
وەبزانە خوێنی خۆمە یا مینەتی رەقیبە
نەکەی ئامان ئاوری کەمتەرخەمیت وەکو تیری ئەجەل دوو چارم کەیت و دەستم لە گەردنت کەیتەوە نەکەی دەس بە دامان.. حەبیبەی شۆخ و شەنگ من کوژراوی عیشقم ؛ عیشقێکە لە تۆ زیاتر زمانێکی تر نازانێت..
کەڕە.. لاڵە.. کوێرە.. کلاراویەتی:
سەر بەردەبازی رێتە
تەن تەختەبەندیجێتە
دڵ مەیلی خاکی پێتە
روح ماڵی خۆتە بیبە !

بنوارە لەم خۆبەخت کردنە، بنوارە لەم ئارام مردنە، سەیرکە چۆن دەیەوێت هەروەکو سێبەرەکەی لێی دوور نەکەوێتەوە، گەرمیی هەناسەکەی، خشەی پێلاو زرەی پلپلە و لاگیرە و هەیاسەکەی وەکو سۆزی عاشقانی ئەهلی دڵ لە قووڵایی هەست و ناخیدا بزرنگێتەوە و هەموو شەوێك هەوێنی شێوەنی سبەینێی بۆ بگرێتەوە.
ئەو سیلسیلە ئەو موشکی خوتەن نێوی براوە
پڕ پێنج و شکەن خەم بە خەم و حەلقەی کراوە
لاولاوە کە لەو لاوە بە ئەم لاوە کشاوە
یا یاسەمەنی خاوە لە ڕووی ڕۆژە ڕواوە؟
سەری سورماوە لەو ئەگریجە و پەرچەم و تاڵ تاڵی زلفە وا بەم لاو ئەولای روخساری بێ وێنەدا ئالاوە هەروەکو پێچ خواردنی تاڵە ناسکەکانی لاولاو بە ئەمامێکی بۆن خۆشی جا دوویی دا یا گوڵێکی بۆن خۆشی پرشنگ دارە کە وەکو تیشکی ڕۆژ لەناو شەوە زەنگی تاریکی ئەو زوڵف و ئەگریجەدا خۆی دەنوێنێت.
ئەم بلیمەتە لە تەشبیهەکانیدا بێ وێنەیە، سەدان قۆناغی پاش خۆی بڕیوە، پەنجەی خستوەتە قووڵایی هەست بە تیژیی نینۆکەکانی سەخت ترین هەست دەجووڵێنێت و بەرەو هەوارگەی عوشاق و موریدانی حەق و راستەقینە لەسەر خۆ کەمەن کێشی دەکات.
گوڵبەندی قەددت لە قوببەی سینە غونچەی گرتووە
غونچە بەم شیرینییە قەت ئەیشکەر ئەی گرتووە
خرپنی و بەرزیی مەمکانی بە سنگییەوە بەلای نالییەوە وەکو درەختێکی رازاوە بە گوڵ کە بە پۆپەکەیەوە گوڵی هەراشی پێوە بێت ئاوا دێتە بەر چاوی .. کام شەکر؟ کام شیرینی؟ کام هەنگوین دەکاتە شیرینیی دیمەنی تۆ کە ڕۆحی سەرگەردانی شیرین چەش کردووە !؟
سۆفیگەریی نالی بەشێوەی خۆی بە رەوشتێکی ناسك و تایبەتی ئینکار ناکرێت، نالی گەیشتبووە راستەقینە، ستایشەکانی نالی لە حەق و راستەقینە و عیشق لە زۆر هەڵبەست دا دیار و ئاشکرایە:
ئەلا ئەی ئەفسی بووم ئاسا هەتاکەی حرص و وێرانە؟
لەگەڵ ئەم عیشقبازانە، بڕۆ ئازانە .. بازانە

چاوت لییەتی چۆن پەلاماری حەزی هەرزان و ئارەزوو هیچ تیا بەسەر نەبووەکان ئەدوا بێ رەحمانە پاش و پێشان لێ دەگرێت و بەامبەرکێیان لەگەڵ دەکات..تاکەی لە کۆرشی عاشقان کەنار گرتن؟ تاکەی ئاوارەی باخ و بێستانی هەرزەکاری و دەربەدەری؟ تاکەی خۆ خەڵەتاندن و خولاندنەوە بە حەزی هەرزان و سەرسەری و سەری رێگا؟ .. وەرە پەنجەکانت بنالێنە لە ستوون و کۆڵەکەی راستەقینەی هەتا هەتایی، وەرە سەیری کۆری ذیکری چاوساغان بکە کە چەند بێ ئەواو بەشکۆن رامەوەستە ، ئازانە، گورج و توند و تیژ، لە باز تیژتر برۆ، برۆ تادەگەیتە ڕازی حەق.

٢٨٩- جۆگەی ئۆستاکی کەوتوەتە نێوان قورگ و ناوی گوێی مرۆڤەوە وەکو تەرازوویەك و زایە لە بــــەیتی هێزەکانی دەرەوەی لەش و هێزی لەشەوە، ئەگەر تەرازووە تێك بچێت دەبێتە هۆی گێژ خواردنی سەر و کەوتنی مرۆڤ.

٢٩٠- بە جەزائیر دەگوترێت وڵاتی یەك ملیۆن شەهید. بە مۆریتانیاش دەگوترێت وڵاتی ملیۆنی. چونکە رووبەرەکەی یەك ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و یەك کەسیشی تێدا دەژیت.

٢٩١- شاری ئەریحا ٨٠٠٠ ساڵ ئێستا دروست کراوە و تاکو ئێستا خەڵکی تێدا دەژی و بە کۆنترین شار دەژمێردرێت.

٢٩٢- رێکخراوی (ئۆپیك) تێکڕا ١٣ دەوڵەتە کە حەوتیان عەرەبن. رێکخراوی (ئەواپیکیش) لە وڵاتە عەرەبە ئەوتدارەکان پێك هاتووە.

٢٩٣- یەك گالۆن ئاوی ئینگلیزی ٤,٥٤ لیترە.

یەك گالۆن ئاوی ئەمریکی ٣,٧٨ لیترە.

٢٩٤- مەرجان *Coral* رەنگی سوورە لە دەریا دەری دەهێنن.

- کەهرەمان *Amber* جۆرێکە لە شریسی دار سنۆبەر.
- یاقووت *Corum – dum* دوای ئەلماس لەو پتەوتر نییە و رەنگی سوورە و شینە.
- یاقووتی سوور *Ruby*
- یاقووتی شین *Sap Phire*
- یاقووتی زەرد و سەوزیش هەیە بەڵام بێ نرخە.

٢٩٥- دورگەی (بەحرێن) پێش ئەوەی ناوی بەحرین بێت پێیان دەگوت: ئوال، دلمون، تیلووس.

٢٩٦- وڵاتی فەرەنسە تا ساڵی ١٥٥٨ ز ژێر دەستەی بریتانیا بووە، بۆ ئازادی ماوەی سەد ساڵ لەگەڵ بریتانیادا شەڕیان کردووە، لە ساڵی ١٤٢٩از ژان دارك لە فەرەنسە دەری پەڕاندن بەڵام بە پیلان گرتیان و بە بیانوی جادوگەری بە زیندوویەتی سووتاندیان

٢٩٧- رووبەری وڵاتی سۆدان یەك ملیۆن میلی چوار گۆشەیە بەرامبەر بەم گشت وڵاتانە:

- بریتانیا ٢٤,٠٠٠ کم٢.
- فەرەنسە ٥٥,٠٠٠٠ کم٢.
- ئیسپانیا ٥٠٥,٠٠٠ کم٢.
- پرتەغال ٩٨,٠٠٠ کم٢.
- ئەڵمانیای رۆژئاوا ٢٤٥,٠٠٠ کم٢.
- ئەڵمانیای رۆژهەلات ١٠٥,٠٠٠ کم.
- ئیتالیا ٣١٠,٠٠٠ کم٢.
- سویسرا ٤١,٠٠٠ کم٢.
- ئەرویج ٣٢٣,٠٠٠ کم٢.

سەرجەم ٢٩٤٢,٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە.



٢٩٨- مەولەوی (١٨٠٦ - ١٨٨٢ ز)

خامە شەق وەردەن دەم مەکەردەوە
زار زار مەنالۆ وە دەم دەردەوە
تۆ پاشکستەی بەرد هەرد دەرد
چەم کور مەینەت، تەن لاغر، رەنگ زەرد

سەردەستەی عاشقان و پۆپەی دیوانی شاعیران، پیری عەیاران و عەودالانی عیشق، پەیامدەری شنەی شەماڵی ئەشنەی سۆز و ستایش، پێش قەرەوەڵی بیروباوەڕ و خواناسین بە شێوەی تازە و نوێ، شەیدای تیشکی شەفەقی یەزدان و هەستی پاک، هەمیشە مەستی عیشقی خوایی پیری تاوەگوز مەولانا مەولەوی.

ناوی عەبدولرەحیمی کوڕی مەلا سەعیدە کە بنەچەکەی دەڕواتەوە سەر پیرخدری شاهۆ. لەبێ دەنگیی شەودا هەستی ئالۆزی دەروونی گرتووی پاڵی پێوە ئەنا و لەژێر رەشماڵ دێتە دەرەوە ئەنوارێتە ئاسمانی شینی بێ بنی پڕ لە جریوەی ئەستارە کە چۆن بێ چلە و هەسوون وەستاوە هێندەی تر کرنۆش و بە چۆکا چوونی زۆرتر ئەبێت بەرامبەر پەروەردگار هەستی دێتە سەمای ستایش و لێوانی بادەی عیشق ئەخواتەوە و مەستی عیشقی خوایی سەری تێ ئەکا و ئەفەرموێت:

ئەمشەو دیارەن بانگم بێ شەرمەن
زایەڵەی سەمتوور کەڵلەکەم گەرمەن

مەولەوی بە تواناوە ئەسپی سەرکێشی خۆی لە گۆڕەپانی لاهووت و فەلسەفەدا تاو ئەداو ئەشهەدوویش شاسوارێکە ! جارجاریش لغاوی خەیاڵ بۆ چارۆیەکەی شل ئەکا و پڕتاو بە لاپەڕەکانی مێژوودا ئەڕواتەوە، بەرودوا ئەفەرموێت:

چەرخ هەر ئەو چەرخەن تا ئاوردو برد
دەست ئەو دەستگێن تا خاتەم ئاورد
دا بەزم شیرین خوسرەو وە هەم دا
شورەت نامەی نام حاتمش کرد تەی
کرد وە کاسەکەل کاسەی کەڵلەی کەی

بنوارە چۆن ئەی لاوێنێتەوە. چۆن ڕووداوەکانی مێژوو ئاکتەرەکانی ڕووت و قووت ئەکاتەوە بە جۆرێکی وا لە رۆژگار و کرداری هێندە شەماڵ ئاسایە، هەر ساتێك لە جێگەیەکە و هەر رۆژێك لای یەکێکە و بۆ یەکێکە.. ئەو سەر و گەردەن و کاکۆڵە کە بێزاری دەر ئەبڕێ بەرامبەر تاج و توانا و دەسەڵات، بنوارە چۆن وەکو کاسە گەڵێك بێ ئەرزش و بێ نرخ و خوڵاوی کەوتووە.

مەولەوی جارجارێك کەمەن کێشی ڕواڵەتی نازەنین و روخساری پڕ پێکەنینی شۆخ پەیکەران ئەبێ و بەرەو کۆڕی عاشقان خۆی ئەکوتێ و لەسەر ئەوای پڕ سۆزی ڕاستەقینە دێتە سەمای سۆفیانە و ئارام ئاسمانی شەیدایی و مەلە کووتا باڵەمەڵە ئەکا و ئەڵێت:

چون چهرەی خەیاڵ روخسارەکەی وێش
ئەپەردەی دڵەی (مەعدوم)ی دڵرێش
ئەمانا جەبین شای سووسەن خاڵان
کەم کەم نە گۆشەی لای سیماڵان
ئەتۆی تاریکی تای شەدەی بێ گەرد
لە تافەت چۆن ئاو حەیات مەوج مەوەرد

پیری تاوەگۆز بەربلاوی خەیاڵ و ئەندێشەی ئەفرێ و ئەرواو و ئەگاتە هەڵ هەڵەی ئاسمانی بێ بنی خەیال و بێ فکرین. بە توندی.. بە تیژی لەم ئەستێرەی بۆ ئەوەی بێ وچان بە توانایەکی خواییەوە حەوت خوانی نهێنییەکانی ئەندێشەی ئەبڕێ و وەکو مۆم نەرم و نیان ئەکا و ئەفەرموێت:

باڵەخانەی چەم دڵ دیوانی تۆن
بانە ئاو وە خاك ئاستانی تۆن
ئەگەش عاجز کرد خەیاڵیش تێش دا
ئازیز بۆ جارێك پابنێ پێش دا

ئای لەم خۆشەویستییەی لە هیچ کوێدا جێگەی نابێتەوە لە گلێنەدا نەبێت.. ئازیزەکەم زاری و گریانم لەبەر تۆیی، فرمێسکی چاوانم نیشانەی بازار گەرمیی، دام و دەزگا و دیوەخانە، دڵم ڕێ گوزەرێتە و هەر تۆی پیادا گوزەر ئەکەی.. ئەگەر پێ شێلیشم کەی ڕەواجە بۆ ژیانی هەتا هەتاییم.

ئاسواری وردەکاری و فەلسەفە بەماناوە ڕاناوەستێ و جار جارێك شێوەنێك ئەگێرێ و ئەڕواتە پرسەی بەربلاوی هەست و ئەندێشە و ئاسمانی غەم و تەم دا ئەڕواتە ڕەشبەڵەکی شیوەنی ئازیزە لەدەست چوەکەیەوە و گوێیەکان هەڵ ئەخا بۆ دەنگی سامناکی ئازیز ڕۆ ڕۆ ڕۆ گیانم ڕۆ ڕۆ ڕۆ. جا لێرەدا مەولانا مەولەوی چۆن گەیشتوەتە ئەوج و هەل هەلە و ئەفەرموێت:

قازان قەتاردن قوڵنگان حەوایی
حەیفەن باڵاکەت شەو بە تەنیایی

ئا.. ئا واتێ ئەگەی ڕەش سواری مەرگ تۆم لەبیر ئەباتەوە ! تۆ بۆ ساتێك.. بۆ تاوێك تاکو تەنها ئابیت هەرگیز. تۆ منی من تۆم گەرچی گۆڕ لە ئاوەد و تەتەشۆڕە و گڕ و گڵپەی ئاگر هاڵاوەکەی هەست پێ ئەکرێت گەرچی بریسکەی دەمی قولنگە و پاچە کە دانەهێنرێتەوە جارجارێك ڕام ئەچڵەکێنێت، بەڵام هەستی (سورمودی)یم پێویستی بە لایە لایە نییە و لێم جیا نابێتەوە، هەروەکو گڕ و خەرمان خەرمانەم داوە بە دەورتا تا ڕۆژی هەتا هەتا! جا توخوا لەگەڵما دەس بەرزکەرەوە با پێکەوە داوای شادیی ڕوحی پاکی پیری تاوەگوز کەین و لە عاستی ئەو هەموو زانیارییە سەری ڕێز و حورمەتی بۆ دانەوێنین.

٢٩٩- ئەگەر مرۆڤێك سەد کیلۆغرام بێت، بیست کیلۆ خوێنی تێدایە واتە خوێن ١/٥ ی لەشە.

٣٠٠- لە سەرەتای دروست بوونی ڕێکخراوی جامیعەی وڵاتە عەرەبەکان سەرۆکەکانی ئەمانە بوون:

١- عەبدولڕەحمان عەززام.
٢- عەبدولخالق حەسونە.
٣- مەحموود ریاض.
٤- شاذلي قلیبی

٣٠١- دەزانیت:

T٦٢: ناوی جۆری تانکێکی ڕووسییە.
M٤٨ : ناوی جۆرە تانکێکی ئەمریکییە.
هۆوك: سارووخێکی زەوی – ئاسمانە ئەمریکییە.
سام: سارووخێکی زەوی – ئاسمانە ڕووسییە.

٣٠٢- لە ئەسپێوە گرانەتا تووش دێت و لە مێشوولەی ئەنۆفلسەوە لە ڕزوتا.

٣٠٣- ئەگەر هاتوو نیو لیتر ئاو تێکەڵی نیو لیتر عەرەق بکەیت، ئەندازەکەی لە یەك لیتر کەمتر دەبێت، چونکە ئاو و عەرەقەکە دەڕۆنە ناو وردیلەکانی یەکترەوە تێکرا لە یەك لیتر کەمتر دەبێت.

٣٠٤- بە پێی بەراورد و سەرژمێرێك كە گۆڤاری "ئیكۆنۆمسیت"ی بریتانیا لە ساڵی ١٩٧٥ ز دەربارەی چڕیی شارەكانی جیهان كردوویەتی دەركەوتووە شاری قاهیرە لە چاو رووبەرەكەی دا چڕو پڕترین شاری جیهانە. ئەمەش چەند بەراوردێكە كە كراوە:

١- قاهیرە ١٥٢,٠٠٠ كەس لە یەك میلی چوارگۆشەدا
٢- ڤاتیكان ٤٢٥٠ كەس لەیەك میلی چوارگۆشەدا
٣- هۆنگ كۆنگ ١٥٠٠ كەس لە یەك میلی چوار گۆشەدا
٤- مۆناكۆ ٢٥٠٠٠ كەس لە یەك میلی چوارگۆشەدا

٣٠٥- لە ساڵی ١٩٦٧ بەرنارد بۆ یەكەمین جار توانی دڵی نەخۆشێك بگۆڕێت بە یارمەتی ٣٠٠ دكتۆر لە وڵاتی جنووبی ئەفریقیادا.

٣٠٥- لە هەر پایەكی مرۆڤ دا ٣٢ پارچە پیشە (ئێسك)ی تێدایە، لە هەر دەستێكی مرۆڤ دا ٣١ پارچە ئێسكی تێدایە.

٣٠٦- توركیا لە ساڵی ١٩٣٣ ز دانی بە ماڧی هەڵبژاردنی ئافرەت دا ناوە. ئەندەنووسیا لە ساڵی ١٩٥٥ ز دا.



٣٠٧- شەڕی بەدر لە نێوان كافران و موسڵمانان دا كە لە ساڵی دووی كۆچیدا رووی دا ئەبووجەهل و عوتبەی كوڕی رەبیعەی باوكی هیندی جگەر خۆر و رەبیعە كوژران حەفتا كەسیش لە كافران بەدیل گیران كە لە ناویان دا عەباسی كوڕی عەبدولوطەلیبی مامی پێغەمبەر (ص) بوو، لەگەڵ عومەری كوڕی ئەبوسفیانیش.

٣٠٨- پێش ئیسلام چەند دەسەڵاتێكی عەرەب زمان هەبووە وەكو:

١- مەناذیرە: كە لە عیراق دا ژیاوەن و ناونراون بە دەسەڵاتی (مناذرە) چونكە شاكانیان ناوی (منذر)یان لە خۆ ناوە و لایەنگری دەسەڵاتی ساسانییەكان بوون.


بابل

٢- غەساسینە: لە وڵاتی شام دا بوون و لایەنگری دەوڵەتی رۆمەكان بوون.
٣- دەوڵەتی سەبەء و حیمیەر لە یەمەن دا كە ئەبرەهەی حەبەشی لەناوی بردن.

٣٠٩- دەزانی وڵات و سەر زەویی بابل بە وڵاتی (خوری) بەناوبانگ بووە.

٣١٠- لە رۆژی ٢٨ی نیسانی ١٩٤٣دا شۆڕشگێرانی ئیتالیا توانیان لە سەرووی ئیتالیادا مۆسۆلینی دەسگیر بكەن و بیكوژن. لەگەڵ ژنە دۆستەكەیدا سەربەرەوخوار هەڵیان واسین.

٣١١- دەزانی:
بیكاسۆ ٩٢ ساڵ ژیاوە
تیتۆ ٨٨ ساڵ ژیاوە
برتراند راسل ٩٨ ساڵ ژیاوە

٢٦٢. دەزانی باوکی خومەینی لە شاری کلکەتەی هیندستان لە بنەماڵەیێکی سیك لە دایك بووە و پەزی بەسەر گەلی ئێران و ئیسلامەوە نەبووە.

٢٦٣. دەزانی دروشمی ناو ئاڵای ئێرانی ئیسلامی هەر ئەو دروشمەیە کە بەسەر پەرستگاکانی سیکەوە هەیە.

٢٦٤. دەزانیت:
١. میرنشینی عەجەمان: ٢٥٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و ژمارەی دانیشتوانی ٤٠٠٠ کەسە.
٢. نوم ئەلقوەین: ٧٥٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە ٤٥٠٠ کەسی تێدا دەژی.
٣. میرنشینی ئەل فجێرە: ١١٧٥ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و ١٠٠٠٠ کەسی تێدا دەژی.

٢٦٥. پاسەوانەکانی پاپای ڤاتیکان خەڵکی سویسران و چۆنیەتیی جلوبەرگیان لەلایەن هونەرمەندی گەورەی دنیای نیگار و پەیکەرسازی "مایکل ئەنجلۆ" وە هەڵبژێردراوە تاکو ئێستاش هەر ئەو جل و بەرگە نەگۆڕاوە و هەر ئەوەیە کە ئەنجلۆ دایناوە.

٢٦٦. جاران ئافرەت مافی هەڵبژاردنی نوێنەری پەرلەمانی نەبوو وڵاتی نیوزیلەندە یەکەمین وڵاتە ئەو مافەی پێداوە.. بەدوای ئەودا چەند وڵاتێکی تر:
- نیوزیلەندە ساڵی ١٨٩٣
- سویسرا ساڵی ١٩٠١
- ئوستراليا ساڵی ١٩٠٢
- یەکیەتی سۆڤیەت ساڵی ١٩١٧
- بریتانیا ساڵی ١٩١٩
- ئەمریکا ساڵی ١٩٢٠
- تورکیا ساڵی ١٩٣٣
- فەرانسە ساڵی ١٩٤٤

٢٦٧. خەڵاتی ئاشتیی نۆبل بەم کەسانە دراوە:
١. داك هەمەر شۆڵد – سکرتێری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان.
٢. هێنری کیسنگەر – وەزیری دەرەوەی ئەمریکا.
٣. مناحیم بیگن – خوێن ڕێژی قەسابخانەی (دێر یاسین) لەگەڵ (ئەنوەر سادات) بە نیوەیی.


مناحیم بیگن


هێنری کیسنگەر


ئالفرێد نۆبێل

٢١٨- ئایا دەزانیت؟
کچ پێش کوڕ ددان دەردەهێنێت.

٢١٩- شاری ڤینیسیا (البندقیە) شارێکی جوان و تەماشاییە شەقامەکانی هەمووی ئاوە و تاکسی و ئۆتۆمبیل بەلەم و ماتۆری ئاوە ئەم شارە لە ئیتالیا دایە و لە دنیادا چەند شارێکی دی کەیان بەم ئاودوە ئاو وەکو: بانکۆک، دوبەی، ئەمستردام.

٢٢٠- ماوەی فەرمانڕەوایی سەرکۆماری ئەم وڵاتانە:
١- لوبنان ٦ ساڵە.
٢- ئەمریکا ٤ ساڵە.
٣- فرانسە ٧ ساڵە



٢٢١- لە چین بەرگی شیوەن (تعزیە) ڕەنگی سپییە و بەرگی بووکێنی ڕەنگی سوورە.

٢٢٢- ناوی پلەکانی ئەفسەری لە سوپادا بەم شێوەیە:
١- عەمید "تاج و سێ ئەستێرە" *Brigadier General* .
٢- عەقید "تاج و دوو ئەستێرە" *Colonel*.
٣- نەقیب "سێ ئەستێرە" *Captain*.
٤- رائد "یەك تاج" *Major*.
٥- موقەددەم "تاج و یەك ئەستێرە" *Left colonel*.
٦- لیواء "دوو شمشێری چەپ و ڕاست" *Major General*.

٢٢٣- یەك قیرات ئەڵماس = ١/٥ گرام = ٢٠٠ میلی گرام. ئەگەر وردە ئەڵماسێك پێنج قیرات بێت دەکاتە یەك گرام.

٢٢٤- لەشی مرۆڤ دەتوانێت لە ڕۆژێك دا دوو لیتر ئاوی دەم پێك بهێنێت و یەك لیتر و چواردە لە سەدەی لیترێك عەرەقی لەش دەر دەدات.



٢٢٥- ئەحمەد موختار جاف (١٨٩٩ - ١٩٣٤) ز
لەو دەمەیدا مانگ و ئەستێرە لە گوم دا بوون، لەو دەمەی تاڵی و تاریکی ڕەوای ڕۆژانە و یاسای شەوگاری تەواو نەبوویی خەڵکێکی زۆر بووە.. لەو دەمەیدا زڕەی پەیوەندەکانی "برۆمیتۆس" تووناو توون و دۆلار و دۆڵ زرنگەی دەهات و زرنگەکانیش یا دیل و چوار لاگیرا و یا ئەوانیش پەیوەند کرا.. لەو دەمەیدا هەموو ڕۆژێك داڵی چڵێسی زۆرداران جەرگی پرۆمیتۆسی دەرنەهێنا و بێ دەربەست لە هاوار و دەردی بێ ئامان و هاژەی فرمێسکەکانی.. لەو دەمەیدا کەڵەپیاوی هۆزی جاف و ئەتەوەکەمان وتی:

به خەو هەڵسن میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەموو تەئریخی عالەم شاهیدی فەضل و هونەرتانە

دەك خوا بشكێ ئەو دەستەی دەمی پڕ بانگەوازی تۆی بێ دەنگ كردووە ! دەك خوا نفرینی لای خوا و مێژوو و دەستە جوانەكان بێت ئەو دەستەی مۆمی هەڵگیرساوی تو و ئێمە كوژاندەوە ! چۆك لە باوەش بێت ئەو نامەردە كە بەو دەردەی بردیت !
روو رەشەكان هانیان داوە و قەل ئاسا بای كردوەتە پەرپۆكانییەوە و بەڵێ قوربان.. قوربان ئەی دەزانی ناوەڕووتی هۆز و مێژوو دەكرێ و كراوە.. بولبولی خۆش ئاوازی گەلی چەوساوە. ئەوای بێ شێڵ كراوی هەزاران عاشق و شەیدا. رەوای چوار دەور چنراوی شاعیری گەنج و جەوان و لاوی سەردەمی تاریكی و كوژاوە بە دەردی دەستی نامەردی خوێن خوارە ناسراوەكانی جاف و كورد:
جاهیلان بۆ ئیستیفادەی زاتی خۆاین رۆژ و شەو
لەم موحیتە مەنعی عیلم و سەنعەت و عیرفان ئەكەن

رووڕەشی دنیا و قیامەت ئەو ئەفانانەن كەوا
هەجووی قەوم و میللەتی خۆیان بە پارە و نان ئەكەن
بڕوانە چۆن بەیداغی شرۆڵی نارەزایی هەڵ ئەگرێ و ڕای ئەوەشێنێت بەرانبەر وردە زۆر دارانی دەور و بەری كە غولامی هەڵقە لە گوێی سیم و زەڕی زۆری زۆردار سەرەترن. بنوارە بانگەواز و سكاڵاكەی چەند بێ هەنووزانە و بە سۆزانە لە دەم دێتە دەرێ.. بنوارە چۆن ئەقیزەی لا گەردنی جەدەوی مل هوڕە نامەردەكان ئەدا و ئەچرپێنێ بە گوێی رەش و رووتاو ئەفەرموێت:

دەسا تێكۆشن ئەی قەومی ئەجیبی بێ كەس و مەزڵووم
بە گورجی بیبڕن ئەو رێگە دووردی وا لە بەرتانە

بخوێنن چونكە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئان و زەمانێك عەینی قەڵغان و سوپەرتانە

زۆردارە سەرەكانی دام و دەزگای مسز بێل بە بیستنی مانای هەڵبەستەكانی موختار وەكو چوار پێیەكی ترساو لە درندە گوێ قوڵاغ بوو ئەوە و سلووكانەوە.. مەگەر نەبێت لەم دەوری گوزەرەدا نا لەم چوار لاو بەرداشاعیرێكی وا رۆشن و خاوێن سروشت هانی خوێندن و خوێندنەوە و زانیاریی تێكرایی خەڵك بدات و بەلایەوە لە هەموو شت گرنگتر بێت ؟
مەگەر لەو بێ دەرەتانییەدا ئاوا بێ نووسێك هەڵ ئەكەوێت بێتە چقڵی چاوە داقڵیشاوەكانی زۆردارانی گەورە و بچووك ؟ ئاوا هان دانێك ؟ ئاوا دانانی رێبازێك ؟ ئاوا غەمخوارێك بوو ئەو و ئێمە و ئەوان؟
بانگەوازی (خەڵقینە دە درەنگە هەستن.. وا زەواری میللەتان دەنگی زەنگی ئاسمانی ئەپێوێ و ئەزرنگێتەوە وردە مل هوڕەكانی ناوچەی هەڵەبجە و بناری هەورامان ئاڵۆزتر ئەكا و بۆ رازی كردنی دام و دەزگای ئینگلیز بە لووشكە لووشكە خۆیان ئەگەیێننە سەر ئاخوڕی بێ شەرمی ئەڕۆن بە چۆكا و چەپ و راست دەست ئەخەنە سەر سینە و بەڵێنی خامۆش كردنی هەڵگیرساوی دژ بە بێگانە ئەدەن بە دوژمن. ئەم بەڵێنە وەكو شمشێرێكی دوولایی وا بووە و بە تیرێك دوو نیشان .. لەلایەكەوە پتەوكردنی باوەڕی ئاغاكانیان و لەلایەكەوە هەڵ لووشینی زەوی و زێڕ و سامانی چەند منداڵە وردیلەیەكی بێ كەس و بێ ناموزا.. وە هەر ساڵ پێشان

دانی پسوولەی ئیمزای دەس هەڵبەست و لە بایی دا داگیرکردنی دارایی و بەجێماوەکانی موختار جاف لەلایەن گورگی دەم خوێناویەوە.
وەنەبێت موختار جاف تەنیا هەر لە مەیدانی میللەت و خاك و خەڵك دا شۆڕە سوار بووە بەڵکی تەڕپۆشی و دڵ تەڕیی ئەم کەڵەپیاوە نیشانەی چاوگەی هان دانی و خوا بووە بۆ جوان پەرستی و جوانی ناسین.

وتم بەو تیغی ئەبرۆتە دڵم لەت لەت بووە قوربان
کەچی فەرمووی ئەگەر بیشتکوژم تۆ هەر بڵێ چاکە !

لە عیشقی خووب ڕوویان مەنعی من هەرگیز مەکە واعیز
بەدەستی خۆم نییە بەخوا ئەمە دەردێکی سامناکە

بەڵێ بازاڕی دەهرە وا یەکێ سۆق یەکێ شێخە
یەکێ جێگەی خەراباتە، یەکێ بێ هۆشی تریاکە..

بەسەر شانا کە وەختێ رادەکێشێ زوڵفی پڕچینی
لە پێش چاوی منی سەودا زەردە وەك ماری زوححاکە

رووڕەش بێت ئەو کەسەی بیری لە کوشتنت کردەوە ! گێلانە وای ئەزانی ئازانە زوو لە بیر ئەچێتەوە. ڕۆژێك هەر ڕۆژێك ئەبێت بە مردوویش ئەو پیاو کوژانە لە دادگای ویژدانی گەل رسوا بکرێن لای مرۆڤ.. مرۆڤی سەر زەوی .. تێکرا.

٢٣٦- جیفارا "جاکوارا" ١٩٢٨ – ١٩٦٥ ز



ناوی ئارتستو جیفارا سێرنایە، لە ئەرژەنتین لە دایك بووە، کوڕی ئەندازیارێکی میعماری بووە، سەرەتا ویستوویەتی کۆلێجی پزیشکی تەواو بکات، بەڵام کۆلێجی بەجێ هێشتووە بەرە و گواتیمالا کەوتوەتەڕێ، لە سەردەمی دەسەڵاتی (جوزمان)دا کە پەیڕەوی بیروباوەڕی چەپ بوو. لە ساڵی ١٩٥٦دا لە مەکسیك پێوەندی لەگەڵ جووتەبرا فیدڵ کاسترۆ و رائول کاسترۆدا پەیداکرد و بوو بە هاوپەیمانیان. لەگەڵیان دا بەرەو کووبا ڕۆیشتن. دەستیان کرد بە شەڕی پارتیزانی دژ بە باتیستای دکتاتۆر و لە پێناوی ئازاد کردنی کووبادا.
شەڕی ئازادیخوازانەی (فیدل) سەرکەوت و دام و دەزگای باتێستا هەڵ پێچرا. جیفارا پلەی مێجۆر (رائد)ی لە سپادا وەرگرت و ڕەگەزنامەی کووباشی پێ درا و لە ساڵی ١٩٦١ دا کرا بە وەزیری پیشەسازی کووبا، بەڵام گیانی سەرکێشیی ئەم پارتیزانە لە دامرکان دا نەبوو، بۆیە بڕیاریدا لە هەر کوێدا دژ بە دەسەڵاتی ئیمپریالیست دەست درایە چەك لە وڵاتی ئەمریکای لاتین دا یەك و دوو نەکات و بەشداریی بکات. ئەوەبوو لە یەکێك لەو شەڕانەدا لە بۆلیڤیا دەست گیر کراو و کوژرا.

٢٢٧- جانتای دیبلۆماسی:

ئەو جانتایەیە لە وڵاتێکەوە دەڕوات بۆ باڵیۆزخانەی خۆی لە وڵاتێکی بێگانە، جا بە پێی یاسایەك لەلایەن وڵاتەکانەوە دانیای پێداناوە ئەو جانتایە نەکرێتەوە و نەپشکنرێت، ئەگەر بشیانەوێ جانتاکە بپشکنن دەبێ نوێنەری ئەو وڵاتە لەوێ ئامادە بێت، هەروەها ئەوانەی وا لە سەفارەتەکان دا کاردەکەن و پەساپۆرتی دیپلۆماسیان هەبێت بەندناکرێن.

٢٢٨- خارکۆف:

شارێکی وڵاتی سۆڤیەتە لە ناوچەی ئۆکرانیادا و تا ساڵی ١٩٣٤ پایتەختی ناوچەی ئۆکراین بووە و نزیکەی ١،٢٥٠،٠٠٠ کەسی تێدا دەژی، ئەم شارە لە ساڵی ١٩٤١ دا لەلایەن ئەڵمانەکانەوە داگیرکرا.

٢٢٩- خالیدە ئەدیب (١٨٧٥ – ١٩٦٤ ز)

ئافرەتێکی خەڵکی تورکیا و پێشڕەوی ڕێکخراوی جووڵانەوەی ئافرەتانی تورکیا و هاوکاری مصطفا کەمال ئەتا تورك بوو. تاوانی پیلانی کوشتنی (ئەتا تورك)ی دراوەتە پاڵ بۆیە ڕادەکاتە بریتانیا و لەوێشەوە بۆ ئەمریکا، هەر لەوێش دا مردووە.

٢٣٠- خرۆشۆف:

نیکیتا سێرجیفتش خرۆشۆف لە ساڵی ١٨٩٤ لە ئۆکرانیا لە دایك بووە، کوڕی کرێکارێکی کانگاکان بوو، بە منداڵی شوانی و ئاسنگەری کردووە، چووەتە جەرگەی سپای قەیسەرەوە، لە ساڵی ١٩١٨دا چووەتە ڕیزی شۆرشگێران و سپای سووردوە، لە ساڵی ١٩٢٩ دا چوەتە ئاکادیمی هونەرە تازەکان. بەرەبەرە لە ریزی حزبی کۆمۆنیست دا پێش کەوتووە و لە ساڵی ١٩٥٨ دا لە جێگەی بولگانین بوو بە سەرەك وەزیرانی یەکیەتی سۆڤیەتی.

٢٣١- خەتی ماجینۆ:

زنجیرە قەڵاو سەنگەرێکی پتەو و ڕێڕەوی ژێر زەوی و جێگای تاقمت و ئاسایشی سەربازان و تونێلی پتە و بوو ئەندریە ماجینۆی وەزیری شەڕی فرانسە سەرپەرشتی دروست کردنی کرد بۆ بەرگری لە هێرشی ئەڵمانەکان بۆ سەر وڵاتی فرانسە. بەڵام لە ساڵی ١٩٤٠دا ئەڵمانەکان گورج ئەو خەتەیان هاڕی بەسەر یەك دا و فرانسەیان داگیر کرد.

٢٣٢- خەتی مارت:

خەتێکی سەربازگەری بوو لە نێوان وڵاتی تونس لە نێوان سپای ڕۆمیلی ئەڵمان و سپای هەشتەمی بریتانیادا کە لە دواییدا سپای هەشتەم توانی وێرانی بکات.

٢٣٣- خەتی هەندنبورگ:

خەتێکی سەربازگەری بووە لە بەشی ڕۆژاوای وڵاتی ئەڵمانیادا تا دوا ڕۆژی شەڕی یەکەمی جیهانی ماوەتەوە، پاشان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە شکاوە.

٢٣٤- دارلان (١٨٨١ - ١٩٤٢ ز)
دوای داگیر کردنی فڕانسە لەلایەن ئەڵمانەکانەە و دامەزرانی دەوڵەتی (فیشی) سەر بە ئەڵمانیا لە فڕانسادا بوو بە فەرماندەی هێزی دەریایی وڵاتی فڕانسە، لە ساڵی ١٩٤٢ لەلایەن گەنجێکی فڕانسەییەوە لە جەزائیر کوژراوە.

٢٣٥- دەلای لاما
ناوی سەرۆکی ئاینی هۆزی لامییەکانە کە لایەنگری ئاینی بوودان لە (تیبەت)، دوای ئەوەی چین دەستی بەسەر تیبەت دا گرت دەسڵاتی دەلای لاما کەم کرایەوە.

٢٣٦- دانووب
دووەمین رووباری قارەی ئەوروپایەو درێژییەکەی ١٧٥٠ کیلۆمەترە لە سەرچاوەکەیەوە لە خوارووی ئەڵمانیاوە دەست پێ دەکات و دەڕژێتە دەریای رەشەوە.

٢٣٧- دەنکرک:
شارێکی کەنار دەریایە لە سەرەوەی فڕانسەدا نزیکی سنووری بەلجیکا، زۆربەی ئەوتی فڕانسە لەو شارەدا دەپاڵێورێت. لە شەڕی دووەمی جیهان دا بەناوبانگ بوو سەبارەت بەوەی کە بوو بە بنکەی بریتانیا دژ بە ئەڵمانیا، دوای گرتنی فڕانسە لەلایەن ئەڵمانەکانەوە و هێزەکانی بریتانیا کشانەوە ئینگلتەرە.



٢٣٨- دوتشە
ناوێکی ئیتالییە واتە سەرۆک، ئەندامانی حزبی فاشستی ئیتالیا بە سەرۆکی حیزبەکەیان دەگوت کە مۆسۆلینی بوو.

٢٣٩- دووشەنبە:
پایتەختی کۆماری تاجیکستانی سۆڤیەتییە و پێی دەگوترا (ستالین ئاباد)و دوای بێزاندنی ستالین ئەو ناوەش گەڕایەوە سەر ناوە کۆنەکەی خۆی. ئەم شارە ٢٦٨ هەزار کەسی تێدا دەژی.

٢٤٠- دیان بیان فو:
بنکەیەکی بەهێزی لەشکری ئیمپریالیستی فڕانسە بوو لە ڤێتنام دا، هێزی ئازادیخوازانی ڤێتنام بە سەرۆکایەتیی (هۆشی مین) پەنجا و حەوت ڕۆژ گەمارۆیان دا و لەئاکام دا گرتیان.. جا هەرچی سەربازی تێدا دابوو بە جەنەڕاڵ "دی کاسترۆ"یشەوە هەموو بە دیل گیران.

٢٤١- دێر یاسین
گوندێکی فەلەستینی رۆژی نۆی مانگی نیسانی ١٩٤٨ سەهیۆنستەکان کوشتارێکی گشتیان تێ داکرد کە بە ژن و منداڵ و پیاوەوە هەموویان کوشتن و لاشەکانیان خستنە ناو بیرەوە.

٢٤٢. ديمۆگرافی
زانیارییەکە کە دەربارەی سەرژماری کەم بوون یان زۆر بوونی خەڵك و مردن و لەدایك بوونیان، هەروەها دەربارەی کۆچ کردن لە لادێوە بۆ شار یان لە وڵات دەرچوون و شیکردنەوەی هۆیەکانی ئەمانە.

٢٤٣. دیناسور:
جۆرە جانەوەرێکی زل و زەلام بوون پێش ملیۆنان ساڵ بەسەر زەوییەوە دەژیان و تا ئێستا بە شێوەییەکی زانیاریی رۆشن، هۆی لە ناوچوونیان باش روون نەبوەتەوە. ئەم گیانلەبەرانە چوار بەشن:

١. بەشی یەکەم:
درترین و خوێن خوارترین بەشەکانی دیناسورە و بە "تیرا نوسور" ناودارە. هەر گیانلەبەرێکی تووش بووبێ، بێ یەك و دوو پەلاماری داوە هەر ئەم جۆرەش بووەتە هۆی لەناوچوونی توخمی دیناسور. ئەمانە گۆشت خۆر بوون و ریزە ددانێکی هەرِدیی و دەست و پەنجەی زەلام و بەهێزیان هەبووە و لەسەر دوو پێ رۆیشتوون و درێژیی هەر یەکێکیان لە دە مەتر کەمتر نەبووە.

٢. بەشی دووەم:
ئەم بەشە وشکاوی بوون (لە وشکانی و لە ئاویش دا ژیاون) زۆر زل و زەلام بوون، بەلام گۆشت خۆر نەبوون بەڵکو لەسەر گیا و گەڵای داران ژیاون. لەسەرەتای دنیاوە هیچ گیانلەبەرێك لەم جۆرە زلتر نەبووە جگە لە نەهەنگی شین.
ئەمانە لەسەر چوار پێ رۆیشتوون، ملێکی درێژ و سەرێکی بچووك (لە گوێرەی لەشیان) و کلکێکی درێژیان هەبووە.

٣. بەشی سێیەم:
ئەم بەشەش هەر خواردنیان گیا و گەڵای داران بووە و بە دوو پێ رۆیشتوون و درێژییان دەوروبەری سێ مەتر بووە، پێیان دەڵێن "کوانادون".

٤. بەشی چوارەم:

دیناسۆری زری پۆش، کەوا تەواوی لەشی هەروەکو بەرگێکی ئاسنی لەبەردا بێت ئاوا داپۆشراو بووە و بۆ خۆپاراستن چەند شاخێکی لە کەڵلەوە هەبووە. بە چوار پێ رۆیشتووە و بەرزیی دوو مەتر بووە، هەر کە بە پشت دا خراوە بە ئاسانی سکیان دڕیوە و بووەتە خۆراکی دیناسورە گۆشت خۆرەکان.

٢٤٤. رادار
دەزگایەکە بۆ دۆزینەوەی فڕۆکە یان هەر شتێکی دی کە بە ئاسمانەوە بێت بەهۆی کورتە شەپۆلی ئیستگەیەوە.

٢٤٥. رایشتاگ:
بە مەجلیسی نوێنەرانی ئەڵمانیا وتراوە لە ساڵی ١٨٧٠ تا ساڵی ١٩٤٥. ئەم مەجلیسە لە سەردەمی دەسەڵاتی نازییەکان دا هەمووی ٨٥٠ نوێنەر بوو.

٣٤٦- زبلن

زبلن له ساڵی ١٨٨٧ له دایك بووه، ئهم داهێنهره ئهڵمانییه جۆره باڵۆنێكی تایبهتی دروست كردووه بهناوی كونت فردیناند فۆن زبلن، بهناوبانگترین باڵۆنێك كه ناوی ئهم داهێنهرهی بهسهردود بووه ناوی (گراف زبلن) كه دهوری دنیای داوهتهوه، دووهمیان باڵۆنی هند نبورگ بوو كه له ئهمریكادا له كاتی نیشتنهوهیدا سووتاوه.

٣٤٨- سانتیاگۆ:

ناوێكه له زۆر جێگه و شار نراوه:

١- سانتیاگۆ: پایتهختی شیلییه.
٢- سانتیاگۆ: ناوچهیهكه له كۆماری دۆمهنیكان.
٣- شارێكه له سلڤادۆر.
٤- شارێكه له پهنهما.
٥- شارێكه له ئیسپانیا.
٦- شارێكه له كووبا.
٧- ناوچهیهكه له ئهرجهنتین.
٨- شارێكه له كالیفۆرنیای ئهمریكا.

٣٤٨- سهعد ئاباد:

پهیمانێكه له ساڵی ١٩٣٧ دا لهنێوان چوار دهوڵهتی دراوسێوه مۆركراوه:

١- عیراق - ناجی ئهلئهصیل.
٢- توركیا - روشدی ئاراس.
٣- ئافغانستان - فهیضوڵلا محهممهد خان.
٤- ئیران عینایهتوڵلا سهمیعی.

بۆیهش ناونراوه سهعد ئاباد ونكه له كۆشكی سهعد ئابادی تاران دا مۆركرا.

٣٤٩- سێگمان ری (١٨٧٥ - ١٩٦٥ ز)

له بنهماڵهیێكی ناسراوی كۆریا بووه و له ئهمریكا خوێندنی لهزانكۆی (لاهوت)دا تهواو كردووه، دوای دهرچوونی ئیستعماری ژاپۆن له كۆریادا دهسهڵاتی گرته دهست و دایه پاڵ ئهمریكا و تا ساڵی ١٩٦٠ ههر به سهرۆكی كۆریا (بهشی باشوور) مایهوه. ساڵی ١٩٦٠ بۆ ئهمریكا كۆچی كرد و له دورگهیهك له دورگهكانی هاوای دامرد.


ئهدواردی ههشتهم و خۆشهویستهكهی مسزسامسۆن

٣٥٠- مسز سامسۆن

بێوهژنێكی ئهمریكایی بووه، ئهدواردی ههشتهمی پاشای بریتانیا عاشقی بووه و ههر لهبهر ئهو خۆشهویستییه وازی له تهختی پاشایهتی هێنا چونكه یاسای بریتانیا ماوهی نهدهدا ئهو ژنه بهێنێت.. بهڵام ئهو هێنای و خۆشهویستی بهسهر پاشایهتی دا زاڵ كرد.

٢٥١- شاستری (١٩٠٤ - ١٩٦٦ ز)
سەرۆك وەزیرانی وڵاتی هیندستان بووە ناوی لال بەهادور شاستریيە، لە دێی (مەغوڵ سەرای) لە خێزانێکی مامۆستا پیشە لەدایك بووە، یەکێك بووە لە شاگردانی (گاندی) و (نەهرۆ) و لە خەباتی رزگاریی وڵاتی هیندستان دا بەشداریی کردووە، لە کاتێك دا چووە شاری (تاشقەند) لە یەکیەتی سۆڤیەت تا لەگەڵ نەییوب خانی سەرۆك وەزیرانی پاکستان دا بەناوبژی کاریی (کوسگین)ی سەرۆك وزیرانی ئەو دەمەی سۆڤیەت پەیمانی ئاشتی مۆربکات، دوای مۆر کردنی پەیمانەکە دڵی وەستاوە و مردووە.

٢٥٢- شتێرن:
رێکخراوێکی سەهیۆنستی جوولەکانە، وشەکە مانای (شەڕکەران لە پێناوی ئازادیی ئیسرائیل)ە، ئەم رێکخراوە چەتەیە لە گەرماو گەرمی شەڕی دووەمی جیهان دا جموجۆڵ و چالاکیی زۆر بوو.. لە سەرەتاوە لەلایەن بریتانیاوە یارمەتی دەدرا و ئەو یارمەتی دانە بوو بە خەڵکی بێ چەکی فەلەستین.

٢٥٣- شیکوکۆ
یەکێکە لە چوار دورگە گەورەکانی وڵاتی ژاپۆن، شاری کوتشی وتوکۆشیما لەم دورگەدان.

٢٥٤- تاهیر بەگی جاف
رووخانەی پڕ هەڵ هەڵەی هەڵبەست و مۆسیقا، چاوگەی هەستی شیرین و بزەی پێکەنین، هەوێنی هەر بەزمێکی ژیان و ژین، ناسك رەفتار، سەکر گوفتار، شەوچرای ئاسمانی بێ ترووسکەی عاشقان سرکەری ئێشی جودایی و دوور لە دولبەر، درەختی بەرداری عیشق و حەز و.. نەوا.. هان دەری ریتمی پڕ تەرازوویی تەلی تار، هاوڕازی ناڵەی نەی و قورگی پڕ ئای و ئای و هاوار، پۆدرە و گەردی رەنگی زەردی شەوبێ دارانی شەو، لەولایە لایەکەری دیدەی کلاردی بێ خەو تا تایەر بەگی جاف:

تابەکەی قوربان بناڵم من بە ئێش و دەردەوە ؟
دەس بە ئەژنۆ قوربەسەر دایم بە ئاهی سەردەوە

رۆژی ئەووەل بوو کە زانیم ئەبێ دێوانە بم
عاشقی تۆ نەوعی مەجنوون وا بە کێو و هەردەوە
چاك زانیویەتی هاژەی عیشقی سیروان ئاسایی دامرکاندنی بۆ نییە عیشقی ئەو هەتا هەتاین و سەرمەدییە.. لە گەڵیا ژیاوە و ئەبەدییە.. وەکو ساوایەکی دایك بەجێ هێشتووە زیرەکانە خۆی ئەلاوێنێتەوە و ئەفەرموویت:
مەرحەمەت کە زوو برۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم
نازی پاپوچت ئەکشێم من بە تۆز و گەردەوە
هەرومکو قەوس و قەزەح با دەس لە گەردن دانیشتن
تۆ بە سوخمەی ئاڵ و سەوز و من بە رەنگی زەردەوە

بنوارە لە کەهکەشانی ئاسمان دا چ پردێکی رەنگاورەنگی دا بەستووە بەسەر دەریای هەست و حەزا.. بنوارە چۆن خۆی گەیاندووەتە دەروازەی مەلەکووتی عیشقی هەمیشە زیندوو، سەیرکە چۆن سەر بەرە و ژوورەکەی هەسوونە زێڕینەی ئەپێوێ و دەس بە خەنجەر هەڵ ئەکوتێتە سەربۆ نەهاتن و کەم مەیلی و کەم

سەودایی، ورد بەردەوە بزانە چۆن دانە دانە ئەندامەکانی خێزان و بنەماڵەی ڕەنگ ئەکاتە شایەت بۆ عیللەت و هۆی دەردی دڵ:

یەك نەفەس چاکی نەهێنا کەعەتێنی بەختەکەم
شەش دەرم گیراوە، داماوم بە دەستی نەردەوە
ئیلتماسی تاهیری بێ چارە قەت سوودی نییە.
تۆ کە دایم شەڕ فرۆشی بەو دڵەی وەك بەردەوە
ژانەکە لەزەتە، لەزەتەکە حەزە..

حەزێکی تێکەڵ بە ئێش؛ ئێشێکی هەڵ بژێراو و پەسنکراو، ئاوا تاهیری بەگ بە شێوەی خۆی. چەنێك ناسك و لەسەرخۆ ویستیەتی بگاتە هەست ئەکو مەبەست.

٢٥٥- تروهیلۆ یان تروهیۆ:
ناوێکە بۆ پیاوە رامیارییەکانی ئەمریکای لاتین بەکار هاتووە وەکو:
١- جۆلیان تروهیۆ:
سەرکۆماری کۆلۆمبیا بووە لە ساڵانی ١٨٧٨ تا ١٨٨٠، لە ساڵی ١٨٨٤ دا مردووەز
٢- تروهیۆ مۆلینا "روفائیل":
سەرکۆمار و دیکتاتۆری وڵاتی دۆمنیکان بووە بۆ ماوەی ٣٠ ساڵی ڕەبەق. لە ساڵی (١٩٣٠)ەوە تا ساڵی ١٩٦١ کە کوژراوە، ناوبراو لە ساڵی ١٨٩١ دا لە دایك بووە.
٣- تروهیۆ مۆلینا "هیکتۆر"
لە ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بووە و بووە بە سەرکۆماری دۆمنیکان.
٤- تروهیۆ: لە ساڵی ١٩٣٦ پایتەختی وڵاتی دۆمنیکان ناونراوە (تروهیۆ) بە ناوی بنەماڵەی فەرمانڕەواوە. بەڵام لە ساڵی ١٩٦١ دا ئەم ناوە لابرا.

٢٥٦- تریجفی لی
خەڵکی وڵاتی نەرویج و یەکەمین سەرۆکی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو لە شاری ئوسلۆ لە ساڵی ١٨٩٦ دا لە دایك بووە. زانکۆی حقوقی تەواو کردووە و سەردەمێك پارێزەریی کردووە. لە ساڵی ١٩٤٦ دا بووە بە سەرەکی نەتەوە یەکگرتووەکان، تا ساڵی ١٩٦٤ کە داك هەمەرشۆلد جێگەی گرتەوە.

٢٥٧- تسوشیما:
یەکێکە لە دورگەکانی وڵاتی ژاپۆن لە مێژوودا سەبارەت بە شەڕی دەریایی کە لە نێوان هێزی دەریایی ژاپۆن بە سەرکردایەتیی (توجو) و هێزی دەریایی رووسیادا بەسەرکردایەتی (روزدستفسکی) لە ساڵی ١٩٠٥دا رووی داوە ناوی درکردوە لەو شەڕەدا هێزی دەریایی رووسەکان تێك شکێنران بە سەریەکدا زۆر بەشیان بەدیل گیران.

٢٥٨- تشمبرلن (١٨٦٩ – ١٩٤٠ ز)
چەند ساڵێك سەرەك وەزیرانی وڵاتی بریتانیا بوو و شێوەی کاریلایەنگیری ئاشتی بووە، لە ساڵی ١٩٣٨دا پەیمانی مۆنیخی لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا بەستووە و دوای داگیرکردنی وڵاتانی چیکۆسلۆفاکیا و پۆڵەندە

لەلایەن ئەڵمانیای نازییەوە رەوشتی بریتانیا دەربارەی ئەڵمان گۆڕا و لە ساڵی ١٩٤٠ چووە ناو جەرگی شەڕەوە و بە بەشداربوونی بەریتانیا لە شەڕدا چەرچڵ بووە بەسەرۆك وەزیرانی بریتانیا.

٣٥٩. ئەلستار:

مانگێکی دروست کراوی ئەمریکایە لە ساڵی ١٩٦٢ بەرە و ئاسمان هەڵ دراوە ئەم مانگە دەستکردە لە ئەلەمنیۆم و مەغنسیۆم دروست کراوە، زۆرتر بۆ بەهێز کردنی سستەمی بێ تەل و دامودەزگای تەلەفزیۆن بەکاردێت. هێز و توانای خۆیشی لە تیشکی هەتاو وەردەگرێت و گۆمەڵی دەکا بۆ تەنگانە. لەماوەی ١٥٧,٨ دەقیقەدا یەك جار بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە.

٣٦٠. تەنکو عەبدولڕەحمان

سەرۆك وەزیری یەکیەتی مالیزیا بوو لە ساڵی ١٩٠٢ لە بنەماڵەیێکی ناسراوی مەلایۆدا لە دایك بووە باوکی سوڵتانی ناوچەی (قدح) بووە. لە ساڵی ١٩١٧ چووەتە بەریتانیا و زانکۆی (ئۆکسفورد)ی تەواو کردووەو لە ساڵی ١٩٥٧ دا بووە بە نوێنەری وڵاتەکەی بۆ راوێژ کردن لەگەڵ بەریتانیا بۆ ئازادیی وڵاتەکەی. لە ساڵی ١٩٦٣ یەکیەتی مالیزیای پێك هێنا و لە ساڵی ١٩٦٥ وڵاتی سنگاپۆری لە یەکیەتییەکەی جیاکردەوە.

٣٦١. تیموشنکو

لە ساڵی ١٨٩٤دا لە خێزانێکیجووتیار لە وڵاتی روسیا لە دایك بووە، چووەتە رشتەی سپاوە. لە شەڕ و شۆڕە ناوخۆیان دا و ناوخۆیەکان لە شۆڕشی ئۆکتۆبەردا شۆرەتی دەرکردووە بە تایبەتی دوای بەزینی فەرماندەی سپای سپی "دنیکین". لە ساڵی ١٩٤٠ بووە بە بە وەزیری بەرگریی یەکیەتی سۆڤیەت. توانی بەری لێشاوی ئەڵمان بگرێت لە شاری (ستالین گراد) دا. بووە بە باڵیۆزی سۆڤیەت لە ئەثیوپیادا، پاشان گەڕاوەتەوە و بوو بە سەرەکی سپای سۆڤیەتی لە دوای ساڵی ١٩٤٨ سەرگوم کراوە و تاکو ئێستا ناوی نەبراوە.

٣٦٢. جیتلاند

شەڕی جیتلاند لە ساڵی ١٩٦ دا نێوان هێزی دەریایی ئەڵمان بە سەرکردایەتی ئەمیرال "فۆن شیر" و هێزی دەریایی بریتانیا بە سەرکردایەتی ئەمیرال "جیلیکو" روویداوە و لە ئاکام دا ئینگلیزەکان سەرکەوتوون، ئەگەرچی زیانێکی زۆریشیان لی کەوتووە.


گستاپۆ

٣٦٣. گستاپۆ

وشەیەکی ئەڵمانییە بۆ پۆلیسی نهێنی بەکارهێنراوە لە سەردەمی دەسەڵاتی نازییەکان دا، لە ساڵی ١٩٣٤دا ئەم رێکخراوە نهێنییە توند و تیژە لەلایەن (هیملەر)ەوە بەڕێوە براوە و لە زۆربەی وڵاتان دا نوێنەری هەبووە، لەبەر ئەوەی چەکی دەستی یاسای نازی بووە دادگای نۆرنبورگ ئەندامانی ئەم رێکخراوەی بە تاوانبارانی شەڕ ناسیوە.

٣٦٤- **كلۆپ پاشا**

سێرجۆن باگوت کلۆپ لە ساڵی ١٨٩٧ لە دایك بووە کوڕی سێ خەتێکی سپای بریتانیا بووە, ساڵی ١٩١٤ زانکۆی "ولتیش"ی تەواو کردووە کە زانکۆیەکی سەربازی بووە و لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بەشداری کردووە و سێ جار بریندار کراوە و برینێکی لە دەموچاویدا دیاربوو لەناو (بەدوو)دا بە "ئەبو حنێك" واتا چەناگەخوار ناسراوە. ساڵی ١٩٢٠ هاتووە بۆ عیراق و لە عیراقەوە ڕۆیشتووە بۆ ئەردون و بە دانەری "الفیلق العربي" ناسراوە و لە شەڕی فەلەستین دا ساڵی ١٩٤٨ بووە هۆی لە دەست چوونی شاری "اللد" و "الرملە". لەدواییدا لە ساڵی ١٩٥٧ دا لە ئەردون دەرکرا.

کلۆپ ئەم کتێبانەی نووسیوە:

١- داستانی فەیلەقی عەرەبی ١٩٤٨.
٢- سەربازێك لەگەڵ عەرەبدا ١٩٥٧.
٣- بریتانیا و عەرەب ١٩٥٩.
٤- شەڕ لە بیاباندا ١٩٦٠.
٥- سەرکەوتنە گگەورەکانی عەرەب ١٩٦٣.
٦- ئیمپراتۆریەتی عەرەب ١٩٦٣.

٣٦٤- هونەری تەعبیری:

شێوەیەکی تایبەتییە لە دنیای هونەردا کە بە هێزێکی ڕاستەوخۆ لە تەلی هەستی بینەر دەدات.. نیگاری تەعبیری روخسارێکی دینامیکی هەیە و شێوە و سیمای کەسایەتییەکان ڕۆشن و ئاشکرایە.. ڕەنگ تێدایە پڕە لە شەپۆلی دەم دەم تێکەڵ بە هەستێکی دەروونی.

ڤان کۆخ و کۆگان و مۆنگ پێشڕەوانی ئەم قوتابخانە بوون.

٣٦٥- **گۆرینگ**

هێرمان فیلهم گۆرینگ لە ساڵی ١٨٩٣ لە دایك بووە, لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بەشدار بووە و سەرۆکی پۆلە فڕۆکەیەکی جەنگی بووە کە لە سەردەمی شەڕدا زۆر چالاك بوون. پاشان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی هیتلەردا بووە بە سەرکردەی هێزی ئاسمانی دوای تێشکانی دەسەڵاتی نازی لە شەڕی دووەی جیهان دا لەدادگای نورەنبورگ لەگەڵ دە نازیی ناوداری تردا بڕیاری خنکاندنی دراوە, بەڵام پێش ئەوەی بخنکرێت بە دوو سەعات لە بەندیخانەدا لە ڕۆژی ٣٠ ی سەپتەمبەری ١٩٤٦ دا خۆی ژەهر خوارد کردووە.

٣٦٥- **جیوفیزك**

ناوی بەرنامەیێکی زانیاریی جیهانییە کە لە ساڵی ١٩٥٧ دا داندراوە, ئەم بەرنامە زانیارییە دەربارەی چۆنیەتی گۆی زەوی و دەوروبەرێتی وەکو: هێزی ڕاکێشانی زەوی (جاذبیة), موگناتیسیی زەوی, تیشکەکانی ئاسمان, نهێنییەکانی ئۆقیانووسەکان, بەستەڵەکی قوتبەکانی زەوی.

٣٦٦. حەسەن ئەل بەننا

حەسەن کوڕی ئەحمەدی بەنناى ساعاتى. لە ساڵی ١٩٠٦دا لە شاری مەحموودییەی میصر لە دایک بووە. لە قوتابخانەی (دار العلوم) خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٩٢٧ تەواوی کردووە. لە شاری ئیسماعیلییەدا ڕێکخراوێکی ئیسلامی پێک هێناوە. بەرەبەرە ڕێکخراوەکە گەورە بووە و دروشمەکەی ئەوە بووە،

"خوا مەبەستمانەو پەیامبەر سەرۆکمانە، قورئان یاسامانە، جیهاد ڕێگەمانە و مردن و لە پێناوی خوادا ئاواتمانە".

کەم کەم ئەم ڕێکخراوە ئاینییە چووە ناو کۆڕی ڕووداوەکانی سیاسەتەوە و لەگەڵ حکوومەتەکانی دەوڵەتی میصردا هەمیشە لە گێرە و کێشەدا بووە. لە ساڵی ١٩٤٩دا کوژراوە.

٣٦٧. خابوور

ڕووبارێکە زۆربەی کەوتوەتە وڵاتی سوریەوە و دەرژێتە ناو فوراتەوە. درێژایی ٤٤٨ کیلۆمەترە.

٣٦٨. دەنشوای

گوندێکە لە ناوچەی منوفییەی میصر ناوبانگی بە ڕووداوێکەوە دەرکرد کە بووە هۆی لابردنی لۆرد کرۆمەر کە فەرمانداری بریتانیا بوو لە میصردا.

پێنج ئەفسەری سپای داگیرکەری ئینگلیز بۆ ڕاوەکۆتر دەچنە ئەو لادێیە و لە تەقەدا ژنێک دەکوژن و خەرمانی دێیەکە دەسووتێنن خەڵکی پەلاماریان دەدەن، ئەوانیش ڕادەکەن و دەردەچن. یەکێک لە ئەفسەرەکان لە هیلاکیدا دەبووریێتەوە و دەمرێت. مردنەکەی بووە هۆی ئەوەی دادگای سپای داگیرکەری بەریتانیا چوار کەس بە خنکاندن حوکم بدات.. ئەم بڕیار ناڕەوایە بووە هۆی جووڵانەوەیەکی گشتیی گەلی میصر دژ بە ئیستیعماری بریتانیا بوو.

٣٦٩. ڕۆتردام

دووەمین شاری هۆڵەندەیە. بەندەرێکی بەناوبانگە کەوتوەتە سەر دەریای باکووردوە و لە هەمان کات دا شارێکی پیشەسازییە کەشتی سازی، جگەرە، پەنیر، شەکری تێدا دروست دەکرێت. بنکەی ناوەندی هێڵی ئاسمانیی هۆڵەندە K.L.M لەو شاردایە.

٣٧٠. ڕۆزنبرگ

تەفینەردوەی بیرورا نازیسم بووە لە شاری تبالین دا لە ئەستۆنیادا لە ساڵی ١٨٩٤ لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩٣٠ کتێبێکی بەناوی "ئەفسانەی سەدەی بیستەم" بڵاوکردۆتەوە کە بیروڕای نازیسم تێدا روون کردوەتەوە. لە ساڵی ١٩٤٦ خنکێنراوە.

٣٧١. ڕۆیتەر

یەکێکە لە پێنج ڕێکخراوی بەناوبانگی هەواڵەکانی جیهانی کە زمان حاڵی وڵاتەکانی (کۆمنوێلث)ە بەناوی بارۆنێکی ئەڵمانییەوە کە ناوی فون یۆلیۆس ڕۆیتەر (١٨١٦ - ١٨٩٩)ز ناونراوە. ئەم پیاوە لەنێوان شاری برۆکس و واکس دا بە هۆی کۆتری نامەبەردوە هەواڵی دەهێنا و دەبرد و لە ساڵی ١٨١٥ لە شاری لەندەنیش دا بنکەیەکی کردوە و لە ساڵی ١٨٥٨ لە زۆر پایتەختی ئەوروپادا لکی بۆ دەزگاکەی بڵاوکردوە تا بوو بە کۆمپانیایێکی گەورە و مەزن.

له ساڵی ١٩٤١ نیوەی راستی ئەم کۆمپانیایە بوو بە مۆڵکی خاوەن رۆژنامە یەکگرتووەکان و لە ساڵی ١٩٥٠ بوو بە مولکی بریتانیا, نیوزیلەندە, ئوسترالیا و هیندستان.
ئێستا لە پەنجا لك و بنکەی زیاتر هەیە لە سەرتاسەری دنیادا و لە ٢٠٠٠ کەس زیاتر کاری تێدا دەکات.

٢٧٢- سیك
خۆیان بە میللەتێك دادەنێن و داوای جیابوونەوە دەکەن لە دەڵەتی هیندستان, بە گشتی ٩ ملیۆن کەس دەبن, بیروڕایەکی تایبەتییان هەیە باوەڕیان بە یەك بوونی خوا هەیە لەگەڵ برایەتیی مرۆڤ لەگەڵ یەك دا, زۆرتر لە ناوچەی پەنجابی هیندستان دادەژین. ئەندیرا گاندیی سەرەك وەزیرانی هیندستان لەلایەن رێکخراوی سیکەکانەوە کوژرا.



٢٧٣- شیانگ شینگ
ژنی رابەری چین ماوتسی تونگ بووە, لە ساڵی ١٩١٠ لەدایك بووە, لە سەرەتاوە ئاکتەری شانۆ بووە, لە ساڵی ١٩٢٩ شووی بە ماوتسی تۆنگ کردووە و سێیەمین ژنی (ماوە)ە.

٢٧٤- صالح جەبر
یەکێکە لە سەرەك وەزیرانی سەردەمی پاشایەتیی عیراق و سەرۆکی حزبی "الامة الاشتراکیة". لە ساڵی ١٩٤١ ناوی دەرکردووە بەتایبەتی دوای شۆرشی رەشید عالی گەیلانی کە بوو بە وەزیری دارایی لە وەزارەتی نوری سەعیددا, لە ساڵی ١٩٤٧ بوو بە سەرەك وەزیران. لە ساڵی ١٩٤٨ پەیمانی پۆرتسمۆثی لەگەڵ بریتانیا مۆرکرد و لە ئەنجام دا میللەتی عیراق لێی راپەڕی هەڵیوەشاندەوە و سەرەك وەزیرانیش لەکار وازی هێنا.

٢٧٥- صەدری ئەعظەم
لە سەردەمی دەولەتی عوثمانیدا بە سەرەك وەزیران گوتراوە صەدری ئەعظەم کە تەواو کاروباری سوڵتانی ئەنجام داوە و تەنانەت ئەنگوستیلەیەکی سوڵتانیشی هەڵ دەگرت بۆ مۆرکردن و فەرمان نووسین.

٢٧٦- تابووری پێنجەم:
وشەیەکە لە رووداوە سایییەکان دابەکاردەهێنرێت لە سەرەتاوە کاتێك (فرانکۆ)لە وڵاتی ئیسپانیادا لەگەڵ کۆمار خوازەکان دا لە شەڕدا بوو ئەو ساتە چوار تیپ لەشکری هەبوو بەڵام لایەنگرانی خۆی لەناو کۆمار خوازەکان دا ناو نابوو تیپی پێنجەم. جا بەم شێوەیە وشەی تابووری پێنجەم لەو وەختەوە پەیدا بوو و بەکار دەهێنرێت.

٢٧٧- طالب ئەلنەقیب
لە ساڵی ١٨٦٢دا لە شاری بەصرە لەدایك بووە و بۆ ئازادیی عیراق ئاڵای جووڵانەوەی سیاسیی دژ بە سوڵتان عەبدولحەمیدی هەڵ گرتووە. لە ساڵی ١٩٠٢دا کراوە بە فەرمانڕەوای (ئیحسا) لە ساڵی ١٩٠٩ بوو بە ئەندامی مەجلیسی ئەعیان و بەکوشتنی فوماندانی تورك لە بەصرە تاوانبار کراوە, دوای داگیرکردنی بەصرە لەلایەن بریتانیاوە لە ساڵی ١٩١٤ دا دوور خراوەتەوە بۆ هیندستان. گەڕاوەتەوە عیراق و کراوە بە وەزیر لە یەکەمین

دەوڵەتی عیراق دا. ناوی ئەوەی هەبوو بکرێت بە مەلیکی عیراق. دووبارە دوورخراوەتەوە هیندستان. لە ساڵی ۱۹۲۹ لە شاری مونیخ لە ژێر "عەمەلیات" دا مردووە و هێنراوەتەوە بەصرە و لەوێ نێژراوە.

۲۷۸. تەربووش

داستانی کڵاوی (طەربووش) سەیرە، لە بنەڕەت دا کڵاوێکی یۆنانی بووە بەڵام شێوەیێکی سیاسیی بە خۆیەوە گرتووە و لەسەرنانی تەربووش مانای لایەنگیر و پەیڕەوی ئیمپراتۆرێتی عوثماني بووە. ئەم کڵاوەش زۆرتر لە میصردا بەکارهێنراوە و چەند کارخانەیێکی تایبەتیی دروست کردنیان لە شاری "قها" دامەزراند تا چیتر لە دەرەوە نەی هێنن. لە ساڵی ۱۹۲٦ دا گردوێکیان دانا بۆ دۆزینەوەی کڵاوێکی تر جێگەی تەربووش بگرێتەوە. بەڵام وادیاری تاکو ئێستا بێ ئەنجام بووە و سەر بێ کڵاو ماوەتەوە.

۲۷۹. طەها هاشمی

زانیاریی سەربازی لە شاری ئەستەنبۆل تەواو کردووە و بوو بە ئەفسەر لە سپای عوثمانیدا، لە پێناوی ڕزگاریی وڵاتی عەرەبیدا لە کۆمەڵەی نهێنیی "ئەلعەهد"دا بەشداریی کردووە و لە ساڵی ۱۹۲۰ دا لەگەڵ مەلیك فەیصەل دا بووە لە دیمەشق و پاش داگیرکردنی دیمەشق لەلایەن فەڕانساوە گەڕاوەتەوە بۆ عیراق و لە ساڵی ۱۹۲۲ بوو بە سەرۆکی سپای عیراق. لە ساڵی ۱۹٤۰ لە وەزارەتی ڕەشید عالی گەیلانیدا بووە بە وەزیر. هەروەها بووە بە سەرەك وەزیرانیش.

۲۸۰. تۆرانی:

جووڵانەوەیەکی توورکایەتییە بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئەو گەلانە تورکی زمانن لە دەوڵەتێك دا هەروەها بە تورك کردنی ئەو گەلانەش کە لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوثمانیدا بوون.

۲۸۱. عەباسەلعەقاد

ڕۆژنامە نووس و نووسەرێکی ناسراوی میصرە لە ساڵی ۱۸۸۹ لە شاری ئەسوان لەدایك بووە. لە ڕۆژنامەی (الدستور) و (المؤید) و (الأهرام) و (البلاغ) دا کاری کردووە. هەروەها لە ڕۆژنامەی (اخبار الیوم) و (الأخبار)دا نووسیویەتی. لە سیاسەت دا دژی نازیسم و کۆمۆنیسم و سەهیۆنستی بووە و زۆر کتێبی نووسیوە وەکو:

۱. هیتلەر لە تەرازوودا.
۲. نازی و ئاین.
۳. کۆمۆنیسم و مرۆڤایەتی.
٤. سەهیۆنیسمی عالەمی.
٥. بەنکی میللەتان.
٦. سەعد زەغلوول.
۷. محەممەد عەبدە

بووە بە ئەندامی مەجلیسی پارلەمان و دژ بە مەلیك فوئاد قسەی کردووە و وتوویەتی: میللەت لەسەر پێیە گەورەترین سەر پان بکاتەوە ئەگەر بیەوێت یاسای وڵات بە سوودی خۆی بجووڵێنێت. لە ساڵی ۱۹٦٤ لە شاری قاهیرەدا مردووە.

٢٨٢- ئاڵای سپی:
پارچەیەك قوماشی سپییە لە نێوان دوو فەرماندەدا یەکێکیان هەڵی دەکات. هەڵبەتە بەرز کردنەوەی ئاڵای سپی واتە تەسلیم بوون نییە, بەڵکو نیشانەی راوێژکردنە بۆ گەیشتنە رێك کەوتن.



٢٨٣- عومەر موختار
لە ساڵی ١٨٥٨ لە وڵاتی لیبیادا لە دایك بووە و خەریکی زانیارییئیسلامی بووە, لە ساڵی ١٩١١دا شەڕی ژیانی لەگەڵ ئیستیعماری ئیتالیادا دەست پێ کردووە کاتێك (طیبریق) یان داگیر کرد, لە ناوچەی جغبووب دا کۆمەڵێك چەکداری لە دەوری خۆی کۆ کۆتەوە وردە وردە شەڕی پارتیزانی دەست پێ کردووە و شۆڕشەکەی پەرەی سەندووە و لە ساڵی ١٩٢٩ لەگەڵ فەرماندەی ئیستعماری ئیتالیادا راوێژی کردووە و نەگەیشتتونەتە ئەنجام و زۆر شەڕی دلێرانەی کردووە, بە رێکەوت دیل دەکرێت لە ساڵی ١٩٣١دا خنکێنراوە.

٢٨٤- غازیی یەکەم
دووەمین پاشای عیراق بوو لە بنەماڵەی هاشمییەوە کوڕی مەلیك فەیصەل کوڕی حسێن لە ساڵی ١٩١٢ لە شاری مەککەدا لەدایك بووە. زمانی ئینگلیزی چاك زانیوە. ساڵی ١٩٢٦ نێردراوە بۆ بریتانیا بۆ خوێندن و لە زانکۆی هارۆ خوێندوویەتی عالیەی کچی مەلیك عەلیی ئامۆزای خۆی هێناوە و تاقە کوڕێکی بوو بەناوی "فەیصەل".
لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا شۆڕشی ئاشوورییەکان رووی داوە سپای عیراق سەرکوتی کردووە. لە ساڵی ١٩٣٩دابە پیلانی بریتانیا تاکو دەسەڵات بکەوێتە دەستی عەبدوئیلاوە بە رووداوی ئوتومبیل مردووە.

٢٨٥- ئیحسان نوری پاشا
قارەمانی شۆڕشی ئارارات, بە بەرهەڵستی رەگەزپەرستە تورکەکان ژەنرال ئیحسان نوری پاشا.
دوای لەناوچوون و پارچە پارچە بوونی دەسەڵاتی عوثمانییەکان ناوبراو بۆ وەرگرتنی ماق نەتەوەکەی دەستی داوەتە چەك لە ئاکام دا لە دیار و ناوچەی خۆی دەربەدەر کراوە و پەنای بردوەتە بە ئێران. لە ساڵی ١٩٧٥ لە شاری تاران وەفایی کردووە و لە گۆڕستانی بەهەشتی زەهرادا نێژراوە.

٢٨٨- ئیبن مەسعوود
دەگێڕنەوە حەورەتی عوثمان دەچێتە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کە بەسەر جێگەی نەخۆشییەوە بووە لێی دەپرسێت:
- لە چی دەترسیت؟
- لە گوناحەکانم.
- حەز لە چی دەکەی ؟
- لێ بووردنی خوا.
- با دکتۆرت بۆ بهێنم ؟
- دکتۆر نەخۆشی خستم.
- شێکت پێویست نییە ؟ بۆت نەبرمەوە ؟
- کاتێك پێویست بوو لێمت بڕی, ئێستا دەم دەیتێ کە پێویستم پێی نییە؟
- بۆ کچەکانت دوای خۆت.

ـ ئەوانیش نایانەوێت. دایانمەتە دەستی خواوە ئەو ناگاداریانە.

٢٨٩. دەربارەی هاوڕێیەتی گوتراوە:

١. ئەگەرچی خۆشەویستی راستەقینە نایابە.. هاوڕێیەتی راستەقینەش نایابتر.

- لافۆنتین -

٢. هاوڕێیەتی لەنێوان ژن و پیاودا نییە.. یان خۆشەویستییە، یان حەزم، یان کینەیە !

- ئۆسکار وایلد -

٣. هاوڕێیەتی هەمیشە بەکەلکە، بەڵام خۆشەویستی جار جارێك زیان بەخشە.

- شیکا -

٤. خودایە لە هاوڕێیەکانم بم پارێزە، لە دوژمنانم دڵنیام.

- مارشال دفیا -

٥. گومان کردن لە هاوڕێ تاوانەکەی لە فێڵی ئەو قورسترە.

- لارۆ شفوکو -

٦. هاوڕێی چاك وەکو لەش ساغی و تەندروستییە، نرخ و ڕێزی نازانیت تا لە دەستی نەدەیت.

- کولتون —

٧ چاکترین ڕێگا بۆ ئەوەی هاوڕێی چاکت هەبێت دەبێ تۆ دۆست و هاوڕێی باش بیت.

- ئەمرسۆن -

٨ هاوڕێی چاك وەکو کاڵەك وایە تا کاڵەکێکی چاکت وەچنگ کەوێت دەبێت سەد کاڵەك تاقی کەیتەوە.

- کلود مێرمێە -

٩ دوو هاوڕێی دڵسۆز واتە یەك گیان لە دوو لەش دا.

- ئەرەستۆ -

١٠. هاوڕێیەتی لەنێوان فەرمانڕەوایی دا نییە، چونکە فەرمانڕەوا شەریك و بەشداری دەسەڵاتی ناوێت.

- لوکان —

٢٩٠. گیتو

ناوێکە لە ئەوروپادا بە گەڕەکی جوولەکە دەگوترێت، لە زۆر شاریش دا گەڕەکی جوولەکەی جیاواز کرابوەوە، ئەو رەوشتە پەیڕەوی ئەو فەرمانەیە کە ساڵی ١٥٥٥ پاپا دەری کرد کەوا جوولەکەکانی شاری ڕۆما نابێت لەو گەڕەکەی تێیدان بچنە دەرەوە و حەسارێکیان بەدەوری گەڕەکەکەدا کرد بوو و دەرگایێکی تایبەتی هەبوو.

٢٩١ فاطمە جەناح

خوشکی محەممەد عەلی جەناحی دامەزرێنەری دەوڵەتی پاکستانە. ساڵی ١٨٩٥ لە شاری کراچی دا لە دایك بووە، خۆی بۆ سەرەك کۆماری هەڵبژاردووە بەرامبەر بە ئەییووب خان بەڵام سەرنەکەوت، بە بەرێز و دایکی میللەتی پاکستان ناوبراوە و ساڵی ١٩٦٧ مردووە.

٢٩٢. فاو

وشەیەکی کورت کراوەی ئینگلیزی "ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ خواردن و کشتوکاڵ" کە لە ساڵی ١٩٤٥ دا پێك هاتووە.

**٢٩٣- فیل**

دەزانیت فیلی وڵاتی هیندستان هەژدە پەنجەی هەیە و فیلی ئەفریقیا چواردە پەنجە؟

فیلی ئەفریقیا پێی پێشەوەی ٤ × ٢ = ٨ پەنجە

پێی پاشەوەی ٣ × ٢ = ٦ پەنجە

١٤ پەنجە

فیلی هیندستان پێی پێشەوەی ٤ × ٢ = ٨ پەنجە

پێی پاشەوەی ٥ × ٢ = ١٠ پەنجە

١٨ پەنجە

**٢٩٤- ڤلادیڤوستۆك**

یەکێکە لە گەورەترین بەندەرەکانی یەکیەتی سۆڤیەت کەوتوەتە ڕۆژهەڵاتی دوور بەسەر ئۆقیانووسی هێمنەوە بەرامبەر دورگەکانی ژاپۆن. شارێکی پیشەسازی و لە هەمان کات دا زانکۆیە..

**٢٩٥- فۆسجین**

غازێکی ڤورسی ژەهراوییە لە ساڵی ١٨١١ زانایێکی ئینگلیز بەناوی (داڤی) دۆزیویەتییەوە لە شەڕی یەکەمی جیهان دا ئەڵمانەکان بۆ شەڕی سەنگەر بەکاریان هێناوە و بە شێوەی بۆمبا تەقاندوویانەتە سەر سەربازی دوژمن دا هەروەها دژ بە ئەڵمانیاش بەکار هێناوە و بۆنی زۆر ناخۆشە مرۆڤ دەکوژێت.

**٢٩٦- فۆکلاند**

هەمووی سەد دورگەیە کەوتوونەتە ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە ٣٠٠ کیلۆمەتر لە تەنگەبەری ماجەلانەوە دوورە, لەلایەن ئیستعماری بریتانیاوە داگیرکراوە, ڕووبەریان ٤٦١٦ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە و لە وڵاتی ئەرجەنتین نزیکە لە ساڵی ١٩٨٥ دا شەڕێکی نیوە ڤورس لەنێوان ئەرجەنتین و بریتانیا ڕووی دا لەسەر خاوەنێتی ئەم دورگانە.. بەڵام تا ئێستاش هەر بەدەست بریتانیاوە ماونەتەوە.

٢٩٧- دەربارەی شاکامی وتراوە:

١- شاکامی گەوجترین و ناپەسەندترین ڕەفتارە, بە غەیری زیان بۆ شاکامی کەر هیچ سوودێکی تێدا نییە.

- بالزاك -

٢- شاکامی لە کوێرەوەریی شاکامی کەرەوە هەڵ ئەقوڵێ تا شاکامی پێ براوە.

- کونتیس دیانا -

٣- مردووەکان جێگای شاکامین, زیندووەکان جێگای بەزەیی.

- كليمنس -

٤. ئافرەتی ناشیرین دڵیان لە مێردەكانیان پیسە, ئافرەتی جوان شاكامی بە مێردی ئافرەتەكانی تر دەبەن.

- ئۆسكار وایلد -

٣٩٨ - دەربارەی لە سەرخۆیی:

١. لەسەرخۆیی تاڵێكی ئاوریشمە مرواریی ڕەوشتی جوانی تێ هەڵ دەكێشرێت.

- هۆڵ -

٢. هەتا وەكو ئێمە بیر لە شتی چاك دەكەینەوە دەبێت لەسەرەخۆ بین.

- شیشرۆن -

٣. بۆ ئەوەی زۆر بژین دەبێت لەسەرخۆ و ئارام بژین.

- شیشرۆن -

٤. لەزەتەكانی ژیان لە چوارچێوەی لەسەرخۆیی دەرناچێتە دەرەوە.

- تیر -

٥. مرۆڤی سەركەوتوو لەسەرخۆیە لە وتەكانیدا, لە جووڵانەوەی دا و لە كرداریدا.

- كۆنفوشیۆس -

٦. ڕابواردنە ناسكەكان لەبیر ناچنەوە بەڵام ناتوانین بەردەوام بین لە ڕابواردنی توندوتیژدا.

- بۆنی -

٧. لەسەرخۆیی ئەو خاڵەیە كە تەواوی فەلسەفەكانی ئاسمانی و مرۆڤایەتی لەیەك دەدەن.

- هۆڵ -

**٣٩٩. ڤیتۆ**

وشەیێكی لاتینییە واتە "من مەنعی نەكەم" هەندێك لە یاساكان پاشاكان ماڤ ڕەدكردنەوەی بڕیاریان پێ دراود وەكو یاسای بریتانیا كە شا ماڤ ڤیتۆی هەیە بەڵام لە ساڵی (١٧٠٧)دوە تاكو ئێستا كەڵكێكی لەم مافە وەرنەگرتووە.

هەروەها لە ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان دا پێنج وڵاتی گەورە ئەو مافەیان دراوەتێ بە مەرجێك یەكێك لەو پێنجە خاوەنی گرفتارییەكە نەبێت.

**٤٠٠. ڤیشی**

شارێكی بچكۆلانەی فەرەنسایە نزیكی شاری (لیۆن)ە, ٦٠ هەزار كەسی تێدا دادەنیشێت. لە شەڕی دووەمی جیهانیدا ناوی دەرچووە چونكە حكوومەتی دەست نیشانی ئەڵمانیا دوای داگیركردنی وڵاتی فەرەنسە لەلایەن ئەڵمانەكانەوە لە ساڵی ١٩٤٠ بارەگای فەرمانڕەوایی بردوەتە ئەو شارە و بە حكوومەتی ڤیشی ناسراوە.

٤٠١- کابیتول
ناوپیەرستگایەکە بۆ ژۆبیتەری خواوەندی ئەفسانەکانی رۆمان دروست کراوە، لە نزیکی شاری رۆما بەسەر یەکێك لە حەوت گردەکەوە.. لەم پەرستگایەدا سەنەدە گرنگەکانی سەردەمی رۆما ئاگاداری دەکرا هەروەها هەر لەوێدا پێشوازی لە سەرلەشکرەکان دەکرا لە کاتی گەڕانەوەیان دا لە شەڕدا بە سەرکەوتوویی.

٤٠٢- کارتل
زاراوەیێکی ئابوورییە واتە یەکیەتییەکی مووەقەت لە نێوان چەند کۆمپانیایەك دا بۆ وەستانی بەربەرەکانێی یەکتر لە لایەکەوە بازاڕ هەڵ لووشین لەلایەکی ترەوە.. ئەم یەکیەتییە مووەقەتە یا بە پێی قسە و راوێژە یان نووسراوە یان سەندیکا "نەقابە"ی کرێکاری بڕیاری لەسەرداوە.

٤٠٣- کلاوس
زانایاکی زانیاری ئەتۆمە، گوایە ئەم زانایە بووە پرۆژەی زانیاریی ئەتۆمی داوە بە یەکیەتیی سۆڤیەت.

٤٠٤- لاتران
کۆشکێکی بەناوبانگە لە وڵاتی ئیتالیا کەوتوەتە خوارەوەی شاری رۆما، بارەگای پاپاکان بووە و نوێ کردوەتەوە و کراوە بە مۆزەخانەی ئاینی مەسیحی.

٤٠٥- لاهوور
بە دووەمین شاری پاکستان دەژمێردرێت، پایتەختی دەسەڵاتی مەغۆلەکان بووە، کەوتووەتە سەر لکێك لە لکەکانی رووباری سندەوە. دوو ملیۆن کەسی تێدا دەژی.

٤٠٦- لایکا

لە پرۆژەی ئاسمانیدا ئەم ناوە ناسراوە، چونکە ناوی سەگێك بووە لە رۆژی ٣ی نۆڤمبەر (تشرینی دووەم)ی ساڵی ١٩٥٧ لەگەڵ دووەمین مانگی دەستکردی یەکیەتیی سۆڤیەت دا هەڵ دراوە بۆ بۆشایی ئاسمان.

٤٠٧- لۆیدز
رێکخراوێکی دەریایی جیهانییە ساڵی ١٨٦٩ پێك هاتووە لەو کاتەدا کە ولیەم لۆیدی خەڵکی بریتانیا قاوەخانەکەی کردوەتە بنکەی رێك کەوتنی نێوان بازرگانان و خاوەن کەشتییەکان، هەروەها پاداشتی ئەو کەشتییانەی کە تووشی زەرەر و زیانی ئاکا و دەبن لە دەریادا وەکو نوقم بوون و ئاگر تێ بەربوون و تاڵانی چەتەی دەریاکان، لەم رووەوە یاسایەکی بۆ بژاردنیان داناوە.

٤٠٨- لیختنشتاین
لیختنشتاین میرنشینێکی میراتییەو سەربەخۆیە لە وڵاتی سویسرادا کە لە سەدەی چواردەوە تاکو ئێستا ماوەتەوە. رووبەرەکەی ١٦٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و ژمارەی دانیشتوانی ٢٠ هەزار کەسە، پایتەختەکەی ناوی (ڤادۆس)ە کە ٣٦٠٠ کەسی تێدا دەژی.. ئەویش بزانە هیچ جۆرە سپا و چەکدارییەکی تێدا نییە، تەنیا

هەزدە کەس نەبێت ئەویش بۆ ڕاگرتنی ئاسایش و ئارامیی خەڵکەکە نەك وەکو چەکدار. کاروباری دەرەوەشی لە باری سیاسییەوە لەلایەن سویسراوە هەڵ دەسووڕێت.

ئەم میرنشینە لەلایەن بنەماڵەی "لیختنشتاین" ەوە بەڕێوە دەبرێت بە پێی یاسایەکی ناسراو، مەجلیسی نوێنەران (پەرلەمان) یشیان هەیە کە بریتییە بە پانزدە ئەندام.

٤٠٩- محەممەدی مەردۆخی

لە شاری سنە لە دایك بووە، پیاوێکی زانا و ڕۆشنبیر و قەڵەم ڕەوان، داناییکی بە وژدان و بە ئیمان. زۆر نووسراوی هەیە بە زمانی فارسی و کوردی، بەڵام فەرهەنگی مەردۆخی گەلێك بەناوبانگە و سووبەخشە لە ساڵی ١٩٧٩ دا مردووە.

٤١٠- مافیا

کۆمەڵێکی ڕێکوپێکە لە سەرەتاوە لە دورگەی (صقلیە) لەسەدەی پانزەدا پێك هاتووە بەڵام زۆرتر لە سەدەی نۆزدەدا ناوبانگی بڵاوبوەتەوە ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە سوێندیان بە خەنجەر دەخوارد کە لە یەکتر خیانەت نەکەن. کاردکانیان زۆرتر دزیو ڕێگەگری و (خاوە) سەندن و زۆر کردن بووە لە خەڵك. تا دوای کۆچی خەڵکێکی زۆری ئیتالیا بەرەو ئەمریکا ئەم کۆمەڵەیە و بە شێوەیێکی نوێ و لەسەر چەند یاسایەکی هاوچەرخ دەستیان بە جووڵانەوە کردووە، دەستەوتیپی چەکدار و پیاو کوژی زۆریان پێك هێنا بۆ قاچاخ و دزی و زۆر و تەڵەکەبازی و سەرانە سەندن، زۆرتر لە شاری نیو ئۆرلیانز و شیکاگۆ دەجووڵانەوە و ئێستاش ئەم کۆمەڵە لە وڵاتی ئەمریکادا زۆر دەستی دەڕوات و توانا و دەسەڵاتی بە ئەندازەیەکە دەتوانێت دەس بخاتە زۆر کاروباری ناو ئەمریکا و لە زۆر وڵاتانی تری دنیادا بنکە و دەستە و دایەرەیان هەیە و پێك هێناوە. زۆربەی کاروباریان بە پێی پێش کەوتنی تەکنۆلۆجیای ئەمڕۆ بەڕێوە دەچێت بەڵام بۆ دزی و قاچاغی و هیرۆشین و تلیاك و بورس بازی.

٤١١- ماهندرا

پاشای وڵاتی نیپال کەناوی مەهراجا هندرا بیربکرام بەهادور شاهە. لە ساڵی ١٩٢٠ لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٥٥ لە جێی باوزکی بە پێی یاسایەکی پاشایەتی دەستووری بووە بە شا.

٤١٢- شۆرشی ٢٣ی یۆلیۆی

ساڵی ١٩٥٢ای میصر لەیەر شەش مەرج پێك هاتووە لە دەستووری میصردا نووسراوە:

١- نەهێشتنی ئیستعمار.
٢- لەناوبردنی یاسای دەرەبەگایەتی.
٣- لەناوبردنی چەوساندنەوەی سەرمایەداری لە دەزگای دەوڵەت دا.
٤- دامەزراندن و دروست کردنی سپایەکی نیشتمانیی بەهێز.
٥- داد پەروەریی کۆمەڵایەتی.
٦- ژیان لەسەر یاسایەکی دیموکراسی.

٤١٣- بلیمەتی

بەهرەیەکە یان لە بیر و مێشکی پیاو دایە یان لە لەش و لاری ئافرەت دایە.
بلیمەت هەموو کارێك دەزانێت جگە لە خۆ تێرکردن.

٤١٤- ئەفلاتون
هەزار قوتابی دەری دابوو بۆ ئەوەی دەرس بڵێتەوە کە سەیری کرد ئەرستۆیان لەناو نییە وەستا و دەنگی نەکرد.
قوتابییەکان روویان تێ کرد و پرسیاری هۆی وەستانەکەیان لێ کرد، وتی:
- ئەگەر گوێ گرم هەبوایە دەرسم دەگوتەوە.
- وتیان: ئێمە هەزار قوتابیین.
- وتی: یەك کەسم دەوێت وەك هەزار کەس وا بێت.

٤١٥- دانایەك لە گەنجێکی پرسی:
- حەز دەکەیت سەد هەزار درهەمت هەبێت بە مەرجێک گێل بیت؟
- وتی: نەء.
- وتی: بۆ چ.
- وتی: دەترسم گێلییەکەم کارێکی وا بکات هەرچی پارەم هەیە لە ناوچێت و هەر بە گێلیش بمێنمەوە.

٤١٦- مصەددەق

ناوی محەممەد مصەددەق کوڕی میرزا هیدایەتە لە ساڵی ١٨٧٩ دا لە تاران لە دایك بووە، لە وڵاتی فەرەنسەدا زانکۆی تەواو کردووە و لە سویسرادا باوەڕنامەی دکتۆرای لە قانوون دا بەدەست هێناوە. لە ساڵی ١٩١٥ دا گەڕاوەتەوە بۆ ئێران، بووە بە مووچە خۆری دەوڵەت، بووە بە یاریدەدەری وەزیری دارایی، بووە بە فەرمانداری (ئازربایجان) دژ بە ڕژێمی شا دەستی کردووە بە جووڵانەوە. نەوتی ئێرانی لە دەست شەریکە نەوت خۆرەکانی ئیمپریالیستی رزگار کرد و میللەتی ئێران پشتیوانی لێ کرد تا توانی لە ساڵی ١٩٥٣ دا شا ڕاوبنێ و دەری بکات. ئەوە بوو شا گەیشتە بەغدا، دوای ماوەیەك لایەنگرانی دام و دەزگای ئەمریکا بە سەرۆکایەتی (زاهیدی) کودەتایەکیان پێك هێنا و شا گەڕایەوە ئێران ئەوسا مصەددەق درایە دادگا چەند ساڵێك بەند کراو پاشان ئازاد کرا بە مەرجێك لە دێیەکەی خۆی نەڕواتە دەرەوە. ساڵی ١٩٦٧ هەر لەو دێیەدا کە ناوی (ئەحمەد ئاباد)ە کۆچی دوایی کرد.

٤١٥- مەهدی

شۆڕەتی خێزانێکی ئایینیە لە وڵاتی سودان کە هەندێك لە ئەندامانی لەگەڵ رووداوە سیاسییەکانی سوودان دا جۆشیان خواردووە وەکو:
١- مەهدیی گەورە: کەدامەزرێنەری، ڕێبازی ئەم بنەماڵەیەیە کە بە جووڵانەوەی (مەهدییە) بەناوبانگە. ناوی محەممەد کوڕی عەبدوڵلایە و لەساڵی ١٨٤٣ دا لە دایك بووە، دژ بە ئیستیعماری ئینگلیز هەستاوە و بە فەرمانی ئەو کوردن پاشا کوژراوە و زۆربەی وڵاتی سودانی ئازاد کردووە.
٢- عەبدولڕەحمانی ئەلمەهدی: کوڕی محەممەد بووە لە ساڵی ١٨٨٥ کە باوکی مردووە لە دایك بووە، دەوڵەتی بریتانیا بە بارمتە بۆ لای خۆی بردووە، تا ساڵی ١٩١٤ ناوناوی (سێر)ی لە

مەلیکی بریتانیا و (پاشا)یەتیی لە مەلیکی میصردوە دراوەتێ. سەرۆکی حزبی "الأمة" بوو لە سودان، تا سەرۆکایەتیی حزبەکەی بە "ئەلصددیق"ی کوڕی بەخشیوە و لە ساڵی ١٩٥٩ دا مردووە.

٢- ئەلصددیق ئەلمەهدی: کوڕە گەورەی عەبدولڕەحمان بووە لە ساڵی ١٩١١ لە دایك بووە و کراوە بە سەرۆکی حزبی "ئەلئومەت" ولە ساڵی ١٩٥٨ دا بە پێی فەرمانی کودەتانی ئیبراهیم عەببود حزبەکە تاوێنراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٦١ دا مردووە. دوای خۆی (صادق المهدی)ی برای جێگەی گرتوەتەوە و ئێستاش سەرۆك وەزیرانی وڵاتی سودانە.

٤١٨- میتران


میتران

فرانسوا مۆریس میتران لە ساڵی ١٩١٦ دا لەدایك بووە باوکی کرێکاری هێڵی ئاسن بووە، لە زانکۆی پاریس دا بەشی یاسای تەواو کردووە، لە شەڕی دووەمی جیهان دا بەشداریی کردووە و ئەڵمانەکان بە (دیل) گرتوویانە بەڵام توانیویەتی ڕابکات و خۆی بگەیەنێتە هێزی بەرگری میللی فرانسە دژی ئەڵمانەکان کە جنرال دیگۆل بەڕێوەی دەبرد.

بوو بە سکرتێری کاروباری دیلەکانی شەڕ لە دەوڵەتی مووەقەتی دیگۆل لە ساڵی ١٩٤٥ دا، چەند ساڵێك بووە پارێزەر و بە ئەندامی پەرلەمان هەڵبژێردراوە بە نوێنەریی حزبی بەرگری دیموکراسی سۆسیالیستی کە بە سەرۆکایەتیی چەپی ناوەڕاست هەڵ دەسووڕا. کراوە بە وەزیری کاروباری شەرکەرە کۆنەکان، لە زۆر دەوڵەت دا بەشداریی کردووە و بە گەڕانەوەی دیگۆل بۆ سەرکۆماریی فرانسە رۆیشتە تایەکی تردوە دژ بە دۆگۆل و دژ بە نازادیی وڵاتی جەزایر وەستا. لە ساڵە ١٩٦٥ دا بەرامبەر بە دیگۆل خۆی بۆ هەڵبژاردنی سەرکۆماری ناودێر کرد بەڵام سەرنەکەوت. زۆربەی لایەنگرەکانی چینی گەنج و لاوە. دواجار لە هەڵبژاردنی ئەم دواییەدا بەسەر جیسکار دیستان دا سەرکەوت و بوو بە سەرکۆماری فرانسە و هێشتا هەر سەرکۆمارە.

٤١٩- میگاتون

وشەیەکە دوای تەقینەوەی یەکەمین بۆمبای هایدرۆجینی بەکارهێنراوە، واتە یەکەیەکی بەرامبەر یەك ملیۆن تەن دینامیت. ئەم وشەیە لە یۆنانییەوە وەرگیراوە، میگا واتە گەورە. هەر بەم جۆرەش وشەی میگا فۆڵت واتە یەکەیەکی کارەبایی کە بەرامبەر بێت بە یەك ملیۆن فۆڵت.

٤٢٠- مەم

محەممەد مەولوود لە ساڵی ١٩٢٧ دا لە شەقڵاوە لە دایك بووە، چیرۆکنووسێکی بە توانا و خۆهێنەر بوو، هاوکاری لەگەڵ کۆڤار و رۆژنامەکانی هەولێر، هیوا، بڵێسە، شەفەق، رۆژی نوێ، نووسەری کورد و هاوکاری دا کردووە. پێم وایە چیرۆکی (پەنجا فلس) تا ڕادەیەکی زۆر ئەم نووسەرەی ناساندبێت بە خوێنەدواری کورد. شێوەی نووسینەکەی زۆر بێ پێچ و پەنا پاراوە لە تەواوی نووسینەکانیدا (مەم)ی داناوە. لە رۆژی ١٩٨٧/٥/٨ دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

٤٢١- نەهەنگ

زۆر نەهەنگ بە فەوارەکەی سەر سەرییەوە لە دەریادا دەبینرێت، لە ڕاستیدا ئەو فەوارەیە ئاو نییە، بەڵکو هەناسەی گەرمی نەهەنگەکەیە بە توندی دێتە دەرەوە لە ئاسمانێکی سارددا.

٤٢٢- نووری سەعید

لە ساڵی ١٨٨٨ دا لە بەغدا لە دایك بووە، باوکی بازرگان بووە، لە ئەستەنبۆل زانستی سەربازیی خوێندووە و لە ١٩٠٦دا تەواوی کردووە و بووە بە ئەفسەر لە سپای عوثماني دا. لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی عەرەب دا لە سپای عوثمان کشاونەتەوە دەستیان کردووە بە رێك خستنی سیاسی سەربازی، لەگەڵ شەریف حسێن دا هاوکاریی کردووە، چووەتە ژێر فەرمانی جەنراڵ (لینبی) و پەیوەندی لەگەڵ جەعفەر پاشای عەسکەری دا کردووە دوای ئەوەی بەدیل گیراوە، پەیوەندیی بە شازادە فەیصەلەوە زۆر بووە، دوای ساڵی ١٩١٨ تا مردنی هەر لەگەڵی دا بووە، کاتێك فەیصەل بووە بە شای عیراق نووری سەعیدی کردووە بە فەرماندەی سپاو لە ساڵی ١٩٢٠ بووە بە وەزیری بەرگری تا ساڵی ١٩٣٠.

شەش جار بووە بە سەرەك وەزیرانی عیراق، یەکەمین جار ساڵی ١٩٣٠دا. دەستی لە کوشتنی مەلیك غازی دا هەبووە. دوای شۆڕشی رەشید عالی لە ساڵی ١٩٤١ دا لەگەڵ عەبدولئیلادا ڕای کردووە بۆ دەرەوەی عیراق. هەمیشە لایەنگری سوودی سیاسەتی ئینگلیز بووە تا لە چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨دا لە شۆڕشی عیراق دا لەلایەن خەڵکەوە کوژراوە.

٤٢٣- هاو هاو

ئەم ناوە لە گەرماگەرمی شەڕی دووەمی جیهانید ا بەسەر زمانی خەڵکەوە بووە، ئەو ناوەیان لە کەسێکەوە ناوە کە لە رادیۆی نازییەکان دا دژ بە بریتانیا قسەی دەکرد و پروپاگەندەی بڵاو دەکردەوە، ئەم کەسەش ناوی ولیەم جیمس بوو کە ساڵی ١٩٠٦ لە دایك بووە و کوڕی پیاوێکی ئیرلەندی بووە.

لۆرد هاو هاو دوای تێشکاندنی ئەڵمانیا لە شەڕدا گیراوە و لە تاوانی خیانەت لە ساڵی ١٩٦٤ دا خنکێنراوە.

٤٢٤- ئایا دەزانیت؟

١- دەزانیت یەك پاردە (گەزی شا)سێ پێیە؟

٢- وەکو زانراوە هەر گیانلەبەرێك دەنگێکی هەیە وەکو: نەڕەی شێر، زیڕەی پڵنگ، حیلەی ماین، کۆڕەی ئەسپ، حەپەی سەگ، زەڕەی کەر، بۆڕەی گا، قوولەی کەڵەشێر، گارەی مریشك، لووشکەی هێستر، کیفەی مار، بارەی مەڕ و قاڕەی بزن. بەڵام (زەرافە) هیچ جۆرە دەنگێکی نییە.

٣- دەزانیت فیل لە حوشتر خێراترە؟ حوشتر لە سەعاتێك دا دە کیلۆمەتر دەبڕێت، بەڵام فیل ٣٠ کیلۆمەتر.

٤٢٥- سەمیر ئەمیس



سەمیرئەمیس

شاژنی ئاشوورییەکان بووە، لە ساڵی ٨٠٠ی پێش زایین دا، ناودەکەی بە ئاشووری "سیمورامات" بووە و خەڵکی شاری دیمەشق بووە، سەر لەشکرێکی سپای ئاشووری خبزۆنار حەزی لێ کردووە و فڕاندوویەتی بە رێکەوت پاشای ئاشوورییەکان کە لاوێکی جوان خاس و ئازا و زیرەك بووە چاوی پێ دەکەوێت و حەزی لێ دەکات و مارەی دەکات.

سەمیر ئەمیس زۆر دەخوێنێتەوە گوێی مێردەکەی بۆ داگیرکردنی وڵاتانی دی و بەربڵاوکردنی دەسەڵات و هەمیشە دەی گوت: "شەهەنشاها ! کەس دەرەفەتی تۆ نایەت ! تۆ دەتوانیت بە سپاکەتەوە بگەیتە ئەوپەڕی دنیا و منیش بە دواتەوەدم تا شارستانییەك پێك بهێنین هەتا هەتایی باس بکرێت".

ئەوێک خیزۆ خۆی دەگەیەنێتە کۆشکی شا. شا و شاژن هەستی پێ دەکەن. شا پەلاماری دەدات و دەبێت بە شەڕیان و خیزۆ دەکوژێت، کە دەگەڕێتەوە لای سەمیرنەمیس لە تاریکایی شەودا مێردەکەی ناناسێت و وا دەزانی خیزۆیە، خەنجەرێکی لە ورگی دەدا و دەی کوژێت.

٤٢٦- قۆزاق

وشەی قۆزاق وشەیەکی تورکییە، بەو تاقمانە گوتراوە کە لە چەند رەگەزێک پێک هاتبوون و لە خوارووی رۆژهەڵاتی رووسیادا دەژیان، کار و پیشەیان تەنیا شەڕکردن و سوارچەکی و کێشەی هەرا بووە.

کاتێک شۆڕشی بەلشەفیک لە رووسیادا دەستی پێ کرد، زۆر لەم قۆزاقانە هاوکاریان لەگەڵیانا کرد و زۆریشیان لەگەڵ سپای سپیدا دژ بە بەلشەفیک وەستان، لە ئاکام دا کە سپای سپی بەزی زۆرتر لە ٣٠ هەزار قۆزاقیش لە وڵاتانی ئەورووپادا بڵاوبوونەوە. ئێستا چ لە یەکیەتی سۆڤیەتی دا و چ لە ئەورووپادا ناوی قۆزاق نابینرێت و لەوە دەچێت چاك تاواونەتەوە !.



٤٢٧- ئەندیرا گاندی:

کچی جەواهیر لال ئەهرۆیە و شووی کردووە بە هاوپۆلێکی خۆی لە زانکۆیدا بەناوی (ئەیرۆز گاندی) کاتێک کە لە بریتانیا پێکەوە خوێندوویانە و باوکی ئەم شووکردنەی لا خۆشنە بووە. لە ساڵی ١٩٤١ دا لەگەڵ مێردەکەی دا بەندکراون. ساڵی ١٩٦٤ مێردەکەی دڵی وەستاوە و مردووە.

خاتوو ئەندیرا بووە بە سەرۆك وەزیرانی هەموو هیندستان. لە ساڵی ١٩٨٥ دا بە دەستی کابرایەکی سیك بە گوللە کوژرا.

٤٢٨- گوڵی یاخە چۆن داهاتووە؟

لە ساڵی ١٨٤٠ دا کاتێك شازادە ئەلبەرت کە شازادەیەکی ئەڵمانی بووە دەچێت بۆ وڵاتی ئەڵمانیا بۆ مارەکردنی شازنە ڤیکتۆریا. ڤیکتۆریا بە دەستە گوڵێکەوە دەرواتە پێشوازییەوە ئەویش بۆ رێزی ڤیکتۆریا بە چەقۆ کونێك لە یەخەی چاکەتەکەی دەکا و گوڵێك لەو دەستە گوڵەی ڤیکتۆریا یە یەخەی دا دەکا. جا لەو رۆژەوە گوڵ بە یەخەکردن دا داهاتووە ؟!

٤٢٩- مێزی خڕ:

بۆ یەکەمین جار شا ئارثەری پاشای بریتانیا مێزێکی دروست کرد بە شێوەیێکی خڕ، تا سواری نازاکان و شمشێر وەشێنە دڵسۆزەکانی لە دەوری دابنیشن. جا بەشداربوون لەو مێزەدا جێگە و رێزێکیتایبەتی هەبووە لەو سەردەمەدا. ئیتر لەوەشەوە هەندێك مێزی کۆبوونەوە سیاسییەکان لە نێوان دەوڵەتان دا یان نوێنەری دەوڵەتان دا خڕبووە.

٤٣٠- بۆچی دەستی چەپ بەرز دەکرێتەوە؟

لە زۆر وڵاتان دا دەبینرێت کاتێك کەسێك بە کتێبی پیرۆزی ئاینی لە دادگاکان دا سوێند دەدرێت دەستێکی دەخاتە سەر کتێبەکە و دەستی چەپیش بە لەپی کراوەوە بەرز دەکاتەوە. جا جاران وەکو ئێستا نەبوو کە بە ئاسانی بزانرێت کابرا رەوشت چاکە یان نا، هەر کەسێك بڕۆیشتایە زیندانەوە ناوی لەپیان خاڵ لی ئەدا تا بناسرێت، بۆیە لە دادگادا لەپی پان دەکردەوە کە بزانرێت خاوەن پیشەی نا پەسەند نەبووە و خاڵ لە لەپیدا

نییە، ئەوسا شایەتییەکەی بە ماقووڵ وەردەگیرا. جا ئەم جووڵانەوەیە تاکو ئێستا ماوەتەوە، بەڵام دیارە نەک بۆ سەیرکردنی خاڵی ناو لەپ.

٤٣١- سۆربۆن:

ناوی سۆربۆن لەدنیای ئەمڕۆدا ناسراوە ڕێزی ئەم زانکۆیە لە زۆر وڵاتان دا پایە و شوێنێکی تایبەتی هەیە. ئەم زانکۆیە سەرەتا لە سەردەمی لویسی نۆهەم دا بۆ قوتابیانی هەژار دروست کراوە کە زانیاریی ئایینی تێدا بخوێنن لای قەشەیەك کە ناوی "ڕۆبێر سۆربۆن" بوو. پاشان بوو بە کۆلیجی ئاداب و زانیاری و لە ڕاستیدا بە کاکڵی یەکەمی زانکۆی پاریس دەژمێردرێت.

٤٣٢- ئایا دەزانیت؟

١- وشەی دینار لە سەرچاوەوە لاتینییە و دەگوترا دیناریۆس.
٢- وشەی درهەم یۆنانییە و پێی دەگوترا دراخما.
٣- وشەی (فلس) یۆنانییە و پێی دەگوترا فولیس.
٤- قرش وشەیەکی ئەڵمانییە پێی دەگوترێت گروشن.

٤٣٣- ئەوە بزانە کە:

١- حەزرەتی عیسا لە ساڵی چوار یان شەشی پێش زایین دا لە دایك بووە، ئەم ڕاستییەش لە دواییدا دۆزراوەتەوە و ساڵ ژمێریان ڕاست نەکردوەتەوە و هەروا ماوەتەوە.
٢- کۆنفوشیۆس لە ساڵی ٥٥٠ پێش زایین لە وڵاتی چین دا لە دایك بووە و لە ساڵی ٤٧٨ پ. ز مردووە.
٣- بوودا لە ساڵی ٥٦٤ پ. ز لە وڵاتی هیندستان دا لەدایك بووە و لە ساڵی ٤٨٣ پ. ز دا مردووە.







کونفوشیوس



سوقرات

٤٣٤- دیسان سوقرات

بڕیاری مردنی سوقرات درا بە دوو تومەتەوە:

١- کە خوای شار ناپەرستیت و پەیڕەوی خوایێکی دیکەیە.
٢- لاوان و گەنجانی وڵات گومڕا دەکات و لە ڕێگای ڕاست لایان دەدات.

لە ڕۆژی کوشتنی ئەم فەیلەسووفەدا خەڵکێکی زۆر گلێر دەبنەوە، لەبەر دەرگای بەندیخانەکەی سوقرات دا سوقرات بانگ دەکات: فەرموون بم کوژن.

کابرای پاساوڵی بەندیخانە بەدەم پرمەی گریانەوە، کاسە بە دەست دەچێتە ژوور، بە

سوقرات دەڵێ: توخوا ئەگەر لە من نارەحەت بیت !. من چ کارەم ؟ گوناهی مەرگی تۆ بە ئەسکوردی خەڵکێکی ترەوەیە، ئەو خەڵکەش وا لەبەر دەرگای بەندیخانەکەدا کۆبووینەوە هەموو لە پرمەی گریان دەدەن !

سوقرات جامی ژەهراوی بەسەردەوە نا، پاش ماوەیەك چاوی لە بزووتنەوەی کەوت و مرد.

٤٢٥ ئەوەبزانە کە ناوچەی (بووکراع) لە سارای رۆژاوای وڵاتی مەغریب دا کە بە دەستی ئیمپریالیستی ئیسپانیاوەیە زۆرترین فۆسفاتی دونیای لییە کە ٢٥٠ کیلۆمەتری چوار گۆشە دەبێت.

٤٢٦ لە سەرەتاوە هیچ پیتێکی نووسینی عەرەبی خاڵی لەسەر نەبووە، تا لە سەردەمی حەجاجی کوڕی یوسف دا لەلایەن "نەصرری کوڕی صاعم"ەوە خاڵی لەسەر دانرا بە پێی فەرمانەکانی حەجاج.

٤٢٧ ئەو زمانەی لە وڵاتی حەبەشە دا گفتوگۆی پێ دەکرێت زمانی ئەم هری پێ دەڵێن.

٤٢٨ زمانێك کەشێوەی رەسمی هەبێت و گفتوگۆی دەوڵەتی پێ بکرێت لە وڵاتی ئەندەنوسیادا زمانێکە بەناوی "بهاسا".
تێکڕا ئەندەنوسیا ٣ هەزار دورگەیە گەورەترینیان بۆرنیۆ، سۆمەترا و جاوەیە. نزیکەی ٢٥٠ ساڵ ئیستیعماری هۆڵەندی تێیدا ماوەتەوە. پایتەختەکەی جاکارتایە. یەکەمین هەڵبژاردنی دەنگ دان لە ساڵی ١٩٥٥ ز دا کرا و "ئەحمەد سوکارنۆ" بوو بە سەرەك کۆمار، ١٠٧ ملیۆن کەسی تێدا دەژی کە لە سەدا نەوەدیان موسڵمانن. دەوڵەمەنترین وڵاتە لە بارەی دار و تەختەی ئەلتیك و ئەبەنۆس و جۆرەکانی ترەوە.

٤٢٩ ئەسکەندەری ماکەدۆنیا لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا رۆژهەڵاتی داگیرکرد، لە چواردە ساڵیدا تۆزترین و چەمووشترین ئەسپی رام کرد بۆسیفالاس بوو، هەر بە سواری ئەم ئەسپەوە لە تەواوی شەڕەکانیدا بەشداری کردووە. لە وڵاتی هیندستان دا، لە شەڕێك دا ئەسپەکەی کوژرا، گەورەترین پرسەی بۆ دانا شارێکیشی بەناوی ئەسپەکەوە دروست کرد. ئەوەی زانراوە ئەسکەندەر خۆی لە شاری بابل لە ساڵی ٣٢٤ی پێش زایین لە تەمەنی سی و دوو ساڵیدا بە نەخۆشیی تا مردووە.

٤٣٠ ئەوە بزانە کە ژمارەی بڕگەکانی ملی زەرافە و حوشتر و مرۆڤ و هەر دڕندەیەکی شیردەر لە حەوت بڕگە زیاتر و کەمتر نییە، هەر چەند ملیان درێژ یان کورت بێت ژمارەی بڕگەکان هەر حەوتن.

٤٣١ لە وڵاتی سویسرادا چوار زمان قسەی پێ دەکرێت:
ئەڵمانی، فڕەنسی، ئیتالیایی، رۆمانی. تێکڕای سویسرا شەش ملیۆن کەسی تێدا دەژی، پایتەختەکەی شاری "برن"ە و شارە گەورەکانیشی زویریخ، بازل، جنێڤە.

٤٣٢ گۆڕەپانی ترەفلگار:
ئەم گۆڕەپانە لەشاری لەندەن بەناوی ئەو شەڕە دەریاییەوە ناونراوە کە لەنێوان سوپای دەریایی فڕانسە و بەریتانیاوە ڕوویداوە، لەم شەڕەدا ئەدمیرال نیلسۆن فەرماندای سوپای بەریتانیا بووە کە سوپای دەریایی فڕانسەی تێك شکاندووە.

٤٤٣- تاكو ئێستا گەورەترین بینایەك كە دروست كراوە دیواری چینە كە ٢٤٠٠ كیلۆمەتر درێژە و لە زۆر جێگەی دا بەرزایی لە ٢٠ پێ كەمتر نییە و هەر سەد گەز و قوللەیەكیان بۆ كردووە.

٤٤٤- هەندێ ماسی هەیە بەناوی ماسیی زێڕین لە شەش مانگ زیاتر ناژین، بەڵام ماسیی سمێڵە (شەبوط) لە ٢٤٠ ساڵ زیاتر دەژیت.

٤٤٥- وەكو زانراوە وڵاتانی دونیا لە كاتی مردنی كەسێكی ناسراودا یان ڕێزلێ نانی سەرۆكی دەوڵەتێك لە كاتی مردنیدا بەیداخیان دادەهێننەوە، بەڵام تاكە وڵاتێك كە بەیداخ دا نانەوێنی وڵاتی سعوودییە چونكە لە ئاڵاكەی نووسراوە: لا إله الا الله محمد رسول الله.

٤٤٦- دەبینرێت كاتێك پاشایەك یان سەرۆك كۆمارێك دەڕواتە وڵاتێك، قاڵیی سوور لە ژێر پێیدا دادەخەن. چونكە ڕەنگی سوور لە سەردەمی كۆنەوە ڕەنگێكی شاهانە بووە، فیرعۆنەكان و یۆنان و فینیقییەكانیش هەر ڕەنگی سووریان بە ڕەنگێكی ڕێز لێ گیراو و بەنرخ داناوە، جا تاكو ئێستای ئەمڕۆدا ماوەتەوە.


كاغەزی یاری

٤٤٧- ئەوەش بزانە كاغەزی یاری "قومار" لە سەرەوەتاوە بۆ قومار كردن دروست نەكراوە، بەڵكو ژنی مەهراجایەكی هیندی دروستی كرد كە مێردەكەی ئەوەندە یاری بە ڕیشی نەكات، بەڵكو بەو كاغەزانەوە خەریك بێت.

٤٤٨- بزانە كە ڕەنگی نەوت لە هەر وڵاتێك دا جیاوازە.
ڕەنگی نەوتی وڵاتی مەكسیك ڕەشە، نەوتی سەرەوەی ئەفریقیا قاوەیی و تا ڕادەیەك بەرەو زەردە. ڕەنی نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش لە قاوەیییەوە دەست پێ دەكات تا ڕەنگی ڕەش.

٤٤٩- **قەیسەر**
كاسكا یەكێك لە پیاوە گەورەكانی ڕۆما لە سەردەمی قەیسەردا. ئەم پیاوە یەكەمین كەس بوو كە لە پشتەوە خەنجەری لە یۆلیۆس قەیسەر دا، بەدوای ئەودا كاسیوس ناوێك. قەیسەر سەیری كرد وا پرۆتوس كە خۆی گەورەی كردبوو ئەویش خەنجەری بە دەستەوەیە ڕووی تێ كرد، گوتی:" هەتا تۆیش.. ئەی پرۆتوس ؟!" گشتیان ٢٣ خەنجەریان پێ دا مالی.

٤٥٠- **سێو**
دەگێڕنەوە كە سێ لاو دەڕۆنە خوازبێنی كچە پاشا، پاشاش مەرجێكیان بۆ دادەنێ كە هەر كەسێك شتێكی نایابی وای هێنا لە وڵاتی ئەوان دا نەبێت واتە ئەویان كچە پاشای زۆرتر خۆش دەوێت وەدی داتێ، سێ كوڕەكە دەكەونە ڕێ هەر یەكە بە وڵاتێك دا هەتا لە وڵاتی هیندستان دا یەكتر دەگرنەوە، یەكێكیان ئاوێنەیەكی جادوویی هێنا، ئەوی تریان قاڵییەكی جادوویی، سێیەمیان سێوێكی هێنا. دەڵێن با بزانین كچە پاشا لە چی دایە؟

ناوینە هەڵ دەخەن سەیر دەکەن کچە پاشا گەڵێك نەخۆشە ! سواری ڤالی جادوویی دەبن و دەگەنە کچە پاشا. سێیەمیان سێوەکەی دەداتێ و کچە چاك دەبێتەوە. پاشان لەسەر کچە لێیان دەبێت بە هەرا، تا شکات دەبەنە لای زانیارێك زانیار دەڵێت.

کچە بۆ خاوەن سێوەکەیە، چونکە ئێوە هەر یەکە شتی خۆتان بۆ ماوەتەوە و تەنیا یەك جار سوودتان لێ وەرگتووە، کابرای خاوەن سێو هەر سێوێکی هەبووە لێی خوراوە.

٤٥١- ئەم شارانە تا ساڵی ١٩٧٠ ئەوەندە کەسەی تێدا دەژی:

| | |
|---|---|
| ١- قاهیرە | ٤,٦٦١,٠٠٠ کەس |
| ٢- ئەسکەندەرییە | ١,٧٦٠,٠٠٠ کەس |
| ٣- بەغداد | ١,٧٥٠,٠٠٠ کەس |
| ٤- تۆکیۆ لە ژاپۆن | ١٤,٧٧٠,٧٢٧ کەس |
| ٥- نیویۆرك لە ئەمریکا | ١٤,١١٤,٩٢٧ کەس |
| ٦- لەندەن لە بریتانیا | ٧,٩٤٨,٣٧٠ کەس |
| ٧- ئۆزاکا لە ژاپۆن | ٧,٧٨١,٠٠٠ کەس |
| ٨- پاریس لە فرانسە | ٧,٣٦٩,٢٨٧ کەس |
| ٩- شەنگهای لە چین | ٦,٩٧٧,٠٠٠ کەس |
| ١٠- بۆینس ئایرس لە ئەرژەنتین | ٦,٧٦٢,٦٢٩ کەس |
| ١١- مۆسکۆ لە یەکیەتی سۆڤیەت | ٦,٥٦٧,٠٠٠ کەس |
| ١٢- لوس ئەنجلس لە ئەمریکا | ٦,٤٨٨,٧٩١ کەس |
| ١٣- شیکاگۆ لە ئەمریکا | ٥,٩٥٩,٢١٣ کەس |
| ١٤- سان باولو لە برزایل | ٥,٢٨٣,٠٠٠ کەس |
| ١٥- بۆمبای لە هیندستان | ٤,٧٨٤,١٢٦ کەس |
| ١٦- کەلکەتا لە هیندستان | ٤,٧٠٢,٢٩٨ کەس |
| ١٧- مەکسیکۆستی لە مەکسیك | ٤,٦٢٩,٦٩١ کەس |
| ١٨- ئاخن لە ئەڵمانیا | ٤,٢٥٩,٢٣٠ کەس |

٤٥٢- چای:

دوو جۆر چایی هەیە، چایی رەش و چایی سەوز، هەر دووکیشیان درەختن بەڵام چۆنیەتی ئامادەکردنەکەی جیاوازە.

٤٢٥- چای

دوو جۆر چایی هەیە، چایی رەش و چایی سەوز، هەر دووکیشیان درەختن بەڵام چۆنیەتی ئامادەکردنەکەی جیاوازە.

چایی بە چەند قۆناغێك دروست دەکرێت؛ دوای کردنەوەی گەڵاکەی لە دار وشك دەکرێتەوە، گەڵاکە دەبێ لە ژووردا و بە ئەندازەیەکی تایبەتی زانرا و وشك بێتەوە. دوای وشك بوونەوەی بە هۆی دەزگای تایبەتییەوە ئەو گەڵایانە ونجڕ ونجڕ دەکرێت و زۆرتر لە چوکوڵی دەکات تا گەڵا.

جا لێرەدا بە دوو جۆر چایی دروست دەکرێت، جۆرێکی وەك هەویری لێ دەکرێت و دەیترشێنن "تخمیر" کە ئەم چاییە رەشەیە خۆمان دەیخۆینەوە و جۆرێکی تر بە شێوەی هەڵم دەمێنێتەوە هەر وەکو رەنگی سروشتی خۆی.
وڵاتانی چین، هیندستان، مالیزیا، ئەندەنۆسیا و سیلان زۆربەی چای جیهان بەرهەم دەهێنن.

٤٥٣- ئەوە بزانە کە یەکەمین وڵات جەژنی کرێکارانی ئەنجام داوە ئەمریکا بووە ئەمەش لە ساڵی ١٨٨٦ی زایین دا.

٤٥٤- دیسان کیلۆپاترە:
شاژنە کیلۆپاترە لەسەر وەسیەتی باوکی یەکەمین جار کە شووی کرد شووی بە براکەی کرد ناوی بەتلیمۆسی ١٣ بوو، دووەمین جار شووی بە (یۆلیۆس قەیسەر)ی قەیسەری رۆما کرد کورێکی لێ بوو بەناوی بەتلیمۆسی ١٤، سێیەمین جار شووی بە مارك ئەنتۆنیۆ کرد کە ئەویش دەسەڵاتدارێکی ئیمپراتۆریەتی رۆما بوو کورێکی لێ بوو لەگەڵ دوو کچ دا کە دوانە بوون.

٤٥٥- بزانە دەریای رەش تورکەکان ناویان ناوە رەش لەبەر زۆریی هەور و باران و لێزمەی زۆر.

٤٥٦- وەکو زانراوە گەڕان و سوور خواردنی خوێن لە لەش دا دوو جۆرە سووڕی بچووك و سووڕی گەورە، جا خراپ نییە بزانیت یەکەمین جار کە سووڕی بچووکی خوێن لە لەش دا هەستی پێ کراو لە باری زانیارییەوە دانی پیانرا لەلایەن "ئیبن نەفیس"دوە بوو، هەروەها سووڕی گەورەی خوێن لەلەش دا لەلایەن ولیەم هارفییەوە بوو.

٤٥٧- وەرزشی (جۆدۆ) لە سەرەتاوە لە وڵاتی چین لەلایەن پیاوەکانی ئاینییەوە داکەوتووە، چونکە باوەڕیان بە چەك و چەقۆ و تیغ و شمشێر نەبووە. ئەو وەرزشە هەمووە سەد ساڵ نابێت کە لە وڵاتی ژاپۆن دا بڵاوبوەتەوە.

٤٥٨- کاتێك پێغەمبەری خوا (ص) لە مزگەوت دا خوتبەی بۆ موسڵمانان دەدا لە بڵندترین پلەدا دەوەستا دوای مردنی پێغەمبەر، حەزرەتی ئەبو بەکر پلەیەك هاتە خوارەوە حەزرەتی عومەریش لە وەستان دا پلەیەکی دی هاتە خوارەوە، بەڵام حەزرەتی عوثمان بۆ خوتبەدانی مزگەوت رۆیشتەوە سەر یەکەمین پلە.



٤٥٩- ئەڵماس
وەکو زانراوە ئەڵماس یەکێکە لە گرانترین بەرد، ئەم بەردە نایابەش رەنگی زۆرە، ئەڵماسی رۆشن رەنگی ئاو، ئەڵماسی شین، ئەڵماسی سوور، قاوەیی، سەوز، هەتاوەکو رەنگی رەشیشی هەیە، بەڵام لە هەموویان نایاب ترو دەگمەن تر رەنگە سەوزەکەیانە.

٤٦٠- ئەمریکا:
وڵاتی ئەمریکا لە پەنجا ولایەت پێك هاتووە، لە سەرەتاوە تا ساڵی ١٧٨٩ گشتی تێکڕا ١٣ ولایەت بووە و چەند ولایەتێکی تریشی پێوە چەسپاوە لە ئاکامی شەڕ و شۆڕ و پێکهاتنەکان دا. بەڵام زۆر لەو پەنجا ولایەتەش بە پارە سەنراوە وەکو: پانزدە ولایەتی ئالاسکا و سیانزە ولایەتیشی لە ساڵی ١٨٠٣ دا بەرامبەر ١٥ ملیۆن دۆلار لە فرنسە وەرگرتووە و ولایەتی فلۆریداش لە ساڵی ١٨١٠ ز ئیسپانیا بەرامبەر بە ٥ ملیۆن دۆلار لێی کشاوەتەوە.

٤٦١- ئایا دەزانی؟
مردنی پیاوێکی هەرە دەوڵەمەند زۆر گرفتاری قەرز و قوڵەی کەس و کارەکانی جێبەجێ دەکات.
- ڕووبەری خاکی کوویت ١٥ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
- بولبول هەرگیز لە قەفەس دا هێلکە و بەچکە ناکات ئەگەر هەر چۆنێك بەخێو بکرێت.
- سەگ کە ماندوو دەبێت لە زمانییەوە عەرەق دەڕێژێ چونکە پێستی سەگ عەرەق دەرنادات.
- هێلکەی گەنیاو دەکەوێتە سەر ئاو چونکە کە گەنیا گازی تێدا زۆر دەبێت و وەکو تۆپی لێ دێت.
- بۆیە بە حەزرەتی عەلی دەڵێن " کرم الله وجهه" چونکە هەرگیز کڕنووشی بۆ بت نەبردووە و بە منداڵی موسڵمان بووە.

٤٦٢- دەوڵەمەنترین وڵات لە کانی یۆرانیۆم وڵاتی کەنەدایە کە ١٥٠ هەزار تۆنی هەیە، دووەم وڵات ئەمریکایە کە ١٤٠ هەزار تۆنی هەسە، سێیەم وڵاتی جنووبی ئەفریقیایە کە ٢٥ هەزار تۆنی هەیە.

٤٦٣- بەڵێنی بلفۆر



ڕۆژی ١٩١٧/١١/٢ لۆرد بلفۆرد بە نامەیەك بە لۆرد ڕۆچیلدی ڕاگەیاند کە جوولەکەیەکی بریتانیایی بوو کە دەوڵەتی ئینگلیز دەوڵەتێکی جوو لە خاکی فەلەستین دا دروست دەکات. ئەو بەڵێنەش لەسەر حیسابی ماڧ میللەتی فەلەستین ئەنجام درا.

٤٦٤- دەزانی کەوا زەرافە بە زمانی گوێی پاك دەکاتەوە؟
بۆ زانین: زمانی زەرافە ١٧ ئینج درێژە.

٤٦٥- ئەگەر بنواڕیتە مەیموونان لە باخچەی گیانلەبەران دا دەبینیت یەکتر ئەوژنن، لە ڕاستیدا بە دوای دانەی خۆیدا دەگەڕێن کە لەشیان دەری دەدات.

٤٦٦- ئەخۆشیی (بلهارسیا) دوژمنی سەرسەختی مرۆڤ بووە و دەبێ، ئەم نەخۆشییە لە میصردا زۆر کەسی کوشتووە لەوانە گۆرانی بێژی بەناوبانگ (عبدالحلیم حافظ)، ناوەکەشی ناوی ئەو دکتۆرە ئەڵمانییەیە کە ساڵی ١٨٦٢ دۆزییەتەوە.

٤٦٧- بێ گومان کلکی تاووس گەلێك ڕەنگین و جوانە بەتایبەتی کە پەخش و بڵاوی دەکاتەوە بۆ خۆنواندن بەرامبەر مێنگینە تاووس. جا ئەو پەڕە ڕەنگاو ڕەنگە لە کلکی تاووسەوە دەرنەچووە بەڵکو لەدوای بڕگەی بڕبڕەی پشتییەوە دەردەچێت و خەڵکیش وا دەزانن ئەو پەڕانە لە کلکییەوە ڕواوە بەڵام وانییە.

٤٦٨- درترین جۆری تیمساح ئەوانەن کە لە ناوی سوێردا دەژین و زۆرتر لە وڵاتانی هیندستان، مەلایۆ، بورما و ئوسترالیادا هەن. بە گشتیش (٢٤) جۆر تیمساح لەدونیادا هەیە. ئەوەش بزانە کە مێشکی تیمساح زۆر بچووکە هەر ئەوەندەی پەنجە کەڵەی مرۆڤ زیاتر نابێت.

٤٦٩- منداڵترین ژنێك تاكو ئێستا كە زاوە ژنێك بووە تەمەنی پێنج ساڵ و هەشت مانگ و خەڵكی وڵاتی پیرۆ بووە كە لە ساڵی ١٩٣٩ دا ئەم كچۆڵەیە منداڵێكی بووە.

٤٧٠- باران لە زۆر وڵات دا زۆرە، لە زۆر وڵاتیش دا کەم دەبارێ، جا بۆ زانین: دورگەکانی هاوای لە ساڵێك دا ٤٧٣ ئینچ بارانی لێ دەبارێت و لە سیرا بانجیی هیندستان ٤٥٠ ئینچ دەبارێت، ئەمەش ڕادەی بارینی هەندێ وڵاتە:

لەندەن ٢٤ ئینچ "گرێ"

ئەدینبرە (ئیرلەندە) ٢٧ گرێ.

ئۆتاوا (كەنەدا) ٣٤ گرێ.

نیویۆرك (ئەمریكا) ٤٠ گرێ.

مەدرید (ئیسپانیا) ١٧ گرێ.

پاریس ٢٢ گرێ.

٤٧١- خالیدی کوڕی وەلید سێ مانگ بووبووە ئیسلام لە شەڕی مونتەدا بەشداری کرد کە لەنێوان ئیسلام و سۆپای رۆم دا رووی دا، لەو شەڕەدا سەرکردەی سوپای ئیسلام زەیدی کوری حارثە کوژرا دوای ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتالب و عەبدوڵلا کوڕی ڕەواحە بوون بەسەر کردە ئەوانیش کوژران، دوای کوشتنی ئەو دوانە خالیدی کوڕی وەلید فەرماندەی سوپای ئیسلامی گرتە دەست و لە ڕووی زیرەکییەوە توانی سوپای ئیسلام بکشێنێتەوە بە کەمترین کوشتار، وئەمەش بزانە سوپای ڕۆمەکان ٦٦ ئەوەندەی سوپای ئیسلامەکان بوو لەلایەن زۆرییەوە.

٤٧٢- مار هەر کە گەورە بێت و ئەوزەبکات کاژەکەی بە لەشی تەنك دەبێت، جا ئەو کاژەی فرێ دەدا، مەرجیش نییە لە ساڵێك دا یەك جار كاژ فرێ بدات بەڵكو بە پێی چۆنیەتیی زل بوونی لەش و قەوارەیەتی.

٤٧٣- **سێگۆشەی مەترسی**

ناوچەیەکە بە ناوی پەرمۆدا کەوتوەتە رۆژهەڵاتی ئەمریکاوە زۆر کەشتیی و فڕۆکەی تێدا گوم بووە و تا ئێستا نەدۆزراونەوە.

٤٧٤- ئەگەر هەر کەسێك ڕۆژی چوار پاکەت جگەرە بکێشێت، لە ماوەی پەنجا ساڵ دا دەکات بە درێژیی ١٤٦ کیلۆمەتر جگەرە، چونکە:

هەر جگەرەیەك ١٠ سانتیمەترە

پاكەتێك ٢٠ جگەرەی تێدایە

٢٠ × ١٠ = ٢٠٠ سانتیمەتر واتە ٢ مەتر

٢ × ٤ = ٨ مەتر هەر ڕۆژێك

۸ × ۳٦٥ =۲۹۲۰ مەتر لە ساڵێك دا.
۲۹۲۰ × ٥۰ = ۱٤٦۰۰۰ مەتر لە پەنجا ساڵ دا
۱٤٦۰۰۰ ÷ ۱۰۰۰ = ۱٤٦ کیلۆمەتر.
بۆ ئاگاداری: نێوان شاری سلێمانی و کەرکووك ۱۱۰ کیلۆمەترە.

٤٧٥- گرانترین خوری لە دونیادا خوریی وڵاتی کشمیرە کە هی ئاژەڵێکە لە کەژەکانی تیبەت دادەژی. هەروەها خوریی موهیرە کە هی مەڕێکە بە مەڕی تورکی (ئەلانجورا) بەناوبانگە، چاکترین خوری هی چوار پێیە کە بەناوی لاما.

٤٧٦- طاریقی کوڕی زیاد توانی رۆژی نۆزدەی گەلاوێژی ساڵی ۷۱۱ی زایین دا لە تەنگەبەری نێوان ئەفریقیا و ئیسپانیاوە بپەڕێتەوە و لە مانگی رەمەزانی ۷۱۲ ز مووسا کوڕی نوصەیر لەگەڵ ۱۸ هەزار شەڕکەردا پەڕییەوە بۆ یارمەتیی طاریق.


ئەفسانەی شەهرەیارو شەهرەزاد

٤٧٧- ئەفسانەی شەهرەزاد و شەهرەیار لە کتێبی (هەزار و یەك شەوە) دا باسی ئەوە دەکات کە شەهرەیار هەموو شەوێك کچێکی مارە دەکرد و بەیانیدا دەی کوشت. وا دیارە ئەو ژن کوشتنە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خیانەتی یەکێك لە ژنەکانی کە لە وەختی خۆیدا لە شەهرەیاری کردووە.

٤٧٨- ئاسن
هەندێك خواردن ئاسنی تێدایە و ئەو ئاسنەش بۆ مرۆڤ زۆر پێویستە. قەرنابیت لە رووی بوونی ئاسنەوە زۆر دەوڵەمەندە، هەر ۱۰۰ گرام قەرنابیت ٤۰ ملیگرام ئاسنی تێدایە ۱۰۰ گرام برنج یان گەنم یان جۆ ٥ تا ۸ ملیگرام ئاسنی تێدایە ۱۰۰ گرام جەرگ ۱۰ ملیگرام و ۱۰۰ گرام سپێناخ ۲٥ ملیگرام ئاسنیان تێ دایە.

٤٧٩- ژن هێنانی بە کۆمەڵ:
بێش ئیسلام هەشت نۆ پیاو پێکەوە بڕیاریان دەدا ژنێك بهێنن، هەر کە ئافرەتەکە منداڵی دەبوو ئەو بڕیاری دەدا باوکی منداڵەکەی کێیە و منداڵەکە لە کامیانە.

٤٨٠- وەکو زانراوە لە ساڵی ٦۲۹ ز لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا، عەمری کوڕی عاص وڵاتی میصری بەدەست هێناوە و لە دوو کەڕەت دا ماوەی ۱۱ ساڵ لە میصردا فەرمانڕەوایی کردووە. لە زەمانی حەزرەتی عوثمان دا لە میصر دوور خراوەتەوە، دوای هاتنە سەرکاری معاویە دووبارە بووە بە فەرمانڕەوای میصر و دوو ساڵ بەردەوام بووە ئنجا مردووە.

٤٨١- لـه سـەردەمی فیرعۆنـەکان دا بـۆ بـیرەوەری لـه بـەردی رەق و پتـەو کێلیـان دروسـت دەکـرد و باسـی رووداوەکانیان لەسەر هەڵ دەکەند. ئەمڕۆ ئەو کێلانە هەندێکیان ماونەتەوە:

له ئیتالیادا ١٢ دانه

له فرانسەدا ٤ دانه

له ئەستانبۆل دا ٢ دانه

یەك دانه له شاری لەندەن

یەك دانی له شاری نیویۆرك

له شاری میصر ٥ دانه ماوەتەوە.

٤٨٢- زانایێکی کیمیاگەری دەری خستووه کە لەشی مرۆڤ ئەم چەندە مادانەی تێدایە:

١- ئاسن ئەوەندەی حەوت بزماری لێ دروست بکرێت.

٢- بەزوپیو، ئەوەندەی پێنج کیلۆ مۆمی لێ دروست بکرێت.

٣- زوخاڵ، کە ٦٥ دەرزەن قەڵەمی رەشی لێ دروست بکرێت.

٤- فسفۆر: بە ئەندازەی ٨٢٠ هەزار دانەی شقارتە.

٥- خوێ: ٢٠ کەوچکی بچووك.

٦- شەکر: پەنجا کیلۆ.

٧- ئاو: ٤٢ لیتر.

٤٨٣- ئەزانی "باز" خێرایی ٣٥٠ کیلۆمەترە له سەعاتێك دا، جا بۆیە دەستە مۆی دەکەن و فێری راوپێ کردنی دەکەن.

٤٨٤- مانگی هەنگوین

یەکەمین مانگی ماڵداری و ژن خوازی پێی دەگوترێ مـانگی هـەنگوین و بنچینەی ئـەم نـاوه لـه میللەتـەکانی بەشـی سـەردوەی ئـەوروپاوه وەرگیراوە، چونکه لـەو مانگـەدا شـەرابێکیان بـه میوانـان دەدا کـه لـه هـەنگوین دروست دەکرا، جا بۆیە ناونراوه مانگی هەنگوین.

٤٨٥- شاخی ئەفریقیا وشەیەکی سیاسییە کە سیاسەت – کاران بەکاری دەهێنن. شاخی ئەفریقیاش لەو وڵاتانە پێك هاتووە: ئەثیوبیا، صۆمال، کینیا، جیبۆتی.

٤٨٦- گەورەترین و پڕ فرۆشترین رۆژنامەکانی جیهان ئەمانەن:

١- رۆژنامەیێکی ژاپۆنی بەناوی (ئاساهی شیمبون)، کە رۆژانە ١١ ملیۆن دانەی لێ دەفرۆشرێت.

٢- براڤدا له یەکیەتی سۆڤیەت ٩ ملیۆن دانەی رۆژانەی لێ دەردەچێت.

٣- دێلی مێرەر، کەوا رۆژانە ٤ ملیۆن دانەی لێ چاپ دەکرێ.

٤٨٧- گۆریلا جانەوەرێکە لە رەگەزی مەیموون، بەڵام زل و زەلامترە ئەم جانەوەرە لە سێ حاڵەت دا بە هەردوو دەست بە سنگی خۆیدا دەماڵێت و لەسەر هەر دوو پێی ڕادەوەستێت:

لەکاتی تووڕە بوون دا.

له کاتی ترس دا.

له کاتی کەیف و خۆشی دا.

٤٨٨. ئەمانە دەربارەی جاڵجاڵۆکە بزانە:

١. تۆڕی جاڵجاڵۆکە ڕێگایەکی نهێنی هەیە تەنیا خۆی دەزانی و شریس هێوە نییە کە بە پا و پل دا بنالێت، ئەمە ڕێگەی تایبەتی خۆیەتی.

٢. ئەو تۆڕەی وا جاڵجاڵۆکە دەی چنێت بە پێی بەرنامەیە و لە کات و زەمانێکی جۆراوجۆردا تەواوی دەکات، لە دواییدا شریساوی دەکات بۆ ئالاندن لە موور و مێش.

٣. جاڵجاڵۆکە نێچیرەکەی خۆی ناخوات بەڵکو خوێنەکەی دەمژێت و کەوڵەکەی دەهێڵێتەوە.

٤. مێینگینەی جاڵجاڵۆکە زۆر لە نێرینە درێتر و ئاڵۆزترە ئەویش بەچکە بەخێو دەکات.

٥. هەر جۆرە جاڵجاڵۆکەیەك کە جۆراوجۆرن لە چنینی تۆڕەکەیان دا ئەندازەیەکی تایبەتی بەکاردەهێنن.

٦. تۆڕی نێرەکانیان زۆر سادە و بچکۆلەترە لە مێیەکان و لە بارەی لەش و قەوارەوەش بچووکترن.

٤٨٩. دەزانی ئەگەر هەندێك مس تێکەڵی زیو نەکرێت، زیو زۆر نەرم و نیان دەبێت، جا بۆیە ڕادەی ٩٣٪ زیوە و ٧٪ مسە.

٤٩٠. گەورەترین هۆتێل لە جیهان دا تاکو ئێستا ئەمانەن:

١. هوتێل روسیا لە شاری موسکۆ ٥٠٠٠ ژوورە.

٢. کۆنراد هیلتۆن لە شاری شیکاگۆی ئەمریکا ٢٣٤١ ژوورە.

٣. هوتێل پالمرهاوس لە شاری شیکاگۆی ئەمریکا ٢١٦٠ ژوورە.

٤. هوتێل هیلتۆنی شاری نیویۆرك ٢١٣٩ ژوورە.



٤٩١. شەڕی ئەفیون شەڕێکی بۆگەنی لەبیر نەچووی مێژووە، لە ساڵی ١٨٤٠ - ١٨٤٢ ز دا رووی دا لە نێوان بەریتانیا و چین دا، لە ئەنجام دا پاپۆڕەکانی بەریتانیا لە کەنارەکانی وڵاتی چین دا دابەزین و ئیمپراتۆری چینیان ناچار کرد بۆ مەرجەکانی بەریتانیا مل کەچ بکات و چاوپۆشی لە هۆنگ کۆنگ بکات، هەروەها بازرگانیی تریاك و ئەفیون لە وڵاتی چین دا ئازاد بکات.

٤٩٢. ئەتیکێت

وشەیەکی فەرانساییە واتە بسوولەی بچکۆڵەی کە چۆنیەتیی هەڵسان و دانیشتن، هەروەها ڕووداوەکانی بەزمی تێ دایە و کە هەرکەسێك پێ لە گوێرەی بەرەی خۆی ڕاکێشێت و پایەی خۆی بزانێت.

٤٩٣. ئەوسا کاتژمێری مەچەك بە کار نەدەهات و ئەوەی هەبوو کاتژمێر (ساعەت)ی بەرباخەڵ بوو. تا شەڕی یەکەمی جیهان کە لەلایەن سەربازەکانی بەریتانیاوە بەکاربرا و بوو بە هەموو جێگا گیر.

٤٩٤. دەزانیت ..!

١. ئەسکەندەری ماکەدۆنی لە ساڵی ٣٣٢ی پ. ز شاری قودسی داگیرکرد.

٢. ناوی وڵاتی چین لە کۆن دا ناوی (کاثی) بووە.

٣. ناوی ئەورووپا بە یۆنانی واتە وڵاتی پانوپۆڕ و بەربڵاو.

٤- ئەتاتورك ناوی "مصطفي علي رضا" بووە و کەمال نازناوی بووە. لە زانکۆی سەربازیدا مامۆستاکەی ناوی ناوە کەمال تا جیاواز بێت لە قوتابییەکی دی کە ئەویش ناوی "مصطفي" بووە.


موسەیلەمەی درۆزن

٥- دەزانیت (مسەیلەمە)ی درۆزن بە رمی "وەحشیی" کوژراوە هەر ئەو کەسەی وا حەزرەتی حەمزەی مامی پێغەمبەری شەهید کرد لەسەر وتەی (هیند)ی جەرگ خۆر.

٦- بیلالی حەبەشی بانگدەری بەناوبانگی ئیسلام کۆیلەی "ئومەییەی کوڕی خەلەف" بووە ئەبو بەکر بە ئاڵتوون کڕیویەتی و ئازادی کردووە.


بلال حەبەشی

٧- شاژنە (شەجەرەتولدور) – شجرة الدر – تەنیا هەشتا ڕۆژ فەرمانڕەوایی وڵاتی میسری کردووە و لە ئاکام دا بە قاپ قاپ و پاپەچینی کوژراوە.

٨- حەزرەتی مووسا تەمەنی سێ مانگ بووە کە دایکی لەناو رووباری نیل دا بەرەڵای کردووە.

٩-

١٠- بزانە یەکەمین سەرکۆماری هیندستان "راجنبدار براساد" بووە نەك مهاتما گاندی کە پێش ئازادی کابرایەکی هیندۆسی کوشتوویەتی.

١١-

١٢- بزانە کە "کوللە" لە دەمەوە هەناسە نادات بەڵکو لەبن دەستییەوە.

١٣-

١٤- جەنگیزخان کە دەستی بە شەڕوشۆڕ یەك خستنی مەغۆلەکان کردووە تەمەنی ١٤ ساڵان بووە.

١٥- پێغەمبەری خوا بەسەر کەژی عەرەفاتەوە لە ساڵی ١٠ ی کۆچەری دا لە کاتی حەج دا فەرموویەتی:
" إن اکرمکم عن الله اتقاکم لا فضل لعربي علي أعجمي إلا بالتقوي".

١٦- دوا تێشکانی ناپلیۆن لە شەڕی واترلۆدا بوو لە ساڵی ١٨١٥ نزیکی شاری برۆکسل لە بەلجیکا.

١٧- یەك تەن نەوت سێ بەرابەر تەنێك وخاڵی بەردین گەرما دەدات.

١٨- بزانە کە شەڕی گەورەی یەکەم لە ١١ – ١١- ١٩١٨ و لە سەعات یانزدەدا دەستی پێ کردووە.

١٩- رۆژنامەی گاردیان ڤالاوبزرڤەر لە شاری لەندەن دەردەچێت.

٢٠-

٢١- وڵاتی برازیل سێ جار بووە بە خاوەنی جامی جیهانی فوتبال "تۆپی پێ" لە ساڵانی ١٩٥٨، ١٩٦٢، ١٩٧٠ دا.

٢٢- بەچکەی کانگەر – کە گیانلەبەرێکە لە وڵاتی ئوسترالیادا دەژی – کە لەدایك دەبێ درێژییەکەی سێ سانتیمەترە، بەڵام بەچکەی ئەهەنگ کە لە دایك دەبێت درێژییەکەی شەش مەترە و قورسییەکەی شەش تەنە.

٢٣- ئەوە بزانە کە تاڵێك نایلۆن و تاڵێك ئەلەمنیۆم بە قەدەر یەك بن توانای نایلۆنەکە دوو بەرابەری ئەلەمنیۆمەکەیە.

٢٤- جووجکەی مریشك لە سپێنتی هێلکە پێك دێت و بەرە بەرە لە خاڵێکەوە دەست پێ دەکات تا گەورە دەبێت. سەیر لەوە دایە جووجەڵە لەناو هێلکەدا ژیانی لەسەر زەردێنەکەیە، هەر کە زەردێنەی هێلکە تەواو بوو جووجکە توێکڵ دەشکێنێت و دێتە دەرێ.

٢٥- یەکەمین رۆژنامەیەك کە لە وڵاتی عەرەب دا دەرچووبێت لە ساڵی ١٧٩٨ دا لە میصر لەلایەن داگیرکەرانی فەڕانسەییەوە دەرچووە، کە بە زمانی فەڕەنساوی بووە، هەروەها یەکەمین رۆژنامەی عەرەبی لە سەردەمی محەممەد عەلی پاشادا ساڵی ١٨٢٧ لە میصردا دەرچووە.

٢٦- کە لە پیاوی مێژووی هیندستان مهاتما گاندی لە دوانزدە ساڵیدا ژنیان بۆ هێناوە.



٢٧- شاعیری ناسراوی عەرەب عەنتەری کوڕی شەدداد گەلێك شانازی بە ئەسپەکەیەوە دەکرد، تا دوژمنانی ئەسپەکەیان لێ دزیوە ئەویش چەند کەسێك لەو تیرە بە دیل دەگرێت و لەگەڵ ئەسپەکەدا سەربەسەر دەیان گۆڕێتەوە، ئەسپەکەی ناوی ئەلەبجەر (الابجر) بووە.

٢٨- (اهل الکهف) ماوەی ٣٠٠ ساڵ لە ئەشکەوتەکەدا خەوتوون.

٤٩٥- جۆن دێری پەیکەرتاشێکی ئینگلیز بووە کە لە سالانی ١٧٥٩ – ١٧٩٨ ز دا زیاوە تاشە بەردێکی دۆزیبووەوە خەیاڵی لێ دەکرد کە بیکات بە پەیکەر. هێندە بەلای ئەو بەردەوە مایەوە تا خەوی لێ کەوت و لە سەرمادا مرد.



پەیکەری بەرێزی ئافرەتان

٤٩٦- لە وڵاتێك دا، لە ئەشکەوتێك دا پەیکەری پیاوێك هەڵکەندراوە ژنان کردوویانە بە مەزار و مۆمی بۆ دادەگیرسێنن و لە باوەڕێك دان ئەو پەیکەرە لایەنگیری ئافرەتانە و تۆڵەیان لە پیاوی دروزنی داوێن پیس بۆ دەکاتەوە.

٤٩٧- چارلس لاینیوس ١٧٠٧ – ١٧٧٨ لە پیری دا کتێبەکانی خۆی دەخوێندەوە کە لە مێژ بوو نووسیبوونی، لە باوەڕێك دا نەبووە کە خۆی نووسەری ئەو کتێبانەیە.



٤٩٨- جاران راکێشانی بەلەم بەناو ئاودا لەلایەن ئەسپ و ئێسترەوە لە وشکانییەوە زۆر باو بووە بە تایبەتی لە وڵاتی ئەڵمانیادا.

٤٩٩- یەکێك لە چەتە پیاو کوژەکانی سەردەمی دەمانچە تەقێنەکانی وڵاتی ئەمریکا بەناوی کرافولد کولدسپای ١٨٧٦ – ١٨٩٦ لە ژیانی دا ١٣ کەسی کوشتووە، ١٣ هەزار دۆلار تەرخان کراوە بۆ سەری، ١٣ شایەت لە دادگاکەیدا حازربوون، دادگەکەی ١٣ دەقیقەی درێژەی کێشاوە، ١٣ پلەیان بۆ کردووە بۆبەرزیی سێ دارەکەی کە لە دار دراوە.

٥٠٠- له وڵاتی کەمبودیادا ئەگەر گەنجێک له دێیەکی کە ژن بهێنێت، دارەڕای خانووی بووک و زاوا لەلایەن دۆستانی زاواوە بە شان هەڵ دەگیرێت و لە دێی بووکە دادەنرێت و خانوو دروست دەکرێت.

٥٠١- له ئوسترالیا تیرەیەک هەیە بە ناوی (لارکیا) هەر ژنێک کە کوڕی دەبێت پەنجەی شایەتمانی کوڕەکەی دەبڕدرێت، سەیر لەوە دایە نازانن ئەم رەوشە ناپەسەندە لە چییەوە بۆیان ماوەتەوە.

**٥٠٢- لنکۆڵن:**

وەکو زانراوە ئەبرەهام لنکۆڵن – ئازادکەری کۆیلەکانی ئەمریکا – لە تەماشاخانەیێکی شاری واشنتۆن دا لەلایەن جۆن بۆث ناوێکەوە کوژرا، باپیری لنکۆلن ناوی ئەبراهام بووە، ئەویش بە گوللە کوژراوە، ئەویش ژنەکەی ناوی (مالی) بووە هەروەها هەردووکیان کوڕەکانیان ناوی "تۆماس" بووە.

٥٠٣- له ناوچەی "لیوکاو"ی وڵاتی بورمادا ژنی مێرددار کراسێک لەبەر دەکات تا خواری کەمەر، هەر دوو پێشی تا ئەژنۆ ئەختێک بەرە و خوار بە بەن دەپێچێت کە درێژیی ئەو بەن و گوریسە لە ٥٠٠ پێ کەمتر نییە.

٥٠٤- جاکۆب ریجان "١٦٦٨ – ١٧٤٢" مێژوونووسی ئەناوبانگی ئەڵمانیا تووشە نەخۆشییەک هات کە نەی دەتوانی لەسەر کورسی دانیشێت، جا فەرمانی لە کۆشکەکەی دا هیچ کورسییەک دانەنرێت و ماوەی ٢٠ ساڵ دانەنیشت.

٥٠٥- ئەو ساڵە وڵاتی تیبەت دابەندییەکانیان کۆت و زنجیر دەکرد وو هەموو بەیانییەک لەناو شەقامەکان دا بەردەڵلا دەکران بۆ سواڵ رۆژانەیان بۆ ماوەی سەعاتێک.

٥٠٦- پەرستگایەکی بەردینلە وڵاتی هیندستان دا هەیە کە دەرگاکانی بە شێوەی کەللە سەرێک دروست کراوە هەرکەسێک دەرواتە ژوورەوە دەبێت لە دەمی پەیکەرەکەوە بڕواتە ژوورەوە ئەو پەرستگایە جێگایەکی دیدەنی خەڵکێکی زۆری هیندستان و بێگانەکانە.

٥٠٧- کاتێک سینی خواردنی لویسی چواردەهەم، پاشای فرانسە، لە ئاشپەزخانەوە دەیان هێنا دەبوایە تەواوی دەست و پا و دەوروبەر و شازادەکان تا ئەژنۆ بە کرنوش دا بڕۆیشتنایە بەرێز بۆ ئەو خواردنە کە پاشا مەیلی دەفەرمووێت.



پەرستگای بەردین



بەندی وڵاتی تیبت



لنکۆڵن



قەڵەندەر

٥،٨ سروشت دەستێکی باڵای هەیە لە سازاندنی فۆرم و شێوە و ئەندازەکان دا، هەروەکو پەیکەرسازێکی بە توانا ساڵەهای ساڵ کاری تێدا کردبێت ئاوەها بەپێی ئەندازەو "تناسب" و هاو ڕادە بە درێژایی ساڵەهای با و تۆز و ئاو و باران و دەریا و بەردی سەرسەختیان هەڵ کۆڵیوە لە خۆیەوە فۆرمی جوانیان دروست کردووە کە لە گیانلەبەرێك دەچێت جا لە دونیادا لەم بابەتە لە وڵاتەکان دا زۆر بەرچاو دەکەوێت. بەندە وا چەندێك لەو پەیکەرە سروشتیانەتان بۆ دەناسێنم وەکو:

١. تاشە بەردێکە لە نزیکی شاری "تافولارا"ی ئیتالیا کە ناسراوە بە بەردی پارێزەر.
٢. نزیکی شاری "شیدر" لە بریتانیا کە ژنێکی بەردین هەیە کە زۆر لە شێر دەچێت.
٣. لە نزیکی شاری "یاوا"ی وڵاتی چین دا تاشە بەردێك سروشت بە شێوەی پیاوێکی ئامادە تاشیویەتی وەکو بڵێی پارێزەری کەژ و کێوە.
٤. لە قەراغی رووباری "ئامور" لە وڵاتی سیبریا دا چوار تافێکی بەردین سروشت هەڵی کۆڵیوە وەك بڵێی بۆ پەرستگایێکی ئاینی دروست کرابێت.
٥. لە شاری "لالیبیلا"ی ئەثیووبیا لوتکە بەردێك هەیە وەکو کەشتییەکەی نووح سروشت هەڵی کۆڵیوە.
٦. دوو بەردی زەلام لە خاڵێکی بچووك بەسەر یەکەوە وەستان. مرۆڤ کە سەیری دەکات وا دەزانیت هەر ئێستا دەهەڕووژێن. ئەو دوو بەردە لە یەکێك لە بەرزاییەکانی وڵاتی فرنسادا پێك هاتوون.
٧. لە نزیکی شاری "لیبیری" ئەفریقیای خواروو دیسان دوو بەرد بەسەریەکەوە وەستاون وا دەزانرێت هەرکات لەوەدایە بهەرووژێن.
٨. لە یەکێك لە کەنارەکانی وڵاتی فرانسادا بەسەر دەریاوە باو دەریا بەردی کەناریان هەڵ کۆڵیوە بەشێوەی سەگێکی پاڵ کەوتوو. ئەو شوێنە بەناوی سەگی نوستوو بەناوبانگە.













٥٠٩ کۆشکێك لە ئیسپانیادا هەیە لە شاری سینترا هێند رازاوە و جوان و جێگای سەرسامییە. بە (کۆشکی حەوت ئای) بەناوبانگە. چونکە بینەر بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت لە جوانیی ئەو کۆشکەدا بە سەرسامییەوە هەر ئەبێت حەوت جار دەڵێت "ئای برا چەند جوانە !".


کلیمه نسو

٥١٠ ئەندرۆ جاکسون حەوتەمین سەرکۆماری ئەمریکا بەوە بەناوبانگ بووە زۆربەی کاتی خەریکی قومار کردن بووە. سەیر لەوە دایە ئەم سەرکۆمارە (قومارچییە) لە بەڕێوەبردنی وڵات دا سەرکەوتوو بووە.

٥١١- دەزانیت "جۆرج کلێمەنسۆ" سەرۆك وەزیرانی فەرانسای سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهان کە بە "پڵنگ" بە ناوبانگ بوو، لە ساڵی ١٩٢٩ ز مردووە بە پێوە نێژراوە لەسەر دوای خۆی.

٥١٢ دەزانی خوا لێ خۆش بوو محمد امین زکی بەگ (١٨٨٠ - ١٩٤٨) مێژووی کورد و کوردستانی داناوە و بەسەرچاوەیەکی مێژوویی باوەڕپێکراو ناسراوە لە زۆر جێگەدا.

٥١٢- گوڵە ناسراوەکانی جیهان:

| ناوی گوڵ | چۆنیەتی |
| --- | --- |
| گوڵی ئەوریشم | گوڵێکی زستانییە. |
| گوڵی ئەختەر | بەشێوەی سەلك دەبێت. |
| گوڵی ئاقاقیا | رەنگین و پەڕ پەڕە |
| گوڵی ئەرخەوان | درەختێکی بنەوشە و بی بۆنە |
| گەڵی بەڕۆژە | زەرد و زل و تۆدارە |
| گوڵی هەنار | درەختێکی سوور و پەڕپەڕە |
| گوڵی وەنەوشە | بەهارییە و بۆن خۆشە |
| گوڵی رازقی | درەختێکی گەرمیانییە و گوڵێکی سپی بۆن خۆشە. |
| گوڵی زەرد | درەختێکە بەشێوەی بنج |
| گوڵی زەنبەق | بەهاییە و بۆن خۆشە |
| گوڵە سوورە | هەموو وەرزە و هەموو جێگا |
| گوڵی سۆسن | جۆرێکە لە زەنبەق |
| گوڵی شەوبۆ | گوڵێکە لە کوێستان دەروێت و بۆن خۆشە |
| گوڵی شەقایق | گوڵی تریاکە |
| گوڵی لالە | گوڵاڵەی زەرد و سوور |
| گوڵی شەمعدان | رەنگینە |
| گوڵی شەپیووری | رەنگین و بێ بۆنە |
| گوڵی قەرەنفل | رەنگین و پەڕ پەڕە |
| گوڵی کەوکەب | وەکو ئەستێرە وایە |
| گوڵی لالە عەباسی | گوڵێکە بەیانیان خۆی دەنوێنێ |
| گوڵی مێخەك | چوار وەرزیە |
| گوڵی محەممەدی | رەنگەکەی سوورە |
| گوڵی مرواری | گوڵێکی سپیی رەنگ بەهاریە |
| گوڵی ناز | بچکۆلە و رەنگاو رەنگە |
| گوڵی نەرگز | زەرد رەنگە |
| گوڵە نەستەرەن | سوور و سپیی و پەڕ پەڕە |
| گوڵی نەیلووفەر | شین و شەپیوورییە |
| گوڵی هەمیشە بەهار | بەهارییە و زەرد رەنگە |
| گوڵی یاس | بەشێوەی بنجە |
| گوڵی یاسەمەن | نەوعێکە لە گوڵی یاس |

٥١٣. ناودارانی جیهان وا ناسراون

| | |
|---|---|
| ئەدیسۆن | باوکی کارەبای جیهان |
| ئەرستۆ | مامۆستای یەکەم |
| ئەنیشتاین | باوکی ئەتۆم |
| داروین | باوکی دنیای سروشت |
| بوقرات | باوکی پزیشکی |
| سوقرات | مامۆستای رەوشت |
| فۆرد ئەمریکا | باوکی ئۆتۆمبیل |
| گۆتەمبرگ | باوکی چاپ |
| لۆمیر فرانسوی | بابی سینەما |
| هومێری یۆنانی | هەڵبەست |
| هیرۆدۆت | باوکی مێژوو |
| پاگانینی | باوکی مۆسیقا |
| فارابی | مامۆستای دووەم |
| تالسی مەلەتی | دامەزرێنەری مەکتەبی ئەیۆنی |
| فیثاگۆرث | باوکی ریاضیات |
| ئەفلاتون | دانەری مەکتەبی ئەکادیمی |
| ئەرستو | دانەری قوتابخانەی لیسە |
| دیونانت | دانەری زانیاریی جەبر |
| ئەلفرێد نۆبل | بابی دینامیت |
| ماری کۆماری | دایکی رادیۆم |


ئەفلاتون


داروین




سوقرات

٥١٤. ئەوە بزانە نێوان زەوی و هەتاو ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەترە، بەینی زەوی و مانگیش ٤٠٦٦١٠ کیلۆمەترە.

٥١٥. کاکێشان

کاکێشان کۆمەڵە ئەستێرەیەکن کە هەتاو بەشێکی گەلێک بچووکی کاکێشانە، هەر کاکێشانێکیش خاوەن ٢٠٠ ملیارد ئەستێرەیە.

٥١٦. خێرایی تیشک لە هەر یەک چرکە (ثانیة) یەک دا ٣٠٠،٠٠٠ کیلۆمەترە.

٥١٧- ١- تیرەی مەریخ ٦٨٨٠ کیلۆمەترە، لە هەتاوەوە ٢٢٧ ملیۆن کیلۆمەتر دوورە، خێراییەکەی ٤٤ کیلۆمەترە لە چرکەیەك دا.

٢- تیرەی مشتەری ١٤٢٠٠٠ کیلۆمەترە و ٧٧٧ ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە، گەورەیی مشتەری ١٣٠٠ ئەوەندەی گەورەیی زەوییە.

٣- تیرەی زەوی ١٢٧٥٦ کیلۆمەترە و خێراییەکەی ٢٩,٨ کیلۆمەترە لە یەك چرکەدا.

٤- تیرەی زوحەل ١٢١٠٠ کیلۆمەترە، دووەمین ئەستێرەی گەورەی کۆمەڵی هەتاوە. یەك ملیارد و ٤٢٨ ملیۆن کیلمەتر لە خۆرەوە دوورە، ٧٦٣ جار لە زەوی گەورەترە.

٥- تیرەی ئۆرانۆس ٥٤٠٠٠ کیلۆمەترە، ٢٨٢٨ ملیۆن میل لە خۆرەوە دوورە.

٦- تیرەی زوهرە ١٢٣٠٠ کیلۆمەترە ١٠٨ ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە. بو خێرایی ٣٥ کیلۆمەتر لە چرکەیەك دا بە دەوری هەتاودا دەچەرخێتەوە لە زەوی بچووکترە.

٧- تیرەی عەتارید ٤٨٠٠ کیلۆمەترە، بەخێرایی ٤٨ کیلۆمەتر لە چرکەیەك دا بە دەوری هەتاودا دەسوورێتەوە.

٨- نیپتۆن تیرەکەی ٢٨١٧٤ میلە، بۆ گەورەیی چوارەمین ئەستێرەی کۆمەڵەی هەتاوە، ٤٥٠٠ ملیۆن کیلۆمەتر لە هەتاوەوە دوورە.

٩- پلۆتۆن: تیرەکەی ٦٠٠٠ کیلۆمەترە، بە دوورترین ئەستێرە دەژمێردرێت لە خوارەوە، لەبەر ئەوەی پێنج ملیارد و نۆسەد و هەشت ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆر دوورە.

١٠- هەتاو (خۆر): تیرەی ١,٣٩٢ ملیۆن کیلۆمەترە، ١,٢٠٠,٠٠٠ جار لە زوی زلترە.

٥١٨- دورگە گرنگەکانی جیهان:

١- برنیۆ لە ئۆقیانووسی گەورەدا.
٢- گرین لاند لە ئۆقیانووسی گەورەدا.
٣- ماداگەشکەر لە ئۆقیانووسی هیندیدا.
٤- سۆماترا لە ئۆقیانووسی هیندیدا.
٥- بریتانیای گەورە لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا.
٦- جاوا لە ئۆقیانووسە هیندی دا.
٧- ئایسلەند لە ئۆقیانووسی ئەتڵەس دا.
٨- ئیرلەند لە ئۆقیانووسی ئەتڵەس دا.
٩- سیلان لە ئۆقیانووسی هیندیدا.
١٠- ساخالین لە ژاپۆن دا.
١١- کبوسیۆ لە دەریای ژاپۆن دا.
١٢- ملویل لە ئۆقیانووسی ڕچاو (بەستەڵکی) سەرەوە.
١٣- دورگەی کرس لە دەریای مەدیتێرنیا (ناوەڕاست).
١٤- ساردینیا لە دەریای مەدیتێرنیا.
١٥- سیسیل لە دەریای مەدرترێنیا.
١٦- قیبرس لە دەریای مەدیتێرنیا.
١٧- جامیگا لە دەریای کاریبیدا.
١٨- فەرمۆزا لە ئۆقیانووسە ئارام دا.
١٩- ئەلب لە دەریای مەدیتێرنیا.
٢٠- سانت هێلانە لە ئۆقیانۆسی ئەتڵەسیدا.

۵۱۹. کەناوی گرنگەکانی جیهان

١. کەنداوی بوتنی لە ڕۆژاوای فنلەندە لە ئەوروپا.
٢. خەلیجی بەنگال لە ڕۆژاوای هیندستان لە ئاسیا.
٣. کەنداوی پەناما لە ئەمریکای ناوەڕاست دا.
٤. کەنداوی تارانتۆ کە کەوتوەتە خوارەوەی ئیتالیا لە ئەوروپا.
٥. کەنداوی سیام لە خوارەوەی سیام لە ئاسیا.
٦. کەنداوی فنلەند لە دەریای بەلتیك لە ئەوروپا.
٧. کەنداوی عەدەن لە خوارووی یەمەنی خواروو لە ئاسیا.
٨. کەنداوی عەرەبی لە ڕۆژاوای دورگەی عەرەب دا لە ئاسیا.
٩. کەنداوی کالیفۆرنیا لە ڕۆژاوای ئەمریکای ژووروو.

۵۲۰.

١. ڕووبەپێوی زەوی بە گشتی ۵١٠ ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
٢. ڕووپێوی وشکانی لە زەوی دا ١٤٥ ملیۆن کیلۆمەتری چوار گۆشەیە.
٣. ڕووپێوی ئۆقیانووس و دەریاکان ٣٦٤ ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
٤. ناوچە گەرمەکانی ڕووی زەوی ٢,٩٦٠,٢٨٤ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
٥. ناوچە فێنکەکان ڕووی زەوی ٢٦٥,١٧٥٣٧١ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.

۵۲۱

١ ڕووپێوی قارەی ئاسیا ٤٤ ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
٢ ڕووپێوی قارەی ئەوروپا ١٠ ملیۆن کم٢ ە.
٣ ڕووپێوی قارەی ئەفریقیا ٣٠ ملیۆن کم٢ ە.
٤ ڕووپێوی قارەی ئەمریکا ٤٢ ملیۆن کم٢ ە.
٥ ڕووپێوی قارەی ئوسترالیا ٩ ملیۆن کم٢ ە.

۵۲۲ وەکو زانراوە یەکیەتیی سۆڤیەت لە چەند کۆمارێك پێك هاتووە. هەر یەکە لەوانە پایتەختێکیان هەیە:

| کۆمار | پایتەخت |
|---|---|
| ئۆکراین | کییف |
| ڕووسیای سپیی | مینیسك |
| ئەذر بایجان | باکۆ |
| گورجستان | تفلیس |
| ئەرمینیا | یەریڤان |
| ئوزبەکستان | تاشقەند |

| | |
|---|---|
| تاجیکستان | دووشەنبە |
| قەرغیزیا | ئەلما ئاتا |
| ملداڤیا | کیشنف |
| لیتوانیا | ریکا |
| استونیا | تالین |

٥٢٣- دەزانی ئەگەر مرۆڤێك ٧٠ کیلۆغرام قورسایی بێت قورسیی مێشکی ١٣٧٥ گرامە، دڵی ٣٠٠ گرامە، جەرگی ١٦٠٠ گرامە و هەردوو کورچیلەیشی ١٦٠ گرام دەبێت.

٥٢٤- دەموچاوی مرۆڤ ١٤ ئێسکی تێدایە، ١٣ ئیسکیان ناجوولێتەوە، تەنیا یەکێکیان نەبێت ئەویش کاژێری خواردوەیە.

٥٢٥ شاژنە بەناوبانگەکانی جیهان

١- ئەلیزابێتی یەکەم (١٦٠٣ ز) کچی هەنری سێیەم شاژنی بەریتانیا کە ماری ستیوارتی کوشتووە.
٢ ئەلێزابێت دوفرانس کچی هەنری پێنجەم.
٣ ئیزەبل دوفرانس (١١٧٠ ز) دایکی هەنری هەشتەمی پاشای فڕانسە بووە.
٤ ئەلیزابێت دوتریش، شاژنی فڕانسە و ژنی شارلی نۆیەمی پاشای وڵاتی فڕانسە بووە.
٥ ئان ستیوارت، شاژنی وڵاتی بەریتانیا.
٦- کاترینی یەکەم، شاژنی پەترۆسی گەورە و کاترینی دووەم ئیمپراتۆری رووسیا.
٧- ماری ئەنتوانێت، شاژنی وڵاتی فڕانسە، کچی ئیمپراتۆری نەمسا بووە، لە شۆڕشی میللەتی فڕانسەدا کوژراوە.
٨ ماری لویز، ژنی ناپلیۆنی یەکەم.

٥٢٦ ژنانی بەناوبانگی مێژوو

| | |
|---|---|
| ١- ئیڤا براون | دۆستی هیتلەر |
| ٢ ئانا ستازیا | کچی قەیسەری رووسیا |
| ٣ باندرانیک | سەرۆك وەزیرانی سیلان (سیریلانکا) |
| ٤ تائیس | دۆستی ئەسکەندەری مەکەدۆنی |
| ٥ کلیۆپاترا | شاژنی وڵاتی میصر |
| ٦ جەمیلە | کچە تێکۆشەرێکی جەزایری |
| ٧ جۆرج ساند | نووسەرێکی فڕانساوی |
| ٨ ژاندارك | رزگارکەری وڵاتی فڕانسە |
| ٩ زیب النسا بیکم | شاعیرێکی هیندی |
| ١٠ مادام دو پەمپادور | دۆستی لویسی پانزدەهەم |
| ١١ دیان دو پواتی | دۆستی هەنری دووەم |
| ١٢- دیان دو کاسترۆ | کچی هەنری دووەم |
| ١٣ کۆنتێس دوباری | دۆستی لویسی پانزدەهەم |
| ١٤- مادام سەمپسون | ژنی ئەدواردی هەشتەم |
| ١٥ ماری ویسترا | قارەمانی رووداوی مایرلنگ |

١٦- ژوزفین دو بوارنە شاژنی فرانسەس
١٧- مادام لاڤایێت زانیارێکی فرانساوی
١٨- مۆنالیزا مۆدیلی تابلۆکەی لیۆناردۆ دافنشی

٥٢٧ - ژمارەی حەوت (٧) لە ناو میللەتانی جیهان دا
- مەولەوی، جەلالەدینی رۆمی فەرموویەتی: ئەو حەوت شاری عشقی پێواوە، ئێمە هێشتا لە داوێنی کۆلانێك داین.

١- حەوت لە کۆن دا:
خەڵکی وڵاتی بابل ژمارەی حەوتیان زۆر بەلاوە بەرێز بووە، چینەکانی ئاسمان و زەوی و ئەستێرەکانیان بە حەوت ژمارە داناوە، رۆژانی حەفتەش حەوت رۆژ بووە.

٢- ژمارەی حەوت لە ئاین دا:


براهما

بە بیروڕای هیندییەکان کە پەیڕەوی ئاینی "براهما"ن مرۆڤ حەوت جار دەمرێت، بووك و زاوا دەبێت.
حەوت هەنگاو لەگەڵ یەکدا پێکەوە هەڵ گرن. لە تەورات دا دیسان باسی ژمارەی حەوت دەکات، لە ئاینی زەردەشتی دا حەوت فریشتەی گرنگ هەبووە.

٣- حەوت لە ئاینی مەسیحیدا:
لە ئنجیل دا دەربارەی حەوت روحی ناپاك گوتراوە بە بیروڕای کاپۆلیکەوە حەوت گوناحی گەورە و حەوت جۆرە تۆبە و حەوت جۆر رەوشت و حەوت جۆر شادی و جودی هەیە.
٤- حەوت لە ئاینی ئیسلام دا:
ئاسمان حەوت تەبەقەی هەیە، فیرعۆن لە خەودا حەوت گای قەڵەو و حەوت گای لەڕی دیوە، وتراوە کە حەوت ساڵ نەهاتی و حەوت ساڵ هان دەبێت. گوناحە گەورەکان حەوتن. لەناو عەرەبەکانی پێش ئیسلام دا حەوت جار بە دەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە، جەهەننەم حەوت تەبەقەی هەیە، حەوت جۆر قورئان خوێنی هەیە، حەوت جار دەبێت گڵاوی دەرکرێت، حەوت جێگەی مریف لە کاتی نوێژ کردن دا دەبێت لە زەوی بکەوێت.


سەمای سۆفییەکان

٥- حەوت لە تەصەووف دا:
لە تەصەووف دا حەوت (وادیی سلووك) ناسراوە:
١- طلب "خواست".
٢- عشق "ئەڤین".
٣- معرفة "زانین".
٤- إستغناء "وازهێنان".
٥- توحید "یەکناسی".
٦- حیرة "سەرسامی".
٧- فناء "نەمان".

٦- حەوت لە مێژوودا:
لە سەردەمی لویسی پانزدەهەم دا شەڕێك ڕوویدا حەوت ساڵ بەردەوام بوو, ئەژدیهابە حەوت سەر بەناوبانگە.

٧- پەرستگای حەوت تەبەقە:
لە وڵاتی بابل و ئاشووردا هەر پەرستگایەك حەوت تەبەقە بووە, هەر تەبەقەیەكیش بەناوی ئەستێرەیەك ناونراوە حەوت ڕەنگی جیاوازیشی بووە, حەساری شاری ئەكباتان پایتەختی مادەكان حەوت حەسار بووە.

٥٢٨- كۆشكە بەناوبانگەكانی جیهان:

| كۆشك | وڵات |
|---|---|
| ١- حەمرا | ئیسپانیا |
| ٢- ئەسكۆریال | ئیسپانیا |
| ٣- ئەلباسین | ئیسپانیا |
| ٤- ئەمپایرئەستیت | نیویۆرك |
| ٥- تریانوون | پاریس |
| ٦- تویلەری | پاریس |
| ٧- سان ژامس | لەندەن |
| ٨- سپی | واشنتۆن |
| ٩- سواسون | پاریس |
| ١٠- فۆنتن | پاریس |
| ١١- كولیزم | ڕۆما |
| ١٢- ئامبواز | پاریس |
| ١٣- ئەلیزێ | پاریس |
| ١٤- ئانستیتو | فرانسە |
| ١٥- پۆتسدام | ئەڵمانیا |
| ١٦- بالەبورین | پاریس |
| ١٧- كرملین | مۆسكۆ |
| ١٨- كندە | پاریس |
| ١٩- گران پالە | پاریس |
| ٢٠- لۆگزام بۆرگ | پاریس |
| ٢١- لۆڤەر | پاریس |
| ٢٢- مەدیسی ها | ڕۆما |
| ٢٣- مالترون | پاریس |
| ٢٤- فاتیكان | ڕۆما |
| ٢٥- ڤێرسای | پاریس |
| ٢٦- وێست منستەر | لەندەن |
| ٢٧- هۆتل ئەنوالید | پاریس |



٢٨- هایدپارک لەندەن

٥٢٩- ئامرازەکانی مۆسیقا لە کۆن دا
١- چەنگ: ئەمڕۆ پێی دەڵێن هارپ.
٢- غژك: سازێکە وەکو کەمانچە وایە.
٣- رەباب: سازێکە وەکو تەنبوورە وایە.
٤- کەمانچە: وەکو فیۆلۆنی ئەمڕۆ وابووە
٥- باربوود: دوای ئیسلام ناونراوە عوود.
٦- تەنبوورە: دوو تەلی هەبووە.
٧- سێ تار: لە کۆن دا سێ تەلی هەبووە، ئەمڕۆ چوار.
٨- دووتار
٩- سونتوور و قانوون: دوو ئامێرە لەتەختە و تەل دروست دەکرێت و بە پەنجە لێ دەدرێت.
١٠- ساز بە پۆ: وەکو نای، زوڕنا، کەڕەنا.
١١- نەقارە و تەپل و دونبەك.
١٢- دەهۆڵ

٥٢٠- مەقامەکانی کۆن:
١- مەقامی عوششاق.
٢- مەقامی نەوا.
٣- مەقامی بۆسلیك.
٤- مەقامی ڕاست.
٥- مەقامی عیراق.
٦- مەقامی ئەسفەهان.
٧- ژێر هاوێژ.
٨- مەقامی گەورە.
٩- مەقامی زەنگلە.
١٠- مەقامی راهوی.
١١- مەقامی حسێنی.
١٢- مەقامی حیجاز.
ئەم مەقامانەش ٢٤ چلی لێ دەبێتەوە:
شوور، سێ گاھ، چوار گاھ، ماهوور، همایۆن، نەوا، ڕاست، پێنج گاھ.
چەند ئاوازێکیشیان لێ جیا دەبێتەوە بەناوی:
ئەبو عەطا، بەیاتی تورك، ئەفشاری، دەشتی، بەیاتی کورد.

٥٣١- مۆزەخانە بەناوبانگەکانی جیهان
١- لۆڤەر: لەپێش دا ئەم کۆشکە دەرباری شاکانی فەرەنسە بووە، بەڵام ئەمڕۆ گرانترین گەنجینەی هونەریی دنیا تێدا داندراوە.
٢- بریتیش مۆزیەم: مۆزەخانەی شاری لەندەن کە لە ساڵی ١٧٥٣ ز دروست کراوە.

٣- مۆزەخانەی لەندەن: لە ساڵی ١٩١٢ ز دروست کراوە.
٤- مۆزەخانەی ڤیکتۆریا: گرانترین و بە نرخترین شتی کۆنینەی مێژوویی تێدایە.
٥- مۆزەخانەی ناپۆلی: لە سەدەی هەژدەهەم دا دروست کراوە.
٦- مۆزەخانەی میللیی رۆما.
٧- مۆزەخانەی ئالاسکا کە لە وڵاتی ئەمریکا دایە.
٨- مۆزەخانەی ماسا چۆست و مۆزەخانەی پالتیمۆر کە هەردووکیان لە وڵاتی ئەمریکادان.
٩- مۆزەخانەی بەناوبانگی لینین گراد لە یەکیەتیی سۆڤیەتیدا.

٥٣٢- پارچە ئەڵماسە بەناوبانگەکانی جیهان:
١- ئەڵماسی کەژی نوور: کە لە سەرەتاوە ٨٦ قیراط قورسایی بووە, ئەمڕۆ ٨٤ قیراط قورساییەتی.
٢- ئەڵماسی دەریای نوور: لە سەرەتاوە ٧٨٠ قیراط بووە, ئەمڕۆ ٢٨٠ قیراط قورسە.
٣- ئەڵماسی رژان: قورسایی ٣٦ قیراطە بەناوی ئەڵماسی وەلی عەهدی فرەنسە بەناوبانگە.
٤- ئەڵماسی بەرازیل: ٨٠ قیراطە و لە وڵاتی پورتەغال دایە.
٥- ئەڵماسی برنیۆ: ٣٦ قیراطە.

٥٣٣- ئەمانە بزانە:
١- ئاپادیمی: کاتێک نەخۆشی بڵاو دەبێتەوە وەکو نەخۆشیی تاعوون, کولێرا, سیل, ئاوڵە .. واژەیەکی جیهانی بۆ بەکاردەهێنن ئەویش وشەی ئاپادیمییە.
٢- کەرەنتینە: هەر کاتێک ئاپادیمی بڵاوبێتەوە بەسەر سنوورەکانەوە ئەوانەی لە وڵاتێکەوە دەڕۆن بۆ وڵاتێکی دی کە پێنج رۆژ دەست بەسەر دەکرێن تا دەردەکەوێت لەگەڵ خۆیان دا ئەو نەخۆشییەیان هێناوە یان نا. جا بەو پێنج رۆژە دەگوترێت کەرەنتینە.
٣- تەلەفۆتۆ چییە؟
دەستگایێکە کە لە رێگەی دوورەوە وەکو تەلگراف دەکرێت ئاوا بەو دەستگایە وێنە دەنێردرێت.
٤- تەلگراف تەلیفۆن , تەلفزیۆن:
ئەم سێ ناوە لە زمانی لاتینی کۆنەوە وەرگیراون تەلە واتە لە دوورەوە, گراف واتا نووسین, تەلە واتە لە دوورەوە فۆن واتە گوێ گرتن. تەلە واتا لە دوورەوە فیزیۆن واتە بینین.

٥٣٤- مانای ئەم وشانە چییە؟
١- ئنسی کلۆپیدی: واتا "دائرة المعارف".
٢- ئامفی تئاتر: واتە جێگایەکی سەر داپۆشراو بە شێوەی مانگی یەکشەوە (هلال) و شانۆگەریی تێدا دەکرێت.
٣- ئیشراقییەکان: مەکتەبێکی فەلسەفەیە, زانا رۆژهەڵاتییەکان پەیڕەوی بوون و دەڵێن: خوا هەموو شتە و لە هەموو شتێك دا دەبینرێت و لە هەموو شوێن و جێگەیەك دا هەیە و مەوجوودە.
٤- بالماسکە: شەونشینییەکی تایبەتییە کە بەشدارەکان بە جلوبەرگی تایبەتییەوە سەمادەکەن و روو و روالەتی خۆیان بە روو پۆشێکی سەیر شاردۆتەوە.
٥- بالێت: سەمایەکی تایبەتییە کە بە جووڵانەوەیەکی هونەری تایبەتی دا داستانێك دەگێڕێتەوە.

٦- بیۆگرافی: سەرگوزەشتەی مرۆڤ و چۆنیەتیی رابردووی مرۆڤ.
٧- بایۆلۆژی: واتە زانیاریی گیانلەبەران و چۆنیەتیی پەیدابوونیان.
٨- (بعد)ی چوارەم: لە قوتابخانەکانی فەلسەفەدا رەوشن بومتەوە کە تەواوی ئەجسام سێ دوورییان هەیە، پانی ، درێژی، ئەستووری، زانیاران دوورییەکی چوارەمیان داسەپاندووە پێی دەڵێن دووریی چوارەم.
٩- ترانسفۆر ماتۆر: دەستگایەکە هێزی کارەبای سەرخوار پێ دەکرێت واتە کەم و زیاد.
١٠- درام: بە شانۆییەك دەگوترێت کە گریان و پێکەنینی تێدا تێکەڵ بکرێت.
١١- سابو تاژ: لە فەرهەنگی سیاسیدا، واتە خراپ کاری و تێك و پێك دان لە کارخانەی جاتی پیشەسازیدا.
١٢- گیوتین: دکتۆرێکی فرانساوی بووە دەستگایەکی دروست کردووە بۆ سەر بڕین کە بەناوی ئەوەوە ناسراوە، هەر لەو دەستگایەش لویسی (١٦) و ماری ئەنتوانێت سەربڕاوە، سەیر لەوە دایە گیوتین خۆشیی هەر بەو دەستگایە کوژراوە.
١٣- میتافیزیك: زانیارییەکە دەربارەی ئەودیوی سروشت (ماوراء الطبیعة) ئەرستۆ ئەم زانیارییەی هێناوەتەکایەوە و دەربارەی نووسیوە.

٥٢٥- درێژترین تونێل کە تا ئێستا دروست کراوە تونیلێکە بەناوی سەورن لە وڵاتی ئینگلتەرەدا کە لە ساڵی

١٨٨٦ز تەواو کراوە بە درێژیی ٧٤٤٧ مەتر.
لەناوچەی نیویۆرك دا تونیلێك دروست کراوە بە درێژیی ٢٨٠٠ مەتر.

٥٢٦- جۆگا (قەناتە) بەناوبانگەکانی جیهان:
١- قەناتی سوێس: لەنێوان دەریای سوور و دەریای مەدیتریناندا هەڵ کەنراوە بە درێژیی ١٦١،٠٠٠ مەتر.
٢- قەناتی پەناما: لەنێوان ئۆقیانووسی گەورە و ئەتلەسیدا هەڵ کەنراوە بە درێژیی ٨١٣٠٠ مەترە.
٣- جۆگای ڕووباری کنگ لە هیندستان بە درێژیی ١٣٠٥ کیلۆمەترە.
٤- جۆگای ماریا لە یەکیەتیی سۆڤیەتی بە درێژیی ١٩٠٢ کیلۆمەترە.
٥- جۆگای ئیمپراتۆری لە وڵاتی چین بە درێژیی ١٣٠٠ کیلۆمەترە.
٦- جۆگای ئاریا — ئوهایو لە ئەمریکا بە درێژیی ٥٤٦ کیلۆمەترە.

٥٢٧- دەزانی یۆنانییە کۆنەکان ئەستێرەکانیان بەناوی خواکانیان ناو ناوە:
١- مشتەری: جۆپیتەر، خوای خواکان.
٢- زوهرە: ڤینۆس، خوای عیشق.
٣- مەریخ: مارس، خوای شەڕ.
٤- عەتارید: خوای قسە.
٥- زوحەل: خوای کات و زەمان.

٥٢٨- بزانە کە زەوی سێ جۆر جووڵانەوەی هەیە:
یەکەم: بەدەوری خۆیدا.
دووەم: بەدەوری خۆردا.
سێیەم: لەگەڵ خۆر و کۆمەڵی هەتاودا بەرەو ئاسمانی بێ تەواو بوون پێکەوە ئاسمان تەی دەکەن بەرەو کوێ؟ خوا خۆی دەزانێت!

٥٣٩- پێکەوە با بیر کەینەوە..
پ ١- ناوی چەند کتێبێکی ئەرنست هەمنگوای بڵێ؛
و- خوای حافیزی لە چەك، بۆ کێ زەنگوڵەکان لێ دەدرێن، پیرەمێرد و دەریا، بەفرەکانیکلیمەنجارۆ.
پ ٢- ئەم نووسراوانە هی کێن؛ دەزگای کەنداو، پاژنە ئاسنین؟
و- نووسەری بەناوبانگ جاك لەندەن.
پ ٣- بیکاسۆ خەڵکی چ وڵاتێکە؟
و- خەڵکی وڵاتی ئیسپانیا بووە.
پ ٤- شۆمان، شۆپێن، شوبەرت چ کارەبوون؟
و- شۆمان خەڵکی ئەڵمانیا بووە و مۆسیقازان بووە.
- شۆپێن خەڵکی پۆڵەندە و ئاهەنگساز بووە.
- شۆبەرت خەڵکی نەمسا و مۆسیقازان بووە.
پ ٥- بە چ هەڵبەستێك وتراوە فەهلەویات؟
و- بە چوارینەکانی بابا تاهیری عوریان شاعیری لوڕی ئەمر.
پ ٦- جاك لەندەن و گۆگۆل کامیان خەڵکی بەریتانیا بووە؟
و- هیچ کامیا. جاك لەندەن ئەمریکایی بووە و گۆگۆلیش خەڵکی رووسیا.
پ ٧- ئەبو عەلی سینا بووە وەزیری کام فەرمانڕەوا؟
و- شەمسوودەدولە و عەلائوددەولەی سەردەمی دەیلەمییەکان.
پ ٨- شاتوبریان و ڤیکتۆر هیگۆ پەیڕەوی چ قەتابخانەیەك بوون لە نووسین دا؟
و- پەیڕەوی قوتابخانەی ئەدەبی رۆمانتیسم.
پ ٩- سومەرسێت موم؛ ئینگلیزە یان ئەمریکاییە؟
و- نووسەرێکی ئینگلیزە.
پ ١٠- نۆتردام لە چ وڵاتێکە؟
و- کلێسایەکە لە شاری پاریس.
پ ١١- ڤاتیکان لە چ وڵاتێکە؟
و- کۆشکێکە لە شاری رۆما پاپای تێدا دادەنیشێت.
پ ١٢- ویست منستەر لە چ وڵاتێکە ؟
و- کلێسایەکە مێژووییە لە شاری لەندەن.
پ ١٣- ئاخرین پاشای خوارزەمشایەکان ناوی چی بوو؟
و- ناوی سوڵتان محەممەد خوارزەمشا بوو.
پ ١٤- دوامین خەلیفەی عەباسی ناوی چی بووە؟
و- المستعصم بالله.
پ ١٥- گەورەترین و زۆرترین کۆمەڵە دورگەی جیهان لە چ وڵاتێکە ؟
و- لە وڵاتی ئەندەنوسیادا کە تێکڕا لە ٣٠٠٠ دورگەی پێك هاتووە.
پ ١٦- بەرزترین لوتکەی چیای دونیا کامەیە؟
و- لوتکەی ئەڤەریست کە ٨٨٨٨ مەتر بەرزە.
پ ١٧- قووڵترین ئۆقیانووس کامەیە؟
و- جێگەیێکە لە ئۆقیانووسی ئارام دایە بە قووڵی ١٤٠٤٨ مەتر.

پ ١٨- ب ج ولاتێك دەڵێن ئەسكەندەناڤ؟

و. سوێد، نەرویج، دانیمارك.

پ ١٩- ولاتی تایلاند ناوێکی دیکەی هەیە، ئەو ناوە چییە؟

و. ولاتی سیام.

پ ٢٠- دارولسەلام پایتەختی ج ولاتێکە؟

و. تانجانیقا.

پ ٢١- چاکترین سیمفۆنییەکانی مۆزارت کامیانە؟

و. سیمفۆنییەکانی ژمارە ٤٩، ٥٠، ٤١.

پ ٢٢- بە کێ دەڵێن باوکی سیمفۆنی؟

و. هایدنی ئەڵمانی.

پ ٢٣- قوتابخانەی ئەکادیمی ولیسە بەکێ وەناسراوە؟

و. ئەکادیمی بە ئەفلاتون و لیسە بە ئەرستۆوە.



پ ٢٤- بە کێ دەڵێن پاشای مۆسیقا؟

و. بیتهۆفن.

پ ٢٥- کێ هایدرۆجینی دۆزییەوە؟

و. کاڤندیش لە ساڵی ١٧٨١ دا.

پ ٢٦- کام پاشای بریتانیا بوو کە ئینگلیزی نەدەدانی؟

و. جۆرجی یەکەم.

پ ٢٧- گوستابو چی بوو؟

و. پۆلیسی نهێنی سەردەمی هیتلەر بووە.

پ ٢٨- دڵ لە هەر دەقیقەیەك دا چەند جار لێ دەدات؟

و. لە هەر دەقیقەیەك دا ٧٠ – ٧٥ جار لێ دەدات.


رۆمیۆجولیت

پ ٢٩- سەمیرامیس ج کەسێك بووە؟

و. شاژنی ولاتی بابل و ژنی بەختونەصر بووە.

پ ٣٠- دزدەمونا ڤاردمانی کام کتێبە؟

و. ڤاردمانی کتێبی ئەتیللۆ (عطیل)ی شەکسپیرە.

پ ٣١ سیمفۆنیی رۆمیۆ و جولێت کێ دای ناوە؟

و. چایکۆفسکی.

پ ٣٢- پەیکەری بەردینی بەناوبانگی ماچ کام پەیکەرساز دروستی کردووە؟

و (رۆودان)ی پەیکەرسازی فرانسە.

پ ٣٣- ئایا پلەی گەرمای لەشی مرۆڤ وەکو یەك وایە؟

و. گەرمای جەرگ ٣٨,٢، ناودەم ٣٦,٥، بن دەست ٣٦,٧ پلەیە.

پ ٣٤- چەند ئێسك (پێشە) لەلەشی مرۆڤ دا هەیە؟

و- ٢٠٠ پارچە و بەم جۆرە:

سەر ٢٢ پارچە.
پشت ٢٦ پرگە.
پەراسوو ٢٥ دانە.
شان و دەست ٦٤ پارچە
لەگەن و پێیەکان ٦٢ پارچە
٢٠٠ گشت

پ ٣٥- ناوی قوتابخانەکانی سیاسەت هەڵ دە؟

و- ئەپۆلۆتیسم، ئەنارشیتیسم، ئیمپریالیسم، ئەنترناسۆنالیسم، دیموکراسی، دیکتاتۆری، رادیکالیسم، ریالیسم، راسیۆنالیسم، سۆسیالیسم، ناسیۆنالیسم، فاشیسم، مارکسیسم، فئودالیسم، کۆمۆنیسم، کاپیتالیسم، ماتریالیسم، میلیتاریسم، نهیلیسم.

پ ٣٦- ج ڤیتامینێك بۆ کەم خوێنی باشە؟

و- ڤیتامین B

پ ٣٧- جاڵجاڵۆکە چەن پێی هەیە؟

و- هەشت پێ.

پ ٣٨- لە باری سروشت ئاساییدا دڵ چەند جار لە دەقیقەیەك لی دەدا؟

و- ٢٥ جار.

پ ٣٩- چەند ئۆکسجین لە ٢٤ سەعات دا دەڕواتە ناو سیی مرۆڤەوە؟

و- ٢٣٠٠ لیتر.

٥٤٠ پاپای کاتولیك و دەرباری پاپا

تاکو ئێستا ٢٦٤ پاپا زیاتر لە جیهانی مەسیحیەت دا فەرمانڕەواییان کردووە. تەواوی ئەو پاپایانە بە جێ نشینی (سان پییر) دەژمێردرێن.

ئەم سان پییرە یەکێك بووە لە هەوەدەمەکانی عیسا ناوی پییر واتە بەرد. ئەم ناوەش حەزرەتی عیسا لێی ناوە، پێی وتووە تۆ بەردێکی کڵێسای خۆمت لەسەر بنەڕەت دادەنێم.

تا پێش فەرمانڕەوایی شارلەمان پاپا و دەستگای پاپا هێندە خاوەن دەسەڵات و دەرکەوتوو نەبوون. بەڵام بە هاتنە سەرکاری شارلەمان هێز و توانا پاپا گەلێك فراوان بوو بە تایبەتی دوای دەرکردنی فەرمانە بەناوبانگەکەی شارلەمان کە لە ساڵی ٧٨٥ی زایین دا دەری کردووە و دەڵێ:

١- هەر کەسێك بۆ کەم ڕێزیی ئاینی مەسیحیەت ڕۆژووی گەورە نەگرێت تاوانی کوشتنە.
٢- هەر کەسێك لەشی مردوویەك بسووتێنێت تاوانی مەرگە.
٣- هەر کەسێك بەزۆر بڕوانە ناو جێگای نوێژدوە تاوانی خنکاندنە.
٤- هەر کەسێك لەو ڕووانەوە کەمتەرخەمیی بنوێنێت و پیاوە ئاینییەکان لێی رازی نەبن سەرانەی لێ دەستێنرێت.

بێ گومان دەرکردنی ئاوا فەرمانێك دەسەڵاتی پاپا و پیاوە ئاینییەکانی بە ڕادەیەکی گەلێك زۆر دەرخستووە و بوودتە هۆی ئەوە پیاوە ئاینییەکان لە بچووك و گەورە ڕووداوەکانی ژیانی خەڵك دا بەبن بە مووی لووت و پەنجەی تێ بخەن.

لە سەرەتای سەدەی چواردەمەوە دەربارەی پاپا گوێزراوەتەوە بۆ کۆشکی ئیمپراتۆریی "لاتران". لە ساڵی ٣٢٤ ز کۆمەڵەیەك لە ئەسقوفەکان پێك هات و پایە و مەقامی پاپایان ناسی و دانیان پێ دانا. لە ساڵی ٤٥٥ی زایینیش دا ئیمپراتۆریش پایەی پاپای ناسی و دانی پێ دانا.

دوای پەلاماری هۆزە درە سەرەتاییەکان و بڵاوبوونەوەی خوێن ڕێژی و وێرانی و کوشتن و بڕین لە دونیای مەسیحیەت دا تا ڕادەیەکی زۆر خەڵکەکە پەنای هێنایە بەر ئاین و مەسیحیەت.

ئەمڕۆ دەربارەی پاپا لەلایەن کەسانێکەوە بەڕێوە دەچێت کە بە سێ بەش دابەش کراوە:

١. ئەندامەکانی ئەنجوومەن.
٢. قازییەکان.
٣. ئەندامەکانی دەفتەرخانە.

بەڵام تەواوی فەرمانەکان لەلایەن پاپاوە دەردەچێت ئەم سێ دامەزراوە لەلایەن ئەنجومەنێکەوە بەڕێوە دەبرێت کە لە ڕاستیدا بە چاو و گوێی پاپا دەژمێردرێن ئەم ئەنجومەنەش کاردینالێک هەڵی دەسووڕێنێ کە لە ڕاستیدا هەم سەرەک وەزیرە و هەم وەزیری ناوخۆیە و هەم وەزیری دەرەوشە.

تەواوی کاروباری پاپا و گرفتارییەکانی دەربارەی پاپا و دونیای مەسیحیەت لەلایەن کاردینالەکانەوە بەڕێوە دەبرێت. بێ گومان ڕابەریی دونیای مەسیحیەت کارێکی سادە و ئاسان نییە. ئەمەش بە چەند کەسێك هەڵ ناسووڕێ جا بۆ ئاسان کردنی کاروبار (دەربارەی پاپا) لە ساڵی ١٣٤٥ی زایین دا زۆر لە پیاوە ئاینییەکانی هێنایە ناو دەزگای فەرمانڕەواییەوە. ئەوانەش کە لە دەرباری پاپادا فەرمانیان هەڵ دەسووڕاند هەر هەموویان کڵاوی سووریان لەسەر دەنا ئەوسا پێش دامەزراندنی دام و دەزگای ئەتەوەنامە (جنسیە) و لەدایك بوون و مردن و ژن هێنان، ئەم کاروبارانە هەمووی لەلایەن کڵێساوە ئەنجام دەدرا.

لەسەدەی دوانزدەدا دەسەڵاتی پاپا و دەربارەکەی گەیشتە هەلهەلە و ئەوپەڕی دەسەڵات. لە پاشاوە تا هەزار وەکو یەك مل کەچی فەرمانی پاپا و دەربار بوون.

## پشکنینی بیروڕا یان دادگاکانی پشکنین

کۆنگرەی بەرز و ڕێکخراوی پشکنین کە تا بە ئەمڕۆیش لە دونیای مەسیحیەت دا هەر ماوە بەڵام نەك بەو توند و تیژی و دڕییەتییە.

ڕێکخراوی پشکنینی بیروڕا لە سەردەمی پاپا "کریگۆری حەوتەم" دا پێك هاتووە و گەیشتوتە بۆیەی خوێن ڕژان و ئازاردانی خەڵکی، ئەم پاپایە لەو باوەڕە دابوو کە ئەسقوفەکان زۆر بە تەنگی ئاینی مەسیحیەتەوە نین بۆیە وا بێ دینی بڵاوبوەتەوە تا کەسانێکی تایبەتی پێك هێنا و بە هەر لادا هەناردیانی وبە بچووکترین تومەتەوە خەڵکیان دەکوشت یان دەسووتاند، بێ لێ پرسینەوە، بێ دادگا، بێ لێکدانەوە لە سەردەمی یەکێك لە پاشاکان دا لە یەك ڕۆژدا ١٨٣ کەسیان بە زیندوویی سووتاندوە.

ڕێکخراویپشکنینی بیروڕا سەردەمێك لە خوارەوەی وڵاتی فەرانسادا و ئیتالیادا بە شێوەیێکی بێ دەربەستانە خەڵکیان دەکوشت و دەسووتاند، کە تا بە ئەمڕۆ گەورەترین ئەنگ و ڕیسوایی دونیای مەسیحیەت و کڵێسا دەژمێردرێت.

لەساڵی ١٥٥٧ی زایین دا پشکنینی بیروڕا لیستەیەکی دەرهێنا و دەربارەی ئەو کتێبانەی وا دژ بە ئاینین یان لەگەڵ ئاینی مەسیحیدا ناگونجێن، ئەو لیستەیەش هەموو جۆرە شتێکی تێدا بوو لە شانۆییەوە بیگرە تا هەڵبەست و داستان. هەتا وەکو گالیلۆی زانیاریش ئەوەندەی ئەمابوو دەربارەی پاپا بیسووتێنن و زۆربەی کتێبەکانیان سووتاند.

بێ گومان ئەمڕۆی دەربارەی پاپا گەلێك جیاوازە لەگەڵ ئەوسادا، جیهانی زانیاری و تەکنەلۆژیا بە ڕادەیەك پێش کەوتووە کە زۆر بیر و ڕای کۆنەپەرستانەی هەڵ وەشاندوەتەوە و دەربارەی پاپایش هێندە خۆی لە قەرەی زۆر شت نادات.

## کۆنگرەی پرۆپاگەندە

لەساڵی ١٦٢٢ی زایین دا پاپا گریگۆری پانزدەهەم ئەم کۆنگرەیە لە پیاوە روحانییەکانی دەربارەی خۆی پێك هێنا بۆ بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحیەت، لە ساڵی ١٩٠٨ دا کۆنگرەی مارە برین و ژن هێنانیان پێك هێنا لەسەر چەند مەرجێك کە پاپا بەپێی ئەو مەرجانە دای دەنا ئایا ئەو ژن هێنانە رەوایە یان ناڕەوا، وەکو ئەگەر کچە یان کوڕە منداڵ بێت و نەگەیشتبێتە تەمەنی ژن هێنان یان شووکردن. یان کاروباری ژن و مێردی بە یەکێکیان هەڵ نەسووڕێت یان جۆری پێوەندییەکە حەرام بێت.

یان کچێك بە زۆر لە پیاوێك مارە بکەن، ئەم مەرجانە بۆ پاپا هەبووە و توانای هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیوەندییەی پێ داوە.

بەڵام دەربارەی ناسازگاری و لە دەست دانی بەشێکی لەش، بۆ ئەمانە دادگاییێکی دوانزدە نەفەری لەلایەن پاپاوە هەڵ دەبژێردرێت و بڕیار دەدەن.

## ئاینی پرۆتستان:

لەنیوەی سەدەی شانزدەهەم دا بیروڕاکانی "لۆثەر" کە خەڵکی ئەڵمانیا بووە و (کالڤن) کە خەڵکی فرانسە بووە دونیای مەسیحیەت و دەربارەی پاپای کۆنە ساڵی هێناوەتە لەرزین.

لۆثەر لە ساڵی ١٤٨٣ لە یەکێك لە ناوچەکانی ساکسی ئەڵمانیا هاتوەتە دونیاوە. باوکی کرێکاری (کان) دەرهێنان بووە. سەرەتای ژیانی لۆثەر پڕبووە لە هەژاری و کوێرەوەری. لە بیست و دوو ساڵیدا رۆیشتۆتە سەومەعەوە و لە ئەنجام دا بووە بە کەشیش و لەبەر ئەوەی قسەڕەوان و شیرین زمان بوو بە مامۆستای "حیکمەتی ئیلاهی" هەڵبژێردرا.

بیربەرزی و وردبینی و وردەکاری لۆثەر هەمیشە هەستی ناسکتر لە گوڵی جووڵاندووە و هەردەم وای زانیوە کە شەیتان لە دەروبەریدا دەخولێتەوە و دەیەوێ هەڵی خەڵەتێنی و تەفرەی بدات.

لە ساڵی ١٥١١ دا کاتێك نێردراوە بۆ شاری رۆما و دەرباری پڕ بریق و هوڕی پاپای دیتوە و هەڵسان و رەفتاری پڕ فیزی کاردینال و ئەسقوف و پیاوە ئاینییەکانی دەربارەی سەیر کردووە هێندەی تر ئاڵۆز دەبێت.

چەند ساڵێك تێ دەپەڕێت، لیۆنی دەیەمی پاپای گەورە بۆ دروست کردنەوەی کڵێسای (سان پییر) پێویستی بە پارە دەبێت جا بڕیاری دا کە خەڵکی دەتوانن خۆش بوون لە گوناحەکانیان بە پارە بکڕن.

ساڵی ١٥١٧ لۆثەر یەکەمین جار دژ بە فەرمانی گوناح بەخشینی بە پارە هەستا و لەسەر بناغەی ژیری و مەنتیق توانی خەڵکێکی زۆر لە خۆی گلێر بکاتەوە. رای گەیاند ئاینی مەسیحی بریتییە لە بڕواهێنان بە ئنجیل و مەسیح و بەس. پاپا بڕیارنامەی کوفر و بێ دینیی لۆثەری دەرهێنا، ئەویش بڕیارنامەکەی هێنا لە گۆڕەپانی شار لەناو قوتابییەکانیدا سووتاندی.

دەربارەی پاپا لە هەڵێك دەگەڕان ئەم زانایە لەناوبەرن کە زۆر لە رەفتارەکانیانی بە ناڕەوا دەزانی.. لۆثەر بۆ ماوەیەك خۆی شاردەوە، لەو ماوەیەدا ئنجیلی وەرگێرایە سەر زمانی ئەڵمانی.. کە خۆی دەرخست ئیتر دام و دەزگای پاپا نەیان توانی زەفەری پێ ببەن، بەرەبەرە پەیڕەوانی رێبازەکەی بە وڵاتان بڵاوبووەوە و ناونرا "پرۆتستان".

# ئافرەت و نهێنییەکانی

ئافرەت تێکڕا ئایینێکی جیان و ڕەوشتێکی جیاوازن، دەرد و دەرمانێکی تێکەڵن، بۆلە شتێکن تێکەڵ بە هەموو شت. خامەی مرۆڤ ئاسان توانای ئەو باسەی نییە، توانایی زمان و بیر و ووتوێژی ناتوانێ بە ئاسانی خۆی لە قەرەی ئەو دەریا قووڵە بێ بنە پڕ نهێنییە بدا و بتوانێت باڵەمەلەی تێدا بکات.

## ئافرەت جادووە !!

ئافرەت گیانلەبەرێک بووەو هەمیشە لە ناخ و بیری زانا و فەیلەسووف و نووسەر و بیرکەرەوە و بلیمەت و کاربەدەست و فەرماندەر و هەژار و دەوڵەمەند و گێل و ئاگادا ژیاوە؛ هەر یەکە بە جۆرێك بەعلام لە پێویستی ئافرەت دا بۆ پیاو بۆ ژیان هەموو پێکەوە هاوڕان.

زۆربەی ڕووداوە گرنگەکانی مێژوو و پیاوە ناسراوەکانی مێژووی مرۆڤ سێبەری ئافرەتیان تێدا دیارە – لە پشتی پەردەوە –.. هەر نەبێت بۆ وردبین "ڕیزەکار" تاپۆکەی نیونیگا خۆی دەنوێنێت !

لە کۆنی کۆنەوە ڕواڵەت و قەد و پەیکەری ژنانە ئافرەت هۆ و هاندەری زۆر شت بووە؛ لە دەرکردنی ئادەمەوە لە بەهەشتی بەرین تا کوشتنی هابیل لە گومڕاکردنی فریشتەکانی خواوە هارووت و ماروت تا لە بەنکێشانی یووسفی پەیامبەر.. لە سەرسوڕمانی حەزرەتی نووحی گەورە تا بەلقیسی لای سلێمان پەیامبەر و تا پێوەندکردنی سامسۆنی پاڵەوان.. لە بە کوشت دانی سزار و ئەنتۆنیۆوە تا سەرکەوتن و سەرالێژیی ناپلیۆن تا تێك و پێك دانی بنەماڵەی ڕۆمانۆف و ڕووداوەکانی راسپۆتینی ژن پەرست !! هەر هەمووی ئەمانە ئافرەت ئاکتەری یەکەمی ڕووداو بوون، ئافرەت هۆی ڕاستەوخۆی پێك هێنانی مێژوو بوون. ئافرەت زیندوویکی تێکەڵە بە توانا و بە هێز .. ناسك و نەرم و نیان، دڵ ڕەق و خوێن ڕێژ و بە پەلامار..

لە هەست و دڵ ناسك و ناوڕ ناسك، خواوەندی خۆشەویستی ئەڤین لە هەمان کات دا دڵێکی وەك پۆڵا و پڕ قین.. ئافرەت گەنین، زەردە خەنەیە، حەزە، ئێشە.

ئافرەت تیشکی خوایە.. گڵپە و گڕ و بڵێسەی ئاگرێکی هەتا هەتایە.. هەناسەیە، ئارەزووە، تاسەیە. ئافرەت نەوایە، چیرۆکی خوایە، ئافرەت گەزە، هەڵەتە، سەختە. ئافرەت سەوزەڵانییە، تەختەلانییە، ئافرەت دووریانە، ژیانە، هاتونەهاتە، خۆمانین ئافرەت خەڵاتە !!

## ئەفسانەیەك دەڵێ ئافرەت چۆن خولقاوە

خواوەند دوای دروست کردنی زەوی و ئاسمان و قووڵایی گەون و حەوت نهۆمی ئاسمان و پیاو.. کەوتە بیرکردنەوە ئافرەت لە چی دروست بکات؟ لە چ هەوێن و کەرەستەیەك ؟ کەوتە بیرکردنەوە تا ڕای هاتە سەر ئەوەی؛

لە مانگ ئاوڕ،

لە هەتاو تیشك،

لە ئەستێرە جریوە،

لە هەور فرمێسك،

لە گوڵ ڕەنگ و بۆن،

لە پەلوپۆی دار و سەروە باڵابەرزەکان نەرم لەنجە و نیان هەنگاونان،

لە شنەی شەماڵ ناسکی،
لە ئاگر گڕ و گلپە،
لە دەریا شەپۆلی تاوتاو و نەرمی و نیانی و هەڵهەڵە،
لە بەرفر سارد و سڕی،
لە سەگ وەفا،
لە هەنگوێن شیرینی،
لە ئەڵماس پتەویی،
لە زێڕ بریقە،
لە تاووس خەرامان ڕۆیشتن،
لە ئاسك نیونیگا،
لە پڵنگ دەری و ئاڵۆزی،
لە ڕێوی فێڵ،
لە دووپشك پێوەدان،
لە ڕۆژگار بۆنەهاتن،
لە تووتی گلەیی،
لە ئاونگ پەسندی و نەرمی..

ئەمانەی هەموو تێکەڵ کرد ئافرەتی لی دروست کرد و ناردییە سەر زەوی و کردییە هاوجووتی پیاو !
دوای حەفتەیەك پیاو بە هەوڵداوان خۆی گەیاندە بارەگای خوا بە کڕنوش دا چوو گوتی:

ئەی خوای گەورە هەرە گەورە ! من ژیانم بە دەست ئەم گیانلەبەرەوە وا داوتە پێم نەماوە، هەناسەی سارد کردووم، بزەی لە لێوم بڕیوە، کڵۆڵ و بی دەرەتان لێی وەستامەتەوە، هەراسان بووم بەدەس گریانی لەسەر هیچی، لەدەس سکاڵای بێ پایانی ! ئەم هەموو لاواندنەوەیە بە من ناکرێت. جا وا هێناومەتەوە، ئەم دیارییەم ناوێت. گەلێك سوپاس.

خواوەند فەرمووی: باشە دایبنی و بڕۆ دوای حەفتەیەك، پیاو دیسان خۆی گەیاندەوە بارەگای خواوەند و بە کڕنوش دا چوو گوتی:

ئەی خوای بێ هاوتا! بۆم دەرکەوت من ناتوانم بێ ئەو گیانلەبەرە درێژە بە ژیان بدەم. بیرم دەکەوێتەوە کە چۆن ناز و گریشمەی دەنواند، لەسەر نووکی پەنجە بە لەنجەولار لە دەورم دەگەڕا و جاروبار بولبول ئاسا گۆرانیی بۆ دەگوتم، ئازاری لەبیر دەردەکردم. جای ئەی خوای هەرە گەورە هاتووم تابم دەیتەوە !
خواوەند ئافرەتی گەڕاندەوە بۆ پیاو.

دوای چەند ڕۆژێك پیاو لە جاری پێشوو پەریشان تر خۆی گەیاندە بارەگای خواو دوای گەڕانەوە ئافرەتی کرد بۆ لای خوا.

خوا فەرمووی: هۆ پیاوەکە. دەبێ بڕیارێکی تا سەر بدەیت.. ئەمە وانابێت دەی بڕیار بدە! پیاو گوتی : ئەی خوای بێ هاوتا ! من ناتوانم لەگەڵ ئافرەت دا بژیم !

خواوەند فەرمووی: هەستە بڕۆ چارەی خۆت بکە، نە بێ ئافرەت دەتوانیت بژیت و نە لەگەڵ ئافرەتیش دا دەتوانیت بژیت !.

## ئافرەتی نایاب

ئافرەتێك باوەڕی بەبیروڕای خۆی هەبێت.

١- ئافرەتێك لە مێردەکەی نەپرسێت ئەرێ لە کوێ بوویت ؟
٢- ئافرەتێك ئارەزوو نەکات گرانترین بەرگ لەبەر بکات.
٣- ئافرەتێك هەوڵ نەدات لۆچ و خەتی رووخساری بشارێتەوە.
٤- ئافرەتێك تەنیا بیری هەر مێردەکەی بێت.
٥-

## باوەڕ بە ئافرەت مەکە

- ئەگەر پێکەنی و.. ئەگەر گریا.
- ئەگەر خۆشەیستی و .. ئەگەر گوتی من خۆشەویستی نازانم.
- ئافرەتێك بڵێ نامەوێ شووبکەم.
- ئافرەتێك بڵێ بیروڕای لەسەر بیر و ژیرییە زیاتر لە هەست و حەز.
- ئافرەتێك بڵێ هەرگیز ئارایشت ناکا و نەی کردووە.

## دوژمنانی ئافرەت دەڵێن :

لە مێووی پێش کەوتنی پیشەسازییەوە تاکو ئێستا ئافرەتێك هەڵ نەکوتووە بۆ یەکەم جا رشتێك دا بهێنێت یان دروست بکات یان درەستی کردبێت. یان ئاوازێکی بەناوبانگی دانابێت. یان لە پزیشکی دا دەسەڵات دار بووبێت. یان تاکو ئێستا پەیامێکی خوای پێ سپێردرابێت. یان گەیشتبێتە رادەی فەیلەسووف !

**ئەمانە لەگەڵ بیروڕای ئافرەت دا ناخۆن**

خەسو و ژن
نهێنی و ئافرەت
بێ دەنگی و ئافرەت
تەمەنی راستەقینە و ئافرەت
پیری و ئافرەت
خزمی مێرد و ئافرەت
بە کورتی : ئافرەت و ئافرەت

**خوا ژنی تووشی چواردە ژان و سزا کردووە**

بێ نوێژی
قورسی سك پڕی
ئێشی منداڵ بوون
ئاین ناتەواوی

میراتی نیوەی پیاو دەکەوێت
دوای تەلاق دان، یان مێرد مردن شوونەکردن تا ماوەی (عدة) بەسەر دەچێت
کەم ژیری
ژێر دەستەیی پیاو
تەڵاق لە دەست پیاوە نەك ژن
غەزا لە پێناوی خوادا "جهاد"
پێغەمبەریان تێدا هەڵ نەکەوتووە
ناکرێت بە فەرمانڕەوا
نابێت بە تەنیا بڕوات بۆ سەفەر و گەشت
سەڵاویان لێ ناکرێت

## ئەفسانەیەکی هیندی دەڵێ

خواوەند گیانلەبەرێکی بەهێزی دروست کرد بەناوی پیاو پێی گوت تۆ بەختەوەری کرد بەناوی پیاو پێی گوت تۆ بەختەوەری؟
پیاو وەڵامی دایەوە : نەء.
خواوەند فەرمووی: باشە ئەی چیت دەوێ؟
پیاو گوتی: ئاوێنەیێکم دەوێ خۆم و کرداری خۆمی تێدا ببینم. سندووقێکم دەوێ گەنجینەکانمی تێدا دابنێم، سەرینێك سەری لەسەر دانێم، روو پۆشێك لە کاتی دڵ تەنگیم دا لە پشتیوە ڕوومی لی بشارمەوە، یارێك دڵشادم بکات، پەیکەرێکی جوانکیلە لە گلینەم دا بیر و ڕایەك جارجارێك بەربەرەکانیم لەگەڵ بکات.
ئەوجا خواوەند ئافرەتی بۆ خوڵقاند !

## ئافرەتی باش لای زانا

لە هەستان دا قەد و باڵای بەرز و کەڵەگەت،
خانومان ئەگەر دانیشت،
راستگۆ ئەگەر ئاخاوت،
خۆگر و لەسەر خۆ لە تووڕەیی و ئاڵۆزیدا،
لە کەنین دا بە بزە پێکەنین،
ئەگەر ویستی کارێك بکات بە چاکی بیکات،
فەرمان لە گوێی مێردی بێت،
لووت بەرز و بە فیز نەبێت،
باش منداڵی بوێت.

## لە ئافرەت دا پەسند ناکرێت

ئێسکی دەرپەڕیو "بەرجەستە".
زۆر قەڵەوی.

نەکەوێتە بێ نوێژییەوە.
چڕی و پانیی برۆ و مووی زۆر.
لووتی پان یان لار.
چاوی تەسک و خێل.
زمان پان، ددان درێژ و دەم زل.
مەمك بچکۆلە و پشتی درێژ.
بازوو باریك و دەست زل.

## لەکۆنەوە گوتراوە

زۆر ژن خووی ئەم جانەوەرانەیان هەیە:

*بەراز، مەیموون، سەگ، مار ، هێستر، دووپشك، مشك، پەلەور، ڕێوی، کاوڕ.*

ئەوەی کە وەکو بەرازە تەنیا بیر لە خواردن دەکاتەوە. ئەوەی وەکو مەیموون وایە، هەر جل و بەرگی ڕەنگاورەنگ لەبەر بکات و هیچی دی نا. ئەوەی کە وەکو سەگ وایە: وەفادارە و وەڕینیشی هەیە. ئەوەی کە وەکو مار وایە: بۆ مێردەکەی خۆی ناسك نیشان دەدا بەڵام لە ڕاستیدا دڕ و ئاڵۆزە.. ئەوەی کە وەکو هێستر وایە: لەسەر یەك پێ وەستان و لاساری هەیە ئەوەی کە وەکو دووپشك وایە: هاتوهووت کەرە لەناو دەر و دراوسێدا هەروەها بلاوکەرەوەی نارێکی و دووبەرەکییە. ئەوەی کە وەکو مشك وایە: پارە لە مێردەکەی دەدزێت. ئەوەی کە وەك پەلەورە: هەر خەریکی گەڕانە بێ وچان دان مەگەر شەوان. ئەوەی کە وەکو ڕێوی وایە: ئاژاوە چییە و گۆبەند نانەوە پیشەیەتی. ئەوەی وەکو کاوڕ وایە: هەرچی چاکە بێت حەزی لێ دەکات، هەمیشە خەریکی خێرخوازی و مرۆڤایەتییە.

## منداڵانی جیهان ئاوەها دایکیان بانگ دەکەن:

منداڵی کورد: دایە
منداڵی میسر: ماما
منداڵی هۆڵەندی: ماتکا
منداڵی رووس: مانجیە
منداڵی ئینگلیز: مەذەر
منداڵی نەمسایی: موترك
منداڵی بەلجیکا: مام
منداڵی تورك: نینا
منداڵی عەرەب: یا امي
منداڵە ژاپۆنی: هاها

## گوتراوە

ژن و ژن: هەرا
ژن و پیاو: خۆشەویستی

پیاو و دوو ژن: دۆزەخ

## بیروڕای گەلان دەربارەی ئافرەت

قولەرەش: کەرەستەیەکە دەکڕدرێ و دەفرۆشرێت.
عەرەب: گوڵ و رەیحانەی مرۆڤە.
فارس: شەیتانێکی بێزراوە.
چین: کچی ئەژدیهایە.
ژاپۆن: گوڵی گەشاوەی ژیانە.
ئینگلیز: بنەڕەتی خێزانە.
ئەمریکی: نیوەی پیاوێکی بە هێزە.
فەڕانسە: دەستە گوڵی تێکڕای کۆمەڵە.
ئەڵمانی: گەلێك لە باوك و کەس و کاری زۆرتر بیرە دەخواتەوە.
کورد: بەعیشوە زولفی لادا لەسەر عوزار و زاری
دوگمەی کرای ترازا بزووت هوای بەهاری
کە شەو بەیانی بەردا گوڵ و وەنەوشە باری
سەودای بە عاشیقان دا باغی گوڵ و هەناری
دونیایەك ئینتیظاري شیرین تەشی دەڕێسێ
- وەفایی -

## فیکتۆر هیگۆ دەربارەی ژن و پیاو وتوویەتی:

پیاو دەریایە
ئافرەت دەریاچە و گۆم.
دەریا مرواری دەیرازێنێتەوە
دەریاچە دیمەنی خەیاڵی و سروشت
پیاو هەڵۆیەکە بە ئاسمانەوە لە فرین دایە و بەسەر ئەوەی کە لە ژێرییەوە فەرمان ڕەوایی دەکا
ژن بولبولێکی خۆش ئاوازە و فەرمان ڕەوای دڵ و هەستە
پیاو چرایەکی بە دەستەوەیە ناوی ویژدانە
ژن ئەستێرەیەکی هەیە ناوی هیوایە
چرا رۆشن دەکاتەوە و هیوایش کەم کەم وەدەردەکەوێت
پیاو بە زەوییەوە چەسپاوە
ئافرەت بە ئاسمانەوە

## ئافرەت داستانە

ئافررەتی فڕانسای: داستانێکی خۆشەویستییە.

ئافرەتی ئەڵەمانی: داستانێکی راستەقینەیە.
ئافرەتی رووسی: داستانێکی نەتەوایەتییە.
ئافرەتیمیسری: داستانێکی خەیاڵییە.

## ژنانی گەلان

رۆژهەڵاتی: نموونەی ناسکی و نازەنینی.
رۆژاوایی: زیرەکی و ناز.
ئینگلیزی: کلیلی خۆشبەختیی ژیان.
ئەمریکا: دەست بڵاو و گەلێك سەربەست.
ئەڵمان: دوور لە ناسکیی ژنانە.
تورك: جوانترین ئافرەتانی دونیا.
نەمسا: خاوێن ترین ئافرەتی رووی زەوی.
ئەسکەندەنافی: گوێ هەڵ دەخا بۆ مۆدە و داهاتووەکان.

## ئافرەتی ولاتانی رۆژهەلات

بەناوبانگن بە:
تورك: ناز و گریشمە
ئێرانی: قەد و باڵا
یەمەنی: ناوقەد باریکی
حیجازی: چاو جوانی
سووریای: سنگ بەرزی
میسری: خوێن سووکی
کورد: لەنجەولار و ناز و ئەدا

## ئافرەتانی یەکەم

١. یەکەمین شاژن لە وڵاتی میسردا کچی "ئەتریب" شا بووە.
٢. مادام ئەفریل سان کوری خەلکی فرانسە یەکەمین ئافرەتێك بووە کە میدالیای زێری تەندروستیی وەرگرتووە.
٣. مادام ئەلکساندر کۆلنتای یەکەمین نوێنەری ئافرەت بووە لە دونیادا کە رابەریی باڵیۆزخانەی یەکیەتی سۆڤیەتی کردووە لە وڵاتی نەرویج دا.
٤. یەکەمین پارێزەری ئافرەتی ڤولەرەش (ماریان بو) بووە لە وڵاتی ئەمریکا.
٥. یەکەمین ئاکتەری ئافرەت کە چووەتە سەر شانۆ مسز کلیان بووە و لە ساڵی ١٦٥٦دا بووە.
٦. ماریا مالا بوراری یەکەمین ئافرەتێك بووە لە وڵاتی یۆنان دا بووە بە پارێزەر.
٧. ساڵی ١٩٠٧ بۆ یەکەمین جار ئافرەتێك بەناوی "لالولیە" خۆی هەڵبژارد بۆ بەڕێوەبردنی شارەوانیی شاری پاریس.

٨- یەکەمین یادگارێك کە دروست کراوە بۆ گۆڕی ژنێك "تاج محەل"ە لە وڵاتی هیندستان کە لە (١٦٣١) ز بۆ شاژنە "نورجهان" دروست کراوە.
٩- یەکەمین پەیکەری میسری پەیکەری شاژنە (نەفرتیتیی) ژنی فیرعەون ئەخناتوونە.
١٠- مسز "بارکلی" بە یەکەمین ئافرەت دەژمێردرێت کە داستانێکی نووسیوە، لە بایەدا ٢٥٠٠٠ دۆلاری وەرگرتووە.
١١- سارە بەرناردی ئاکتەری شانۆیی نزیکەی ٣٠٠٠٠ جار بەسەر تەختەی شانۆوە مردووە، ١٠٠٠٠ جاریش بە ژەهر مردووە ٧٠٠٠ جاریش لە ئاودا خنکاوە هەروەها ٥٨٠٠ جاریش گوللەی بە خۆیەوە ناوە.
١٢- ساڵی ١١٢٤ز بۆ یەکەمین جار قردێلەیان بە زوڵف و ئەگریجی دا هەڵواسیوە بۆ ئەوەی بە چاوی حەسوودەوە نەبن، ئەمە باوەڕی ئافرەتانی چین بووە و بۆیە قردێلە داهاتووە.

## باوەڕ بکە:

١- ئافرەتێك لە وڵاتی یۆگۆسلاڤیا بەناوی "ماشیوبویر" لە ماوەی ٢٨ ساڵ دا ٢٨ کوڕی بووە، هەر هەمووشیان نەمردوون و ماون.
٢- ئافرەتێکی خەڵکی ناوچەی کالیفۆرنیای ئەمریکای بەناوی "بیتی هیلی" نەمرد تا ٢٥٦ کەسی لە کوڕ و کوڕەزا و و کچ و کچەزای خۆی نەدی. لە ساڵی ١٩٥٦ دا مرد.
٣- ژنێك بەناوی فاسیلیست گشتی ٦٩ منداڵی بوو.
٤- ژنێکی "دی ماڵدنیر" ناو بەپێی یاسای ریاضیات منداڵی بووە:
ساڵی یەکەم یەك منداڵ
ساڵی دووەم دوو منداڵ
ساڵی سێیەم سێ منداڵ
ساڵی چوارەم چوار منداڵ
ساڵی پێنجەم پێنج منداڵ
ساڵی شەشەم شەش منداڵ.
لە سکی شەشەم دا مردووە ئەم رووداوە لە وڵاتی فەرەنسەدا تۆمار کراوە.
٥- مادام مۆنتاجیست خەڵکی شاری پاریس حەڤدە کوڕی بووە بەڵام لە چوارادە مێردان.
٦ لە مێژووی کۆنی یۆنان دا باس کراوە "لیۆن" ئافرەتێکی جوانکیلە و شۆخ و شەنگ بووە ئاگاداری پیلانێك دەبێت لەنێوان دۆستەکەی و دۆستی دۆستەکەی دا، بۆ ئەوەیش نەیگێڕێتەوە زمانی خۆی لەبن دا دەبڕێت. خەڵکی شاری ئەثینا پەیکەرێکی بۆ دەکەن بە شێوەی دەڵەشێر لە گۆڕەپانیشاردا.
٧- سۆفیا ریا وولف دوای مردنی مێردەکەی بە خاڵ لەسەر زمانی خۆیدا کوتاوە چونکە زمانی ئەو بوو بووە باعیسی مردنی.
٨- ماجدەلینا ستەرمرزوك خەڵکی شاری تۆبۆلسك لە وڵاتی رووسیا هەر دوو مەمکی لە پیشتییەوە ڕووا بوون، سێ منداڵیشە پێ بەخێوکردن.
٩- ئافرەتێکی خەڵکی ئیسپانیا شەل بووە کە مردووە وەسیەتی کردووە هەر شەلێك کەوتە دوای تەرمەکەی ٥٠٠ فرانکی بدرێتێ.
١٠- برژانگی کچێکی چینی بەناوی کالیسینگ دە سانتیمەتر درێژ بووە.

## شاژنەکان و نهێنییەکانیان:

١. ئەلیزابێتی یەکەم زۆر حەزی لە جل و بەرگ دەکرد, دوای مردنی ٢٠٠٠ دەستە جلکی لە پاش بەجێماوە.
٢. ئان پۆلینی ژنی هەنری هەشتەمی پاشای ئینگلتەرە هەمیشە دەسکێشی لەدەست دەکرد تا پەنجە شەشەمینەکەی وەردەرنەکەوێت.
٣. کاترین شاژنی رووسیا هەر کاتێك بی ویستایە پێبکەنێت دەی گوت ژێر پێی ختوکە بدەن ! هەموو بەیانییەکیش پێنج پیالە قاوەی دەخواردەوە.
٤. کیلۆپاترا حەزی لە خواردنی کاڵەك و سیر دەکرد.
٥. "ئۆژین"ی ژنی ناپلیۆنی سێیەم ئەو کەوشانەی لە پێی دەکرد بۆ جاری دووەم هەرگیز لە پێی نەدەکردەوە.
٦. ئەلیزابێتی شاژنی وڵاتی ئەمسا کاتێك کە دەخەوت پارچەیەك ئاورێشمی تەڕی بەناوقەدییەوە دەبەست چونکە لەو باوەڕە دابوو کە ئەمە یارمەتییە بۆ ناسکیی پێستی لەش و ناوقەدی.
٧. (ماری) شاژنی وڵاتی یۆگۆسلاڤیا پێوەندی خزمایەتیی زۆر نزیکی لەگەڵ ١٣ پاشای ئەورووپادا هەبووە.
٨. (ماری تریزا) شاژنی وڵاتی ئەمسا دایکی شانزدە کوڕ و کچ بووە سێ دانە لە کوڕەکانی بوون بە ئیمپراتۆر و دوو دانە لە کچەکان بوون بە شاژن.
٩. ژنی لویسی چواردە داوای لە پزیشك کردووە کە ئەختێك خوێنی پاك بکاتەوە تا کاتێك لە دەربار "واتا کۆشکی شاهانە" دا باسی چۆنیەتی رابواردنی شەوانە دەکرێت وا خوێن ئەڕژێتە دەم و چاوی و سووربێتەوە.

### ڕەوشتی ژنانە

١. لە وڵاتی غانادا ژنانی ئاووس گۆشتی مار ناخۆن چونکە لە باوەڕێك دان منداڵەکانیان گێل دەردەچێت.
٢. لە وڵاتی ئەنگۆلای رۆژهەڵات دا ئەگەر ژنێك بەسەر منداڵەوە مرد پیاوەکە دەبێت خوێنی ئەو ژنە بداتە کەس و کاری ئەگەر نەیتوانی دەبێ ببێتە کۆیلەیان.
٣. لە ئەفریقیای رۆژاوادا تا سەردەمێك لەمەوبەر هەر ژنێك دەیەمین منداڵی زیندە بە چاڵ دەکرا.
٤. لە یاسای کۆنی ئەڵمانیادا هەبووە هەر ژنێك ببێتە هۆی مردنی منداڵەکەی زیندە بە چاڵ کراوە لەگەڵ سەگێك و مارێك و پشیلە و کەلەشێرێك دا.
٥. بیروڕای چینییەکان وابوو هەر ژنێك ئەگەر ئارایشی نەکرد و هاتە دەرەوە مانای ئەوەیە ئەو ئافرەتە پاك نییە و بەدکارەیە.
٦. لە باشووری وڵاتی هیندستان دا وا باوە هەموو بووکێك لەسەر دەست و پێ بەڕێوە بڕوا تا دەگاتە لای زاوا ئەویش پێی بە سەریدا بنێ.
٧. لە وڵاتی غینیای تازەدا کچ دەڕوات بۆ مەلەکردن لە نزیکی کوڕە خۆشەویستەکەی دا لە ژێر ئاودا خۆی رووت و قووت دەکاتەوە, کوڕیش دەرپێیەکەی دەداتێ بەو جۆرە خوازبێنی تەواو دەبێت.
٨. لە دوورگەی تاهیتی دا ئەگەر ئافرەت گوڵی کرد بەسەریدا بەلای چەپەوە بە دوای هاوڕێدا دەگەڕێت, خۆ ئەگەر بەدوای راستیدا کرد ئەوە بە دوای شوودا دەگەڕێت.
٩. لە دوورگەی موباسای وڵاتی سۆماڵ دا هەر ئافرەتێك دەبێت دوو پیاو داوای بکات و لەگەڵ یەك دا زۆران بگرن.. کچە دەبێت بە ژنی سەرکەوتووەکەیان.

١٠- له وڵاتی "تشیا" له ئەفریقا, هەر ژنێك منداڵی نەبێت دەبێت بەردێك هەڵ بگرێت سەنگی ٩ کیلۆگرام و دای ئەنێ تا منداڵی دەبێت.

## شیربایی له چەند وڵاتێك دا

١- له مێژووی کۆنی جوولەکەدا هەر کەسێك ژنی بهێنایە دەبوایە چەند ساڵێك خزمەتی باوکی کچەکەی بکات ئەو کاتە کچەیان پێ دەداو هەر بەم شێوەیە چەند پێغەمبەرێك ژنی هێناوە.
٢- شیربایی هیندییەکانی وڵاتی ئەمریکا چەند سەر ئەسپێك بووە له زاوا وەردەگیرا.
٣- لەناو کوردا تاکو ئێستاش تاکوتەرا شیربایی دەبینرێت, کە تفەنگێکی برنەو و دەمانچەیەك یان سەد دینار بوو.
٤- هەندێ هۆزی ئەفریقیایی چەند سەر مەڕ یان مانگا یان پێستە پڵنگیان له باتی شیربایی وەرگرتووە.
٥- له ناوچەی کانتۆنی وڵاتی چین دا شیربایی دوو کەڵەشێر, دوو گۆزە شەراب, چوار بەراز, دە ماسیی وشك کراوە و یەك فەردە گەنم بووە.

## شەیتان:

ڕۆژێك حەزرەتی عیسا شەیتان دەبینێت چوار وڵاخی بار لێناوە و داویانەتە بەر. دەفەرموێت:

- شەیتان ئەمانە چین؟
- بار و تایە و شت دەفرۆشم.
- باردکانت چین ؟
- ئەمەیان داوێن پیسییە.
- کێ دەی کڕێت ؟
- شاکان و سوڵتانەکان.
- ئەی دووەمیان؟
- شاکامییە؟
- کێ دەی کڕێت؟
- زاناکان.
- ئەی سێیەمیان؟
- پاش قوڵ دان و کڵاو لەسەرنانە؟
- بسێنی کێیە؟
- بازرگانان.
- ئەی چوارەم؟
- بوختان و پیلانە.
- بسێنی کێیە؟
- ئافرەتە ئافرەت !!..
- عیسا دەفەرموێت: لەهەمووی بەڵاترە, بەڵاش لەوە دایە کە ناتوانی دەست له ئافرەت هەڵگرین.

## ئافرەتێکی نووسەری فەرەنسایی وتوویەتی:

ئافرەت دەڵێ:
ئەو ملوانکەیەکی پێ بەخشیوم بایی شارێکە نرخی هەر تەواو نابێت.
ئەوی تریان دیوانێکی هەڵبەستی بۆ داناوم پڕ لە هەستی جوان و خاوێن.
سێیەمیان: نازانی چەندێک جوان و قۆز و ئێسک سووکە و هەمیشە لە پێ ماچ کردمە.
بەڵام ئەی تۆ؟ ئەی ئەوەی کە خۆشم دەوێی، هیچت پێ نەبەخشیوم هیچم پێ ناڵێیت؟ خۆ جوانیش نیت!
بەڵام بەخوا تاقە خۆشەویستی منی و کەنیزناسا لە دەورت دەگەڕێم.

## ژنی فەیلەسووف

لە فەیلەسووفێکی پرسی هاوبەشی ژیانت چۆن هەڵ دەبژێریت؟
وتی: زۆر جوان نەبێت هەموو خەڵک چاوی تێ بڕێت، زۆریش ناشیرین نەبێت بێزی لێبکەمەوە، کەلەگەتێکی وا نەبێت خۆمی بۆ بەرز کەمەوە کورتە باڵاش نەبێت خۆمی بۆ دانوێنمەوە.. هێندە قەڵەو و تێک سمڕاو نەبێت لای شەماڵم لێ ببڕێت ئەوەندەش لەر و لاواز نەبێت لەوە بترسم با بیبات. وەکو مۆم سپی نەبێت و ڕەش تاڵیش هەروەکو تاپۆ.. ئەوەندە گەوج نەبێت تێم نەگات هێندەش خوێندەوار نەبێت دەمە دەمم لەگەڵدا بکات.. دەوڵەمەندێکی وا نەبێت وا بزانێت کڕیومی هەژارێکی وایش نەبێت مایەی تانەی منداڵەکانم دوای خۆی!

## بانگەوازێک بۆ ئافرەت

نووسەرێک: ئەی ئافرەت! ئەگەر ناتوانیت ببی بە ئەستێرەیەکی ئاسمان هەر نەبێت ببە بە مۆمێک لە ماڵدا.
فیکتۆر هیگۆ: هەر چەندێک دنیا بجووڵ بێتەوە تۆ هەر وەک خۆت گەورەیت، ئەی ژن.
بیتهۆڤن: ئەی ئافرەت! من هەست بە جوانیی دەوروبەرم و ڕازاندنەوەی سروشت ناکەم ئەگەر دەستی نەرمونیانت بەسەر گوڵ و جوانیی سروشت نەکێشێت.
تالێری: ئەی ئافرەت! نەکا باوەڕ بەو پیاوە بکەیت کە بڵێت تەنیا هەر تۆیت و تۆی و بەس.
ترتلیان: ئەی ئافرەت! تۆ سەرەتای ڕێگەی بەرەو شەیتانیت، تۆ دەروازەی دۆزەخیت.
ئەلفرێد دی مۆسێ: ئەی ئافرەت! تۆ خەوی شەوانمی و مایەی کڵۆڵیی ڕۆژگارم.
ڕابندرانات تاگوور: ئەی ئافرەت! تۆ بە تەنیایی دەستکردی خواوەند نیت، مرۆڤیش لە دروست کردنی تۆدا بەشدارە.. تۆ نیوەت ژنە و نیوەی دیکەت ئاوات و ئارەزووی حەزلی کەرانە.

### گەلانی ئەورووپا لە بارەی ئافرەتەوە وتوویانە:

## گەلی ئینگلیز

١- تەنیا چەکێک کە ئافرەت هەیەتی زمانییەتی.
٢- ئافرەت و پرد هەمیشی پێویستییان بە چاک کردنەوە هەیە.
٣- لە ڕۆژی ناگواردا پیاوان زووتر دەست و پێیان گوم دەکەن تا ئافرەتان.
٤- ئافرەت کلیلی هەر ماڵێکە.

٥- مایەی ژانەسکە ئافرەتی ناشیرین.. مایەی دەردەسەرە ئافرەتی جوان.
٦- ئەمە گۆڕی ژنەکەمە، نا لێرەدا لە دونیایەکی بێ دەنگ و پڕ بەختەوەری دا لێی پاڵ کەوتووە.. لێی گەڕێ. خۆ بەخوا منیش بەختەوەرم.
٧- هیچ هێزێکی ئاوی ئاگاتە دڵۆپی فرمێسکی ئافرەت.
٨- هەرگیز باوەڕ بە (نا)ی ئافرەت مەکە. ئەگەرچی ئێستا دەڵێ هەرگیز نابێت سبەینێ بە ئاسانی دەڵی بەڵێ قوربان !
٩- خوا پیاوی دروست کردووە بۆ ئەوەی درۆ بکات، ئافرەتیشی بۆیە خوڵقاندووە تا درۆکانی پیاو بسەلمێنێت؟

## گەلی رۆمانیا:

١- چادری بێ ئافرەت وەکو تاری بێ تەل وایە.
٢- ئافرەت گریان فێربووە تەنیا بۆ درۆکردن.

## گەلی پورتەغاڵ:

١- ئافرەتێك دوو کەسی خۆش بوێت لەگەڵ هەردووکیان دا درۆ دەکات.
٢- دایکی ژیر و زرنگ هەمیشە کچەکەی تەمەڵە.

## ئۆکرانیا:

١- پێش حەوت ساڵ شەریکی ژیانی، ئەکەی ستایشی ژنەکەت بکەیت.
٢- مێرد یاسای ژنە.

## هیندستان:

١- ئەگەر بتەوێت چۆنیەتیی زێڕ بزانیت دەی هەسوێی ئەگەر هێز و توانای گا تاقی بکەیتەوە باری لێ دەنێیت.. یان رەوشتی پیاو گوێی لێ دەگریت.. بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانیت ئافرەت تاقی بکەیتەوە.
٢- ئافرەت لە قسە ناکەوێت مەگەر دەست بکا بە گریان.

## سکۆتلەندە:

کوڕەکەم کوڕمە تا ژن دەهێنێت، بەڵام کچەکەم تا دەمرێت هەر کچمە.

## فرانسە:

١- ئەگەر لە پیاو تێ گەیشتوویت بڕۆ بەدوای لێکۆڵینەوەی ئافرەت دا.
٢ ئافرەت زەرەرێکی پێویستە.

٢. ئەگەر ئافرەت نرخی سێوی بزانیبا نەی دەدا بە کەس.

نیرلەندە:

هیچ هێزێک وڵاتی نیرلەندە لەناونابات، ترفۆزیی قەشە و لووت بەرزیی ئافرەتانی نەبێت.

ئەڵمان:

١. هەر کەسێک ژنی دەوڵەمەندی هێنا ئازادیی خۆی فرۆشت.
٢. پیاوی بێ ژن وەکو سەری بێ لەش وایە، ژنی بێ پیاو وەکو لەشی بێ سەر وایە.

یۆنان:

بەڵێنی ئافرەت بەسەر ئاوەوە دەنووسرێت.

ئیسپان:

١. ئافرەت وەکو سێبەر وایە، لێی دووربکەویتەوە بەدواتا دێت، بەدوایا بڕۆی بۆی دەرددەچێت.
٢. باوەڕ بە ژنی بێ دەنگ مەکە و سەگی هەمیشە دەم بە وەڕین.

پۆڵەندە:

١. هەر ئادەمێک حەوایەکی هەیە.
٢. چاودێریی لە کیجێک زۆر ئاسانترە لە چاودێریی لە ئافرەتێک.
٣. شەیتان ئافرەتی قووت دا بەڵام بۆی نەخورا و نەیتوانیی بیهاڕێت بەیەک دا.

چین:

١. ئافرەت وەکو فەرمانڕەوا وایە زۆر کەم دۆستی ڕاستەقینەیان دەبێت.
٢. پیاو دەتوانێت ئافرەتێک لە هەموو پیاوان بپارێزێت تەنیا لە خۆی نەبێت.
٣. لە بەرەبەیان دا لێدانی ئافرەت پێویستە، بەڵام لەبیری نەکەی لە دەمە و نیوەڕۆ دا لێی نەدەیتەوە.
٤. ئافرەت وەکو قاڵی وایە تا بە دار لێی دەیت تۆزی لێ دەبێتەوە.
٥. ئەگەر شەیتان نەی توانی بڕواتە جێگایەکەوە ئافرەت دەنێرێت.

ڕووس:

١. سەگ لە ئافرەت ژیرترە چونکە بە خانە خۆییەکەی ئاوەڕێت.
٢. کاتێک کچ لە دایک دەبێت چوار دیوار دەس دەکەن بە گریان.

٣- هەموو پیاوێك كوڕی ئافرەتێكە.
٤- ژنی سەرباز نە ژنە و نە بێوەژن.

**ئیتالی:**

جوانیی ئاسمان بە ئەستێرەكانەوەیە, جوانیی ئافرەتیش بە زوڵف و ئەگریجەیەوە.

**بولگار:**

باوەڕ بە هەتاوی زستان مەكە, هەروەها بە دڵی ئافرەتیش.

**سوێد:**

دڵی ئافرەت لە چاوی دە پیاو زۆرتر دەبینێت.

**ژاپۆن:**

لەبەر ئەوەی دایكت چاودێری لە ژنەكەت دەكات كەواتە باوەڕت بە ژنەكەت هەبێت.

**پۆڵەندە:**

بەهار كچۆڵەیە.. هاوین دایكە.. پایز بێوەژنە.. زستان ئافرەتە.

**چیكۆسلۆڤاك:**

١- ئافرەتی جوان سێ مێردی دەوێ: یەكەم پارەی بۆ بدا, دووەم خۆشی بوێت و لە دەوری گەڕێت. سێیەم لێی بدات.
٢- ئافرەتی ئەڵمان بۆ گەوڕ باشە, چیكی بۆ چێشتخانە, فەڕانسەیی بۆ ناوجێگە.

**ڕۆژهەلاتی:**

١- زێڕ بە ئاگر تاقی دەكرێتەوە, ئافرەت بە زێڕ.
٢- ئافرەت نەئاینی تەواوە و نە بیركردنەوەی.
٣- سەرسووكیی ئافرەت دڵی پیاو قورس دەكات.
٤- مزگەوتی ئافرەتماڵەكەیەتی.
٥- كاتێك ئافرەت قسە دەكات سەیری چاویشی بكە بزانە چاوەكانی چ دەڵێن.
٦- لە ژنەكەت بپرسە.. بەڵام ئەوەی بە چاكی دەزانی ئەوە بكە.

## بزەی لێو

(١)

ژنێك یەكەم جار چوو بۆ دیدەنیی هاوسێكەی منداڵەكەشی لەگەڵ دابوو. ژنەی هاوسێ لێی پرسی:
ئەم كچۆڵەیە هی تۆیە؟
گوتی : بەڵێ
گوتی بێگومان دەبێت باوكی جوان بێت !

(٢)

بە ژنێكیان گوت: خەسووەكەت دەرمان خوارد بووە و مردووە.
گوتی بی گومان گازی لە زمانی خۆی گرتووە.

(٣)

گوتی:
ئەوە بۆ چی ئافرەت وا جوان خۆڵقاوە و بێ بیر؟
ژنەش وەڵامی دایەوە:
جوان بۆ ئەوەی پیاو حەزی لێ بكات، بێ بیر و گەوجیش بۆ ئەوەی حەز لە پیاو بكات!

(٤)

سوقرات بە قوتابییەكی خۆی گوت:
ژن بهێنە كوڕم.. ئەگەر ژنەكەت باش دەرچوو ئەوا ئەبێت بە بەختیارترین مرۆڤ، ئەگەر باشیش دەرنەچوو، وەك من دەبی بە فەیلەسووف.

(٥)

فەیلەسووفێك دای بەلای دارێك دا و نواڕی ئافرەتێك بە دارەكەدا هەڵواسراوە، وتی:
خۆزگە هەموو دارێك بەری وای دەگرت.

(٦)

كوڕە هاتبووە لای دایكی كاسەیەك دۆی بە دەستەوە بوو،
وتی: دایە شوو ئەكەیت یا ئەم دۆیە ئەخۆیتەوە؟
ئەویش وتی: جا كوڕم من دانم هەیە تا دۆ بخۆمەوە؟!

(٧)

ڕووی كردە هاوڕێیەكی و گوتی:
كاتێك ژنەكەم بادار بوو داستانی سێ سوارەی دۆماسی دەخوێندەوە سێ كوڕی پێكەوە بوو !!
دۆستەكەی بەسەری خۆیدا و گوتی:
بڕا ڕۆ ! ئەكەی من خەریكی خوێندنەوەی داستانی دوانزدە سوارەی مەریوانە !!

(٨)

هاوڕێیەك لەوی تری پرسی

- ئەرێ هەواڵی تازە چییە؟

ئەویش گوتی: بۆم دەرکەوتووە ژنەکەم راستم لەگەڵ دا ناکات و خەریکی رابواردنە.

گوتی: من پرسیاری هەواڵی تازەت لێ دەکەم ئەی دۆست !

(٩)

کابرا نەخۆش کەوت و خەریك بوو دەمرد, رووی کردە ژنەکەی و گوتی:

- کە مردم شوو بە دراوسێیەکەمان بکە.

گوتی: بۆچی؟

گوتی: ئوتۆمبیلێکی پێ فرۆشتم تاسەر لووتم کڵاوی ناوە سەرم.

(١٠)

مێردە رووی کردە ژنە و گوتی:

- ئەوە بۆچی بەشانەی سەری من تووکی ئەو سەگە شانە دەکەیت؟

گوتی ئازیزەکەم, مەترسە .. خۆ.. شانەکەم شۆردووە.

(١١)

کابرا رووی کردە ژنەکەی و وتی:

- کەی ئەم ئارایش کردنە تەواو ئەکەیت؟

ژنەکەش وتی:

- تۆ بۆ ئەوەندە گەوجی! نازانی سێ دەقیقە یەعنی سێ سەعات.

(١٢)

ژنێك مێردەکەی مرد و لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسی:

"گەلێك غەمبارم بۆ مەرگت. ناتوانم ئاوا بژیم !"

ساڵێك تێنەپەڕی دووبارە شووی کرد ئەو کاتە وشەی (بەتەنیا)ی بۆ (ناتوانم ئاوا بژیم) زیاد کرد !

(١٣)

ژنە رووی کردە مێردەکەی و وتی:

کاتێك مردم لەسەر گۆڕەکەم بنووسە:

"لە ئاسمان دا ئارامی و ئاسایش هەیە"

وتی: نەخێر, ئەنووسم:

"لە ئاسمان دا ئارامی و ئاسایش هەبوو " !!

## وەلی دێوانە

شاعیری شەیدا و عارفی تەواو عەیاری هونەری جاف زانا و قەلەندەری ڕێگای هەق و عیشق، توانای مەیدانی ئەندێشە و خەیاڵ و ڕاستەقینە، وەلیی جگەر سووتاوی عیشقی ئەزەلی و هەتا هەتایی لەناوچەی گەرمیان و نزیکی دێی گوبانو عوسمانی بڕنەوا لەدایك بووە، لە تیرەی کەماڵەیی جافە. کە لە بنچکەوە ئەڕۆنە سەرتیرەی شاتری، کە یەکێکە لە تیرە زۆرەکانی عەشیرەتی جاف. لە ساڵی (١١٦٢)ی کۆچیدا لەدایك بووە و، لەتەمەنی سی و یەك ساڵیدا مردووە.

لەبەر ئەوەی لە کتێبێکی ڕازاوەوە لە یەکدراوەدا خەریکی چۆنێتی ڕاستەقینەی ژیانی ئەم عارفە شەیدایەم بۆیە نامەوێت لەیرەدا بە درێژیی باسی بکەم، بەڵام هەر ئەوەندە ئەڵێم، گوناهێکی هەرە گەورەیە بازێك لە نووسەرانمان، هەرکەسێك بووە و هەر کەسێکیش هەیە، تۆمەتی تۆمەتی ئەخوێنەواری بە خاوەن بەیان و شیرین زمانێکی وادا بکات..

ئاخۆ لەسەر چ بنەڕەت و بەڵگەیەکە ئەم بیروڕایە پووچە؟

یاران لە جەرگم یاران لە جەرگم
من شەم شێویی تیردان ئەجەرگم
هەر وەخت کە مەیۆ ناکام مەرگم
ئامانەت نەکەن کەفەن وەبەرگم
بەو شەرت شوران حاشیەی ئەندامم
نەواکم پیش بۆ زوخا و نەزانم

بنوارە لەم عیشقە سەرمەدییە و لەم هەڵهەڵەی بە ئەوج گەیشتنە.. ئەو لە زیندوییدا، ئەوەی لەشی و تەنی حەزی لێکردووە دووری لێ گردووە. ئاواردی ئاودۆڵ و نزار و هەردە، وردە وردە بەرە بەیانی عیشقی هەتا هەتا خۆی لاواندۆتەوە.

بەوشەرت شوران حاشیەی ئەندامم
نەواکم پیش بۆ زوخاو نەزامم

ئەو پێی خۆش نەبووە، جێگای زامەکەی بارانی تیری بێ ئامانی مەرگیش بێت، لەکاتی شۆردنا زوخاو لەلەشی بێت چونکە ئەو زەخاوەی بەنیشانەی حەز و ئێش زانیوە ئەو لە ژیاندا ئەوەی بیری لێنەکردۆتەوە ئارەزووەکانی لەش و ئەندامەکانی بووە، جا تکا ئەکا هەر بەو بەرگە شرۆڵانەوە بیخەنە ژێرخاك، ئەکا لەشی لەناو گڵێنەی خەڵکیدا خیانەتی لێبکاو، وا بزانرێت ئەوە زووخاو و ئاوات و ئارەزووەکانیەتی و بە شێوەی زوخاودێنە دەرەوە.

وەلی لە ناوچەکانی گەرمیاندا کەرەستەی تەباریکی تر و مانووی بیرو ئەندێشەیەکی کەمبووە. ئەنێش و ژانی برسێتی، ئەفرچەی قورگی ووشك و تینوێتی، ئە سۆز و هاڵاوی گەرمیی گەرمیان، ئە ئاوری پڕ سەرسامی دەوروبەر، ئەهۆ ز ئەخزم ئەیاران ئە بەشەرنا، ئەیان توانیوە بۆ ساڵێك زنجیرەی تێفرینی میرزای ڕۆژنبیر و خاوێندل بپچڕێنن.

ئاوا ژیانی بردۆتە سەر، تابە دەردی ئەوینی ڕاستەقینە و هەتا هەتایی سەری ناوەتەوە، لە یاد و کرداری ئەو زاتەش، وەك سەرمایەیەکی کەلەپووری بۆ هەموو مرۆڤێك ماوەتەوە.

## بزانە

١- گەورەترین چاو، هی جانەوەرێکی دەریایە بەناوی "حبار" کە جۆرێکە لە ماسی سەدەف. بازنەی چاوی (٣٨سم).

٢- گەورەترین بەندەرێک لە جیهاندا "شاری" "نیویۆرک" بە (٣٩١) کەشتی لەیەک کاتدا دەتوانن لەنگەری تێدا بخەن.

٣- گەورەترین تابلۆیەک تاوەکو ئێستا دروستکرابێ، بەناوی "پانۆرامای میسیسیپی"یە، لەلایەن هونەرمەند (جۆن باننارد) لە ساڵی ١٨٤٦ دا تەواو بووە. درێژایی ١٥٢٥ مەترە، پانییەکەشی ٣ مەتر و ٦٥ سانتیمەترە.

٤- قووڵترین گۆم لە جیهاندا کەوتۆتە "سیبریا"ی یەکیەتی سۆڤیەتەوە. گۆمەکە ناوی "بایکال"ەو قووڵییەکەشی ١٤٨٥ مەترە.

٥- گەورەترین کاتژمێر لە یەکێك لە باخچەکانی ژاپۆندایە بە گەورەیی (١٨) مەترە بەناوی (نوتوفوك).

٦- درێژترین پیاو ناوی (رۆبرت والدو) بووە لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا درێژیی گەیشتۆتە (٢٧٢) سانتیمەتر.

٧- بەرزترین ئافرەت درێژیی ٢٤٧ سانتیمەتر بووە بەناوی (زینخ جیلیان).

٨- درێژترین ژن و مێرد کە پێکەوە ژیاون ناویان.

- ئانا هینن سوزان	درێژیی ٢١٧ سانتیمەتر بووە.

- مارتن کان بورین	درێژیی ٢٢٠ سانتیمەتر بووە.

٩- کۆڵترین پیاو خەڵکی وڵاتی ئەمریکا بووە، بەناوی (کالفن فلیبس) کە تەنها ٦٧ سانتیمەتر باڵای بەرز بووە.

١٠- تا ئێستا قووڵترین چاڵێك کە مرۆڤ دەریبێنێ و، پیادا رۆیشتبێتە ناو جەرگەی زەوییەوە، لە یەکێك لە کانەکانی ئەفریقیا بووە، کە بە قووڵی (٣٧٧٧) مەتر بووە.

١١- لە ساڵی ١٧٣٥ی زایینی لە شاری مۆسکۆدا گەورەترین زەنگڵەیان دروستکردووە کە قورساییەکەی (١٩٦) تۆنە و بە درێژی (٥,٧٨) مەتر و بە گەورەیی (٥,٩٥) مەترە.

١٢- بچووکترین کتاوێك کە تا ئێستا هەیە بەناوی (زمانی گوڵەکان) کە درێژیی و پانیی (٢ × ٢) ملیمەترە و ئەستوورییەکەشی یەك ملیمەترە.

١٣- بەرزترین کورسییەك کە دروستکراوە تاوەکو ئێستا، بەرزییەکەی (١٢,١٠) مەترە و جێگای دانیشتنەکەشی (٢٥) مەتری چوار سووچەیە، کە سەد و پەنجا کەس دەتوانن لەسەری دابنیشن.



درێژ ترین پیاوی جیهان





بەرزترین ئافرەتی جیهان

# محمد پاشای جاف

( ١٢٣٠ – ١٢٩٩ ك )

محمد پاشای جاف سەرۆکی عەشیرەتی جاف و کوڕی کەیخسرەو بەگی سلێمان بەگە جاف بووە لە ساڵی ١٢٣٠ کۆچەریدا لە دایك بووە لەناو تیرەکانی کوردەواری ئەو سەردەمەدا قسە بیسراو و لێپرسراو بووە و دەسەڵات و توانایەکی باشی هەبووە زۆر بە ئاسانی هەمیشە هەزار سواری شەڕکەری لەژێر دەستدا بووە لە کۆتاترین کاتدا.. هێندە مل کەچی دەسەڵاتەکانی ئەو سەردەمە نەبووە وەك دەوڵەتی عوسمانی وە ئێران وە هەروەها ئەمیرانی بابان. ئاخری ئەم مل نەدانە و جەربەزەییە بوونە هۆی کوشتنی لەلایەن عوسمانلیەکانەوە پیلانێکیان بۆ رێك خست بە دەستی چەن کەسێکی تیرەی کەرەم وەیسی بە ناوچەی (ئیبراهیمی سەمین) ئێستادا و لە تەمەنی شەست و نۆ ساڵیدا.. بە خەنجەر کوژراوە.

محمد پاشای جاف پیاوێکی گەلێك ئازا و لە هەمان کاتدا بە تەگبیر بووە. زۆر تووشی گیر و گرفتی گەورە هاتووە بەبۆنەی گەرمیان و کوێستانی ئێلی جافەوە.. لەە باوەڕێکدا بووە ئەگەر ئێلی جاف دەس لە کۆچەری هەڵ بگرێت بە زوویەکی زوو تیائەچن و لەناو ئەڕۆن.

ئەم زاتە قەڵای بەناوبانگی (شیروانە)ی بەسەر دوو تەپۆڵکەوە دروست کردووە، کە یەکێکە لە شاکاردکانی میعماری کە لەرۆژهەڵاتدا، ئەنوارێتە چەمی سیروان.. هەروەها عەرووسیەکانی ئەو قەڵایە لەبەر سوورڕخواردنی هەتاو، وەك هەمات کاتدا چۆنیەتی "با" لە هەر گۆشەیەکەوە هەڵبکات جۆرێك خۆی لە عەرووسیەکان ئەخشێنێت لە چلەی گەرمای گەرمیاندا لەش فێنکی پێ ئەگات. ئەم زاتە حەوت کوڕی هەبووە بەم ناوانە:

١- محمود پاشای جاف.
٢- عثمان پاشای جاف.
٣- حمە علی بەگ.
٤- حسن بەگ.
٥- فتاح بەگ.
٦- سلێمان بەگ.
٧- قادر بەگ.

* مەحموود پاشای کوڕی محەممەدی پاشای جاف، سەرۆکی ئێلی جاف، ساڵی ١٢٦١ ك هاتۆتە جیهانەوە، پیاوێکی ئازا و رۆشنبیر و ئەدەب دۆست بووە.. هەمیشە (میوانخانەکانی جێگای شاعیران و ئەدیبان و، مەلا زاناکان بووە.. ماوەیەکی زۆر قائیمقامی شاری هەڵەبجە بووە.. لە ئاخری ژیانیدا کەوتە سەر کەلکەڵەی کوردایەتی وەك خۆی فەرمویەتی (کاتێك کە توانیم نەمزانی، وەختێك کە زانیم نەمتوانی) کە ئینگلیزەکان عیراقیان داگیر کرد، پاشا هیچ هاوکارییەکی لە گەڵیانا نەکردووە.



محمد پاشای جاف

۱۲۳۰ ـ ۱۲۹۹هـ



مەحموود پاشای جاف



نوری سعید



مەلیك غازی

## چاوگەکان


١- مۆسیقای سنفونیك — ادوارد دوانز

٢- نو وتار دەربارەی میعماری — میشیل سوفرو

٣- هونەری شانۆ — لئون موسیناك

٤- مێژووی سینەما — ئارتورنایت

٥- فیلم و دەرهێنەر — دان لیونیکستن

٦- مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەراست — جورج لیجافسکی

٧- مێژووی وڵاتی ئەمریکا — ئاندەر مورفا

٨- مێژووی وڵاتی بریتانیا — ئاندەر مورفا

٩- مێژووی شارستانیەت — ویل دورانت

١٠- مێژووی مرۆڤ — هندریك وان لون

١١- ژیانی پیاوە ناودارەکان — بلوتارك

١٢- مێژووی زانساری — پییر روسو

١٢- مێژووی دروست کردن و دۆزینەوە — پییر روسو

١٤- مێژووی زانین — جورج سارتن

١٥- ئاسۆی زانیاری — جارلز هیچر

١٦- مێژووی پزیشکی — جوزێف گارلند

١٧- سەردەمی باوەڕ — ئان فرەنل

١٨- سەردەمی ئەندێشەی بەرز — جورجی دوساتیلانا

١٩- سەردەمی ژیری — استوارت هشایر

٢٠- سەردەمی ئایدەلۆژی — هنری نایکی

٢١- سەردەمی لەیەکدانەوە — مۆرتن وایت

٢٢- مێژووی ئاینەکان — هاشم رضي

٢٢- فەرهەنگی ئەفسانەکان — پییر گریمان

٢٤- لوغەت نامەی خودا — علامه دهخدا

٢٥- فەرهەنگی معین — دکتور معین

٢٦- مێژووی فەلسەفە — ویل دورانت

٢٧- المعجم — شمس قیس رازی

٢٨- شاکارەکانی ئەدەبیاتی جیهان — شهباز

٢٩- شاکارەکانی ئەدەبیاتی گێتی — حدادی

٣٠- ئەتلەسی جغرافیا — مۆئەسسەی سحاب

٣١- دائرة المعارف بریتانیکا — مۆسسەی سحاب

٣٢- دائرە المعارف امریکانا

٣٣- لاروسی تێکرایی

٣٤- فەرهەنگی فەلسەفی — ڤۆلتێر

٣٥- فەرهەنگی ناظم الاطبا — میرزا علی أکبر خانی نفیس

٣٦- ئاوڕێك لە مێژووی جیهان — جواهر لال نهرو

٣٧- القاموس السیاسي — احمد عطیه الله

## (سوپاس) ی چاپی یەکەم:

### سوپاس

١- لەکاتی ئامادەکردنی ئەم کەشکۆڵەدا، مامۆستا عبدالرزاق بیمار یارمەتیەکی باشی دام، خوا نموونەیان بۆ پێش خستنی ئەدەبی کوردی زۆرتر کات. یارمەتیەکەی شایانی ئەوەیە سوپاسی بکەم و ماڵی ئاوا.

٢- بە سەرپەرشتی مستەفا زەنگەنە ئەم بەرهەمە چاپ کراوە.

خوسرەو جاف



ئەندازیار خوسرەو جاف

# ENCYCLOPEADIA OF LITER ART AND SCIENCE







زنجیرەی بڵاوکراوەکانی چاپخانەی شڤان 8